پارتیزانەکانی

# دوای ئەنفال

بەرگی دووەم

مەلاشاخی



چاپی یەکەم

2020

# پارتیزانەکانی دوای ئەنفال

* بابەت : سەروەری

* نووسەر : ابووبکرمحمدحاجی(مەلاشاخی)

* بەرگی دووەم

* چاپی یەکەم 2020

* تایپ şaxî

* دیزاین şaxî

* تیراژ ( 1000 ) دانە

* چاپخانە : چوارچرا



* ئیدارەی گشتی ( ی.ن.ك ) یارمەتی چاپکردنی داوە

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەگشتییەکان

ژمارەی سپاردنی ( 1800 ) ی ساڵی 2020ی پێدراوە.

نرخی هەردوو بەرگ 000 15 دینار

**پێشکەشە بە :**

- ڕەوانی پاکی مام جەلال
- شەهیدانی ڕێگای ڕزگاری کوردستان
- پارتیزانەکانی دوای ئەنفال
- کەس و کار و خانەوادەی شەهیدان
- پێشمەرگە و گەریلا و شەڕڤــان
- تێکۆشەران ودڵسۆزانی کوردایەتی
- هاوکارانی پارتیزانەکان.



# بەشی پێنجەم

# پارتیزانەکانی دوای ئەنفال

# لەجیاتی پێشەکی

- ئەم کتێبە کەبەرگی دووەمی ( پارتیزانەکانی دوای ئەنفال ) ە ئەمیش وەك بەرگی یەکەم بریتی یە لە مێژوو و بیرەوەری وئەرشیف وبەڵگەنامەو چیرۆکی چەندین تراژیدیا و ڕووداوەکانی دوای ئەنفال، لەبەرگی یەکەمدا تایبە تمەندیم دابوو بە خەباتی جوامێرانەی پارتیزانەکان لەسنووری گەرمیان و قەرەداغ و شارەزوور و شاربازێڕ و ڕیکخراوی سلێمانی .. لەم بەرگەیشدا تایبە تمەندیم داوە بە پارتیزانەکانی کەرکوك و پیرەمەگرون و سورداش و دۆڵی جافایەتی و کۆیە و هەولێر و بتوێن وخۆشناوەتی و سۆران وبالەکایەتی وبادینان ...

- ساڵی 2019 کتێبی( جوامێری )م چاپ وبلاوکردەوە، کەتایبەت بوو بەخەبات وتێکۆشانی پارتیزانەکانی ، حزبی شیوعی عێراق )..

- گەرچی لە 2012 دا چاپی یەکەمی ( پارتیزانەکانی دوای ئەنفال )م بلاوکردەوە، بەلام بە پێویستم زانی پرۆژەکە لەسنووری ناوچەیەك وحزبێك وبەرهەمی تاکەکەسی تێپەڕێنم.

- پترلەماوەی هەشت ساڵ لەهەوڵ وکۆششی بەردەوابووومدا بووم بۆ تەواوکردنی ئەم کتێبە.

- هەرچەندە ئەم کارە هەروا سووك ئاسان نەبوو، هەشت ساڵ گەڕان و بەدواداچوون و نووسینەوەو تایپکردن و دیزاین.. بەم دەست و پە نجەو بەم چاوە ماندوو وکزانەوە، هەرخۆم دەزانم کەچەند کۆسپەم هاتوونەتە سەر ڕێ و کارێکی یەکجارگران و تاقەت پرووکێن بووە.

- ئەشێ دوای ئەم هەموو هەوڵ وماندووبوونەیش، هێشتا هەموو ئاما نجەکانم نە پێکابێت، پارتیزان و هاوکار و کەسانی ماندووی تر هەبن من زانیاریم دەربارەیان نەزانیبێت، یاخوود مافی خۆیانم جێبەجێ نەکردبێ، هیوادارم لە کەم وکورتی بەگەورەیی خۆیان بمان بوورن. بەئومێدی ئەوەی لەچاپی داهاتوو دا بکارین کاری باشتروخزمەتی زیاتر پێشکەش بکەین.

مەلاشاخی

کەرکوك 2/2/ 2020



# خەباتی پارتیزانی دوای ئەنفالی چوار

**چۆن بە پارتیزانی ماینەوە...؟**

ئەگەرچی لە هێرشی ئەنفالی چواردا لەهەندێ ناوچە بەبیانووی مانەوەو بەرگری، رێگا لەهەندێ خەڵك گیرابوو.. کەخۆیان لەپەلاماری شاڵاوەکانی ئەنفال رزگاربکەن، بەڵام لەسنووری(شێخ بزێنی خواروو)ئێمەی پێشمەرگە، نەك رێمان لەکەس نەگرت، بەڵکو بەهەموو توانامانەوە هەوڵماندا کە زۆرترین خەڵك لەشاڵاوەکە دەربازبکەین و بیانگەیەنینەشاروشارۆچکەونۆردوگاکان،ئەوانەش کەرزگارناکرێن رێنماییان بکەین بۆ خۆحەشاردان،هەربۆیە بەبەراورد لەگەڵ ناوچەکانی دەشتی کۆیە و قەڵاسێوکەو (شێخ بزێنی سەروو..)کەمترین زیان بەرخەڵکی دانیشتووی ناوچەکەی ئێمە کەوت. چەندرۆژێك بوو، هێڵەکانی رێکخستن لەشارەکانەوە پەیتا پەیتا بەراپۆرت ونامەی تایبەتی لەشێواز وچۆیەتی هێرشەکان،لەگەورەیی وزۆری هێزی دوژمن،لەمەترسی بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی ئاگاداریان دەکردینەوە..

- ئێمە کادیرو فەرماندە وپێشمەرگەکانی سنووری(کەرتی 1ی ساڵەیی) ماڵ بەماڵ بەخەڵکمان راگەیاند کە کێ فریادەکەوێ بەرلە هێرشەکە با زوو ناوچەکەچۆڵ بکەن. خۆمانیش لەبەرزاییەکانی سەرزێ وگوندەکانی:

(قەرەسالم،تولکی،کاولەسوار،شەوگێر،پەڵکانە،دەرماناو،عەمدۆن)سەنگەرمان لێداو بریارماندا تاپەراندنەوە و دەرباز کردنی خەڵکەکە شەری مان ونەمان بکەین..

ـ شەوی 1988.5.4/3 دوای بیستنی هەواڵی کیمیابارنکردی گۆپتەپە،جارێکی تر خەڵکمان لە دەسپێکردن ومەترسی هێرشەکە ئاگادارکردەوە،ئەوشەوە تابەیانی خەڵك نەخەوتن،رێگاوبانەکان لەکاروانی کۆچکردووان جمەیان دەهات،ئێمە چەند (کەڵك)ێکمان لەنێوان گوندەکاتی پەڵکانە وسێکانی ولەنێوان چەمەکانی گوندی توڵکی و گوندی ئاوماڵ دانابوو،بەردەوام خەڵکمان دەپەڕاندەوە بۆ بەری هەولێر..

ـ بەرەبەیانی 1988/5/4 لەهەموو قۆڵەکانەوە هێرش بۆسنووری ئێمەش دەستی پێکرد،پێشمەرگەکانی بەشی هەندەسەی (تیپی21ی کەرکوك) رێگاکانی نێوان ئێمەودوژمنیان مین رێژ کردبوو،سەعات 9 ی بەیانی لەسەررێگای(عەلی بەیان)مینی یەکەم بەسەیارەیەکی لاندکرۆزدا تەقییەوە و هەمووسەرنشینەکانی بۆدۆزەخ نارد، لە سەعات(10)مینی دووەم لەسەر رێگای(توڵکی ـ بیرەسپان)بەهینۆیەکدا تەقیەوە هەموو سەرنشینەکانی کوشت و بریندارکرد،ئەمە وای کرد کە دوژمن نەوێرێ بە ئۆتۆمبێل زووبگاتە سەنگەرەکانی هێزی پێشمەرگە،بەدرێژایی ئەورۆژە پێشمەرگە بووبووبەسێ بەشەوە.ژمارەی(25)پێشمەرگەلەنێوسەنگەراکاندا لەگردە بەرزەکاندا خۆیان قایم کردبوو،(25)پێشمەرگەی تربەسەرپەرشتی(شەهید ئاوات رشید) لەهەوارەکانی(دەرماناو) لەنزیك (گاقڕان) چوونەسەنگەر.مینێکی دەبابەشکێنیشان لەسەر رێگاکە نابوو وەوە، ئەگەر گاگەلی گوندەکە نەیانتەقاندایەتەوە کارەسات رووی دەدا،چونکە هەردوای تەقینەوەی، تراکتۆر وعارەبانەیەکی پڕلەهاوولاتیانی گوندی(مەرزیخە)بەوێدا هاتن، ئەگەر گایەك نەبووبایە بەقوربانی.. چەندین ژن ومناڵ شەهید دەبوون..

ئەورۆژە بەسەرپەرشتی شەهید ئاوات دەیان خێزان لەنێوان (پەڵکانە ـ سێکانی) پەڕێندارنەوەو دەربازکران (شەهیدئاکۆسوور) و(وەستاصابر)وهاورێکانیشیان لە

چەمەکانی نێوان (تولکی - ئاومالّ) دەوری جوامێرانەیان هەبوو لە پەڕاندنەوەی سەدان خێزان بۆ دەرەوەی بازنەی شەڕەکەو دەربازکردنیان بەرەو دەشتی هەولێر..

25)پێشمەرگەی گورجی تر هەرجارێك کە دوژمن لەسنوورەکە نەزیك دەبوونەوە، هێرشیان دەکردە سەر وبۆدواوە بەرپەرچیان دەدانەوە....ئەوروژە و شەوی دواتر تا کاتژمێر1ی دوای نیوەشەو کە رژێم ئیتر زێی بچووکی لەدوکانەوە بەردرایەوە و هیچ مەجالێکی نەهێشتەوە بەسەدان خێزان وهەموو پێشمەرگەکان پەڕیندرانە نەوبەرەوە، ئەوانەی شارەزاییان لەکەڵکەوانی دا هەبوو،ناکرێ هەرگیز لەیادبکرێن، بریتی بوون لە:(ئاکۆسوور، بکرعابد کاولەسواری، صالح احمد حمدامین علی، یاسین کوێخایابە،رحمان کوێخایابە کاولەسواری، وەستاصابیر)وچەند کەسێکی تر تا دوا کاروان ، شانیان دابووە بەر ئەو ئەرکە گرانە..

- دەستەیەکی تر لەپێشمەرگەکانی سنووری کەرکوك بەسەرپەرشتی عەریف نامیق زوو پەڕیبوونەوە ئەوبەر،ڕێگای(کەلی سۆر)یان لە رووباری(شەرغە) کۆنترۆڵکردبوو، نەوەك دوژمن لەوقۆڵەوە هێرش بهێنێ وپشتەوەمان لێ بگرێت..

- وابڕیاربوو هەمووپێشمەرگەوژن ومناڵکان بەرلە دونیا رووناکبوونەوە لەژێر پردی نزیك گوندی(تازەدێ)ی ئێستا و(شەیتان)ی جاران بەرو(قەمبەر،نێرەگین،بانەمۆرد) بکەونەڕێ و لەو دۆڵ و قەمیشەڵانانەدا تا پاشنیوەڕۆ خۆیان حەشاربدەن..

تا دواتر خەڵکە لێقەوماوەکە بەرەو (دێدەوان)ولەوێشەوە بۆ هەولێر بەڕێ بخرێن و پێشمەرگەکانیش بەرەوە سماقولی وخۆشناوەتی بەڕێ بکەون.

- بەداخەوە چەند خێزانێك بەهەرهۆیەکەوە بوویێت مابوونەوە،دواتر زۆربەیان خۆیان حەشاردابوو،بەشێنەیی دەربازبوون،چەندخێزانیش جاشەکان بەسەیارەی خۆیان بردبوویانن بۆکەلاوەکانی گوندی(عەلی بەیان)و لەوێ لەژێر داروپەردووی خانووەروخاوەکاندا حەشاریان دابوون،پێیان گوتبوون:لێرە مەجولێن تا بۆشەو

سەیارەتان بۆ دێنین و دەتانبەینە ناوکەرکوك..بەڵام بەهۆی بێمتمانەیی یەکێك لەسەرۆك خێزانەکانەوە بەر لە خۆرئاوابوون بەرەو ناحیەی شوان بەرێ دەکەون و بەپێی خۆیان دەچنە بەردەستی ئەنفالچییەکان وراپێچی تۆبزاوا یان دەکەن..

- من دەستەیەك پێشمەرگەی ئازاو دلێرم لەگەڵدابوون،بڕیارماندا تا گەیاندنی ئەوسەدان خێزانەی شیو(قەمبەر) بەئۆردوگاکانی هەولێر..بەجێیان نەهێڵین،خێزان خێزان لە پاڵ گرد ونێو ئاژەڕ وقەمیشەلانەکانداحەشارماندان،ئامۆژگاریمانکردن پەرۆ و شرۆشیتاڵی مناڵ هەڵنەخەن،چونکەدەبووە هۆی ئاشکرابوونیان بۆفرۆکەو ئەو کۆپتەرانەی بەدرێژایی ئەورۆژە دەسووڕانەوە...

پاشنیوەڕۆی 1988/5/5 کەرتی1ی ساڵەیی بەرەوسەرجادەی (کۆیە - هەولێر) بەرێکەوتن، بەمەبەستی رۆیشتن بۆ مەڵبەندی( 3 ی هەولێر) لەدۆڵی سماقوڵی.. منیش لەگەڵ هەڤاڵەکانم لەو دۆڵەداماینەوە، سەرلەئێوارە خێزان خیزان بەرێمان کردن بۆ گوندی (بانەمۆرد)وخۆمانیش چاودێریمان دەکردن..نەك پیروپەککەوتەو نەخۆشەکان بەجێ بمێنن،هەرگیزئەوەم لەبیرم ناچێت کەژنێك بەناوی(خەجیلە)ی خێزانی(لەشکری قادرمولود شەوگێڕی)پتر لە(3سەعات) رێگا(مام کریم رەشان)ی باوکی بەکۆڵەوەبوو..چەندین پیرەژنی نەخۆشم دەبینی کوڕ و بووکەکەی بەنۆرە بەکۆڵ هەڵیان دەگرتن..

## دەربازکردنی ژنێکی دووگیان:

- دەمەوئێوارەبوو،لەکاتی پەڕینەوەماندا لەبەردەبازەکانی رووباری(شەرغە)لەنێوان گوندەکانی(نێرەگێن - بانەمۆرد)گوێم لەگریان و لاواندنەوەی ژنێك بوو،زۆربەکوڵ دەگریا.. باسی لە بێکەسی خۆی دەکرد،زڕەی زنجیری دەبابە هەندی گریانی ژن دڵم راناچڵەکێنێ، زۆر نیگەران بووم، زۆر بەپەلە گەڕامەوە بۆلای.. هاوسەری ژیانم دەستی مناڵەکانی گرتبوو...چەند مەترێك لەپێشمەوە دەڕۆیشتن ،هاوری کرد:

ـ ئەوەکێیە..؟ تۆدەیناسی.؟مەگەریوە..! با لەئێمە دانەبڕێیت،ئەشێ تاریك دابێ و ئیتر هەرگیز یەکترنەبینینەوە....

من گوێم بەوقسانەنەدا،ئەوانم بەچەندکەسێك لەخزمەکان سپارد و خۆم گەڕامەوە، چووم بۆلای ئەوخوشکە کلۆڵەی کە دەگریا، تێڕامام بەلاّم نەمناسی، پێشمەرگەیك بەناوی (بکرمحمودتوفیق) بیرەسپانی ناسراوبە(فەرهەنگ)م نارد تابپرسێت:

ـ کێشەی چییە.؟ کە گەڕایەوە گوتی:مامۆستا ئەوژنە دووسێ منالّی لەگەلّدایە، خۆشی ژانی منالّبوونیەتی،بەپەلە خۆم گەیاندەوە کاروانەکە، قەناعەتم بەژنێکی بەسالاّچوودا کرد، کە بگەڕێتەوە وببێتە مامانی، گەرخوا حەزی کرد رزگاری بوو، هەمووپێکەوەبچین بۆیانەمۆرد،پاش نیوسەعات چاوەڕوانی مامانەکە هاتەوەلامان، گوتم : ها مزگێنی بدە .. خوارزاکەمان کوڕە یا کچە..؟؟

گوتی:بەخوا کاکە وابزانم منالّی نابێ...هەلّسن ..! بابڕۆین ژنەکە ژان بەریداوە...

ئەوشەوە ماوەی یەك سەعات ڕێگامان بەماوەی (4)سەعات بڕی،هەر کیلۆمەترێك دەڕۆیشتین و هاواری لێ هەلّدەستا:(دوورکەونەوە منالّم دەبێ..) دوایش هەر هیچ.

پیرەژن گوتی ئەشێ سکی سوورابێ،هەندێ خەریکی بوو،خوشکەکەمان ئارام بۆوە، دوو لەمنالّکانیم دایە دەست پێشمەرگەکان لەکۆلّیان بکەن،خۆمیش کوڕە خەپەکەیم کردە سەرملم..تا سەعات 12ی شەو گەیشتینە بانەمۆرد ئەومنالّە دووجار لەکۆلّ و سەر(تلیقانە)ی من خۆی پیسکرد،زەرداوی میزوپیسایی منالّەخەپەکە گەیشتبوونە ناوکەفەوپووزەوانەکەم،هیچ بەلامەوە کێشە نەبوو،ئەمگوت:گرنگ ئەوەیە منالّێکی چاوگەش لەرۆژێکی ڕەشدا چاو هەلّدێنێ وخێزانێك لە ئەنفال رزگار دەکەین..

ـ بەونیوەشەوە ئارد و رۆن وتەشتێکم پەیداکردوکەوتمەدرووستکردنی ناوساجی، هەمووپێکەوە تێرمان خوارد.دوای نیوەشەو هەڤالّ(صدرە)و دووسێ پێشمەرگەی (حزبی سۆسیالیستی کوردستان) هاتن، لێم خوڕین ئێوە کێن..؟

خۆیان ناساند ئەویش پرسی : ئەی ئێوە کێن ..؟

گوتمان پێشمەرگەی یەکێتین،پرسی کێ لێپرسراوتانە..؟

یەکێك لەهەڤالان منی پێ ناساند...ئەویش زۆر پیاوانە ئامادەیی هاوکاری دەربڕی.

- هەرئەوەندەمانزانی ژنەکە دای لە هۆڕەی گریان،وامانزانی دیسان ژانی منالبوونە،

لێمان پرسی: ها خوشکە خێرە دیسان مەسەلەکەیە ..؟

گوتی: نەخێر..نا نا هیچ ژانم نییە،توخوا تۆ(مەلاشاخی) یت.؟؟

گوتم: بەڵێ..بۆ.؟گوتی: لەرووم نایە باسی بکەم .. بەدەم گریانەوە دوورکەوتەوە..

دواترئەوەمزانی کەبەر لەچەندرۆژێك لەماڵی دراوسێیەکی ئەواندا بڕی (700)دینار کۆکرابۆوە، تا کلاشینکۆفێکی پێ بکڕن و منی پێ تیرۆر بکەن...

گوتم خوشکەکەم هەرچی بووە قوربانی تۆبێت، هیچ گوێی مەدەرێ..

گوتی: چۆن گوێی نەدەمێ... تۆ لەپێناوی من و منالَکانم کەسوکارەکەی خۆت فەرامۆشکردووە،کەسوکاری منیش بەجێیان هێشتووم..ئاخر ئیترچۆن نەگریەم..؟

تۆبڵێی رۆژێك بێت لەم رۆژەرەشە رزگارمان ببێت وچاوم بەتۆ بکەوێتەوە..؟

ئەوشەوە تەنیاجرکەیەکیش نەخەوتم،چەندهەڤاڵێکی(کۆمەڵە)ی خەڵکی (بانەمۆرد) ئەوانەی لەیادم ناچن بەڕێزان(وریاسەعدی عەبدوڵڵا وهیوا سەعدی عەبدوڵڵا و کامەران سەعدی عەبدوڵڵا و میرزا حەمەد ئیبراهیم و ئایزن قادرحەسەن و کاك عوسمان حەمەدەمین صادق)بوون. دوای ئەوەی هاتن بۆلامان،گوتیان:

خەڵکی گوند هەمووی دەربازبوون،ئەوەی ماوەتەوە چەند هەڤاڵی رێکخستن و پێشمەرگە و هێزی پشتگیری گوندەکەین..

خواهەڵناگری زۆر هاوکارمان بوون لەداڕشتنی بەرنامەی چۆنیەتی حەشاردانی ئەوهەموو ژن ومناڵ وپیرو پەککەوتانەدا..

ـ کوڕەکانی شادڕەوان(مەلامحمدی نێرەگێن)کەزانیبوویان من لەوێم،گوتبوویان ئەوە خۆشەویستی باوکمانە،بابچین بۆلای،ئەوانیش کوڕی ئازاو بەهیمەت بوون،کات زۆر بەخێرایی دەڕۆیی،لەسەر ئەوە رێکەوتین خەڵکە ئاوارەکە دابەش 3 گروپ بکەین.

## گرووپی یەکەم:

کە زیاتر لە 200کەس دەبوون هەڤاڵ(صدرە)پێشیانکەوت بەرەو باکوری چیای دێدەوان ، بۆ نزیك(ئەشکەوت سەقا)بۆ شەوی دوایی گەیاندبوویانی بە(بنەسەراوە) هاوسەر و منداڵەکان و زۆربەی خزمانی منیشیان لەگەڵدابوون..

## گرووپی دووەم :

150 کەس دەبوون دوولەهەڤالانی رێکخستن لەگەڵ کوڕانی(مەلامحمدی نێرەگێن) سەرپەرشتیان گرتەئەستۆوبەرەو لوولەشاخەکانی گوندی(جلبەسەر)بەرێمان کردن. ئەوانیش بۆشەوی دوایی گەیەنرابوونە کۆمەڵگای دارەتوو.

## گرووپی سێیەم:

کەپترلە 150کەس دەبوون،هەڤاڵ(عوسمان حەمەدەمین صادق) پێشمان کەوت بۆ دۆڵی(مێوەرە)کەدەکەوتە نێوان هەردووگوندی(بانەمۆر ـ بەردەسپی) کونەشاخێکی سروشتی لێبوو جێگای سەدان کەسی تێدا دەبووەوە،ئەوخوشکە ومنداڵەکانیشی هەرلەگەڵ ئێمەبوون، لەوێوە تا دەرگای ئەشکەوتەکە منداڵە خەپەکەم کردەوە کۆڵ.

ـ بەرەبەیان بوو،بە توولەرێیەکدا بەریزەبەدوای چاوساغەکەماندا بەرەوحەشارگەکە دەڕۆیشتین،دووسێ جاروام هەست دەکرد پەتی پووزەوانەکەم گرێکانی کراونەتەوە بەدوای خۆمدا دەکشێ،هەڤاڵ(فەرهەنگ)لەدوای منەوەبوو،پێم وابوو کە بەئانقەست پێی لەسەر دادەنێ،دووسێ جارئاوڕم لێی دایەوە بەنەرمی پێم گوت:

ئەوە بۆوادەکەی..؟ لەوەڵامدا گوتی:بەخوا مامۆستا هیچم نەکردووە،کە گەیشتینە شوێنی مەبەست و هەموو ژن ومنداڵەکانمان کردە ئەشکەوتەکەوە..

دنیا رووناك بووەوە،ئەوچادەستم کراوەبوو کەخۆم گورچ بکەمەوە و پووزەوانەکەم ببستمەوە..تەماشامکرد پەتەکەی نەکرابووەوە،هەروەك خۆی بوو،بەلأم مارێك ویستبووی بێمەوبدات وددانەکانی لە چنینی پووزەوانەکەم گیربووبوو،هەرجارێك کاك (فەرهەنگ)پێی لەسەرکلکی دانابوو،لایەك لەشەویلاگەی هەڵتلیشابوو، هەربۆیە روحی تێدانەمابوو..لە خوارووی ئێمەوە،کۆپتەرەکان زۆر دەگەڕان..

ئێمەیش لەسەر گردەبەرزەکان بەکەپکەشاخ و ژاڵەو قەمیش چەندسەنگەرێکمان دروستکرد،خۆم و پێشمەرگەکان بڕیارماندا تا دوا فیشەك دیفاع لەو خەڵکە بکەین،تا دوای عەسر بەوشێوەیە ماینەوە، لەوسنوورەوە هیچ رووی نەدا،سەرلەئیوارەچوومەدەرگای کونەکە،کە بەتانییەکی بۆری بەسەرەوە بوو، تا لامبردوبانگم کردن فەرموون وەرنە دەرەوە، خەریك بوو بۆنی ژوورەوە گیژم بکات، لەکاتژمێر6ی بەیانی تا ئێوارە ئەو هەمووکەسە لەژوورەوە،هەرلەوێش لەناو ئەشکەوتەکە دەستیان بەئاوگەیاندبوو، بۆیە وا بۆگەنی کردبوو..کە درەنگ داهات..ئیتر ترسی هێرش بۆسەرئەو ناوچەیە نەما،خێزان خێزان بەڕێمانکردنەوە بۆ گوندی(بانەمۆرد) لەکۆتایی بەڕێکردنی ئەو خەڵکەکەدا بووین، پێشمەرگەیەکی حەرس بانگی لێکردین : وریابن..وریابن.! تەماشامانکرد لەبەرزاییەکانی ئەوبەرمانەوە چەند چەکدارێك جمووجوڵیان هەبوو، گومانی ئەوەمان کرد جاش بن و دزەیان کردبێت،بۆیە خۆم و10 پێشمەرگە بە دۆڵکاندا چووین بۆ پارێزیان، ئەوان چونکە ژن ومناڵەکانیان بەدووربین بینیبوو، لەئێمە دڵنیابوون، وایانزانیبوو کەدەچین بۆلای ئەوان..کەلێیان نزیك بووینەوە،لێمانخوڕین :ئێوە کێن..؟

گوتیان پێمە هێزی پشتگیری وکەسوکاری (مەلاعەزین)ین،گەیشتینەلایان یەکترمان ناسییەوە، ئاگاداریان کردینەوە کە لە چەمەکەدا دوو تراکتۆر وعارەبانەیەك هەیە، هی پیاوێکە لەسەیدەکانی گوندی(جل بەسەر)دەتوانن رازی بکەن یەکێکیان خۆتان

ونەوی تر کوڕکەی خۆی لێیبخوڕێت،ئەوژن ومناڵانەی ناتوانن بەپێ بڕۆن بیانگەینن بە نزیك دارەتو و بنەسەراوە،خۆاحافیزمان لەوان کردوچووین بۆخزمەت .مام سەید)چەندلێی پاڕاینەوە.سوودی نەبوو،خەریك بوو لێی نائومێدببین، پێشمەرگەکان گوتیان مامۆستابابڕۆین،سوودی نییە،منیش بیرم کردەوە لەپێناو رزگارکردنی ئەوهەموو ژن و منالەوهەردوو تراکتۆرەکەوکوڕەکەیدا.. کارێك بکەم رازی بێت،بیستبووم لەشۆڕشی ئەیلولدا سەرلقێکی کەرکوکی لەوسنووره زۆر بەزەبرو زەنگ بوو بوو،هاتەوە بیرم، گوتم: مام سەید..مام سەید.! ئەگەر ئیستا نەزانی من کێم وکوڕی کێم..نەك ئینکاری ناکەی،بەڵکوخۆت دەپاڕێیتەوە... ترکتۆر لەخزمەتتان دایە. ئیتر بەتووڕەیی بەجێم هێشتن..کاتێك ئاوڕم دایەوە بینیم گورج کەوتۆتە دوامان و بانگی کردم:راوەستە کاکە راوەستە.! توخوا..پێم بڵێ تۆ کوڕی کێیت ..؟ منیش ناوی ئەوسەرلقەم هێنا..گوتم من کوڕی ئەوم.

وەك ئاوی بەسەردا بکەی ئاوا سارد بۆوە،گوتی:ئێ دەوابڵێ..بۆ دەنگ ناکەی.؟ بانگی لەکوڕەکەی کرد کوڕم هەردوو تراکتۆرەکە پڕبکەوە لەهەوا،خۆتیش لەگەڵیان بچۆ کوڕەکە سەری سووڕمابوو،دوای چپەیەك ئەم باوکە چۆن رازی بوو..

گوتی رۆڵە هیچ مەپرسە،ئەگەر بزانی ئەمە کوڕی چ کافرێکە هیچ کێشەکێشێکی لەگەڵدا ناکەی،هەردووتراکتۆرەکەمان خستەئیش،لەوێوە رێگا نەبوو بۆ بانەمۆرد، دەبوو بچنەوە رووباری(شەرغە)و لەوێوەبۆ نێرگێن ئەوجار بگەڕێنەوە بۆ بانەمۆرد.. سەرپەرشتی ئەوئەرکەم بە(شەهید حەمەرێبان)و(فەرهەنگ) سپارد،خۆمیش دەستی مام سەیدم ماچکردو دوای گەردن ئازایی بەڕێ کەوتینەوە بۆگوندی بانەمۆرد. بۆشەوەکەی پێش بەڕێکەوتن سەرهەردووتراکتۆرەکەوناو هەردوو عارەبانەکان و سەرشیشە کانیشمانلەژن ومناڵ وپیر هەڵچنی بوو،لەبیرمە پیرەژنێك ئەوەندەمناڵ لەباوەشی دانیشتبوو،پێیەکانی سڕ بووبوون،هاواری کرد:..کامە قاچی منە..؟؟

لەكاتی بەڕێكەوتندا لەناو گوندەكەوە تەقەیەك كرا،كەسێك بانگی كرد:

هۆو ورەحمەتی خواتان لێبێت مەڕۆن..پیرەمێردێك وئافرەتێك بەجێماون، چاوەڕێمانكردن،كەگەیشتنەلامان تەماشامكردن،(خەدیجە)و(كریم رەشان)بوون، هەرچەند هەوڵیاندا جێگای پێیەكیشیان نەبووەوە.. بەناچاری بەنیوەی پشتێنەكەی من (مام كریم)مان لەكۆڵی كچەكەی شەتەك داو خوشكە( خەجیّ)مان لەپشتی شوفێری تراكتۆرەكەوە سواركرد و بەرە و دەوروبەری هەولێر بەڕێمان كردن. سێ چوار ڕۆژ لەبناری دێدەوان وسەربەستی(شەرغە)و شیو(قەمبەر)خۆمان راگرت. چەندجارێك جاشەكان لێمان نزیك كەوتنەوە...

- لە ڕۆژی 1988/5/8 چەندجاشێك لە گوندی سێگردكانەوەبەروشوێنەكانی ئێمە هاتنە پێشەوە،چەندین دەستڕێژ تەقەیان كرد،ئێمە وەڵامان نەدانەوە،پیاوێكی پیر خەڵكی گوندی(دەرماناو)بوو بەناوی(حەمەدەمین پیرۆز) لەبن كەپكەشاخێك دەبێت، كەگوێی لە تەقەكانیان دەبێت،خۆی پێ راناگیرێ و قوتەقوت دەكات،دەچنەسەری و تفەنگەكەی لێدەستێنن و ئازادی دەكەن،كەلێی دەپرسن ئەم ناوچەیە پێشمەرگەی لێ یە؟ پێیان ئەڵێ:بە پیرەمێردێكی وەك من دەوێرن،ئەگەر ئازان لێرە بەولاوە پڕی لەپێشمەرگەیە، فەرموون بڕۆن ئەوان چەك بكەن،بۆیە بەپەلە خۆیان خڕدەكەنەوەو دەگەڕێنەوە،زۆری پێ نەچوو(حەمەدەمین پیرۆز) بەهەناسكەبڕكێ گەیشتەوەلامان، بینیمان چەكەكەی پێنەماوە،دەستی كرد بەگریان و رووی كردەمن:

- ئاخرمن ئاخرشەڕم ئەگەر ئاخرشەڕنەبوومایە ناچووم لەوشوێنەبخەوم،من لەشێرن خەودابووم لەخەونداشوان بووم بینیم بزنێك لەنێری(تەگە)یەك دەپەڕێ.. خەونەكە لەخۆم هاتەدی جاشی خۆێڕی منیان چەك كرد،وەر ئیستا چەكێكم بدرێ شەرتە دەچم بەدوایاندا یاخۆم بەكوشت دەدەم یا تفەنگەكەمیان لێ دەسێنمەوە..

## ئابلوقەدرانی هەندێ لەکەسوکارم

هەندێ لەکەسوکارەکەم،یەکەم شەولەزێ پەڕێندرابوونەوە،بەلام هیچ هەواڵێکیان نەبوو، بریتی بوون لە مام ومامۆژنم (خەسوو وخەزوورم) و میمکم (رەعنا) و (محمدتۆفیق)ی هاوسەری ودوو بووکیان وهەشت منالیان..لەدوای دەرازبوونیان و گەیشتنیان بە(قەلاشەیتان) بەهۆی(دووگیانی)یەکێکێك لە بووکەکانیان، بڕیاردەدەن لەئەشکەوتێکدا لەدەم زێیەکە خۆیان بشارنەوە،بەوئومێدەی هەر چەندرۆژێکەو دوایی هێزەکانی رژێم دەگەڕێنەوە شوێنی خۆیان..لەبەر ئەوەی مام و مامۆژنی من کاك ئاسۆسوور ومنالەکانیش ئامۆزاو ئامۆزازامان بوون، ئێمە زۆر هەولماندەدا شەو بچین بەدوایاندا و دەرازیان بکەین..بەلام بەهۆی ئەوەی(قەلاشەیتان)شوێنێکی ستراتیژی بوو بۆ رژێم،کردبوویان بەسەنگەرومۆلگە..بەداخەوە بەرلەوەی ئێمە فریایان بکەوین،خۆیان رادەستکردبوو،سەرەك جاشێك لەسێبەری دارتوویەك دایان دەنێت و بەدیاریانەوە دەست دەکات ەگریان، بەتووڕەییەوە پێیان دەلێ:

بەخێر نەیەن....! بۆ ئێستا هاتن....؟ کە فەرمادەی عەسکەرییەکە لێرەیەو لەگەل ئەفسەری هەوالگری ئیوەیان بینی...تازە من هیچم پێ ناکرێ...

لەشکری ئەنفال لە(ئیڤا)یان باردەکەن و دەینگوازنەوە بۆکەمپی(تۆبزاوا)ی کەرکوك.

پاش شەش مانگ بەهۆی لێبووردنەوە (مام و مامۆژن)ی من و(مام ومامۆژنی) ئاسۆسووربەنیوەروح لە(نوگرەسەلمان) گەڕانەوە...ئەم ئازیزانیشمان لەبیابانەکانی خوارووی عێراق زیندەبەچال کرد:(خونچە محمودحاجی (ئامۆزای نووسەر)، خوناوجبارمحمد،رۆشنا جبارمحمد،هەناجبارمحمد سەردار جبارمحمد، سانیەمحمدرسول، کارزان عبدالرحمن محمد، کاروان عبدالرحمن محمد،رۆژان عبدالرحمن محمد،فەرمان عبدالرحمن محمد..)

## شێت بوونی بێستوون *

پێش نیوەڕۆبوو 1988/5/8 بوو،لەشیو(قەمبەر) خۆمان حەشاردابوو،لەپڕ بوو بە فڕکان فڕکان. وامانزانی دەورمانگیراوە،پێشمەرگەیەك لەدەستەکەی کاك(ئاسۆسوور) بەپەلە هات: فریاکەون..! فریاکەون..!

(بێستوون حمەقالە) شێت بووە،ئەگەر زوو فریای نەکەویت هەرموویان دەکوژێت.

پێش ئێمە کاروان دووبزی چووبوو،زۆر هەوڵی لەگەڵدا دابوو،سوودی نەبووبوو، منیش خۆم ـەست و بەپەلە ڕۆیشتم،خوا هەڵناگریٚ هەر کەچاوی بەمن کەوت ساردبووەوە،چەکەکەی ئەمنکردوبۆبەرپێم فڕێیدا،زۆربەکوڵ دەستی بەگریانکرد، خۆم لێی تورەکرد:ها کاکە خێرە واخۆت شێت کردووە.؟ بەدەم هەنسکەوە گوتی: .(بابەڕۆۆۆ برا ڕۆۆۆ چۆن شێت نابم ..مامۆستا ناهەقم مەگرە، لەمشەوانەدا لەبناری خاڵخاڵانەوە بە نێو هێزەکانی دوژمندا خۆم گەیاندە(رەندیخان)لەگوندی گۆپتەپە، شەوەکەی مانگەشەوبوو،لەبەر تریفەی مانگەشەوداهاوسەرەکەم ومناڵێکم وچەندین ژن ومناڵی دراوسێکانم بینی لەپاڵ رەزێکی هەڵکوڕوزاودا هەر هەموو باوەشیان بەیەکدیدا کردبوو،دەتگوت خەویان لێکەوتووە،چەند بانگم کردن..چەندپاڕامەوە.. چەند بەدیاریانەوە گریام..کەسێکیان وەڵامیان نەدامەوە..هەرهەموویان بەچەکی کیمیاوی شەهید کرابوون،کەچی ئەم هەڤاڵانە ئەڵێی نەبایان دیوە نەباران......

هیچ شەرم وحەیا ناکەن،هیچ حیسابێك بۆ دڵی من ناکەن.. گۆرانی ئەڵێن..)هەرچۆن بوودڵیم دایەوە.بەنەرمی باسی سەبروخۆڕاگری و شۆڕش وقوربانیدانی دێرسیم وهەڵەبجەم بۆکرد.. لەگەڵ هاوڕێیان ئاشتمکردنەوە،داوای لێبووردنیان لێکرد..چەکەکەم پێ دایەوە، هەرکەسە گەڕاینەوە شوێنەکانی خۆمان..

---

* ئەنفالی خاڵخالاٚن مەلاشاخی/ چاپی دووەم / ل 41

دواتر کاك بێستوون ئارام بووەوە خۆی هات بۆلام چەند هەواڵێکی شێخ بزێنی سەروو و قەڵاسێوکەی باسکرد،لەوانە مامە شێخ صدیق باوکی پێشمەرگەی دێرین (حەمەکۆزەبۆرەیی)لەرۆژی کیمیابارانی گۆپتەپە پەراگەندەی(کێوەچەرمەڵە)دەبێت، کەبەنەخۆشی دەیدۆزنەوە،دیبەنەکەلاوەکانی(تەکباسان)لەوێ بەتەنیا دەمێنێتەوە، گەرچی دواترچەندهاوولاتییەك دەگەنەسەری وهەندێك خواردن دەکەنەدەمیەوە، ئاوی دەدەنێ ..بەڵام بەداخەوە نۆشەوی دواتر لەتەمەنی 75 ساڵی دا گیان بەولاتی وێرانکراو دەسپێرێ.... دواتر سەگ ودرندە بەشێك لەلاشەکەی دەخۆن.

هەرلەورۆژانەداهاوولاتییەکی خەڵکی گوندی(مەهمەخان)لەنزیك تلیان تراکتۆرەکەی وەردەگەڕێ و بەهۆیەوە شەهید دەبێت...

## کشانەوەی بەشێك لەهێزەکانی رژێم

لە رۆژی 1988/5/9 لەقەمیشەلانێکی چڕی نێوان گوندی ئاومال و قەمبەر بووین، (عبدالرحمن محمدعمر)باوکی (حەمەرێبان)گەیشتەلامان،لەگەڵ خۆیدا پێداویستی دروستکردنی(کەڵەك)بۆپەڕینەوەلەزێی بچووك وەك(داروبزمارویەت وچەند چوپێکی شۆفەڵ)ی بۆمان هێنابوو،ئاگاداریشی کردینەوەکە هێزەکانی رژێم لە زۆربەی ناوچەکانی شوان وشێخ بزێنی کشاونەتەوە..ئیتر بەپەلە کەڵکەکەمان درووستکردو بردمانەسەر ئاوەکەو دەستمان کرد بەپەڕینەوە، بۆسنووری خۆمان،ئەو بارودۆخە ئومێدێکی بە ئێمەو هێزی پشتگیری بەخشییەوە، ئەو ناوچانەی خۆمان بۆئێمە زۆر گونجاوتربوو،چونکەبست بەستی،هەرچی بنکەوحەشارگەی نهێنی و ئەشکەوت و کونەکەمتیاروکۆنەبیر و کارێزوسەرچاوەی ئاو هەبوو.هەرهەمووی شارەزابووین، وردە وردە لەگەڵ ئەوبارودۆخەڕاهاتین،هەرچەند ئەوناوچەیە بۆرژێم ستراتیژی بوو، نزیك بوو لەکەرکوکەوە،بەڵام ئێمە لەخۆمان ڕادەبینی بۆماوەیەکی زۆر بە شێوەی پارتیزانی لەوشوێنانە بمێنینەوە،ئەوهەڤالانەی لەگەڵ مندا مابوونەوە متمانەم

پێیان بوو،بریتی بوون لە(رئووف حسن ابراهیم(مام رئووف)،محمدعبدالرحمن (حمەرێباز)سلیم محمدحاجی(سلیم حاجی)علی حاجی عومەر، خورشید قادرحسن (خوشەشەل) حکیم محمد حاجی،رحمان حاجی کریم، سلیمان مولود تولکی، علی حاجی عمرشەوگێڕی،وهاب حسن سەقزلی،چەتۆ سەقزلی،حمەڕەش کاکل(هەلگورد) صالح احمدحمەدەمین،بەکر عابدکاولەسواری،دکتۆرجاسم،حمەدەمین حاجی عەلی) دەستەکەی(لاوە)یش بریتی بوون لە:

(لاوەیابەمحمد،کاکۆعمرحەسۆ،ئەنوەرکوێخایابە، رحمان کوێخایابە، جبارمحمدیابە، إبراهیم محمدیابە،صباح عومەرحەسۆ،یاسین یابەمحمد)دەستەکەی(ئاسۆسوور)یش (قادرمحمدتۆفیق،جوادئەحمەد،صباح محمدتۆیق)بوون .

جگە لەوهاورێیانە، ئەم هەڤاڵانەیش هەریەکەوبەدەستەیەکەوە هاتنەوەسنوورەکە:

( عوسمان جمیل ، عەلی گەرمیانی، عومەر مەغریب (برای شەهید مەلائاراس ) صالح B.K.C، مستەفاشەوگێڕی، عمرمەرزیخەیی،مەلامیرزا، جمال حەمەدەمین، حاجی احمدبیرالك، عوسمانەسوورقایەباشی،کاروان عبدالله دوبزی، نامیق رسول (عەریف نامیق)،مام نووری قەرەسالم، زانا هادی، کاکە ئەحە، وەستا فخرالدین، سەید تالیب حسن قەباغی، علی گەرمیانی، و ....)

لە دوای داگیرکردنی ناوچەکەو وێران کردنی گوندەکان وسوتماککردنی تەڕو وشك پاش (7) رۆژ مانەوەلە(شەرغە) لەبناری دێدەوان، رۆژی 1988/5/11 گەڕاینەوە سەرزێی بچووك،چەمەکانی (ئاومالْ)..لەوێوە بە دووربین تەماشای گوند و شوێنی حەوانەوەی خۆمان کرد،بۆمان دەرکەوت کە هەرهەمووی وێرانکراوە..

شوێنی سەنگەرەکانی پێشوومان هەمووکرابوون بەمۆڵگەوبارەگای سوپا وجاش. لەگوندی شەوگێر چەندزرێپۆش وتانگ لەسەر گردی(حوسێن پاشا)و(گاقڕان)

سەنگەرلێدرابوو،لەبەرزایی(قەرەسالم)ەوەچاودێری ناوچەکەیان دەکرد. ماوەیەك لەقەمیشە لانەکانی هەردەی نێوان (ئاومال)و (قەمبەر) خۆمان حەشاردا..

- ڕۆژی 1988/5/20چەند پێشمەرگەی گەرمیان گەیشتنە لامان، نامەیەکی هەڤاڵ (عمرمەرزیخەیی)یان پێگەیاندم،کەهەواڵی چەندچالاکی تێدابوو:

**چالاکی یەکەم:**

پاشنیوەڕۆی 1988/5/7چەند جاشێك لە( ناحیەی شوان)ەوە پێشرەوی دەکەن بەرەو سنووری گوندی وێرانکراوی (حسن قەباغ)و لە هەڵەتەکانی (هەنارە) چەند پێشمەرگەیکی ئازاو (هێزی پشتگیری) لێیان دێنە دەست و تێکیان دەشکێنن، دوای کشانەوەی هێزەکەی دوژمن (3)جاش کە جاویان بە چەند گاوگۆل دەکەوێ، بە مەبەستی بەتالان بردنیان دووبارە دێنەخوارەوە..هەربۆیە دیسان پێشمەرگەکان لێیان دێنەوەدەست و یەکێکیان دەکوژن ودوانیش بریندار دەکەن..

**چالاکی دووەم:**

پاش نیوەڕۆی 5/9/ 1988 هەمان دەستە لە پارتیزانەکانی دوای ئەنفال لە نێوان گوندەکانی(عەمدۆن)و(کانی ڕەش) لە هەردەکانی(قەلاپەچێ) کەمین بۆ سەیارەیەکی (ئیڤا)ی سەربازی دادەنێنەوە... پاش شەڕێکی دووسەعاتی سەیارەکە تێکەشکێنن وشوفێرەکەی وسەربازێك دەکوژرێت و دووپێشمەرگەیش بەناوەکانی(عزیزمحمد)و (لقمان)بە سووکی بریندار دەبن.

**چالاکی سێیەم:**

ئێوارەی 1988/5/18 دەستەیەك لە دڵسۆزانی هێزی پشتگیری و پێشمەرگەکانی تیپی21ی کەرکوك بەفەرماندەیی(عمرمەرزیخەیی)لەنێوان گوندەکانی(مەرزیخە) و (عەمدۆن) بۆسەیەك دا دەنێنەوە،لەئەنجامدا(4) سەربازو (2) جاش دەکوژرێن لەم چالاکی یەدا هەڤاڵ (محمودعوسمان) ناسراو بە(خولە) بریندار دەبێت..

( بەداخەوە(خولە)ی برای شەهید عبدالرزاق لەراپەڕینەمەزنەکەی 1991 لە کاتی ڕزگارکردنی کەرکوك لە شۆڕاو شەهید بوو.)

## بەرەو خۆشناوەتی

ڕۆژی 13 5/1988 لەزێی بچووك پەڕینەوە وبە دەشتی کۆیەداو لەنزیك گوندی (گۆمەشین)ەوە ویستمان ئەوشەوە بپەڕینەوە،ئەوڕۆژە دووجاشی خۆفرۆش بەناوی (عیسا)و(موسا)وە فێڵیان لەچەند سەربازێکی هەڵاتووکردبوو، بەسواری گوێدرێژ چووبوونەلایان و دوکەسیان بەدیل گرتبووەك دیاری تەسلیمیان کردبوونەوە.

سەرلەئێوارە بەرەوجادەی (کۆیە - هەولێر) دەڕۆیشتین،تووشمان بوو بە تووشی چەند چەکدارێکەوە،خەریك بووتەقە لەیکتر بکەین،دواتر کەوتینە گفتووگۆ،باشبوو یەکترمان ناسییەوە،هاوڕێیانی(حیزبی شیوعی)بوون،کاك (کوێخاسەعیدتورکمانباغ) یشیان لەگەڵدابوو.

هەرلەوێ یەکمانگرتەوەو بۆشەوەکەی لە جادەکە پەڕینەوە،لەوەبەروە مۆڵگەیەکی جاش بەسەرگردێکی بەرزەوە بوو، زۆر زاڵبووبەسەر دەورووبەری خۆیدا،دەبووئێمە زۆر بەنەرمی وبێ خشپە ڕێ بکەین،لەسەرگردەکەوە جاشێك بەچرادەستی(لایت) ئیشارەی دەکرد،دڵنیابووین کەئاشکربووین،بۆیە لەنەدیوێکدا هەڵوەستەمان کرد، گوێمان لێ بوو جاشێك بانگی دەکردین:

(ئۆ هۆی کاکی ڕێبوار دەستەچەپ بگرن،پێشتان هەمووی ئەلغامە،کاکە ئێمە هەموومان کوردین،لەم وەزعە نارازی وبێزارین، فەرموو لادەن..!ئەگەر برسیتانە لەخزمەتتانادەبین....) ئێمە وەڵامێکمان نەدانەوە و درێژەمان بەڕۆیشتنەکەماندا، تا گەیشتینە سەرچیا .. لەخواروی کەلاوەکانی گوندی (قۆتەلیاس).

لە 1988/5/13 گەیشتینە بارەگاکانی (باواجی) حزبی سۆسیالیستی کوردستان کەلەنێوانی گوندەکانی(سێنان)و(سماقولی)سەنگەریان گرتبوو،ئازووقەوخواردنی

باشیان هەبوو،فرنێکی چاکیان دروستکردبوو،خواردنی باشیان بۆئامادەکردین، کاک کانەبی کریم ناسراوبە(دڵزار) ڕێزی گرتین وتالەویٚ بووین زۆرهاوکارمان بوو. هەر لەویٚ هەواڵی شەهیدبوونی(عبدالله خەرابەیی)و دوو هەڤاڵیمان پێگەیشت کە لەنزیك سەربازگەی تۆبزاوای کۆیە بەزیندوویی لەهەلیکۆپتەر فڕێدرابوونەخوارەوە. لە ڕۆژی 1988/5/14 کەوتینەرێ بەرەو(نازەنین، کونەفەلەوسە، چیای هەوریٚ) سەرکەوتن لەهەردووچیای ئاوەگرد و هەوریٚ زۆر شەکەت وماندووی کردبووین، برسییەتیش هێزی کەم کردبوویـنەوە، هەربۆیە پێش گەشتن بەچیوە،لەودیوی تووشی شوانێك بووین مێگەلێك بزنەمەرەزی دەلەوەڕان،لەگەڵی ڕێکەوتین، نێری (تەگە)یەکی سووری گەورەمان لیٚ کڕی،هەر لە سێبەری ئەوپیرەدارانە سەرمانبڕی و پەلپەلمانکردو بەپێی ژمارەی خۆمان کردمانە ئەوەندە بەشەوە،ئاگرمان کردەوە و شووڵە هەنارمان هێناو دەستمان کرد بەگۆشت برژاندن...ئامێك وەبەرماندا هاتەوە.

## نوکتەی شاخ

(دوای ڕاپەڕینی 1991 کە هاتینەوە هەولێر سەردانی حەمەڕێبازی خاڵۆزام کرد، کۆمەڵێك منالی چاوگەش لێمان کۆبوونەوە،منیش یەك یەك دەربارەی ناویان و منالی کێن پرسیارم لێکردن،کچێکی قنج هاتەبەردەمم گوتی :

. من ناوم هەوریٚ یە و کچی حەمەڕێبازم..

پرسیم کاك حەمەڕێباز ئەوە چۆنە ناوت لێناوە هەوریٚ..؟

یەکسەر وەڵامی دامەوە : ئەی نەبوو لەچیای هەوریٚ تەگەمانخوارد...

بۆیادی ئەو ڕۆژەناوم لیٚ نا هەوریٚ..)

. ڕۆژی 1988/5/14 لەگوندی (خەتیٚ) چووینە بارەگاکەی هەڤاڵ(عبدالرزاق) پێشوازییەکی گەرمی لێکردین. داوامانلێکرد ئەگەر پێویست دەکات ئامادەین لەیەکێك لەبەرەکانی شەڕ بەشداری بکەین..بەڵام بەڕێزیان گوتی:نەخێر ئێوە زۆر

ماندوون،پێویستتان بە پشوودان وحەسانەوە هەیە، لێرە لای ئێمە جەژن بکەن و بۆدوای جەژن وادەکەم بەرەزامەندی وبڕیاری فەرماندەیی **گشتی بتان نێرینەوە بۆسنووری کەرکوك..)**

**ئیترلەسەر رای ئەو ئێمەیش بڕیاری مانەوەماندا، بۆ سەردان ودیدەنی هاوڕێیانمان لەتیپی21ی کەرکوك،کەوتینەڕێ بەرەو(بێراوا)و(شیرێ) پاشنیوەڕۆ بەهەڤاڵکانمان شادبوینەوە. شەو لای ئەوانماینەوە..**

رۆژی1988/5/16 پیرەمێردێك **هاتەلامان،گوتی ناکرێ راستی لەئێوەبشارینەوە، جەنابی (میر)جوابی بۆناردووین ناوچەکە چۆل بکەین،داوای لێکردووین خۆمان تەسلیم بکەینەوە،هەربۆیە گومانمان لادرووست بوو کەڕژێم هاوشێوەی گۆپتەپە هێرشێکی کیمیاوی بکاتە سەریەکێك لەگوندەکانی دۆڵی بالیسان،بەیانی زوو هەر پێشمەرگەونانی دووژەممان هەڵگرت وکەوتینەرێ بەرەوشاخی(مۆتە)و(پانی سەر) ئەمبەر وئەوبەری رێگاکە هەمووی گوڵەباخ بوو،کاك رەنجەی عومەرصدیق و کاك عومەرحەساری گوتیان هەنا ماوین وشەهید نەبووین،وەرە با لەم شوێنە چەند** وێنەیەك بۆیادگاری بگرین.



دوای عەسر لەشاخەکان هاتینەخوارەوە، **هەتا بگەڕێینەوە بۆگوندی (شیرێ) لەپڕ** شەش فڕۆکەی جۆری (سیخۆی) هاتنە ئاسانی **ناوچەکە،بۆ زانینی رەوتی هەوا** چەند پارچە لەپدۆرەیەکیان فڕێدایە خوارەوە



# کیمیابارنکردنی گوندی وەریّ

لەگەلّ هەڤالەکانم لەگوندەی (شیریّ) نیوەرۆپێکەوە سا‌وەرەسوورەیەکمان خوارد. پاشنیوەڕۆ لەناوگوندەکە دەرچووین بڕیارماندا کە بچینە بەرزاییەکانی باشووری گوندەکە،ئەگەر چەکی کیمیاوی بەکارهێنا (با) بەرەو هەرلایەك بوو،ئێمەخۆمان بەلاکەی تردا بڕۆین تا لەدووکەڵی بۆمبەکان دووربکەوینەوەو گیانمان پارێزراوبێ. لەنیوەڕۆتا ئیوارە بەشاخەکانی (مۆتە)و(پانیسەر)ەوەبووین،خۆر لەئاسۆی (هەوریّ) بەرەو ئاوابوون دەچوو،فڕۆکەکانی رژێم پەیدابوون، گوندی (وەریّ)یان کردەئامانج. بێتەلەکان لەسەر شاخەبەرزەکانەوە پەیامیان گەیشت :

( توانا توانا..! فڕۆکەکان گوندی (وەریّ)یان کیمیاباران کردووە..بۆئاگاداریتان..)

بۆشەوکەی هەواڵەکان واگەیشت کە(نەخۆشخانەی شۆڕش)لەگوندی خەتێ پڕبووە لە بریندااری چەکی کیمیاوی و(35) هاوولاتی بیّ تاوانیش هەرلەویّ شەهید بوون. ئەگەر هەولّ وهیمەتی (دکتۆر زریان) و تیمەپزیشکی یەکەی یەکێتی نەبووایە زیانی گیانی زۆرلەوەی روویدا پتر دەبوو..

---

* گوندی وەریّ، دەکەوێتە ناوچەی خۆشناوەتی و سەر بەناحیەی بێتواتەی قەزای رانیە یە، ـ (١٧٠)کم لەباکووری خۆرئاوای سلێمانییەوە دوورە،خەلکەکەی بەکاری کشتوکاڵی و ئاژەلداریەوە خەریکن و پێش تەختکردن و کیمیابارانکردن نزیکەی ٥١ ماڵی لێبوو، بەڵام ئێستا هەشت ماڵی لێیە.

| ژ | ناوی سیانی | بوون |
|---|---|---|
| 1 | بلال سلیمان قادر | 1948 |
| 2 | عائشة قادر احمد | 1948 |
| 3 | نەخشین جلال سلیمان | 1948 |
| 4 | محمد جلال سلیمان | 1981 |
| 5 | سەفین جلال سلیمان | 1982 |
| 6 | سلیمان جلال سلیمان | 1985 |
| 7 | حمد یة طة سلیمان | 1973 |
| 8 | حمد امین مصطفى حسن | 1953 |
| 9 | ئەمین مصطفى حسن | 1961 |
| 10 | جمیل حەمە امین اسماعیل | 1978 |
| 11 | رشید حەمە امین اسماعیل | 1980 |
| 12 | پیرۆز حەمە امین اسماعیل | 1982 |
| 13 | نەورۆز حەمە امین اسماعیل | 1984 |
| 14 | عائشة قادر محمد | 1933 |
| 15 | صابر محمد حسن | 1955 |
| 16 | ناهیدة احمد لطیف | 1955 |
| 17 | عزیز صابر حمد | 1984 |
| 18 | خالد سلیمان قادر | 1967 |
| 19 | لیلى مصطفى خضر | 1980 |
| 20 | أسكندر مصطفى خضر | 1982 |
| 21 | گەلاوێژ مصطفى خضر | 1985 |
| 22 | مدینة محمد خضر | 1985 |
| 23 | محمد طه مولود | 1972 |
| 24 | جمال طه مولود | 1974 |
| 25 | بنار طه مولود | 1983 |
| 26 | عائشة خضر یوسف | 1948 |
| 27 | فخریة فتاح خضر | 1985 |
| 28 | خدیجة قادر مصطفى | 1953 |
| 29 | واحید احمد بابکر | 1965 |
| 30 | هەتاو واحد احمد | 1986 |
| 31 | یوسف کریم حسن | 1986 |
| 32 | عاصمة خضر شیخ | 1955 |
| 33 | امنه محمد خضر | 1974 |
| 34 | امنه احمد رسول | 1985 |
| 35 | ابراهیم احمد علي | 1968 |

*سەرچاوە: ئەنفالی خاڵخاڵان / مەلاشاخی لیستی ناوی شەهیدانی کیمیابارانی گوندی وەری 5/17/ 1988

## جەژنی رەمەزان لەسێبەری ئەنفالدا

پێشتر چەند جەژنێکمان بەناخۆشی بەڕێ کردبوو، ئەوجەژنەیشمان بە دڵتەنگی و دوور لەکەسوکارمان وزێدی باوباپیران لە ئەشکەوتەکانی بناری چیا بەڕێ کرد، ماڵ وماڵ وخزم وکەسوکارەکانیشمان یان لە نێو تەلبەندەکانی(تۆبزاوا) بەندبوون یان لەسایە و سێبەری خەڵکدا لە کۆمەڵگازۆرەملێکانی دەوروبەری هەولێر ژیانی ئاوارەیی وسەرگەردانییان لە پەنای خێرەومەنداندا بەخەم وپەژارەی کارەساتەکانی ئەنفالەوە بەڕێ دەکرد..

دوای جەژن چووینەوە(خەتێ) سەردانی کاک عبدالرزاقمان کردەوە،پێش گەیشتنی ئێمە، رژێم بە تۆپی دوورهاوێژ بارەگاکانیانی تۆپباران کردبوو،پاش گفتوگۆ دەربارەی خەباتی پارتیزانی وبەرگری ومانەوە،زۆر رێنمایی کردین،لەگەڵ دوو دەستە لە هێزی پشتگیری(سێگردکان)و(ئۆمەرگومەت)بەرەودەشتی کۆیەوناوچەی شێخ بزێنی بەڕێ کەوتینەوە..

ـ لە 1988/5/26 لەگوندی (سماقە)ی دەشتی کۆیە خواحافیزیمان لە خزمانی ئۆمەرگومەت وسێگردکان وسێکانی کرد،ئەوان بەرەو (کۆتانەکان) و ئێمەش بەرەو قەمیشەڵانەکانی(ئاوماڵ) بەرێ کەوتین..

### هەواڵەکانی بەری کەرکوک

شەوچەندبرادەرێك کەزانبیان گەڕاوەتینەوە،هاتنەلامان،باسی سەفەرکەمان بۆکردن، ئەوانیش هەواڵی ناوچەکانی شوان وشێخ بزێنی یان بۆ ئێمە باسکرد،گوتیان:

1. کاك شۆڕش قەرەهەنجیری وکاك احمدکرێکار وکاك علی چیمەنی و کاك تاریق گۆگجەیی وکاك ستارقەمەری و کاك مەلاشێخە و چەند هەڤاڵێکی تر لە ماسقەلان و چەمەکانی گورگان و هەیبە وساتی.. زۆر بەناخۆشی ژیان دەگوزەرێنن وماونەتەوە.

2ـ هاوولاتی(عزت حمەرەش تەها)خەڵکی(کارێزە)ی خاڵخالان لەکاتی گەڕانەوەی لە (چەمچەماڵ) ەوە بۆگوندەکەی خۆیان بەنیازی کۆکردنەوەی پاشماوەی ماڵەکەی. لەنزیك گوندی فەقێ میرزا.. دوو هەلیکۆپتەری لێ پەیدا دەبن،دوای ئەوەی دەزانن

کەچەکی پێ نییە،بۆی دەنیشنەوەو باڵبەستی دەکەن ولەگەڵ خۆیان دەیبەن و ئەنفالی دەکەن،تائێستا چارەنووسی نادیارە.

## هەڕەشەی علی کیمیاوی

دوای پەلاماری ئەنفالی چوار تەنیا کەلاوەکۆنێکیش لەبەری کەرکوك نەمابوو تا ئێمە تیابحەوێینەوە. ڕۆژی 1988/5/26علی کیمیاوی لەکۆبوونەوەیەکدا گوتبووی:

(تەنانەت نابێ یەك خانووش لەوناوچانە بمێنێ،خۆم چاودێری ئەوکارە دەکەم، ئەگەر لەسنووری هەر گوندێك تاقەخانوویەك ببینم نەڕوخابێ ..هەرخۆم دەزانم چی لەفەرماندەولیپرسراوی ئەوشوێنەدەکەم،خۆم ئەمەم بەموستەشارەکان ڕاگەیاندووە، ڕەنگەبڵێن ئێمەگوندەکانمان خۆشدەوێ. نامانەوەێ چۆلیان بکەین، پێم گوتن من ناکرێ گوندەکانی ئێوە بهێڵمەوە..ئەگەر سەرپێچی هەبێ ئەوا بەچەکی کیمیاوی پەلاماریان دەدەم بەوەش خۆتان وماڵ ومناڵکانتان تیدەچن....)

- لە 1988 . 6 . 1 دا ساڵیادی دامەزراندنی(ی.ن.ك)بوو، نزیکەی حەفتەیەك دەبوو لەنێو کەندر وقەمیشەلانی نێوان گوندەکانی(ئاومالّ . قەمبەر) خۆمان حەشاردابوو. ئەوڕۆژە وەك ساڵانی پێشوو نەمانتوانی بە وتاروئاهەنگ وچالاکی هونەری یادەکە پیرۆزبکەین،تەنیا ئەوەنەبێت بەکۆبوونەوەیەك وچەندین ئامۆژگاری دەربارەی خۆڕاگری و بەرەنگاری ودوورکەوتنەوە لەخیانەت و خوێندنەوەی چەند شیعرێکی مقاوەمەت فەرامۆشی خۆمان دایەوە..

ئەوهەڤاڵانەی سەربە تیپەکانی 86ی دەشتی هەولێر و87ی قەرچووغ بوون،وەك ئێمەنەبوون،سەیارەی شۆڕشیان لەبەردست بوو،ئێواران سەیارەکانیان قوڕدەدا بۆئەوەی فڕۆکەکان نەیانبینن،بەرەو دەوروبەری هەولێر شۆڕ دەبووینەوە،جاری واهەبوو هەندێ لەهەڤاڵان شەو وڕۆژێك لای خێزان وخزم وکەسوکاریان دەمانەوەو دوای پشوودان بەرە بەیان بەرەو بناری(دێدەوان) و سەربەستی شەرغە دەگەڕانەوە.

# مانگی حوزەیران و
# چەند هەواڵێکی ناخۆش

هەرچەند رۆژانی رووداوەکان بەوردی لەبەردەستدا نەماوون، بەڵام دڵنیام لە نیوەی یەکەمی مانگی حوزەیران روویاندا:

### 1 ـ ماسقەلان

لەهەردەکانی نێوان هەردووگوندی (گۆلکەمردوو . مام ڕەش)چەند هەلیکۆپتەریك بەنزمی دەکەونە کێومالکردن وگەڕان، لەرۆژهەڵاتی مام رەش ولە( چەمی مێوەکان) چەند پێشمەرگەیەکی هێزی یشتگیری دەدۆزنەوە وهێزەکانی کۆماندۆ ومەفرەزە تایبەتییەکانی جاش بۆیان دادەبەزنەخوارێ و گەمارۆیان دەدەن،دوای شەڕێکی دەستەویاخە ئەم سێ هەڤاڵە فیشەکیان پێنامێنی و بەبریندارى بەدیلی دەکەونە دەست دوژمن:

1 . سەردار جەلال محمد

2 . ئازاد جەبار محمد

3 . حەمەشکور جەبار محمد

کەسی سێیەمیان دوای 3مانگ بەرلێبووردن دەکەوێت وئازاددەکرێ،دووهەڤاڵەکەی تریشی بێسەروشوێنکران.ئەو دووکەسەبراوئامۆزای شەهید(کیف الدين جبارمحمد) بوون کە لە(کارەساتی هەکاری)شەهیدبووبوو،سێیەمیش(حەمەشکورجەبارمحمد) لەراپەرینەمەزنەکەی 1991 لەرزگارکردنی شاری کەرکوك شەهیدبوو.



# مانەی سەرکەوت و هاوڕێکانی

سەرکەوت محمدنجیب(سەرکەوتی ئاسایش)پێشمەرگەی تیپی21ی کەرکوک بوو، زۆر نەبوو برینەکانی چاك بووبوونەوە، بەکەسوکارەوە لەگوندی (عەمدۆن) دەژیان، دوابەدوای هێرشەکانی ئەنفالی چوارلەگەڵ دەستەیەك پێشمەرگەوهێزی پشتگیری و چەند ژن ومناڵێك .لەزێی بچووك دەپەڕنەوە، رووله هەڵەتەکانی سێگردکان دەکەن، چەندرۆژێك بەناخۆشی دەژین ئەوبارودۆخەبۆپیروژن ومناڵکان زۆر ناخۆش دەبێت. دواجار کاك(محمدنجیب)ی باوکی کاك سەرکەوت بڕیار دەدات،کە ئەو ژن ومناڵانە بە نێو سەربازگە و مۆڵگاکاندا، بەلاڕێکان دا بباتەوە بۆناوشارۆچکەی (تەقتەق)و لەشالاوەکانی ئەنفال رزگاریان بکات.

خێزانی خۆی وعومەرمحمودی عەمدۆن وحاجی علی دووبز وچەندخانەوادەی تر ئامادەدەکات وتاریکەشەوێك بەڕێدەکەون وبەرێی هات ونەهاتدا دەربازیان دەکات.

ئەم هەڤاڵانەیش خەمیان سووکتر دەبێت و لەسەنگەری بەرگریدا دەمێننەوە:

(سەرکەوت محمدنجیب، قاسم محمدعلی (قاسمەرەش) عبدالباری (شاهۆ) شەماڵ، خەلیل سەیدقادر.مامۆستاسەلام،سەفەرمحمدنجیب،علی برنجە،خلیل حاجی علی، محمدجمیل، عبدالرحمن دووبزی، سیروان محمدسعید، حمیدعمر، تەهاعمرمحمود،

**محمدعمرمحمود، محمودعمرمحمود. یاسین عمرمحمود، احمدعمرمحمودعەمدۆنی، هاوکارحاجی علی،دەربازحاجی علی.صدرالدین حاجی علی دووبزی،(جاسەلات) .**

**دوابە دوای کشانەوەی بەشێکی زۆر لە هێزەکانی رژێم و ئاسانتربوونی هاتووچۆ، لەمەڵەتەکانەوە دادەبەزن بۆ چەمەکانی سێگردکان و عەمدۆن،کاك علی سێکانی و سەفەرمحمدنجیب (کەلەك)ێکی زۆر باش دروستدەکەن،هەم بۆخۆیان و هەم بۆ پەڕاندنەوەی پێشمەرگەکانی کەرکوك وگەرمیان..**

**شەوی 19/18ـ 6 ـ 1988 دەستەیەك لەپێشمەرگەی سنووری شوان دەگەنەلایان. کە ( 37 ) پارتیزان دەبن،لەوانەی ناوەکانیان زانراوە:**

**احمدکرێکار،شۆڕش قەرەهەنجیری.سەرکەوت گوڵمکەوە،وهاب قەرەهەنجیری،ئازاد، عمردوحێلە،جوامێردوحێلەیی،عمردانەسۆفی،مەلاشێخە،مەلاویسی،علی چیمەنی، خەلیل مامڕەشی،رەمەزان چیمەنی،صباح کەرکوکی،حەمەفەرەنسی، شێرکۆ، رەمەزان، نەوزادچیمەنی، رفعەت بیبانی(رەفعەتەسوور)....**

**دووڕۆژ لەناوچەی شێخ بزێنی دەمێننەوە،خۆیان دەشۆرن،پشوویەکی باش دەدەن.**

**ـ رۆژی 21/20 ـ 6 ـ 1988 بەچاوساغی(سیدخلیل سیدقادر)وجاسم صالح ناسراوبە (جاسەلات) بەرەو مەلەبەندی 3ی هەولێر بەڕێ دەکەون***

**ـ هەرلە گوندی (عەمدۆن) مام شکۆر کەپیاوێکی بەتەمەنی گوندەکەو خانەوادەیەکی دڵسۆزی شۆڕش وکوردایەتی دەبن،بۆ ماوەی چەندمانگ بەوتەمەنەوە خۆڕادەگرێ. دواتر بەهەوڵ و هیمەتی (مەلا جەوهەر)ی کوڕی دەگەینرێتەوە شار و دەربازدەکرێ.**

---

*** سەرچاوە: چاوپێکەوتنێکی پێشمەرگەوپارتیزان(سەرکەوتی ئاسایش)**



## بیرەوەری پێشمەرگەیەك
## عاسی حوسێن مەحموود

بەر لە کیمیابارانی گوندەکانی (گۆپتەپە)و(عەسکەر)لەقەڵاسێوکە وهێرشی ئەنفالی چوار،ناوچە ئازادکراوەکانی ژێردەسەڵاتی شۆڕش،بووبن بەشوێنی حەوانەوە داڵدەی خێزان و کەسوکاری پێشمەرگە و سەربازە هەڵاتووەکانی جەنگ، هێرشی ئەنفال تەنیامالی خانەخوێییان وێران نەکرد،ئەوانیش هێلانەوێران بوون....

(گردخەبەر)یەکێك بوولەوگوندانەی دەیان خانەوادەی لەوجۆرەی تێدا حەوابووەوە، ئەم گوندەمیوانپەروەرو فیداکارەپترلە200هاوڵاتی بەرشاڵاوەکەکەوتن ولەدەشت و بیابانەکانی خوارووی عێراق کۆمەڵکوژکران.

پێشمەرگەی دێرین(عاسی حوسێن محموود) لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا لەتوێی کتێبێکی چیرۆکئامێزادا ئەوتراژیدیایانەی یاداشت کردووە:

کاتێ کە گۆپتەپە وعەسکەرکیمیاباران دەکرێن (مام حسێن محمود) و هاوسەرەکەی (تەنکەمستەفا نادر)و(پەیمان)ی کچیان وکوڕەکانی(محمدحسێن)و(عاسی حسێن)و (اسماعیل حسێن) ومالی میم قودرەت (قودرت سوڵتان عەبجولا) دایکی هەڤاڵ (رفعت عبدالله)خۆی و(رەمزی عبدالله)و(حاکم شەوکت)ی کوڕی و هاوسەرەکەی ودووکچی)و مالی حسێن نافیز(حوسێن هەیبەیی)خۆی و(سەوزە)ی هاوسەری وچوارکچی، مالی مکائیل مستەفا موراد (هاوڕێ شەماڵ) خۆی وهاوسەرەکەی و

(ئازاد گوڵچی) ماڵی ئازاد جەوهر (ئارام) خۆی وخاتوو (ڕێواس) ی هاوسەری، (دکتۆر جمال)خۆی و(زینب)ی خێزانی مناڵێکی بچکۆلە، ماڵی (صابیر عوبید)خۆی هاوسەرەکەی ..چەندین ماڵێکی تر.
- شەوی 4/3 - 5 -1988 ئەم خانەوادانە هەمووپێکەوە لەبەرئاوایی کۆدەبنەوە چۆن خۆیان دەربازبکەن ..بەرەبەیان حاکم شەوکەت و عاسی حسێن بەماتۆڕ دەچن بەرەو(گۆپتەپە) تا هەواڵێکی هاوڕێیان و خەڵکەکەی بزانن ..
پێش خۆرهەڵات بەکوڵی غەم و خەفەتەوە دەگەڕێنەوە ..ژن ومناڵە کان دەگوازنەوە بۆبناری خاڵخاڵان وخۆشیان ئەوانەی پێشمەرگەبوون، ئەوانەی چەکیان پێ دەبێ دەچنەسەنگەرقایمەکانی نێوان گوندەکانی (قەسرۆك)و (قەمیشە)..بەنیازی بەرگری لەشالاوکە ئەوڕۆژە لەوبەری زێ بەرانبەریان لە پشتی(موخەڕەس) و (مەلازیاد) شەڕێکی گەورە لەنێوان پێشمەرگەو ئەنفالچییەکان تائێوارە درێژەی دەبێت، بەبەرچاویانەوە گوندەکان دەسوتێنرێت، سوپاوجاش وکۆپتەرەکەن چەندجارێك لێیان نزیکدەکەونەوە، بەلام خۆڕادەگرن و خۆیان تووشی شەڕناکەن..
سەرلەئێوارە دەگەڕێنەوە لای ژن ومناڵەکان ودەیانگوازنەوە بۆ دەرباز لەبناری خاڵخاڵان دەبینن ئەوبنارە بەسەدان خانەوادە لە بێشەو ودۆڵ و قەمیشەلانەکاندا خۆیان حەشارداوە ...لەبەرزاییەکانەوە بە دووربین دەبینن کە چۆن شۆفەلەکان ماڵ بەماڵی گوندی چەردخەبەروێران دەکەن،چەندرۆژێك ئاوا بەناخۆشی دەەگوزەرێ، ئێوارانێك جاشەکان هەواڵ دەنێرن بۆ ئەوخەڵکە، دڵنیایان دەکەنەوە کەهێزێکی زۆری کۆماندۆ هاتوون سبەی هێرش دەکەن بۆ ڕاپێچدانی ئەو خەڵکە ..
ئەوڕۆژە خەڵکێکی زۆر خۆیان ڕادەست دەکەنەوەو سواری ئیڤای سەربازی دەکرێن ودەگوازرێنەوە بۆ چارەنووسێکی نادیار .. ئەم خانەوادانە خۆیان کۆدەکەنەوەو دەچنە شوێنێك لەنزیك گوندی (دار ئەختیار) لەوێ خۆیان حەشار دەدەن. بۆبەیانی

هێزەکانی ئەنفال لە هەر چوارلاوە هێرش دەکەن بۆسەر ئەوخەڵکە بێتاوانانەی لە بابەرووشە و هەنجیرەزەرد و دەرباز ی بناری خاڵخالان خۆیان حەشاردابوو... هەرهەموویان دەگرن ورایپێچیان دەکەن..بۆ سەرلە ئێوارەکەی کاک شەوکەت و عاسی حسێن و سابیرعوبێدرەحمان و هاورێکانیان کۆدەبنەوەو بیر لەوەدەکەنەوە هەرچۆنێك بێت خۆیان و ژن ومناڵەکان لەنێوبازنەی هێرشەکە دووربخەنەوە ..

ئەوشەوە لە لەپشتی دارئەختیار و(گەڵباخ)ەوە زۆر بەزەحمەت خۆیان لەوگەمارۆیە رزگار دەکەن و لە یەکێك لەرەزو چەمەکانی نێوان تورکمان باخ و دووشیوان حەشاردەدەن. یەك دوو ڕۆژی تێدا دەحەوێنەوە، پاش نیوەڕوانێك دەیانەوێ لەچەمەکە خۆیان بشۆرن و ساوەرسوورەیەك بۆ خواردن ئامادەبکەن..لەپڕ لەنزیك خۆیانەوە گوێیان لەهاوار هاوارێك دەبێت: هۆی خەڵکینە خۆتان بشارنەوە دوژمن وا بەرەو ئێرە دێت. بەپەلەپروزێ خۆ لەبەردەکەنەوەو پەلاماری چەکەکانیان دەدەن، لەنزیکەوە گوێیان لە دەنگی ماشێنی سەربازی دەبێت،بەپەلە ژن ومناڵەکان خۆیان ون دەکەن، پیاوەکان فریای گەڕانەوە ناکەون،لەناو چەندئاودرێك سەنگەر دەگرن.. لەپڕ سەربازێکی بێچەك دێتە سەرگردکەی دیار سەریان،ئەوانیش دەوری دەگرن و داوای خۆبەدەستەوەدانی بۆیان دەردەکەوێت چەند جاشێکی بردووە بۆخاڵخالان و لەگەڕانەوەدا ڕێی هەڵەکردووە،بۆئەوەی تائێوارە ئاشکرانەبن، بەخۆی سەیارەکەوە دەیبەنە ناو چەمەکەوە ولەوێ حەشاریان دەدەن،لەورۆژە رەشەشدا کوردبیری لەتۆڵە نەکردۆتەوە. نەیان ویستووە دیل بکوژن..هەر بۆیە مام حسێن پەنای دەدا.. بۆشەوەکەی بە شارەزایی (حسێن هەیبەیی) لەنێوانی (تەپەکوڕە)و(خدرشیرین)ەوە بەرەو بان شوان سەردەکەون و لەوێ بەرێکەوت پیاوێك بەناوی (کوێخامەدحەت)یان تووش دەبێت،وەك مرۆڤێکی چاك دەبێتە فریشتە بۆدەربازکردنی ژن ومناڵەکانیان. بەرەبەیانێك لەئاستی گوندی (قەفار)ەوە دەیانباتە سەرجادەی (شوان ـ کەرکوك) و

بەهاوکاری جاشەکانی شوان سواری ئوتومبێلیان دەکەن وبەسەلامەتی دەگەنەوە گەرمکی رەحیماوا....

بۆنیوارە لە دەربازبوونی ژن ومناڵەکان دڵنیادەبنەوە،بەرەو خاڵخالان دەگەڕێنەوە، دەچنەوە شوێنی جارانی خۆیان. کەپشتی گوندی (قەسرۆك) دەبێ،دوای ئەوە دەبینن ناوچەکە بەسەربازگەو مۆڵگەی جاشان کۆنترۆڵکراوە..هیچ ئومێدێکی ژیان لەوسنوورە بەدی ناکەن دەسووڕێنەوە بۆ دەوروبەری مۆردخوادە و ئاوبارە، لەوێ تووشی مامۆستا مەلاعەبدولرحمانی ئاوبارەو کوڕەکانی دەبن ...

بەوشێوەیەماوەیەکی زۆر لەنێوان خاڵخالان وکێوەچەرمەڵە بەپارتیزانی دەمێننەوە، لە کۆتاییدا حاکم شەوکەت دەچێتە لای پارتیزانەکانی (تیپی 25ی خاڵخالان) و لەشەڕێکدا لەگوندی(پەلکەڕەش) شەهید دەبێت و ئەوانی تریش پەرتەوازە دەبن، کاك (عاسی حوسێن)ی پێشمەرگە ونووسەر و پارتیزانیش،لە مانگی تەمووزدا روو دەکاتە خۆشناوەتی و ماوەیەك لەگەڵ هەڤاڵەکانی کەرکوك لەوسنوورە لەسەنگەری بەرگریدا درێژە بەخەبات دەدات،دواجار کەمەڵبەندی 3 بڕیاری گەنم گردوجۆبلاو دەدات..کاك عاسیش دەنێرێت بەشوێن کەسوکاری دا، دێنە دێی (گولان) و هەر لەوێ لە بن هەنارەکاندا لەگەڵ خۆشەویستەکەی بڕیاری هاوسەرگیری دەدەن و لەگەڵ دەیان خێزانی تردا بەرەو دۆڵەڕەقەو بناری قەندیل و سەرسنوور کۆچ دەکەن و لە خیوەتگای (دێڵزێ) لەخیوەتێکی بچووکدا لەگەڵ دەزگیرانەکەی (مرواری محمد احمد) پەیمانی هەتا هەتایی واژۆ دەکەن.

سەرچاوە: بیرەوەری پێشمەرگەیەك عاسی حوسێن مەحموود / چاپی یەکەم 2015

# نووسەرو پارتیزانی دوای ئەنفال عاسی حوسێن



## یادی هاوسەرگیری دەکاتەوە.*

نووسەر وپیشمەرگە و پارتیزانی دوای ئەنفال (عاسی حوسێن) لەساڵیادی هاوسەرگیری دا بەم چەند دێڕە یادەکە پیرۆزدەکات:

لە 16 / 8 / 1988 لەگوندی( گوڵان)ی مقدس. لە دۆڵی شاورێ، لەسەخترین ڕۆژگارەکانی ژیان و لەکۆتایی ڕۆژەکانی انفالی شووم و بەدناو لەگەڵ مهرەبان ترین و نەرم ونباترین خاتون ژیانی هاوسەریمان پێك هێنا.

ئەم 31 ساڵەی ژیانمان پڕبوە لە هەوراز و نشێوو، لە نەبونی و لە سەختی، لە تاڵی و لەشرینی. بەڵام ئەوەی وەك بەردێکی قورس لە شوێن خۆی ماوەتەوە و هیچ ڕەشەبایەك نەی لەقاندوە خۆشەویستی نێوانمان بوە، ئێمە پێکەوە هەموو ڕۆژە سەختەکانمان تی پەڕاند، ئێستا خاوەنی منالْ و نەوەی خۆمانین.

بەهیوام ژیانی هەموان پڕبێ لە خۆشی و کامەرانی.

* جگە لە کاك عاسی حـ. شەهید (سەرکەوتەرەش) و (مام ئاراس) یش هەر لەوێ هاوسەرگیریانکرد.

### شەهید کردنی دوو پارتیزان

## لە ناوچەی شـــوان

1. هەرلەوڕۆژانەداهەواڵمان پێگەیشت کەپێشمەرگەی ئازای تیپی21ی کەرکوک (حەیدەرقادر) لەگوندێکی ناوچەی شوان یەکێك لەهاوڕێکانی خۆی خیانەتی لێ دەکات ولەکاتێکدا کە خەریکی هەویرشێلان دەبێت تا بیکات بەناوساجی بۆ هەڤاڵەکانی،زۆر نامەردانە لەپشتەوە شەهیدی دەکات و خۆی رادەستی سەرەك جاش تەحسین شاوەیس دەکاتەوە..

2 ـ هەر لەو ناوچەیە جەکدارێك بەناوی (جمال کریم باوە)وە پێشمەرگەیکی پارتیزان بەناوی خالیدناسراو بە(کاروان)لەخەودا سەردەبڕێت وسەرەکەی بەدیاری دەباتەوەبۆسەرەك جاش(تحسین شاوەیس).

## شەهید بوونی فەرماندەی کەرت عەلی پونگینە

پاشنیوەڕۆی 1988/6/10 بوو،دەمەوئێوارەیەکی تەپ وتۆزاوی وپڕمێشوولەبوو، هەڤاڵ کاك(عوسمان قابەباشی)بەخۆی وپیکابەشۆڤێرلێتەکەیەوە گەیشتەلامان، داوای کرد من وکاك (ئاسۆسوور) و چەند هەڤاڵێك لەگەڵ ئەودا بچین بۆ بنەسەراوە، دوومەبەستی سەرکی هەبوو:

1 . بتوانین کەسووکارکانمان ببینین.

2 . هەندی خۆراك وپێویستی رۆژانەی ژیان دابین بکەین..

عەسرەکەی بەرێکەوتین،بۆسەعات 6ی ئێوارە گەیشتینە گوندی(کانی بزرە) کەئێمە گەیشتین ئەم هەڤالانە پێش ئێمە گەیشتبوونە ئەوجێیە:

( علی پونگینە، فاقەمەحمووری، عوسمان جمیل، کەریمەڕەش، نووری قادر، محمدحسین، سمکۆلباس، شازاد دارەتوویی)و کوڕێکی گەنج بەناوی(دەوڵەت).. لەپەلەپەل کردن و هەڵسوکەوتی نائاسایی (دەوڵەت) کەوتمە گومانەوە، زۆربەی هەڤاڵانم ئاگادارکردەوە کەلێی ئەمین نەبن..چەندجارێك کاك(علی پونگینە)ی جیاکردەوە، بەچپە قسەی لەگەڵدا دەکرد،جارنا جاریش دەیگوت:

(ئەی لەمنونەکەوێ ' ئەوە لەکۆپتەر دەترسن ..؟

درەنگە..درەنگ.. زووکەن بابەرووناکی بگەین..)

کاك(علی پونگینە)م جیاکردەوە،پێم گووت: گومانم لەهەڵسوکەوتی (دەوڵەت)هەیە، ئاگاداری خۆت بە.دیاربوو کاك(علی پونگینە)دڵی لێ پیس نەکردبوو،دەوڵەت سواری سەیارەکەی خۆی بوو و بەعەنتەرناش بۆی دەرچوو،کاك(علی پونگینە)یش دوابەدوای ئەو دەرچوو،ئێمەش بەپەلە سواری سەیارەکەی خۆمان بووین و کەوتینەدوایان،من ئەمجارەیان لەپێشەوە سوارنەبووم،چەکەکەم مەخزەنی 75ی لەسەربوو،رامکێشایەوەو چوومە سەر چەمچەی سەرکابینەی پێشەوەی پیکابەکە، زۆربەوریایی چاودێری زەوی وئاسمانم دەکرد،پێش رۆژئاوابوون گەیشتینە کۆنەپونگینە نزیك بنەسەراوە، چواردەوری ئۆردوگاکە بە رەبایەی جاش تەنرابوو، هەموو رێگاکان بە چەندمەترێك بەنزیکی جاشەکاندا دەڕۆیی،لەسەر سەری کاك عوسمانەوە سواربووبووم،لە سەقفی سەیارەکەم دا،کاك عوسمان قایەباشی وای زانی کۆپتەر هات . ئیستۆپ(برێك)ێکی گرت و لەشوێنی خۆی وەستا،هەردوولای رێگاکە تەبارەی گەنم بوو،مەترێك دیوارەی کردبوو،ئەوان لەسەیارەکە دابەزین،من لەو بەرزیەوە سەیری هەردوو سەیارەکەی (دەوڵەت) و(علی پونگینە)م دەکرد، سەیارەکەی دەوڵت گەیشتە ئاستی رەبیەکە،دەوری رەبیەکە پڕلەچەکدار بوو، دەستی دەرهێناوسلاوی کرد،کەمێ هەڵوەستەی کردوسووڕایەوە پشتی ساترەکە،

کاک(علی پونگینە)چەندمەتری مابوو بگاتەلایان،هەرهەموویان دەستڕێژییان لێکرد، نەیان گوللەی گرداری (BKC) بەمدی وئەودیومدا تێپەڕبوون، بەڵام بەرنەکەوتم، منیش زووهاتمە دەست وزیاترلە 10 فیشەکم بەسێرە پێیانەوەنان ،هەمووخۆیان خزاندە ناو مۆڵگەکەوە، کاک ئاسۆسوور و کاک عوسمان قایەباشی و برادەرانیش بەپەلە دابەزین و کەوتنە تەقەکردن،منیش بەپەلە هاتمە خوارەوە وپەلاماری (RBG) یەکەم داو مووشەکێکم پێوەنان، بەڵام نەمپێکا، هێرشمانکرد، بەناو گەنمەکەدا بەرولای سەیارەکەی کاک علی چووینە پێشێ، خۆرئاوابوو،گوێمان لەدەنگی کاک (علی پونگینە)دەبوو کە بەهاوڕێ بریندارەکەی دەگووت: تۆ بڕۆ..!
لەبەرئەوەی سەیارەکەیان لە رووتەنی و لە رببیەکەوە زۆر نزیك بوو،هیچ ماوەیان پێمان نەدا بگەینە سەری وبیهێنینەوە،عوسمانی برام تۆزێ قەڵەوبوو،زۆر دڵی بەمنەوەبوو، هەردەیگووت :
ـ کاکەدانیشە،منیش بەردەوام تەقەم دەکرد،خۆی رانەگرت وهەربەغار هاتەبەردەمم، لەباری پانی لەبەردەمم درێژبوو،گووتی: دەی کاکە لەسەرشان وملی منەوە تەقەیان لێبکە،ئەگەرفیشەکێکیش بۆ تۆهات با بەرمن بکەوێ،کەمێك خۆمان کپ کرد، چاوەڕێی ئەوەمان دەکرد ئەگەر بریندارێش بن ،بەسوود وەرگرتن لەتاریکی چەند مەترێك بکشێنەوە،دەگەنەلای ئێمە،لەپڕ کەسێك بەچوارچنگۆڵەنزیکمان کەوتەوە، لەسەرخۆ بانگی کردین:پێشمەرگە..پێشمەرگەمنم،فریام کەون بریندارم.. بەپەلە خستمانە ناو پیکابەکەوە وبردمانەشوێنێکی نەدیو، کە فیشەك نەیدەگرتینەوە، لەبەرلایتی سەیارەکەمان تەماشامان کرد،فیشەکێك لە سینگی دابوو،لەناوشانی دەرچووبوو، لێمان پرسی ئەی کاك(علی پونگینە) گوتی یەکەم دەستڕێژ هەردوکمان بەرکەوتین،ئەوتوانای دابەزینی نەمابوو،برینەکەم گەرماوگەرم بوونزۆرهەوڵم لەگەڵدا. بۆم دەرباز نەکرا،ئەو هێشتا مابوو،بەمنی گوت:

. من تەواو..تۆبڕۆ..خۆت رزگارکە..!

ئیتر سەری بەسەرسوکانی سەیارکەدا شۆڕبووەوە..هەموو دڵنیابووین کە تەرمی کاك علی پونگینەمان پێ رزگارناکرێ،بڕیارماندا بەپەلە بریندارەکە دەرباز بکەین، لەپڕ کاك ڤاقە مەخمووری گەیشتەلامان،گووتی من بریندارەکەدەناسم، بیدەنەلای من،خۆم تەگبیری چارەسەری دەکەم،خستیە ناوسەیارەکەی خۆیەوە وبەپەلە رۆیی.

ئێمە تا نیوەشەو لەونزیکە ماینەوە،پێمان رێی نەدەدا بڕۆین،دەمانگوت:

بەڵکو ئەوە خوایە ئەویش مابێت و وەك هاوڕێکەی تری بە بریندار بگاتەوە لامان. بەداخەوە چاوەڕوانی سوودی نەبوو،ئێمەیش بەو ماندوویەتی و غەمبارییەوە بڕیاری گەڕانەوەمان دا، لەگەڕنەوەدا لەپشتی دارەتوو،کاك عوسمان بەرەو لای قوشتەپە شۆڕی کردەوە،ئێمە هیچ شارزانەبووین،لەخۆرهەڵاتی قوشتەپە چووینە (دەواجن)ێك،پێشترهاوکار ودۆست و باوڕپێکراوی کاك (عوسمان قایەباشی)بوو، بەگەرمەوە پێشوازی لێکردین،هەربەونیوەشەوەو بەدەستوبرد خواردنیان بۆمان ئامادەکرد،کاك عوسمان جگەرەی زۆر دەکێشا،ئەوان باشیان دەناسی،دوای نان خواردن،چوار پارچە(تەکە)پاکەتیان لەبەردەمی دانا،دووفەردە برنج و دووفەردە ئاردوو 4 کیسە دەرمانچاو تایت وسابوون وخوێ وچەندین شتی تریان بۆمان خستەناوسەیارەکەوە،گوتیان تەنیا جگەرەکان نەبێت..باقی شتەکان بۆ هەمووتانە، 25مریشکی قەڵەویشیان بۆمان کردبووە ناو قەفەس و ئەویشیان بۆمان هێنا، ئێمەش زۆر سوپاسمان کردن(بەداخەوە ئیستا کاك عوسمانەسوور کۆچی کردووە) بەرەبەیانی بەرەو بەستی (شەرغە).... بەرێکەوتین، تاریك وڕوونی بەرەبەیان گەیشتینەوە حەشارگەکەی (عوسمانەسوور). لە دەفتەری بیرەوەرییەکانم نووسیم:

(ئەمشەوە کاك(علی پونگینە) گەیشتە کاروانی نەمری وسەروەری و (دەوڵەت)یش بوو بەجاشێکی خائین وخۆفرۆش ..)




## ژیاننامەی شەهید علی پونگینە

. علی عبدالله علی سۆرخان  ناسراو بە (علی پونگینە)

. لەساڵی 1952 لەگوندی (پونگینە)ی سەربە قەزای (بنەسلاوە) لەدایك بوو بوو.

. لە ساڵی1979  پەیوەندی بە کۆمەلەو(ی.ن.ك)ەوە دەکات ودەێت بە پێشمەرگە.

. بەر لە شەهید بوونی فەرماندەی کەرتی (2)ی (تیپی 86 ی دەشتی هەولێر)بوو.

. دووبرای بەناوەکانی (جوهر) و( ئەنوەر) برازایەکی بەناوی (محمد)شەهیدبوون.

. لە ژیانی پێشمەرگایەتی بەشداری دەیان داستان و تەبەردی و چالاکی کردبوو.

. لە ژیانی پێشمەرگایەتی (2) جار برینداربووە.

. ناوی خێزانەکەی (نەجیبە محمد ئەحمەد)ە

. ناوی مندالەکانی ( زریان و چیمەن و دیمەن)ە

. ئاستی خوێندن : خوێندەوار بوو

. عەشیرەت : گەردی

. رێکەوتی شەهید بوون : مانگی 10. 6 . 1988

. *شوێنی شەهید بوون : بنەسلاوە*

## شەڕی یەکەم لە چەمەکانی توڵکی
## لەبەری شـێخ بزێنی نزیك کەرکوك
## 1988/6/24

لەبرئەوەی سنووری دەشتی هەولێر خەڵکێکی زۆری تێخزابوو،چەند پێشمەرگەیەك تەسلیم بەڕژێم بووبوونەوە،لەوانە فەرماندەی کەرت(صلاح شینە)چەند کەسێکی شەهیدکردبووە و هاوکاری تەواوی رژێمی دەکرد،هەربۆیە ئێمە وامان بە باشترزانی بگەڕێیننەوە سنووری کەرکوك،خۆمان (کەڵەك)ێکی بچکۆلەمان هەبوو،(مام نووری) قەرەسالم وکاك(عمرمەغریب)ی برای(شەهیدمەلائاراس)یش هەریەکەو کەڵکێکیان بۆ هاتووچۆ دروستکرد بوو..ئێواران ئەمبەروئەوبەرمان پێدەکرد.

شەوی 1988/6 21/20 بەچەند کاروانێك،بەخۆمان و چەکەکانمان و کەلوپەلێکی زۆرەوە لەزێی بچووك پەڕینەوە،لەچەند شوێنێك حەشارگەمان درووستکرد،چوند سەنگەرێکی قوولمان لە نێوان زێیەکەو چەمەچڕەکان هەڵکەند، رۆژانە پەرچمان دەبڕی و لەجاوی کۆپتەرەکان بزرمان دەکردن،هەموو رۆژێك ئەوچڕپی و گەڵادارانەمان دەگۆڕی،چونکە لەکۆێ ئەوجۆرەدارەوشکانە هەبووایە،کۆپتەرکان تەقەیان لێی دەکرد،ئەوسەردەمە کەس خۆی لە هاوڕێکانی بەگەورەتر نەدەزانی، هەموو وەك یەك خزمەتمان دەکرد،هەرکەسەبەپێ شارەزایی خۆی،هەواڵ لەشارەوە گەیشت کەدوژمن بەنیازە جارێکی تر کێومالی دەڤەرەکە بکاتەوە، هەربۆیە بڕیارماندا ببین بە دوودەستەی(8)کەسی یەوە،لەوێ بمێننەوە،بەئارەزووی خۆیان،

خۆم و(8) پارتیزانی تربچینە دورگەی(مام نەجیم) کە 200 مەترێك لەوشوێنەوە دووربوو، تەنیا ئاوێك لەنێوانماندا هەبوو،من وەستای نانکردن وبرنج لێنان بووم، لەبیرمە جارێکیان لەسەر سێر(ساج) نانم دەبرژاند،ئاردەکەمان زۆرکۆن بوو،کرم لێیدابوو،کاتێ کە دەمانبرژاند، خاڵی سوورسوور درووست دەبوو، پێشمەرگەیەك بەلایەوە سەیربوو،پرسی :

. ئەرێ ئەوە بۆ لەکاتی برژاندا قرتەیەکی لێوە دێ وخاڵ خاڵ سوور دەبێت..؟؟

گوتم : ئەگەربەڵێن بدەی دەنگ ناکەی پێت دەڵێم..

گوتم ئەوە هەمووی کرمن دەبرژێن و دەتەقنەوە... هاواری کرد:

. وەی باوکەڕۆ کرم دەخورێت..؟ گوتم ئا کاکەدڵیابەکەپیس نییە، چونکەئاگر هەموو پیسییەك پاکدەکاتەوە. هەرگوێ مەدرێ، ئەوە(لحم عجین)ە ...!

لەوگفتووگۆیەدا بووین،گوێمان لە دەستڕێژێك بوو،لەپڕ کۆپتەرێکی بچکۆلانەی (استیتلاع)مان لێ پەیدابوو، بەکۆپتەرەکەی بارق ناسرابوو،وەك زەردەواڵە بەنێوان دارەکاندا دەسوڕایەوە، گەیشتە سەر زێیەکەو گوێمان لە دەستڕێژێك تەقە بوو، کۆپتەرەکە بەپەلە زۆر بەرز بووەوە و بەرەوکەرکوك گەڕایەوە،توومەکە 6 پێشمەرگە لەناوەڕاستی ئاوەکە لەسەر کەڵەکێك دەبن، ئەڵێن تازە ئێمە هەرکوژراوین، پێنج کەسیان پێکەوە تەقەیان لێکردبوو،کاتێ ئەوپێشمەرگانە هاتن،پێمانگوتن :

. ناهەقتان نەبووە،بەڵام تازە ئێمەو شوێنەکانمانتان ئاشکراکرد،هەموومان چووینە سەنگەرە کانمانەوە،سەعات11ی پێش نیوەڕۆ بوو. لەپڕ بینیمان دەستەکەی کاك مستەفاشەوگێڕی بەغاردان هاتنە خوارەوە،لێمانپرسین :

. ها برایان زووپێمان بڵێن . بۆ وا پەشۆکاون..؟ چی روویداوە..؟ لەوڵامدا گوتیان :

. فریای خۆتان بکەون ..! وەك یەکەم هێرشی مانگی 5 لەهەموو میحوەرەکانەوە هێزەکانی رژێم بەرەو ئێرەدێن،هەرچەند سەعاتێکیتر ئێرە گەمارۆ دەدەن،من چوومە

سەرداریکی بەرز. بەدووربینەکەم تەماشامکرد،لە(تەقتەقەوە بەرێی سێگردکاندا، لەقوشتەپەوە لەکەلی سۆرەوە،لەناحیەی شوانەوە لە عەلبەیان و مەرزیخەوە،لە دارەمانەوە، لەرێی بیرەسپانەوە،لەپردێ وگەلۆزییەوە، لە(عاربەرێ )وە پێشرەوییان دەکرد،لەهەموولایەکەوە، لەهەردووبەری زێوە، بەهەزاران کۆماندۆ وسەرباز و جاش گەیشتنە چەندسەد مەتری نزیکمان،سەرەتا بە (9) هەلیکۆپتەر،بەرۆکێت وناپاڵم و بۆمبی هێشویی(عنقودی)..هەمووشوێنەکایان ئاگربارانکرد،کەگومانیان لێ هەبوو، بەشوێنەکانی ئێمەشەوە،بڕیارمان دابوو خۆمان ئاشکرا نەکەین،مەگەر ئاشکرابین، ئەوسا شەڕی مان ونەمان دەکەین،ئەوکەلەك (بەلەم)ەی ئامرازی هاتووچۆمان بوو، هەر10 مەترێك لەهەڤالانەوە دووربوون،کۆپتەرەکان بەدۆشکا شیتاڵ شیتاڵیان کرد، دەیان دەبابەو زرێپۆش چوونە شوینە بەرزەکانی دەوروبەرمان (300)مەتر لەلای خۆرئاوامانەوە،جاشەکان بشۆفەڵ دەیان بە سەنگەریان بۆخۆیان دروستکرد، بە حەسیر سێبەریان بۆخۆیان درووستکرد، ئەوەبەڵگەی مانەوەیان بوو،ئەورۆژە لەنیوەڕۆهەتا دەمەوئێوارە بەهەمووچەکێك کەپێیان بوو،چەمەکانیان ئاگرباران دەکرد،ئێمەبە خزمانی شەهیدمستەفاشەوگێڕی و ئەو شەش کەسەی بوونەهۆی هاتنی ئەوهێزە 25 کەس زیاتربووین،ئەوهەشت کەسەی ئێمەودەستەکەی شەوگێڕی13کەسبوون،ئێمەش(15)کەس لەدوڕگەکە بووین،ئەو(8)هەڤاڵەی لای خۆم بوون،هەموویان تووشی(مەلاریا)هاتبوون، رۆژانە حەبی(کلۆرۆکوین)م دەدانێ، ئەورۆژە نۆرەی (تاولەرز)ی سێ . چوار کەسیان بوو، لەتەوقی سەرم تاپێڵاوەکانم بەگەڵادار داپۆشیبوو، زۆربەوریایی جوولەم دەکرد،مەتارەکەم بەپەتێك دەمخستە ناو ئاوەکەوە،کەپڕدەبوو،رامدەکێشایەوەو بۆ نەخۆشەکانم دەبرد،ئەوە کارێکی ئاسان نەبوو،گەرمای ئەورۆژە هەڵپروکێن بوو، جلەکانمان وشکایی نەمابوو،ژێر توترك و ئاوسەنگەرەداپۆشراوەکان،وەك دوزەخی داگیرساوی لێهاتبوو،دوژمن

پووش وپاوانی دەورو بەرمانی ئاگردابوو،ئەوەندی تر گەرما زۆر نارەحەتی کردبووین، تا کاتژمێر(4)ی سەر لەئێوارە ئاشکرا نەبووین، چاومان لیّ بوو لەشوێن ماڵکەی(عوسمان مام مولود) تولکی و(عمرصدیق) و دراوسێکانیان، هەرچی نرخی هەبووایە تالاّنیان دەکرد،ئەوە پێویستیان نەبوویایە، فیشەکێکیان پێوە دەناو ورد و خاش وخراپیان دەکرد، ناو سەنگەرەکەمدا پاڵکەوتم لەورۆژەرەشەدا سەرخەوێکم شکاند،مام رەئوف کاولەسواری هۆشیاری کردمەوە:

- ئەوا دووشۆفرلێتی پڕ لەجاش بەرەو لای هەڤاڵانمان دەڕۆن،لەسەرئاوەکەی نێوانمان ماوەیەك وەستان،دواترچەندجاشێك هەر یەکەو دوو دەبەی(5) لیتریان هەڵگرت و بەرەو زێی گەورە بەڕێ کەوتن ، کە ئاوەکەی زۆر ساردتربوو..ئیتر هیچ چارە نەما و هەڤاڵانی سەروە ئاشکرابوون، شەڕی دەستەویاخە ماوەی 45 دەقەی خایاند،شوێنی ئێمە بووبەسێبەر.دڵنیابووین بەئاسانی نامان بینن،تا ئیوارە چەندین کەسیان لیّ کوژرا، سیّ تەرم بە پێناسەو چەکەکانیانەوە کوتنە بەردەستی هەڤاڵانمان،برادەرانی خۆمان هەمووسەلامەت بوون،دوای مەغریب بەهەڤاڵانم گوت: خۆتان گردبکەنەوە،شەو قەڵای مێردانە،لەم ناوچەیە دوور دەکەوینەوە، ئەوەی زۆر نیگەرانی کردم یەکێك لەکوژراوەکان بوو، بەو هاوینە پێڵاوی لاستیکی لەپێبوو،زۆر زۆر بەدوای هەڤاڵەکانماندا گەڕاین کەسیانمان نەدۆزییەوە،هەندیّ سەمونی عەسکەری وخەیارو تەماتە لە ناوسەنگەرەکانیان بەجیّ مابوو،هەرچەند بەترسەوە هەموویمان خوارد،بەڵام تووشی دلەراوکێی کردین،نەماندەزانی بەدیلگیراون، یا رۆیشتوون بۆ شوێنێکی تر، گەڕاینەوە بۆ دوڕگەکە، کەرێکمان هەبوو،بەچوارپەل و قەپۆزبەستراوی لەژێرتوتڕکدا حەشارمان دابوو،بەپەلە هێنامان وبەقوڕ سواغماندا.. سێری نانکردن و هەگبەکەشمان قوڕدا،ئەشیا پێویستەکانمان لێی بارکرد،جارێکی تر دەموقەپۆزیمان توندکردەوە.زۆر نزیك لەهێزەکانی دوژمن،بەوبەتاڵییە بچووکەی

نێوان سوپاو جاشەکاندا بە ئاودڕێکی دوومەتر قووڵدا لەبازنەی گەمارۆی دوژمن دەرچووین،هەرئەوشەوە بەنێوان دەیان کەمیندا تێپەڕبووین،خۆمان گەیاندە(گێلێن) لەوێ کەڵەکێکی بچکۆلانەم شکدەبرد،تا بەرەبەیان بەخۆمان و کەروبارەوە پەڕینەوە دوڕگەی گێلێن. بەرانبەربەگوندی سارتك، کەرکەمان دوور دوور لەخۆمان حەشاردا، کەڵکەکەمان شاردەوە،دوای پێنج رۆژ دوژمن تەرمەکانی خۆیان بردبۆوە و لەناوچەکە پاشەکشەیانکرد،ئێمەش بەوریاییەوە گەڕاینەوەشوێنەکانی پێشوومان، هەموو ئەوشوێنانەی گومانمان هەبوو کە بۆی چووبن،وەکو( هەنارە، دەورێشغولام، کارێز وبیرالك وبیرەسپان چەندشوێنێکی..)پێشمەرگەمان بۆ هەواڵ پرسینیان نارد، لە هەر هەمووی نائومێد بووین، دەستەکەی هەڤاڵ مستەفا شەوگێڕی گەڕانەوە حەشارگەکانی پێشوویان، ئەوان پێشتر کەڵەکێکیان لە چەمی (احمدئایش) هەبوو، گوتمان بڕۆن ئەوێش تەماشابکەن،گەر(کەڵك)ەکە نەمابێت، ئەوە دیارە ئەوان پێی پەڕیونەتەوە.ئەویش هەر لەشوێنەکەی خۆی بوو،تادەهات زیاتر نا ئومێد دەبووین، کەسوکارمان هەواڵی شەڕەکەیان زانیبوو،لەچەندجاشێکی ناسیاویان پرسیبوو، لەوەڵامدا گوتبوویان:ئێمەلەوێ بووین، دڵیاتاندەکەین ،نەکەس بەدیل نەگیراوە، نەکەسیش نەکوژراوە، هەر کە ئەو هەواڵەمان پێ گەیشتەوە، ئاهێك هاتەوەوە بەرماندا،شەوان من هیچ نەدەخەوتم، چوونکە شەوێك ئەفسەرێك و دووجاش هاتبوونە نزیك حەشارگەکەمان، ئەوشەوە زێیەکە کەمی کردبوو،شوێنپێیەکانیان تالێوئاوەکە هاتبوو،شەوی دواتر هەموو هەڤالان خەوتن،تەنیا من ومام رەئوف کاولەسوار هۆشیار بووین، چووینە سەرزێی، لەبەرمانگەشەولەناو چەگلەکە دانیشتین،دوای نیوەشەو هەستمان کرد لەوبەرەوە بەرانبەرمان دەنگی گمەگمی دووکەس دەهات هەرگەیشتنە سەرئاوەکە، لەمبەرەوە چەکم لێڕاکێشان وگوتمان:

- کێن زەلام ..

. عوسمانی برام بەقوڕگی پڕگریانەوە هاواری :

ئەرێ وەڵا ئەوە دەنگی مەلاشاخی برامە..!

بانگم کرد:کاکەگیان..ئیوە هەمووتان سەلامەتن..؟

لەسەلامەتی خۆیان دڵنیای کردینەوە، ئێمەش سەلامەتی خۆمان بەوان راگەیاند..

تابەرەبەیان هەموویانمان پەڕاندەوەلای خۆمان،بۆیان باسکردین چۆن کشاونەتەوە، چوونەتە حەشارگەکانی شەوگێرو هەربە کەڵەکەکەی ئەوان پەڕیونەتەوەو پاشان گوتوویانە نەك هەڤاڵانی خۆمان پێویستیان پێ هەبیت، یەکیکیان هینابوویەوە شوێنەکەی خۆی و بە مەلەوان چووبۆوە بۆ ئەوبەر..

لەوێشەوە چووبوونەوە پشتی دوژمن و بۆ بەیانی چووبوونە بەستی شەرغە،لەوێ هەڤالان(مەولان) و(جوهرگردەسوری)و(بەکرگردەسوری) زۆر هاوکارییان کردبوون. هەموومان پێك شادوشوکربووینەوە،دوژمن هەموو حەفتەیك جارێك دەهاتەوە، بۆکێومالی ناوچەکە،ئێمە ترسمان لێیان شکابوو،لەگەڵ ئەوبارودۆخە ڕاهاتبوین، خواردنی تەندروست رۆژبەرۆژ کەمی دەکرد،زۆرجار ناچار دەبووین (تەپکەو فاق و داو ودارلاستیك و تۆڕ و تەڵە و قولاب..) بۆڕاوکردن بەکاربێنین،جاری واهەبوو، کەنیازی دوورکەوتنەوەمان هەبووایە،نۆك مان بەخوێوە دەکوڵاند و وشکمان دەکردەوەو لە مەتارەیەکدا لەگەڵ خۆماندا هەڵماندەگرت، هەمووجار کە بیرم لەژیانی خۆمان دەکردەوە .کۆمەڵی سەرتایی و ژیانی چاخەکانی کۆنی باو و باپیرانم وەبیر دەهاتەوە، بۆئەوەی بیزار نەبن و گیانی خۆراگری و بەرخۆدان لە ناخیاندا تۆکمەتر بکەم .کتیبەکەی گیڤارو شۆڕشی کۆیلەکان و چەپکێك لە وتەکانی (ماوسیتۆنگ)م بۆیان دەخوێندەوە،هەندێك جاریش لەسەر داوای خۆیان شیعرم پێشکەشیان دەکرد. زۆر جار ئەم شیعرەم بۆ هەڤاڵەکانم دەخوێندەوە :

## جەنگەڵ

لەهەندەران...

لەوبەر هێڵی سنوورەکان.

لەکووچەو کۆڵانی شارێ.

دەنگێکی کز دەهات لە دوور.

شوورەییە..

لەسەردەمی گەشتی گەردوون.

رمانی قەڵای زۆرداران،

بەرەو ئاشتی و یەکسانی چوون.

کەچی ئێمەی مـرۆڤــی کورد

وەک (کۆمەڵی سەرەتایی)

لەژێر ئەشکەوت و لە جەنگەڵ

دەژین لەجێی ورچ و مەیموون.

شێخ بزێنی 1988

* مۆرەی چیا / شیعر / مەلاشاخی / چاپی یەکەم/ چاپخانەی شەهید ئیبراهیم عەزۆ



# پارتیزانی دوای ئەنفال
## شەهید بەکر محمود (فەرهەنگ)

- لەساڵی 1963 لەدێی(بیرەسپان خواروو)لەناحیەی(پردێ)چاوی بۆژیان هەڵهێنا.
- هەر لەساڵی 1963 حەرەس قەومی (عبدالقادرتوفیق)ی مامیان شەهید کردبوو.
- ساڵی 1980 پەیوەندی بە(کۆمەلەی رەنجدەرانی کوردستان)ەوە دەکات.
- لە 1982/1/14 لەلایەن دەزگای ئەمنی(پردێ)وە زیندانی کرا پاش ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆر رەوانەی (هیئەی خاسەی کەرکوك) و (امن عامە )ی بەغداکرا پاشان بەزیندانی هەتا هەتایی حوکم درا.
- لە 1982/7/23 بەرلێبووردنی گشتی کەوت و ئازادکرا.
- هەرهەمان ساڵ بووبەپێشمەرگە لەتیپی21ی کەرکوك.

پاشئەوەی بەر لێبوردنی گشتی کەوت لەساڵی 1982 ئازاد کرا لەزیندان بێ ڕاوەستان پەیوەندی کرد بەهێزی پێشمەرگەوە لە تیپی 21 ی کەرکوك.

- لەچالاکی و نەبەردیدا نمونەی پێشمەرگەی چاونەترس بوو،
- لە نەبەردییەکدا زۆر بەسەختی برندار دەبێت.
- شەهید بەشداری شەڕەکانی بەرگری ئەنفالی 4 ی کردو ماوەی 2مانگ لەگەڵ دەستەکەی مەلاشاخی(نووسەر) لە دەشتی کەرکوك وهەولێر مایەوە.
- لەمانگی تەمموزی 1988 لەنزیك هەولێر..لەگەڵ دوو پێشمەرگەی هاوڕێیدا کەئەوانیش(شەریف کریم ڕۆژبەیانی)و(یاسین عومەر صدیق بیرەسپانی) بەدیل دەگیرێن و رەوانەی (امن هەولێر) دەکرێن و پاشان شەهید دەکرێن.



# مام کەریم احمد زەردکی و..
# کەمینێك لە پردی حاجی وسوو

سەرلەئێوارەی 1988/7/25دەستەیەك لەپێشمەرگەکانی کەرکوك ودەشتی هەولێر لە قەمیشەڵانەکانی شیو(قەمبەر) بەسەیارەکەی هەڤاڵ(عوسمان جەمیل) بەرێکەوتن بەروە(دارەتوو) و (بنەسلاوە) لەنزیك پردی (حاجی وسوو)کەوتنە بۆسەی هێزێکی سوپاوجاشەوە.پاش شەڕێکی دەستەو یەخە سەیارە کەیان بەجێ دەمێنی،لەکاتی کشانەوەدا هەڤاڵ(کریم احمد زەردکی) لە هەڤاڵەکانی دادەبڕیت و بەجێ دەمێنێ..

هەر لەونزیکە لەبێشەیەکدا،خۆی حەشاردەدات،هەرئەوشەوە کاك عوسمان جمیل و هەڤاڵەکانی بەسەلامەتی گەڕانەوە، بەڵام هیچ هەواڵێکی(مام کریم) یان نەدەزانی. هەفتەیەك سوراغمان کرد، هیچ هەواڵێکی نە لە هەولێر نە لە ئۆردوگاکان،نە لەلای جاشەکان نەبوو،نائومێدبووین،هەربۆیەلەوچۆلە لەسێبەری دارێك پرسەمان بۆ دانا. هەڤالانی دەشتی هەولێروقەرەچووغ هاتن بۆلامان وپرسەوسەرخۆشییان لێکردین. (مام کەریم یەکێك لە هەڤاڵە دێرینەکانی باڵی (م.س) بوو،هەرچەند بڵێی پیاوێکی بەهیمەت ودڵسۆز بوو،ئەگەرچی چاوی زۆر کزبوو، باش نەیدەبینی،بەڵام سووربوو لەسەر خۆڕاگری، هەربۆیە ئێمەش زۆر خۆشمان دەویست،زۆر پەرۆشی بووین، بەڵام بێ سوودبوو..)

لەولاشەوە مام کەریم پەنا بۆئەو بێشەیە دەبات،هەر هەمان شەوهێزەکەی دوژمن بڕیاری مانەوەدەدەن و هەموو بەرزاییەکانی دەوروبەری دەکەن بە سەنگەر و مۆڵگە، ئەم هەڤاڵە بە نینۆکەکانی چاڵێك بۆ پاشەکەوتکردنی ئاو درووست دەکات،بەهۆی گەرماوە وردەوردە ئاوەکە وشك دەکات،لەجیاتی خواردن هەرگەڵاداروگیا دەخوات،

سەرباری ترس و برسێتی و تینوویەتییش (مار) یێکی گەورەیشی لێ پەیدادەبێت. بەوحاڵەوەخۆی نادا بەدەستەوەو ماوەی(21)رۆژ بەربەرکانی لەگەڵ مەرگدا دەکات.

- رۆژی 1988/5/15هێزەکەی رژێم پاشەکشە دەکەن و بەرەو هەولێر دەگەڕێنەوە. سەرلەئێوارە بە کپبوونی دەورووبەری خۆی دەزانی کە هیچ مەترسییەك نەماوە، چەندجارێك هەوڵدەدات سەرکەوێ،بەڵام ناتوانێ ، ئیتر بەچەمەکەدا شۆڕدەبێتەوە.. دەگاتە دەشتاییەك لەوێ پەکی دەکەوێ و یەکجاری لە ژیان نائومێد دەبێت، لە پڕ(3) کەسی خەڵکی گوندی (بانەمۆرد) وەك فریشتە پەیدا دەبن ،بەپەلە فریای دەکەون و دەیکەنە کۆڵ،لەشوێنێکی ئەونیزیکە هەندێ وشکە صمونی پاشماوەی دوژمن و کەمێك ئاوی بۆ پەیدا دەکەن..پاش یەکدوو سەعات دێتەوە قسەو خۆی پێیان دەناسێنێ.بۆ شەوەکەی بەهەر جۆرێك دەبێت دەیگەیەننەوە (بنە سەراوە) ئیتر لەوێ دکتۆر (موغەزی) بۆ دەکات و چاك دەبێتەوە..

لەکۆتایی مانگی حوزەیران لە قەمیشەڵانەکانی شیو قەمبەر بووین،لە پڕ هەڤاڵێك هاواری کرد(موژدە..موژدە)هەموو لە شوێنی خۆمان راست بووینەوە،کە تەماشامان کرد ئەوا (مام کەریم) بەرەو لای ئێمە دێتەوە،پێك شاد و شوکر بووینەوە ، هەموو بەسەرهاتەکەی خۆی بۆمان گێڕایەوە، رووداوەکانی ئەو هەر لە فلیمەکانی شەڕی نێوان ڤێتنام و ئەمریکا دەچوو،برادەران پێیان گوت: خۆ تۆ فێری سەربازی نیت، رزگارت بوو بوو،بۆهاتیتەوە.سەری هەڵبڕی وهەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاو گوتی: ئۆخەی هەوای ئازادی.. ئیتر لەگەڵمان مایەوە تا دوی جەژنی قوربان،دوای جەژن ئێمە ویستمان بڕۆین بۆ خۆشناوەتی،گوتی منیش دێم،کەرێکمان پێبوو،ویستی سواربێت،لەپاڵ بەردێك بۆمان راگرت،کەخۆی هەڵدا لەجیاتی روولەپێش سواربێت، روو لە دواوە سواربوو،من زۆر دڵم پێی سووتا،دەستم کردبەگریان،بەپەلە دابەزی... ئەو رووداوە زۆرکاریگەری لەسەرکردم بۆیە ئەم شیعرەم بۆ نووسی:

# دێدەوان

<u>پێشکەشەبەتێکۆشەری دێرین(کەریم احمد زەردکی)</u>

شوێن.. قەمیشەلانێکی چڕبوو

خانوو.. نێوچەم وئاودڕبوو.

لەپاش سووتــماکی سەدان دێ،

ئەنفالی سێ چلەی چووبوو.

کەچی هێشتا بەدووبینایی کزەوە،

وەک جارانی بەپشوو بوو.

لەدوای دەیان هێرشی چڕ،

چاوشارکێ لەگەڵ کت وپڕ.

ورەی گەلێ بلند تربوو.

ئەوڕۆژەیش وەک رۆژانی دی،

لەبن کەولێ،لەنێوتەنگێ.

خۆی حەشاردا تا درەنگێ.

ئێوارانێ بەتەپەتەپ گەیشتەجێ

وتی: هاتووم بمخەنەڕێ.

دەمەوێ بچمە سەفەرێ.

دمڕۆم هەتا دڵنیا بم ،

هاوڕێ ی ژیانم ..کەوتۆتە کوێ.

خۆر لەزەردە،

رێگای هات ونەهاتی گرت،

لەگەڵ کاروانی پێشمەرگە.

هەر ئەوشەوە،

لەسەرپردی حاجی وسوو.

دێدەوان یش چاوی لێ بوو.

کەوتنە نێو داوی بۆسەوە ،

چوار کەناریان بوو بەئاگر

ئەوانیش هەر بەگری سوور ،

تەیمانی دوژمنیان بەزان ..

بەسەر مردندا بازیاندا .

هیچیان بەتەپکە نەگیران .

ئاسۆگەیێ دووئاسۆگە ،لێک دابڕان .

پاش دەیان جار هەڵدێران وهەڵسانەوە.

ماندووبوون و حەسانەوە.

ئەوشەوە هەتا سبەینێ،

لەبێشەیەکدا دەمینێ.

کەرۆژ هەڵدێ..

بەگاڵەی دووژمن دەزانێ،

هەموو لوتکەکان گیراون

بەناچاری دەچێتەنێو کەندەلانێ.

لەولایشەوە ..

هیچ کەس هەواڵی نازانێ.

رۆژدێ و دەچێ.

وردە وردە لێوی چەمیش
وەک لێوی ئەو هەڵدەقرچێ
باش ( 21 ) شەوجودایی.
دابڕان و بەتەنیایی .
دوای پرسەو سەرخۆشی دۆستان.
دوژمن رۆیی و مل خۆی شکان .
ئەم هەڤاڵیش دێتە دەرێ لەنێوچاڵێ.
تا بەدەست بێنێ هەواڵێ .
لەولایشەوە دووریێبوواری برسی وتێنوو،
دەچن بۆ نان ،دەچن بۆ ئاو.
دەدزنەوە ..امامەای کەم بیناوپەشۆکاو.
کەدەپرسن ..لەو ماوەیە،چۆن ژیابوو،
بۆ نەمردبوو؟
جا دەزانن ..لەجیاتی هەموو خۆراکێ،
لەبەکوتێ..گیای خواردبوو..
کەهاتەوە..
لەسیمادا وەک برێشکەی بەرئاگربوو.
بەلام ..لەبیروبڕوادا
وەکو جاران خۆڕاگربوو.
دەشتی هەرلێر 1988

---

* دیوانی شاخیـ شیعرـ شاخی ـ چاپی یەکەم



## برینداربوونی دەهام باوە

ـ دەهام حەمەد باوە حەمەد ساڵەیی ناسراوبە ( دەهام باوە )

ـ لەدایکبووی 1952 گوندی مەلاقەرە مەخموور / هەولێر

ـ لە شۆڕشی ئەیلوول دا شەش ساڵ پێشمەرگەدەبێت

ـ لە ساڵی 1981 دەبێ بە پێشمەرگە لەریزەکانی حزبی سۆسیالیستی کوردستان.

ـ ساڵی 1985 پەیوەندی دەکات بە ریزەکانی ( ی ن ك ) وە / تیپی 85ی دەشتی هەولێر

ـ دوا پلەی جێگری فەرماندەی تیپ بوو

بەرەبەیانی 1988/7/10

چەند دەستەیەك لەپارتیزانەکانی کەرکوك وهەولێر لە قامیشەڵانەکانی نێوان گوندەکانی(قەمبەر)و(ئاومال)بووین،خۆمان حەشاردابوو،لەپرسەیارەك پەیدابوو، پێشمەرگەکان دەنگیان لێکردن : ئێوە کێن؟ گوتیان ئێمە پێشمەرگەین ،ئەمشەو لە رێگای گەڕانەوەماندا لە دەوروبەری شاری هەولێر هەڤاڵ(دەهام باوە)بریندار بووە، هاتووین بەدوای داین کردنی برینپێچێکدا، منیش (د.سلێمان محمدحاجی )ی برام لەگەڵ ناردن، برینەکەی بۆ تیمارکردو هاتەوە،دووڕۆژی تر لەسەریەك دەچوو بۆتیمار کردنی، دواجار کەگەرایەوە گوتی بەداخەوە تەندروستی خراپە.

### دووبارە برینداربوونەوەی دەهام باوە

پاش نیوەرۆی 1988/7/21 دەستەیەك لەپێشمەرگەکانی تیپی 87ی قەرەچوغ دەهامیان لەگەڵ خۆیان برد بۆ دەوروبەری هەولێر بە مەبەستی فریاکەوتنی .. بەداخەوە لەنزیك گوندی(موردکە)دەکەونە بۆسەی دوژمنەوەو لەوبۆسەیدا جارێکی تر بریندار دەکرێتەوەو بەهۆی کاریگەری برینەکەیەوە هەرئەوشەوە شەهیدبوو.

* مەلاشاخی / ئەنفالی خاڵخاڵان



## شەری دووەم لە چەمەکانی تورکی

## پەرژین کانەبی تەواری دوای ئەنفال

ئەگەرچی زۆر لەمێژا بوو کەپەندی پێشینانی کوردی ئەوراستییەی سەلماندبوو (شێر لەلانە دەرچیٚ چ نێر چ میٚ) بەلاٌم مێژووی گەلانی ئازادیخوازیش پڕاوپڕە لە هەلٚوێستی بەرزوشکۆمەند،زۆرن ئەومرۆڤەناودارانەی،بەبیٚ جیاوازی لەرەنگ و بیروباوەڕو رەگەزو ئاین..بەقارەمانییەتی ئازایەتی،ناوی خۆیان لە لیستی ناوە درەوشاوەکانی مێژووی مرۆڤایەتی تۆمارکردووە...

لە دیرۆکی تاریك وروونی کوردەواری خۆمانیشدا، وەك چۆن زۆر پیاوی جوامێرو فەرماندە و کەسایەتی دلێر وگیانبەخش وسەرکرنەی ناودارونەمرهەن،هەلٚوٚئاسا چوونەتە لوتکەی هەلٚویست ودوای شەهیدبوونیان ناوی خۆیان لەدەفتەری سەروەریدا تۆمارکردووە..بەهەمان شێوە زۆرکچ و شێرە ژنی خاوەن هەلٚوێستیش کۆتی دیلییەتییان پچڕاندووەو چاونەترسانە وەکو تەوار لەشەققەی بالٚیان داوەو چوونەتە نێو رەوی بەرزەفڕەکان و لە ئاسمانی نەمرایدا بوونە بەئەستێرە و ناوی خۆیان خستۆتە پالٚ ناوەکانی(زێرینای ئامێدی) و(قەدەمخێر)و(کوێخانێرگز) و (لەیلاقاسم ) و(زەکیەئالکان)و دەیان شێرەژنی تر، چیا سەربەرزەکانی (قەندیل )و (کێلەشین )و(خانٚخالاٌن) و(گارا)..شایەدی دەدەن کەچۆن ژنانی ولاٌتپارێز لەپالٚ هاوڕیٚ وباوك و براو هاوسەروکەسانی جیٚ متمانەی خۆیاندا ،لەسەنگەرەکانی داکۆکی لەمافەرەواکانی گەل بەگشتی وژن بەتایبەتیدا..گیانی خۆیان لەسەرلەپدا دەناوەوپێشکەش بارەگای سەروەرییان کردووە..

شۆڕشی نوێی گەلەچەوساوەکەمان،جارێکی تر ئەو راستییەی سەلماندۆتەوە، کە هەرگیز نەمەل بەبالٚیٚ دەفڕیٚ و نەچەپلەیش بەدەستێك لێدەدریٚ ونەشۆڕشی درێژخایەنیش بەتەنیا یەك رەگەز دەگات بەئامانج..فەرموون ئەوەخەباتی دژواری رابردووی شاروشاخ،ئەوە خەباتی نهێنی و خۆڕاگری ناوزیندانەکان و رۆژگارە

تاڵەکانی سەردەمی بەرخۆداز ...ئەوەساتەپڕمەینەتییەکانی ودوای ئەنفال و ئاوارەیی وراپەڕین وکۆڕەو...ئەوە ململانێی رەش وسپی ،هەق وناهەق...

ژنانی کوردستانیش درێغییان نەکردوە،ئێستا مافی خۆیانە بەشانازییەوە داکۆکی لەمافەڕەواکانی خۆیان بەتایبەتی ومافی مرۆڤ بەگشتی بکەن.هەقی خۆشیانە، شایستەن بەوەی کە زۆرلەئیستا پیرۆزتر،زۆرلەئیستا مەزن تر بەچاوی رێزەوە تەماشابکرێن ..خاتوو (پەرژین کانەبی شێخ بزێنی) یەکێکە لەو ژنە تێکۆشەرو دلێروئازایانەی لەدوای ئەنفالەکان،ژیانی خۆیلەیی وئۆردوگاکانی بۆ قەبوڵ نەکرا،بۆئەوەی وەك هەزاران ژنی تر راپێچی زیندان وگەرمەسێرەکانی (رمادی)و(نوگرەسەلمان)نەکری.رۆژی1ـ9ـ1988 رووی کردە چەم و هەردەکانی شێخ بزێنی و خۆی گەیاندەپۆلێ لەپێشمەرگە پارتیزانەکانی دوای ئەنفال لە گوندەکەی خۆیان، کەبریتی بوون لە هاوسەرەکەی وچەند هاوڕێ وهەڤاڵێکی شەهیدان( مام برایم )و (مەلائاراس)...

ئیتر ئەمیش بەرگی خاکی پۆشی و چەکی کردەشان،بوو بەتەواری دوای ئەنفال و بەقارەمانی تێکۆشان، بووبە پارتیزانی چنگ بەگڕ وبەپێشمەرگەی کوردستان، لەولایشەوەسیخوڕوجاش وخۆفرۆشان،عەلی کیمیاوی وهەواڵگری وسوپای تالان. کەوتنەشوێن پێ هەڵگرتن وکەوتنە کۆکردنەوەی هێزودارشتنی نەخشەی تاوان، تائەوەبوولە 15ـ9ـ1988دا.لەگەڵ گزنگی خۆرەتاو،هێزێکی گەورەو بێشوماری داگیرکەر بەپاڵپشتی تانك وزرێپۆش و(15)هەلیکۆپتەرو (4) فرۆکەی (pylatos) هێرشیان کردەسەر(دوڕگەی مام نەجم) لەسەر زێی بچووك، لەنێوان هەردوو گوندی (توڵکی) و(ئاوماڵ) ئەو رۆژە هەتا ئێوارە شەڕێکی نا بەرانبەر، نەبەردێکی قارەمانانەی تر، لەمێژووی ئازایەتی رۆڵەکانی کەرکوك وگەرمیان نووسرایەوە..

**زیانەکان لەو بەرگرییەدا :**

- کوژرانی ئەفسەرێك و پتر لە (50) سەرباز..
- شەهیدبوونی : پەرژین کانەبی و نەجات کۆچەکی و رحمان صالح و سعد و مەشعەل حسین بۆڵی



# نامەیەک لە خاڵخاڵانەوە
## شەهید ئەنوەر مستەفا (مام هەژار)

لە دوای هێرشی ئەنفالی چوار لە ساڵی 1988 و وێرانکردنی سه رجەم لادێکان خەڵکێکی زۆر لەپێشمەرگە وهێزی پشتگیری و هەڤاڵانی رێخستن بە ژن ومناڵەوە لە بناری خاڵخالان لە دۆڵی(هەنجیرە زەرد)لەنێوئەشکەوت و کونەشاخ وقەمیشلان و بێشەکاندا پتر لە مانگێك خۆیان دە شارنەوە .. هەرچوار دەورەیان بەجاش و سوپای عێراق گەمارۆ دەدرێت،مام هەژار کە پێشتر پێشمەرگەی کەرتی رێکخستن وهاوڕێم بوو، سەرپەرشتی چەندین کەسی گوندەکەیان دەکات، لەو بارودۆخەکەدا ئێوارەیەك کۆیان دەکاتەوە و باسی خۆراگری وتاوانباری رژێمیان بۆدەکات.. لەکۆتاییدا لێیان دەپرسێت :ـ ئێستا ئێوە هەڵوێستتان چۆنە..؟

هەڤاڵ(مەلازاهیر)وەلام دەداتەوە:کاکە ئێستا موهیمە مرۆڤـ نەڕوخێ وخۆڕاگربێت.. دوا بەدوای ئەو کاك تالیب وکاك جەوهەرمستەفاوکاك خالید وفوئادی مەلاسمایل و چەند کەسێکی تر هەمان هەڵوێست دەردەبرن..مام هەژار لەوەلامیاندا ئەڵێ :

ـ ئافەرین زۆر راستە ئێمە بێ باکین لەمردن قەت نامانەوێ بە سەرشۆڕی بمرین ..

پاش چەند رۆژێك شوێنەکەیان ئاشکرا دەبێت و لەلایەن جاشە کانەوە هەواڵیان بۆ دەچێت، کە ڕژێم بە نیازە هێرش بکات بۆ ئەو شوێنەی ئەوان..

ئیتر هەموو تووشی شڵەژان دەبن...دواجار هەواڵ دەگات، کە قاسم ئاغا وتویەتی سەیارە دێنم و رزگار رزگارتان دەکەم.. هەندێك بڕوای پێ دەکەن و ئەوانەیش متمانەی پێناکەن زووئەو جێگایەچۆل دەکەن..لەو سەروبەندەدا مام هەژار ئەڵێ:

ـ با نامەیەك بۆهەڤاڵ مەلاشاخی بنێرین بەڵكوفریای ئەوخەڵكە بكەون .. كەخریكە فریوی قسەی قاسم ئاغادەخۆن. لەگەڵ مەلازاهیر نامەیەك دەنووسن وبەرێی دەكەن. بەداخەوە نامەكە زۆردوادەكەوێ. بۆشەوەكەی دەگەڕێنەوە(قەڵاتی سەڵتە ئەحمەد) لەوێ دەمینێنەوە،بۆبەیانی هێزی جەیش وجاش هێرش دەكەن بۆبناری خاڵخاڵان، لەناو ئەشكەوتەكەوە بە دووربین چاویان لێ دەبێت كەچۆن جاشە شڕەخۆرەكان تراكتۆر و شتەكانیان بە تالان دەبەن...

بۆ شەوی دواتر ئەو ئەشكەوتە بەجێ دەهێڵن و لەگەڵ خاڵە تالیب و كاك فوادی مەلاسمایل بە خێزانەوە دەچنە دۆڵی لوولەكە، پاشان هەواڵ دەزانن كە قاسم ئاغا 21 ئۆتۆمبێل دەبات وهەموو ئەوانەی كەبروایان پێ كردبوو هەموویانی تسلیم بەرژێم دەكاتەوە، سەرجەمیان ئەنفالكران، هەرهەمان رۆژهەواڵیان پێ دەگات كە سوپای عێراق هێرشیان كردوە بۆچەمی(بابەڕوشە)كەدەكەوتە بەینی(چوغلیجە)و (جەلەمۆرد)وزیاتر لەچوارسەدكەسیان دەسگیركردوە،سەرجەمیان ئەنفال دەكەن. چەن شەوێك لە دۆڵی لوولەكە خۆیان حەشاردەدەن،پاشان دەچنە شوێنێك بە ناوی (هەوارە سماقەیی) بۆ ماوەی یەك مانگ لە ناودرێكدا ژیان بەسەردەبەن، كە هەموو ڕۆژێك پێش ڕۆژهەڵات دەچنە ناوبیرەكەوە ودوای ڕۆژئاوایش لە دەرەوەی بیرەكە خواردن ئامادەدەكەن..شەوێك جێگاكەیان لەلایەن هێزی ڕژێمەوە تۆپباران دەكرێ، ئەو شوێنانە سوپای لێ نابێت. لە ناو بازنەیەكی بچووكدا چواردەوریان بە سوپا و جاش گەمارۆ دەدرێ، لە لای خۆر هەڵاتەوە گوندەكانی گردخەبەر وگەلناغاج و سەرچنار و جەلەمۆرد لەلای ژورەوە قەسرۆك و قودرەتە و قامیشە، لەلای خوارەوە گوندی ئۆمەرمەندان تا دەگاتەجیایی خاڵخاڵان.. بەسوپا و بە جەیش دەتەنرێت. رۆژێك جێگۆڕكێ دەكەن و لەبێشەیەكدا خۆحەشار دەدەن ، لەپڕجاشەكان هێرش دەكەنە سەر شوێنەكەیان و ئازووقەو شتەكانیان وا لێ دەكەن بە كەڵكی خواردن

نەمینێ،بۆیە هیچ چاریان نامینێ جگەلەوەی بڕیاردەدەن ئەگەر خۆیان بشمرن دەبێ خێزانەکانیان لە زێی بچووك بپەڕێنینەوە بۆ تەق تەق و رزگاریان بکەن..

شەو لە بەینی دەبابەکانی ڕژێمەوە،لە بەستی سماقەوە خۆیان دەگەیەننە سەر زێی، دوای ئەوەی کە ژن و منالەکانیان تسلیم بە هەندێ لە کەس و کاریان دەکەنەوە..

پاش دلنیا بوون دواتر خۆیان دەگەڕێنەوە بناری خالخالان..لەو ماوەیەدا چەند جارێك تووشی پارتیزانەکانی تیپی 21 ی کەرکوك دەبن، هاوکارییان دەکەن.

دوای راپەڕین هەڤالْ (مەلازاهیر)سەربووردەی ئەوڕۆژگارەی زۆر بۆ باسکردووم، لەوانە گێڕایەوە:

. حاجی ئیبراهیم کە خۆی یەکێ بوو لەوکەسانەی لەوهێرشەدا کەووتبووە بەر شالاوەکە، لەوکاتەدا بوورابۆوە نەیاندۆزیبووەوە وتەنیاخۆی ڕزگاری بووبوو، خەلکەکەی تر کە ژمارەیان زیاتر لە 150 کەس دەبوو،سەرجەمیان ئەنفال کران، پاشان حاجی برایم کە بە هۆش خۆی دێتەوە دەبینی کەس لە دەورو بەری نەماوە، پێش ئەوەی لە هۆش خۆی بچێ جوانە گایەك قەرار دەدات ..

کە گەڕایەوە بۆ لای ئێمە پێش ئەوەی هیچ قسەیەك بکات وتی :

- بڕۆن ئەو جوانە گایەم بۆ بگرن سەری ببڕن ، هەر خودا منی ڕزگار کرد، ئەگینا منیش وەك ئەوان دەستگیردەکرام و تیادەچووم..

لەبەر ئەو هەوالە ناخۆشە،سەرەرای برسێتیشمان هیچ تامێکمان لەوخواردنەنەکرد، سەروریش هاتوو،وەك دێوانەمان لێهاتبوو،بێجگە لەئاسمان هیچ ڕووناکیەکمان نەمابوو،بەبەرچاوی ئێمەوە لە دەشتی کۆیە جاش و سوپا گوندەکانی دەسووتاند، بەو شێوەیە برسیەتی تینی بۆهێناین، هیچ ئومێدێکمان نەما هیچ یارمەتی و هاوکاریەکمان پێ نەگەیشت،لە نێوان مردن و ژیان، ئێمە ژیانمان هەلبژارد و تسلیم بە ڕژێم بووینەوە.

# بەشی شەشەم



## بیرەوەری

## پارتیزانەکانی کەرکوک و سورداش



# پاریتزانیکی رەتلی سووورداش بیرەوەرییەکانی خۆی دەگێڕێتەوە

مامۆستاجلال تەلانی پارتیزانی دوای ئەنفال بەدووورودرێژی بیرەوەریەکانی رۆژانی پارتیزانی یاداشتکردووە، ئەمە بوختەی ناوەرۆکی یەکێك لە بیرەوەرییەکانییەتی:
پاش پەلاماری ئەنفال بۆسەر بارەگاکانی سەرکردابەتی(ی.ن.ك) لە دۆڵی جافایەتی شۆڕش دەکەوێتە قۆناغێکی ترسناکەوە.سەرکردایەتی شۆڕش بڕیاری کشانەوەی زۆربەی هێزەکان بۆسنوور دەدا،چەنددەستەیك بۆشەڕی پارتیزانی ئامادە دەکات، لەوکاتەدا مەڵبەندی سێ لەهەندێك ناوچەدا مابوون،لەهەندێك ناوچەی کەرکوك و گەرمیانیش چەند مەفرەزەیەك هەبوون،بۆئەوەی مەشخەڵانی شۆڕش نەکوژێتەوە، لەرۆژی 1988/5/25 مەکتەبی سیاسی)دەستەیەك پارتیزانی تردەنێرێتە خوارەوە، بۆکۆکردنەوی زانیاری وکردنەوەی بەرەیەکی نوێ، تاڕژێم ناچاربکەن بەکشانەوە لەبەرەکانی شەڕگەی مەڵبەندی سێی هەولێر،هەم فریای پێشمەرگە پەڕاگەندە و هەڤاڵان بکەون لەچەمی ڕەزان وناوچەکانی تر،ئەو مەفرەزەیەش ئەم هەڤەڵانەدەبن:

1. شەهید غریب هەڵەدنی(لێپرسراوی دەستە)
2. عوسمان حەمەکاکی
3. د.تەهاعبدولڕحمان
4. خلیل عمر
5. محمد کریم هەڵەدنی

6. ڕسوڵ محمد ساڵح (کۆچی کردووە)

7. ساڵح محمد ساڵح

8. جلال حمەساڵح (مامۆستا جلال تەلانی)

<u>جگە لەم دەستەیە دەستەی دووەم دەچن بۆ سنوری چیای ئاسۆس</u>

لە چیای(ئاسۆس) لە ناوچەی گەلاڵە) لێك جیادەبنەوە،ئەوسا چیای (گۆجاڕ) سوپای ئێرانی لێ دەبێ،سوپای عێراقیش بەچیای (ژیلوان)ەوە دەبێ،دەچنە بەینی هەردوو دەوڵەتەوە لەدۆڵی گەلاڵە پشوویەك دەدەن..

لەنێوان دووهێزی گەورەی عێراق - ئێراندا ژیان زۆر زەحمەت وگران دەبێ ، ئەگەری مردن زیاتر دەبێ لەژیان،چەند شەوێك لەبەینی دوودوژمندا دەمێننەوە، ڕێگای ئاودیوبوونیان ئاستەنگ دەبێ,بەدووربین بەینی دوو لوتکە دیاریی دەکەن، سوپای عێراق،ڕەبایە لەپاڵ ڕەبایەدەبێ،بە شەو و بە ڕۆژ تەقە بەسەریانەوە دەبێ، دەچنەخانویەکی ڕوخاوەوە،مانگایەکی (قاچ بەمین شکاو)ی بەجێماوی لێ دەبێ، هەندێکیان ئەڵێن: باسەری ببڕین و بیخۆین و نەجاتی بدەین ،دەبن بەدوو ڕەئی. لایەنی دووەم ئەڵێن: گوناحە.. بەڵام ئەنجام سەری دەبڕن ودەیخۆن..

کاك غەریب بۆ ماوەی سەعاتێك بەدووربین مراقەی دەوروبەر بەدەکات، ڕێگاکە تاقی دەکاتەوە,دەگەڕێتەوە بەهاوڕێکانی ئەڵێ:تاقیم کردەوە کەسی تێدا نییە ڕێگامان ئەبێت،ئەوانیش لێی دەپرسن: چۆنت تاقی کردەوە..؟

ئەڵێ: کەس دیار نەبوو بۆدڵنیابوونیش داڵێك بەسەر بەردەکەوە نیشتبووەوە،ئەگەر کەسی تیابوایە ئەوداڵە نەئەنیشتەوە،بۆ سەر لە ئێوارە کاك غەریب وعوسمان و مامۆستا جەلال دەچنە ناوەڕاستی شاخەکە,کاك غەریب خۆی ڕووت دەکاتەوە, بۆئەوەی ئەگەر دوژمن بینیشی وابزانێ دەعبای کێوییە,

دواترچەندمەترێك دەچێتەپێشەوە،سەربەودیودا شۆڕدەکاتەوە وگورج دەگەڕێتەوە،
ئەڵێن:چی بوو؟ئەڵێ:(ڕێگا هەیە،بەڵام زۆرسەختە،هەرچەندە باش خوارەوەم نەدی،
بەڵام وابزانم جوندییەك سەیری کردم،نازانم ترسا، یاخۆ چوو ئاگاداریان بکاتەوە،
باخێرابڕۆین...)بەپەلە دەگەڕێنەوە بۆلای هەڤاڵانیان،ئەوشەوەش لەوێ دەمێننەوە،
پێشتر چەند کۆنە قتووەیك گۆشت دەدۆزنەوە هەرچەند مێژووی بەسەرچوو دەبێ،
ئەڵێن: بابیخۆین،هەمووەیخۆن جگە لەمامۆستا جەلال ، کاك غریب ئەڵێ: کاکە تۆ
بۆنەتخوارد...؟ ئەویش ئەڵێ: نەك تەسەمومی کردبێ و بتانکووژێ بایەکێك
هەواڵەکە بباتەوە بۆ سەرکردایەتی...
کاك غەریب بەپێکەنینەوە ئەڵێ:(دەتەوێ ئێمەبمرین تۆش بڕۆیتەوە.؟ ئەوسا ئەڵێن
تۆ دەرمانت داونەتێ وکوشتووتن، تۆئەبیت بەخائین وئێمەش دەبین بەشەهید..
پێش سەربڕینی مانگاکەدکتۆرتەها گوتبووی گۆشتی مانگاکەخراپە،قاچی بۆگەنی
کردووە،زیاتر مەبەستی ئەوەدەبێ سەری نەبڕین،هەڤاڵێك ئەڵێ:
دکتۆر گیان من نامەوێ زانستی پزیشکی لەسەربخوێنم،برسیمەوحەزم لەگۆشتەو
ئەیخۆم،لەهەمووی ناخۆشتر ئاگریان پێ نابێت, یەك دەنکەشقارتەیان دەبێ ئەویش
لە لای دکتۆر تەهادەبێ،بەلەفاف و لۆکە دەیپێچێ، بۆئەوەی ئاگای لێ بێ نەشکێ و
نەفەوتێ،لەڕێ زوو زوو پێی ئەڵێن:وریابە نەکەوی،ئەویش ئەڵێ: خەمی منتانە..؟
یان دەنکە شقارتەکە...؟ لەپڕ لە هەر چوارلاوە دەبێ بەتەقە،وادەزانن کە هجوومە،
گیڤەوگیزەی گوللە بەسەریانەوە،خۆیان دەدەن بەزەویدا، پاش ماوەیەك بۆیان
دەردەکەوێ داروەونە ئەسوتێن و فیشەك وتەقەمەنی شاراوەیە ئاگری گرتووە،
بۆئێوارەدرنگ دەچنەسەرشاخ،لەێوە دادەبەزن،دەبینن ئەودۆڵەپڕە لەمەعەسکەرات،
هەڵەدن ویاخسەمەر مەتاری کۆپتەر لێیە،لە(چالاوا)مەتارهەیە.هەتاچاوبڕکات هێزە.
وەك ڕۆژی حەشەروایە،لەبناری چیای (ژیلوان) گیردەخۆن،ڕێگانابێ،پاش 15ڕۆژو

کۆکردنەوەی زانیاری تەواو دەگەڕێنەوە،بەئاگاداری هەڤاڵان دەچنەوە(شانەخسێ) چەن شەودواتر عێراق هجوم دەکات،تاسەر سنوور دەگرێت، ڕۆژێك مامۆستاجەلال نامەیەك ئەنووسێ بۆکاك غەریب،داوادەکات مۆڵەتی بدات لەسنوری(مەڵبەندی3)وە بڕواتەخوارەوە،بۆئەوەی سۆراغی کەسوکاری بکات،تابزانێ ماون یا ئەنفال کراون، ئەویش ئەڵێ:مەڕۆ ئەفەوتێی ،قەراربێ پاش چەند ڕۆژی تر خۆم مۆڵەتت ئەدەم، ئەگەر بانگیش کراین ئێوە مەیەن، حەقی خۆتانە.. لەپاش نانخواردن نامەیەك لەمەڵبەندەوە دەگات، کەئامادەبن بڕۆن بۆسنووری (مەڵبەندی3).

- پاش چەند ڕۆژێك مامۆستاجەلال دەچێ بۆ (سورەدێ)هەرچۆنێك بێ هەواڵی کەسوکاری دەزانێ و ودەربازیان دەکات بۆ ئێران و دەگەڕێتەوە...

- ڕۆژی 1988/8/8 ناخۆشترین ڕۆژدەبێ،دوژمن هەموو هێزی خۆی لەخواروو و ناوەڕاستەوەدێنێ وهێرش دەست پێدەکات،کاك ئازادهەورامی وکۆمەڵێ پێشمەرگە شەهیددەبن ،ڕۆژێك شەهید غریب هەڵەدنی بانگی مامۆستا جەلال تەلانی دەکات: وەرە مژدەت دەمێ ئاواتەکەت هاتەدی، ئەپرسێ : ئاواتی چی..؟

ئەڵێ: بابڕۆینەوە چایەك بخۆین، بۆت باس ئەکەم، لەگەڵ کاك غائیب دەچنەوە بۆ ماڵی کاك غەریب،پێیان ئەڵێ:( دوێنێ لای کاك نەوشروان بووم کارێکی زۆر مەزنی لێ داواکردووم.. ئێوەم لەگەڵدابن لە 90٪ خۆم بەسەرکەوتوو ئەزانم، هەرچەندە ئەشزانم کارەکەم سەختە،کوری خۆتان ئاسایی دەوێ..)ئەوانیش دەپرسن: ( کێی ترمان لەگەڵدایە..؟ )ئەویش ئەڵێ: (خۆمان بەڕاوێژ دیاری ئەکەین، ئەبێ ژمارەمان کەم بێت وباشتروایە سەڵت بن، کوڕی لادێ وهوشیارو خۆڕاگربن،ڕەنگە(9) مانگ زیاتریشمان پێ بچێ..)خۆیان ئامادەدەکەن وناوەکانیان دەبات بۆلای کاك نەوشیروان. هەتا لێپرسراوی ڕێکخستنی لێ ئاگاداربکاتەوە...ئامانجی ئەمجارەیان

بریتی دەبێ لە جۆشدانەوەی جەماوەر و پەیوەندی شارو شاخ لەڕێگای بێتەلەوە, لەشاخی(پیرەمەگروون)ەوە بۆ(م.س) وبەپێچەوانەیشەوە..

- هەموویان دەچنەوە بۆ لای کاک نەوشیروان ،ئەویش ئامۆژگارییان ئەکات و ئەڵێ: یەکەم شت پشت بەخزم ببەستن..خۆ ئەگەرخزمبێ و تەنزیمیش..بێت ئەوە باشتر. ناوی چەندهەڤاڵێکی دەدەنێ ،لەوانە هەڤاڵ(رئوف حاجی احمد)و(رسولێ تەلانی) و ( خدر جاف )و (بەرزانی قالە خلۆز )و( کامل )

- لەئۆردوگای (پیرشێخ) وێنەیەك دەگرن ودوعاخوازی لە کەسوکاریان دەکەن،دەبێ بەڕۆژی حەشر.وەك بۆ سێدارە ببرێن وادەبێ، بەتایبەتی غریب هەڵەدنی و محمد حاجی کریم خێزاندارەبن,ئەوانی تریان سەڵت دەبن،دەڕۆن بۆ قاسمەڕەش وزەڵێ بۆ ئەوەی پارە بۆمەسروفاتی خۆیان وهاوکاری بۆ خێزاندارەکان سەرف بکرێت. بەکاك نەوشیروان ئەڵێن:هەندێ پێویستیمان ئەوێ وەك دووربین شەو وکیسەخەوو جلی بارانگیر و پێڵاوی ئەدیداسی سووپایی... ئەویش ئەڵێ: جا لەکوێم بوو..؟ بڕی سێ هەزار دیناریان بۆسەرف دەکەن وشتی پێویست دەکڕن ودەکەونەڕێ. لە17/ 10/ 1988 دوو دەستە لەپارتیزانەکانی ڕەتڵی سورداش و ئاسۆس وەك وەجبەی دووەم لەسەر سنووری ئێرانەوە بەڕێ دەکەون.

(تا1989/7/14لەخوارەوە دەمیننەوە،ئەمە یەکەم مەفرەزە بوو،کەماوەی زۆر بێت.)

لەسەرسنوور(سویا) ڕێیان دەگرن و ناهێڵن بڕۆن ،هەربۆیە چەندشەوێك دەمێننەوە. ناچار بەناوی هەدییەوە بڕێك پارەی عێراقییان دەدەنێ،ئەوجا پێیان ئەڵێن:ئێوە شەوبڕۆن ئێمەش هەندێك تەقەتان بەسەردائەکەین،ئەڵێن بەدزییەوە ڕۆیشتن، لەچەمی هەرزنەوە دەپەڕنەوە ئەوبەری سنووری دەستکرد،کەهەمووی ڕەبایە دەبێ، ئەوشەوە دەچنەئەشکەوتی(بێترخێ)لەبەری ئاسۆس ونەجاتیان دەبێ.

دەستەکەی ئاسۆس ئەم پارتیزانانە دەبن:خالیدمحمدامین سۆڤ(خالیدکۆمەڵایەتی)

.ابوبکرقادرابراهم،احمدسالح احمد،قادرحەمەسعیدپیرۆت،سابیرحەمەامین یاخیانی، اسماعیل محمود،دەرۆن بەرەوناسۆس،دەستەی(سورداش)یش بۆشاخی ژیلوان، شەو وڕۆژێك لەوێ پشوودەدەن.هاوكات چەند مۆڵگەیەكی ڕژێم شوێنەكانیان چۆلدەكەن,ئەوانیش دەچنە جێگاكانیان،هەندێ خواردن وتەقەمەنی لەوانە(مین) كە زۆر پێویستیان پێدەبێ بەجێ دەمینێ،دەست دەكەن بەكارەكانیان، هەرچی خواردنی بەجێماوە كۆی دەكەنەوەو لەچەندشوێنی جیاجیا بنكە دادەنێن، خۆیان بۆ هەموو ئەگەرەكان ئامادەكەن.دوایی دەچنەچیای پیرەمەگروون، لەوێوە سەیری ئۆردوگای پیرەمەگرون دەكەن.زۆر دڵخۆش دەبن. هەوای ئازادی ساف و پاك وخاوێن هەڵدمژن،شەهیدبوون بەگەورەترین مەدالیادەزانن،كە سەیری گوندی سووتاو و چۆڵ وهۆڵ دەكەن هەرچی یادگاری كۆن هەیە وەك شریت بەبەرچاو و خەیاڵیاندا دێ ودەچێ.خۆزگە بۆڕۆژی ئازادی ئەخوازن وخۆیان بەپاڵەوان ئەزانن، هەركەسەیان خۆی بە گیڤارایەك دەزانێ، بگرە لەگیڤارا زیاتریش.چوونكە گیڤارا لەولاتی چۆڵ وستووماكدا شۆرشی نەكردبوو..

دوای گەیشتن بە چیای پیرەمەگرون سێ هەڤاڵیان جیا دەبنەوەو دەگەڕێنەوە بۆ سنووری ئێران،ئەوانیش(خدرمحمودجاف)و(بەرزان قالەخەڵون)و كاك (كامل)دەبن..

لە دوای رۆیشتنی هاوڕێكانیان، لە سەر چیای پیرەمەگرونەوە سەیری چواردەوری ئۆردوگاكە دەكەن ،تابزانن كوێ چۆڵە وكوێ ڕەبایەی لێیە،بۆئەوەی شەو دابەزن و هاوڕێیانی ڕێكخستن بدۆزینەوە،پەیوەندی درووست بكەنەوە...

پاش پشودان وخۆشۆرین وریش تاشین خۆیان ئامادەدەكەن بۆچوونەوە ناوخەڵك. بۆ ئەوەی لای نەیاران نەناسرێنەوە, بۆهەر یەكەیان ناوێكی نەهێنی دادەنێن.. ناوی كاك غەریب دەكرێ بە(خەباتەبچكۆل)بڕیار دەدەن ناوەكۆنەكان بەكارنەهێنن، یەكەم لەبەرسەلامەتی كەسوكار.دووەم بۆ ئەوەی تێكەوتن نامۆنەبن بەخەڵكەكە.

سێیەم خۆیان وەك جاش وبەشێوەی سەرسەری نیشان بدەن ,کە بەکۆڵانەکاندا ڕۆیشتن بەدەنگی بەرز موعیدبەردەرکی سەرا بۆیەك دابنێن، بۆ ئەوەی خەڵك گوێیان لێیان بوو وابزانن چەکداری ڕژێمن.چوارەم ناوی نهێنی گەڕانەوە بۆ شوێنی دیاری کراو دیاری دەکەن...پاش ڕاوێژو و تەگبیر،ئێوارە دادەکشێن بۆخوارەوە، هەموویان نەشارەزادەبن، بەوشوێنەدا کەئێستا بەشێك لەشارۆچەکە کەیە دەکەونەرێ ،جگە لە تاقم و تفەنگ کۆڵەپشتی خاڵیشیان پێدەبێ،هەمووچەکانیان سواردەبێ.یەك یەك بەدوای یەکدا دەچنەخوارەوە،تانزیك جادەی گشتی، لەوێ دەبن بەدووبەشەوە،بەشێکیان لەقەراغ شەقامەکە دەبنە کەمین، تەنها شەقامەکە لەگەڵ ڕەبایەکان بەینیان دەبێت، پێشمەرگە هۆشیاروبەئاگا،ئەوانیش بەدیار ئاگرەوە خەریك خۆگەرم کردنەوە دەبن. غەریب هەڵەدنی وفەریق هەڵەدنی وعوسمان گێچینەیی و مامۆستا جەلال تەلانی لەبەینی دوو ڕەبایەوە بەژێر پردەکەدا کەشەقامی سەرەکی شارۆچکەکەبوو،دەچنە ناو ئۆردوگاکەوە، بەشێوەی گیاندار بەچوار چنگۆڵە دەڕۆن،هەرچۆنێك دەبێ دەگەنە بندیواری ماڵەکان،بەلای ئەوماڵانەدا دەڕۆن کە خانووەکانیان تەواونەکراو دەبێت، ئەزانن ئەوانە ماڵەهەژارن و حەوشە و حەساریان نەیە،دەچنە بەرماڵێکی قەرەباڵغ، دەبینن جوانەکایان سەربڕیوە.کاك غەریب بەدووربین سەیریان دەکات,هیچ لەوناوە نابینێ،دنیایەکی کش ومات.یەکسەر بێدەرگا لێدان دەچنە حەوشی ماڵێکەوە.. ژنێك هەڵدەسێتە سەرپێ و دەپرسێ برا ئێوە کێن؟؟...

کاك غەریب یش ئەڵێ:منم.. غەریب هەڵەدنیم،یەکسەر باوەشی پێدا دەکات و ئەملاوئەولای ماچ دەکات.لەبەر ئەوەی میوانیان دەبێ دەیانباتە ژوورێکی تر، لەوێ نان دەخۆن،بەچپەوە پێی ئەڵێن:کاك خەباتەبچکۆل بۆگوتت من غەریب هەڵەدنیم..؟

ئەویش ئەڵێ:ئەمە ئامۆزامە،خوشکی بەکری لەگەڵ خۆمانە،میوانەکەش مامی ئاسۆ سورداشی دەبێ،پاشان حواب بۆ هیواسورداشی هەم خزم و هەم ڕێکخستن و هەم پیاوێکی دڵسۆز دەنێرن،لە مەوعیدێکدا بچێ بۆ(دۆڵەبی)لەچیای پیرەمەگروون. خواردن وپێداویستی هەفتەیەك هەڵدەگرن و دەگەڕێنەوە لای هەڤاڵانی کەمینەکەو خێرا بەرەوچیا،بۆبنکەکەیان دەگەڕێنەوە،بەم کارە زۆر دڵخۆش دەبن،لەوە بەدواوە بڕیاردەدەن کەبەسەرەبچن بۆناو شارۆچکەکەوهەرچییان بینی بۆیەکتری بگێڕنەوە, شەوێك کاك غەریب دوای گەڕانەوە دەگێڕێتەوە:هاوڕێیان.!(ئەمشەوکەچوینەماڵێك خەوتبوون،ماڵەکەمان هەڵساند ناسیاو بوون، حاجێکی لەخواترس بوو،بەژنەکەی گووت چیمان هەیە لەخواردنی ناش بیاندەیەو بۆیان بپێچەوە،بەڵام من بەتانی یەکە لە سەرچاوم ناکەمەوە، ئەگەر بەیانی لەمونەزەمە بانگم بکەن وسووێندم بدەن، سوێندئەخۆم نەمدیوون،سوێندەکەم لێناکاوێ..چوینەماڵی پیاوێکی بەتەمەنی تر، بەدەم جگرە تێکردنەوە سوپاسی کردین و هیوای سەرکەوتنی بۆ خواستین.. وتی پێنج فەرزە دوعاتان بۆ ئەکەم سەلامەت بن،بەخوا ئێوەنەبن سەدام لێرەشمان ناهێڵێ،بۆجنووبمان ئەبات..ئەوکەمە شەرەفەی هەمانە ئەوەیش نامێنێ.. ڕووڕەشی دنیاو قیامەت ئەبێ. ووردەووردە فرمێسك بەچاویا ئەهاتە خوارەوە..) ئەوشەوە شەوێکی زۆر سارد دەبێ،هەرچی گەڵای دارهەیە وشك هەڵدەکرووژێ, لەدوای ڕۆیشتنی پارتیزانەکان مام حاجی ئەچێتە حەوشە،بەوسەرمایە هەرچەندی ئەکن بۆیان ناچێتە ژوورەوە. ئەڵێن نەخۆش ئەکەوی،ئەڵێ نایەم خۆمن لەوکوڕە گەنجانە زیاتر نیم،ئێستا لەو شاخە پڕلەبەفرەن خۆ لەکۆشکانین بەهاوین سەرمایە، چ جای ئەم شەوەسەختە بەهەرحاڵ دوایی دەیبەنە ژوورەوە، پێیان گووتبوو: ئەوانە گەنجن و ڕاهاتوون..

شەوێکی تر دەچنەماڵێکی دۆستی خۆیان،خاوەن ماڵەکە پێیان ئەڵێ:

بادراوسێکەمان پێ نەزانێت، چونکە پیاوێکی خراپە..دوایی خەبەرمان لێ ئەدەن. نەی زانیبوو ئەوانیش هاوکاری پارتیزانەکانن..هەردولا دڵسۆز وماڵی چاك دەبن، لەترسی ئەوەی گومان لەیەکتر نەکەن هەردوولایان خۆیان بەپیاوی ڕژێم دەناسێنن،

- پاش چەند ڕۆژ چاوەڕوانی هەڤاڵ هیوا دیار نابێت،زۆر بۆی نیگەران دەبن،دەبێ نەگیرابێ..؟ یان دەبێ بێ وەعد بێ، هەرچەندە لێی ڕائەبینن،دووبارە دەچنەوە بۆ ناو ئۆردگا.هەواڵی دەپرسن..ئەڵێ: چوم بۆ دوکان لەوێوە بێم بۆ گوندی دۆڵەبی پرسیارم لەناسیاوێکی خۆم کرد لەکوێوە بڕۆم .

گووتی:ئەوەتێکچوی..؟گووتم بۆ..؟گووتی هەرچی گوندهەیە هەمووی سووتاوە و ناوچەکە موحەرەمەیە، بزانن ئەتگرن، گەڕامەوە تۆزێك دڵم لەئێوە کرمێ بوو، نەیزانیبوو جگە لەگوندی(دۆڵەبی) دۆڵێکیش لەچیای پیرەمەگروون بەوناوە هەیە.

- دوای ماوەیەك پەیوەندی بە کاك(بارام)ەوە دەکەن و لەرێی ئەوەوە شار وشاخ بەیەکەوە دەبەستن.هەڤاڵانی شاریش پەیوەندی پێوە دەکەن، بۆسەلامەتی خۆشیان هەڤاڵێك بەرەو ڕوویان دەکەنەوە،بۆ ماوەیەك دەگەڕێنەوە بۆ دۆڵی جافایەتی، لە(م.س )وە پەیوەندیان پێوە دەکرێت، کەهەڤاڵانی (هەردی) وەزعیان باش نی یە فریایان کەوون.هەردی هەڤاڵ (کوێخا سیروان )وهاوڕێ کانیان دەبن،پەیوەندییان پێوەدەکەن, شوێنی دیاریکراویشیان بۆ دادەنێن لە چیای پیرەمەگروون،دەستەیەك دەچنەوە بۆشوێنی دیاری کراوە,دەبینن نەهاتوون و نەپەیوەندی بێتەلیان ماوە, دووبارەپەیوەندی دەکەنەوە،ئەڵێن:ڕێمان هەڵەکردوە وپاتری جیهازەکەمان مردووە، دووبارەچنەوە بەدوایانداو دەیان بەن بۆبنکەی ژیلوان هەموو وەزعیان خراپ دەبێ، لەڕولاوازو چڵکن وکوڵکن،جل وبەرگ وپێڵاودڕاو،چەندشەوێ لەوێ پشوودەدەن و دەحەسێنەوە،هەڤالانی سورداش دەچنەوە بۆئۆردووگا، سی جووت پێڵاو وهەندێ پێداویستی تریان بۆدێنن، هەندێکیان ئامادەنابن خۆیان بگۆڕن,ئەڵێن:

با سەرکردایەتی بابزانن حاڵمان چۆن بووە,هەنگوین ونانی باشیان دەدەنێ،بۆ ئەوەی گوریان بەبەردابێتەوە.نازانن کە چ ڕێگایەکی دووریان لەپێشەوە ماوە ئەوان شارەزانابن ولایان ئاسایی دەبێت.کاك غریب هەڵەدنی بانگی هاوڕێکانی دەکات، ئەڵێ:(تازووە ئەم هێزە بەڕێکەن,نەك بەئێمە گوندکانیش بمانایە لەچەند ڕۆژێك زیاتر بەخێو نەئەکران)

داوا لە کاك سالارو مامۆستا جەلال تەلانی دەکات (بیان گەیەننە سەر چەم و بیان پەڕێننەوە وپشوویەك بدەن وبگەڕێنەوە، عوسمان محمودیش لەگەڵ خۆیان بەرن, کوڕێکی دڵسۆزو وریایە،سالاریش خێزانداره باسەر لەماڵەوە بدات،چونکە سەڵت و خێزاندار جیاوازن، هەدیەیەکیش بۆفاتمەخانی هاوسەرم ئەنێرم بەدەست خۆتان بیدەنێ،ئامانەتەلاتان، تەنها لەشەهیدبوون لەئەستۆی ئێوەنییە..)ئەوانیش ئەڵێن: بەسەرچاو،بەڵام لەگیرفان زیاترنەبێ،لەدڵی خۆیاندا ئەڵێن:ڕەنگەپارچەئاڵتوون بێت، دەبینن شریتێکی(تەسجیل)ە.دەیکاتە ناو گیرفانی مامۆستاجەلال تەلانی وخۆشی گیرفناکەی دادەخات، کە دەگەنەوە دەیدەنەدەست فاتمەخان...

مامۆستاجەلال دەپرسێ: فاتمەخان ئەودیاری یە چی یە..؟ ئەوەندە گرنگ بوو لای کاك غریب ،زەردەیەك دەکات و ئەڵێ: گۆرانی(بەرهەم حەسن)ە تازە دەرچووە ، منیش قەڵەم جافێکم بەدیاری بۆی کڕیوە,کەی گەڕانەوە بۆی ببەن .

ئای لەوخۆشەویستی یەی نێوان لەیل و مەجنوون، پاش لەدایك بوونی پێنج منداڵ نامەو هەدیە بۆیەك ئەنێرن،دیارەخۆشەویستیشیان وەك خەباتەکە بەدڵسۆزی بووە.

- ڕۆژی 16 /12/ 1988خواحافیزی دەکەن وبەرێ دەکەون،هەڤاڵ غریب پێیان ئەڵێ:

ئاگاتان لەخۆتان بێ،بەقسەی ئەوان نەکەن،خۆتان چۆنتان پێ باش بوو وابکەن، ئەمانە شارەزانین،هەرچەندهێزێکی دڵسۆزن بەڵام مووتەفەڕیقەن، ژمارەشیان بۆ پارتیزانی زۆرە(31)کەسن. 34 کەس ودووهێسترو گوێدرێژێك .قافڵەیەك لەژیلوان

سەردەکەون، مامۆستا جەلال باسی ڕێگاکەیان بۆدەکات،پێیان ئەڵێ:

(لەهەندێ شوێن بەرۆژ دەڕۆین،لە هەدێکیش بەشەو،ژەمی نانێك بخۆن،لەیەك دانەبڕێن، ناوچەکە چڕو شاخاوی وکوێستان و بەفرە،هیچ دەست ناکەوێ، ئەوەی کۆڵی خۆمان نەبێ نیە)لەپڕیەکێك ئەڵێ:(ئەرێ وەللا خلیل دوونانی خوارد) بانگی دەکەن بۆ دوونان.؟ ئەڵێ: زۆرم برسی بوو،ناوی یەکێك لە هەڤاڵەکانی دێنێ گوایە دوو نانی بان شوان قەرزارە..وەك ئەوەی ئەوکویستانە نانەواخانەی لێ بێت..!!

- بەدۆڵی شخ محمدا دەڕۆن،مامۆستا جەلال لەپێشەوە، هەڤاڵ سالار لەدواوە،هەور خۆی کۆدەکاتەوە،باران دەست پێدەکات،دەگەنە دۆڵی پشت گەلاڵە،سپیلك ڕەبایەی پێوەدەبێ،ڕوودەکەنەرەبەن،بۆ شەو دەچنە ناو ئەشکەوتێك،دەمی ئەشکەوتەکە بچکۆلە و لەناوەوەگەورەدەبێ،هەرچۆنەبێ‌ئەوشەوەی تیا دەگوزەرێنن، بەیانی زوو تاریك وڕوون دەکەونەرێ، بەفربارین دەست پێدەکات، دەیکات بەکڕیوەیەکی سارد، ترسیان لێدەنیشێ ئەگەر شەویان بەسەردابێ هەموویان تیابچن.

- لەکۆڕەوەکەدا هەر لەو ڕێیە بەسەدان خەڵك لە(گۆمەداڵ) ڕەق بوو بوونەوە، بۆیە ئەمانیش ناهەقیان نابێ نیگەران بن،زۆر دەترسن،چونکە هەڤاڵان خەڵکی پێدەشتی گەرمیان دەبن،سەرما بۆئەوان ئاسان نابێ..لەپڕ هەڤاڵێك خۆی دەدا بەزەویدا ئەڵێ: بم کوژن ناڕۆم،مامۆستاجەلال وکوێخاسیروان لێی دەپاڕێنەوە،هیمەت بداتەخۆی، ئەوجا هەڵدەستێتەوەو دەکەوێتەڕێ،کاك وریا ئاغجەلەری گوێدرێژێکی پێدەبێ، لەبەفرەکەدابەجێدەمێنێ،دیسان مامۆستاجەلال ئەڵێ:(ئەوەندەمان نەماوە هیمەتێ) یەك لە کاروانەکە جنێوێك دەدات و ئەڵێ: (ئەم گ..ە هەرئەڵێ ئەوەندەمان نەماوە..) هەرچەند گوێشی لێدەبێت بەڵام لەبەر دڵسۆزی خۆی هیچ وەڵامێکی ناداتەوەو ماوەیەکی زۆر بەفردەشکێنێ،بەهەرحاڵ لە بەفرە زۆرەکەنەجاتیان دەبێ و خۆیان گەرم دەکەنەوە،هەتا ئێوارە لەناو ئەشکەوتی(بێترخی)دەمێننەوە،چاوەڕوان دەکەن

تا درەنگ دابێت و شەوبەرامبەر(گەناو)بەرەو (ئیسێوێ) بڕۆن،شاخی (تەوراسە) لەوبەرەوە ڕەبیەی عراقی پێوەدەبێ،بەرەو چەمی(هەرزنە) دەڕۆن،لەوبەرەوە گوندی هەرزنە سەربە ئێران و لەم ەریشەوە چیای(بەرگورد)ڕەبایەی عراقی پێوەدەبێ، دەبوو بەبەینی ئەوڕەبایانەدا بڕۆن،کەهەر 500م ماوەی دەبێ، ئەگەر هاژە هاژی ئاوەکە نەبووایە ڕەبایەکان گوێیان لە لەچرپەی کاروانەکە دەبوو، مەترسی کەمینی ڕژێم و ئەلغامیش لەوە ناخۆشتر،پاش ئەوەی دڵنیا دەبن کە کەمینی لێ نییە، دەچنەسەرئاوەکەی سەفرە،پێش ئەوەی بگەنەچەمەکە،دەزانن ئەوەندە زۆرەناتوانن پێیدا بپەڕینەوە، بەوتاریکە شەوە بە ڕێگای پێچاو پێچدا ، روودەکەنە (سورەبان) ڕێگاکەیان زۆرچڕو زەبەند دەبێ،مامۆستاجەلال تەلانی بە کاك کوردۆئەڵێ :

ئێرە هەمووی ئەلغامە ، ئەتوانی هەڵیان بگریتەوە..؟

ئەویش دەپرسێ: بۆ ڕێگای ترنییە..؟ ئەڵێ: نەخێر..کوردۆ ئەڵێ: کەوابێ چارنیە خۆم ئەبەخشم بەهەڤاڵەکانم.هەڤاڵان رادەگرن وداوایان لێدەکەن دەنگەدەنگ نەکەن، جگەرەنەکێشن،لایت لێنەدەن..دەست دەکەن بەهەڵگرتنەوەی ئەلغامەکان،دە دوانزە دانەهەڵدەگرنەوە،مامۆستاجەلال دەگەڕێتەوە بۆلای هەڤاڵان،پێیان ئەڵێ:

بەشوێن مندا وەرن،لانەدەن..چەندمەترێك دەچنەپێشەوە،لەتەنیشت کاك کوردۆ وە زرمەیەك هەڵدەستێ،ئەوناوە روناك دەکاتەوە ،مامۆستا جەلال بەئاسماندا دەبات، کەچی ئەو بانگ دەکات :کوردۆتۆ ماوی..؟ ئەویش ئەڵێ:

من سەلامەتم ئەی تۆ..؟ مامۆستا ئەڵێ:(قاچێکم پەڕیوە،هەرتۆزێکی پێوە ماوە، وریابە،چەکەکەم کەوتووە،بمدەوە...! زۆر وریابە فیشەکی لەبەرە)

هەڤاڵان لەگەڵ دەنگی تەقینەوەکە دەکشێنەوە،وادەزانن کەمینە.بەڵام سودێکی ئەلغامەکە ئەوەدەبێ لەبەر شەوقەکەی ڕێگای خوارەوەیان بۆ روناك دەکاتەوەو لەئەلغامەکانی ترلادەدەن.مامۆستا جەلال بە شاخەکەدا بەقنەخشکە شۆڕدەبێتەوە،

جەماعەتیش بەدوایانداده‌ڕۆن، بەوە باش دەبێ ڕەبیەکان وادەزانن دەعبایە،چونکە پێشتر زۆرجار دەعبا ئەلغامیان تەقاندبووەوە، مامۆستاسواری هێسترەکە دەکەن و دەچنە سەرئاوی هەرزنە،کەتەماشای دەکەن،دەبینن لەوێش بوواری پەڕینەوە نییە، ساڵی پێشوو هەرلەوشوێنە 12 پاسداری ئێرانی خنکابوون.کاك مستەفاچالاوی و یەکێکی تر،دەیانەوێ تاقی بکەنەوە،هەردەگەنە قەراغ ئاوەکە خەریك دەبێ بخنکێن، دوای ئەوەی نائومێد دەبن بەناچاری چەندسەد مەترێك بۆسەرەوە.تولەڕێگایەکی بزنەڕێ دەدۆزنەوە وئەچن بۆشوێن سیمەکەی کە(مام) کاتی خۆی پێیدا پەڕیبۆوە، ڕێگاکە بۆ ڕۆیشتنی هێسترکە باش نابێت،هەربۆیە هەڤاڵ مستەفاچالاوی هەندێك دەیکاتە کۆڵ و تواناى نامینێ،کوێخاسیروان ئەڵێ:ئەکەرهەر کەسێك هەڵی بگرێت.. دووچەکی بەدیاری ئەدەمێ، کەس تواناى نابێت،ناچار هەندێك بەخشەخش دەڕوا، بەدەم ڕێوە ئەڵێ: بەخوا ئەگەر هەمووتان بریندار بوونایە یەك یەك لەکۆڵم ئەکردن و دەرم دەکردن.. کوێخاسیروان ئەڵێ:بەخوا باوکم ڕاستە،دوای ئەوە دووکەسیان دەچنەبن باڵیەوە،دەیبەنە پەنایەك،هەڤاڵ(حەمەسەقەر)دەمارەکانی دەبەستێ و تیماری دەکات.هەموو دوعای بۆدەکەن سەلامەت بێت و شەهید نەبێ،بەدەم پرتەوە بۆڵەوە ئەڵێن:بەس ئەم شەهیدبێ کەسمان دەرناچین،نانیشیان کەم دەبێتەوە، بارانیش هەراسانیان دەکات. بێتووش مەقەڕی (مام جوتیار)ی لێ دەبێ. دوو(پ.م) بەهانایانەوەدێن. بەلام هیچیان بۆناکرێ ،هەرلەوبەرەوە ئەڵێن:

ئێران ڕێگانادا سیم ببەستین ،ئەی چی بکەین..؟

مامۆستا جەلال بەوحالەیشەوە ئەڵێ:( بڕۆن چووپ ودارمان بۆ بهێنن کەڵەك دروست ئەکەین.یان لەوگوندانە خەڵکی شارەزاو مەلەوان بهێنن پارەیان بدەنێ.) دەڕۆن و دووبارە دێنەوە،ئەڵێن: ئێران ڕازی نییە، بگەڕێنەوە بۆلای قەلادزێ..

مەجالی گەڕانەوەشیان نابێت.بۆڵە بۆڵ و مەقۆ مەقۆ پەیدا دەبێ، مامۆستا جەلال ترسی لێ دەنیشت،داوادەکات کلاشینکۆفەکەی بۆ بهێنن،ئەڵێن: بۆچیتە..؟ ئەڵێ: ئەیخەمە ژێرسەرم. ئەڵێن:ئەبێ ژێر سەرت نزم بێت نابێ بەرزبێ،مامۆستا تفەنگی بۆ ئەوە دەبێ ئەگەر ئاشکرابوون نەکەوێتە دەست دووژمن و خۆی پێ شەهیدبکات،مامۆستاجەلال رووبیان لێدەکاتەوە وئەلێ:(لەموعدی خۆمان لاماندەوە، ئەمڕۆ هەڤالان پەیوەندی ئەکەن بە(م س) ەوە ئەوان ڕیامان ئەکەون، خۆڕاگرین، ئەگەر زۆربرسیتانەودەتوانن هێسترەکە سەرببڕن و بیخۆن)بەڵام نانتوانن، بەناچاری هەرچی نانە، کۆی دەکەنەوە. تا چەندهەڤاڵێك بگەڕێنەوە بۆ لای کاك غریب و جوابەکەیان بدەنێ،شەهید ئاکۆسوور و خەلیل بیدەری و دووانی تردەگەڕێنەوە ، بۆدۆڵی جافایەتی،بۆ بەدبەختی لەدوای ئەوان جاش وجەیش دەچنەسەر بنکەکان، هەڤالان شوێنەکەیان چۆڵ دەکەن، دەشزانن کاروانەکە نەگیشتۆتە سەرسنوور.. گومان دەکەن کەوتبنەکەمینەوەو دیلیان هەبێ و خەبەریان لێ دابن، بەهەرحاڵ بروسکە دەکەن بۆمام جوتیارو پەیوەندییەکان لەسەردەشت،ئەوان دەچن وسیمیان بۆ دەهێنن و هەڵی دەبەستن.یەکەم کەس هەڤاڵ (مام علی حەیران)دەپەڕێننەوە، دووەم کەس مامۆستا جەلال. نان وهێلکەیشیان بۆدێنن ،مامۆستا ومام علی لەگەڵ ولاخدارەکە دەچنە (هەرزنە)،بۆ شەو لە مەقەڕی مام جوتیارەوە دەچنە سەردەشت، لە وێوە مامۆستا جەلال تەلانی داخلی نەخۆشخانەی دەکسەردەشتی دەکەن،دواتر دەیبەن بۆ نەخۆشخانەی مەهاباد و لەوێ چارەسەری پێویستی بۆ دەکرێ..

پاش چاك بوونەوە دەگەڕێتەوە بۆئۆردوگای (پیرشێخ)و دیارییەکەی (کاك غەریب) دەگەیەنەتە دەست (فاتمەخان).

دوای ئەوان دەستەیەکی تر بەرەو لای هەڤالانی کەرکوك وسورداش بەڕێ دەکەون.

* سەرچاوە: بیرەوەری مامۆستا جەلال تەلانی

# هاتنەخوارەوەی پارتیزانەکانی کەرکوك

زۆربەی پارتیزانەکانی سنووری کەرکوك،بیرەوەرییەکانی خۆیان یاداشت کردووە، ئەوبیرەوەرییانەی بۆ ئەم بابەتە من سوودم لیٚ وەرگرتوون بیرەوەرییەکانی پارتیزان (شەهید ئاکۆسوور وفەخرەدین سمایلبەگی ونەقیب بیبانی وپۆلاهەیبەیی وحەسەن شورتەوعوسمان سیدەری وبیستوون سابوراوەیی وهیوارەش وچەندهەڤاڵی تر.)ن دەمەویٚ لێرەدا پوختی کۆی یاداشت وبیرەوەرییەکانیان لەم بابەتەدا چڕ بکەمەوە:

- دوای ئەوەی پێشمەرگەکانی 21ی کەرکوك و 25ی خالخالان وهەموو تیپەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان لەبارەگاکانی قەندیل و درێژایی سنوور جێگیرکران.. هەواڵی مانەوەو بەرگری ئەو دەستەپارتیزانانەی خوارە ،ئومێدی هێنابووەوە ناخی ئەوانیش،هەربۆیەزۆریان بیریان لەدروستکردنی دەستەی تردەدا وئامادەیی خۆیان دەردەبڕی بۆ گەڕنەوە بۆ سنوورەکانی خۆیان.

کاك ئاکۆسووریش دوای ئەوەی بیرلەوە دەکاتەوە لەگەڵ دەستەیەك لەهاوڕێکانی بگەڕێنەوە بۆ سنووری کەرگوگ،سەرەتا راوێژبەهاوڕیٚ نزیکەکای خۆی دەکات، دواتر بریاردەدەن پرسوڕا لەگەڵ هەندیٚ لەهەڤالانی کەرکوك بگۆڕنەوە،ئێمە ماڵمان لە(نەغەدە)بوو،خۆم وخێزان تازە لە نەخۆشی گرانەتا هەڵسابووینەوە،هاتە ئەویٚ بۆ ئەوەی راوێژ لەگەڵ ئێمەیش بکات،بیرۆکەکەی خستە ڕوو، من لەگەڵ هەندیٚ ئامۆژگاری و تێبینی .دەستخۆشیم لەهەڵوێستی خۆی و هاوڕێکانی کرد...

شەومیوانی من بوون وبەیانی لەگەڵ هەڤالان(فاقەمەخموری) و(حەیدۆ)چوون بۆ (قاسمەڕەش) لەویٚ چەندهاڤالێکیان بینی بوو،پرسوڕایان پیٚ کردبوون،یەکێك لەلێپرسراوانی کەرکوك،خۆی لێیان تووڕەکردبوو،نەك هەرپێی باش نەبوو بوو، کۆمەڵێك قسەی نەشیاویشی پیٚ کوتبوون.

بەڵام ئەوان بڕیارێك بوو دابوویان،سەرەتای مانگی ئایاری 1990بوو،لەگەڵ کاك نەوشیروان کۆدەبنەوە و کاك نەوشیروانیش رازی دەبێت لەسەر چوونەخوارەوەیان بە پارتیزانی،بۆ ئەومەبەستە بەڵێنی هەمووهاوکاری وپشتگیرییەکیان پێدەدات.

- ئیتر لەوێ خوولێکی هەڵگرتنەوەی مین وبەکارهێنانی تەقەمەنی وبرینپێچی وراهێنانیان بۆ دەکاتەوەلە 12 5/1990 تا1990/5/24 لەلایەن(د - شوان - خدری محموودجاف...)وە راهێنانیان پێ دەکرێ..

- سەرەتای مانگی حوزەیرانی1990 هەموو کەلوپەل وپێداویستییەکانیان بۆ ئامادەدەکرێ..کەبریتی دەبێت لە (جیهازێکی راکاڵ،دووربینی شەو،چەند چەکێکی سووك،تەقەمەنی...) بۆسەلامەتی پەیوەندی هێڵ وشەپۆلی تایبەت و ناوی نهێنی بۆ جیهازی هەردوولا دیاری دەکەن،ناوی جیهازی لای کاك نەوشیروان(ئارام)وجیهازی لای کاك ئاکۆسوور(شاباز) دەبێت.

- لەیەکەم هەفتەی مانگ بەچاوساغی(خدرجاف)لەنزیك(بێتووش)ەوە بەرەو سەرزێ شۆڕدەبنەوە،بەڵام دەکەونە کەمینی(پاسداران)ەوەو چاوساغەکەیان رادەکات و ئاکۆ بریندارەبێت و لەگەڵ هاوڕێکانی پاسدار دەیانگرێ،پاشان بە بروسکە و هەوڵی کاك نەوشیروان..ئازادیان دەکەن..

- لەشەوی21-22 /5/1990 بەچاوساغی کاك بکرئیسۆیی و هەڤاڵانی،دەگەنەوە سەرئاوەکەو لەرۆژی24/5 1990 پارتیزانەکانی کەرکوك دەپەڕێننە ئەوبەرەوە،ئیتر لەوێوە بۆ(گۆمەزەل)بەڕێ دەکەون،لەم رۆیشتنەدا هاوڕێ لەگەڵ کاك(بەکرئیسۆیی) (بێستوون سابووراوەیی،حەبدەرحاجیتانی، ئەنوەر عەبدوڵا(بێستوون تەلانی)بەرەو رەتڵی9ی سورداش وبۆلای کاك(غەریب هەڵەدنی)هاوڕێ دەبن..

- رۆژی 1990/5/25 دەگەنەلای هەلیکۆپتەرە شکاوەکەی شەڕی عێراق - ئێران کە لە نزیك گۆمەزەل بوو.



## پارتیزانەکانی کەرکوك وهاورێانیان

## لە پاڵ کۆپتەرە شکاوێکی شەڕی عێراق ــ ئێران

ناوی پارتیزانەکانی لای هەلیکۆپتەرەکە:

ئەوانەی بە پێوەن.. لە ڕاستەوە

1- نەقیب ناسح ئەحمەد.. 2 - شەهید وریا عەبدوڵا

3 - شەهید ئاوات رشید 4- فەخرەدین مەحمود

5 - حەیدەر سەعید 6 - شەهید ابراهیم فازل حەمە رەحیم(ئیباو)

7 - پۆڵا محمد ساڵح 8 - شەهید رمەزان احمدحمەعلی(ئاکۆسوور)

ئەوانەی دانیشتون لە ڕاستەوە؛

9- بێستون سابووراوایی 10- شەهید بەختیار محمد ساڵح(خاڵە بەخە)

**تێبینی نووسەر** :

بەپێی زنجیرەی ناوەکان و ئامادەبووانی ناو وێنەکە ئەم وێنەیە لەلایەن کەسی (12)هەمەوە ئەنوەر عەبدوڵا(بێستوون تەلانی)یەوە چرکێندراوە.

ـ لە 1990/5/25دەگەنە نزیك گوندی هەڵەدن وخۆیان لەکێومالّی سوپا دەپارێزن..

ـ لەرۆژی 1990/5/27 لەگەڵ دەستەی پارتیزانەکانی رەتلّی 9ی سورداش یەکدەکرنەوە،لەلایەن کاك غەریب هەڵەدنی وهاورێکانیانەوە پێشوازییەکی گەرمیان لێ دەکرێ ،دوای مانەوەی چەند رۆژ لە مەکۆکانی شاخی پیرەمەگروون،کاك غەریب هەڵەدنی و کاك ئاکۆ و چەندهەڤاڵێك بۆ ناساندنی هاورێیانی رێکخستنی ناوشارو هاوکاری پارتیزانەکان،بەکاك ئاکۆسوور دەچنە ناوکۆمەڵگای پیرەمەگرون،لەوێ کاك چەتۆی برای شەهیددکنۆر هادی دەبینن...

بەرنامەرێژی دەکەن بۆچوونەخوارەوەی پارتیزانەکانی کەرکوك بۆسنووری خۆیان.

ـ شەوی 4ـ 1990/7/5کاك غەریب هەڵەدنی کاك ئاکۆسوورو پارتیزانەکای کەرکوك دەگەیەنێتەپشتی گوندی(تەرەمار)و دەگەرێتەوە،بۆرۆژی دواتر بەپێی ئەو بەرنامەی دارێژرابوو،کاك چەتۆ لەپشتی (کوپەڵە)لە دیوی بازیان خواردنیان پێدەگەێنیّ و بەرنامە بۆ شوێنی داهاتوویان لەنزیك شاخی(کێوەچەرمەڵە) دادەنێن، ئیتر زۆر پارتیزانانە لە پشتی باینجانەوە بەرەو کانی بۆگەنەوە دەوروبەری گوندی فەقێ میرزا و تیژەو تلیان بەرێ دەکەون،بەداخەوە لەبەر هەرهۆکارێك دەبێت لەوێ لەگەڵ کاك چەتۆ یەك ناگرنەوە.

## چوون بۆ بان شوان

ـ بەرلەوەی خواردنی ناوکۆڵپشتییەکانیان تەواو ببێت،بیر لە دۆزینەوەی شوێنێکی بێ شك وحەشارگەیەك دەکەنەوە،دیارە لەسەردەمی ئەنفالداکاك ئاکۆسوورماوەیەك لەبان شوان دەبێت، هەرلەوێ هەندێ خواردنی بۆ رۆژی تەنگانەحەشار دابوو، هەربۆیە بریاردەدا برۆن لەچەمی(تاژین)لەنزیك ناحیەی(شوان)خۆیان حەشاربدەن، بەوئومێدەوەرێگایەکی دوور دەبرن،خۆشبەختانە سەرکەوتوو دەبن، خۆراکەکان دەدۆزنەوە،هەرچەند کەدەری دێننەوە دەبینن کە شەکر وبرنجەکە چەند مشکێکی

تێدا تۆپیوە،بەڵام لەبەرناچاری هەر بەکاریان دێنن..لەئاردەکەش دەیان(ناوساجی) دروست دەکەن و شەوێك بەرەو شێخ بزێنی بەرێ دەکەون.

- لە شەوی 10-1990/7/11پشت بەشارەزایی کاك(فەخرەدین سمایلبەگی)لەگەڵی دەرۆنەخوارەوە بەرەو هەڵەتی تەرەقە، شەوی دواتر لەئاست گوندی( کانی ڕەش)بە وریایی کەمینێکی جاشەکان دەبەزێنن ولەچەمی شیوەسووردەپەڕنەوە،هەرئەو شەوە دەگەنە هەڵەتی(هەنارە) ئەوشوێنە حەشارگەی زۆری هەبوو،ئاودڕەکانی بە دار و مۆردو ژاڵە داپۆشراو بوون، لەوێ بە دڵنیاییەوەلێی دەخەون.

- پاش یەکدوو ڕۆژخواردنیان بەرەوتەواوبوون دەچێ،ناوساجییەکان کۆتاییان دێ، برادەران دەکەونە دڵەراوکێ،لەوێش کاك ئاکۆسوور بەفریایان دەکەوێتەوە، پێیان ئەڵێ هاوڕێیان هیچ نیگەران مەبن، من لە نزیك گوندی (دەرماناو) هەندێ خۆراکم لە کاتی ئەنفال شاردۆتەوە،کەبریتییە لە(سێ فەردە برنج،فەردەیەك شەکر،چەند فەردە ئارد...)شەوی دواتر بەرێ دەکەون،شتەکان دەدۆزنەوە،هەرچەند بەهۆی بارەنەوە تەڕ دەبن ودەبن بەکلۆ کلۆ،بەڵام بەناچاری چەند رۆژێك قبوڵی برنجی لێ دروست دەکەن و چای بەسەردا دەکەن..

جارێکی تر مەترسی تەواوبوونی خواردن وهەوڵی دروستکردەوەی پەیوەندی ناچاریان دەکاتەوە کە بیر لە جێگۆڕکێ بکەنەوە،کاك ئاکۆسوور وەك هەمیشە پیاوی تەنگانەو ڕۆژە ئاستەمەکان دەبێ، بەهاوڕێکانی ئەڵێ:هیچ غەمتان نەبێ، ئێوە لێرە ئاگاتان لەخۆتان بێت،من وخاڵەبەخە دەڕۆین، تاخواردن داین نەکەین ناگەڕێینەوە. هەرئەوشەوە روولەچەمی (ئیلنجاغ) دەکەن،خۆیان دەگەیەننە رەز وباخ وشینایی ماڵی(دایەخەجێ) بەیانی کە دایەخەجێ و مناڵەکانی لە تەقتەقەوە دێنەوە، کاك ئاکۆ و خاڵەبەخە خۆیان ئاشکرا دەکەن، سەرەتا دایەخەجێ سەرسام دەبێ،چۆن پێشمەرگە گەیشتوونەتەوە ئەوشوێنە، ئاخر ناهەقی نەبوو، رەبیەکانی

(تەپەکورە) هەرچەند سەدمەترێك لەوێوە دوور بوون،ئاکۆ متمانەی تەواوی بە دڵسۆزی ئەوخێزانە دەبێ ،هەربۆیە پێیان ئەڵێ:

ئێمەمەفرەزەیەك پارتیزانین، دەبێت ئیوە فریامان بکەون، ئەویش لەوەڵامدا ئەڵێ:

- کوڕم ئاکۆ..! ئێمە تەنیا بەرۆژ بۆمان هەیە لێرە بمێنینەوە،دەبێت بەشەوان بگەڕێینەوەشارۆچکەی تەقتەق،منیش لەئیوەدڵنیام،بەڵێن بێت هەرچی لەتواناماندا بێت بۆتانی دەکەین،دواتر ژیرانە باسی لە بارودۆخی ناوچەکە کرد و زانیاری دروستی پێدان لە بارەی بوونی چەند ماڵەمەڕدارو جوتیاری تر لە گوندەکانی کانی رەش و مەرزیخە،سەر لەئێوارە ئەوان گەڕانەوە بۆ تەقتەق،ئاکۆ و خاڵەبەخەیش تا بەیانی لە شوێنێکی لاڕێ لێی خەوتن،بۆرۆژی دواتر خۆراك وپاکەتی جگەرەو ئاگرو پێداویستییەکانی پارتیزانەکانیان هەموو هێنابوو،هەرئەوڕۆژە هەندێ چرپی دار وگەڵا لەخۆیان دەئاڵێنن وبەکۆڵەپشتی پڕەوە بەنێو چەمەکەدا بەرەولای هاوڕێکانیان دەگەڕێنەوە...

## شێرەژنێکی تری شوان

ئەوخۆراکە وەریانگرتبووهەربەشی چەندرۆژێك دەکات،ئاکۆ بیری لەسەرچاوەی تر دەکاتەوە، دێتەوەیادی کەچەند ماڵێکی تر لەونزیکە هەن، داوا لە کاك فەخرەدین دەکات خۆی ئامادەبکات، ئیتر هەردووکیان بەڕێ دەکەون بۆلای ماڵەجوتیارەکەی چەمی (مەرزیخە)کە دەگەنە ئەوێ کەسی لێنابێت، شەولەوێ دەخەون، بۆ بەیانی هەموویان دێنەوە،کەچاویان بەپێشمەرگەکان دەکەوێ ئەبڵەق دەبن،ئەوان خەڵکی گوندی (سمایلبەگی) دەبن،دەیانناسنەوە،ماڵی حاجی غەفوور وپورەخەجێ دەبن، لەفەخرەدین دەپرسن ئەوە ئیوە چی دەکەن لێرە..؟

ئەوانیش کە دڵنیادەبن خەڵکی باش ونیشتمانپەروەرن، دروست پێیان ئەڵێن:

- ئێمە هەرپێشمەرگەکانی جارانین وکوردستانمان بەجێ نەهێشتووە،خەباتی پارتیزانی دەکەین. بۆیان ڕووندەکەنەوە قۆناغەکە سەختەو پێویستیان بەهاوکاری ئەوان هەیە،دوای ئەوەی تێر لەخواردنی نان و هەنجیر وماستاویان دەکەن، بەمەرجی پاراستنی نهێنییان،بەڵێنی هەموو هاوکارییەکیان پێدەدەن،ئەوشەوەیش لەو ناوە دەمێننەوە، بۆبەیانی زوو مام حاجی غەفوور و دایەخەجێ دەگەڕێنەوە، دووفەردە ئارد وفەردەیەك شەکروتەنەکەیەك ڕۆن وچەندین پێداویستی تر لەگەڵ خۆیان دێننەوە.بۆشەو هەمووپێداویستییەکان دەگەیەننەوە حەشارگەی (هەنارە).

## گومان پەیداکردن

لەگەڵ ماڵی حاجی غەفووردا ماڵێکی تریش لەوچەمە دەبن،ئەوانیش دەیانبینن، دوای گەڕنەوە بیرلەو ماڵە دەکەنەوە،ئەوماڵە کێ بوون..؟ دەبێ نهێنیمان بپارێزن..؟ بۆ ڕۆژی دواتر کاك ئاکۆ لەگەڵ خاڵەبەخە دچن بۆماڵیان، ئەویش هەرکەسێکی زۆرباش وناسیاوی خاڵەبەخە دەردەچێت،کە کاك(کازم عەباس) دەبێت،ئەویش دەبێت بەیەکێکی تر لەوکەسانەی جێی متمانەی پارتیزانەکان دەبن، داوای هاوکاری لەویش دەکەن،جوامێرانە ئامادەیی خۆی دەردەبڕێ، ئەوانیش داوی لێ دەکەن (پاتری)بەك بۆ جیهازەکەیان دابین بکات،بۆ ڕۆژی دواتر لەگەڵ خۆی پاتری و هەندێ کەل وپەلی تریشیان بۆ دێنێت...

## بەکارخستنەوەی جیهازەکە

پاترییەکەیان بەکۆڵ دەبەنەوە بۆحەشارگەکەیان لە(هەنارە)یەکسەر بێتەلەکە دەخەنەوە کار:

- ئارام..ئارام. لە(شابان)ەوە..وەڵام وەردەگرنەوە،بروسکەیەك بۆکاك نەوشیروان دەنێرن،دوا زانیاری وەزعی خۆیان ناوچەکەی بۆ بەرێ دەکەن،هەر لەرێی بێتەلی (ئارام)ەوە پەیوەندی بە کاك (غەریب هەڵەدنی)دەکەنەوە،لەرێی ئەوانەوەداوا لەکاك

چەتۆ دەکەن کەبێت بۆ چەمەکانی(قەراناو) تاکو لەوێوە پەیوەندی دروست بکەنەوە،دوای ئەوە کاک ئاکۆسوور وفەخرەدین دەکەونەڕێ بۆ کات وشوێنی دیاری کراو،بەڵام بەداخەوە زۆر چاوەڕوان دەکەن هیچ ئاکامێکی نابێت ،هەربۆیە دیسان بەنائومێدی دەگەڕێنەوە بنکەکانیان،جارێکی تر لەڕێی بێتەلەکەی کاک غەریب هەڵەدنی یەوە مەوعیدێکی تر لەگوندی (مۆردخوادە)بۆ کاک چەتۆ دیاری دەکەنەوە،ئەمجارەیان لەوشوێنە بەیەك دەگەنەوە،هەر لەوێشەوە بەرنامە بۆ پەیوەندی داهاتوو لە چەمی مەرزیخە دا دەنێن و دەگەڕێنەوە..

لەرۆژانی دواتر کاک چەتۆ بە هەندێك کەل وپەلی پێویستەوە دەگاتە شوێنی دیاری کراو، دوای گلەیی زۆر لەبارەی هەڵەکانی رابردوو و بەرنامەی داهاتووگفتوگۆ دەکەن،هەرلەوێ کاک چەتۆ داوا لە بارتیزانەکان دەکات ،کە ئەگەرهەرکەسێکتان ئارەزووی بینینی کەسوکارتان هەیە،من ئامادەم بتانبەم و بەسەلامەتی بتان هێنمەوە،بۆیان روون دەکاتەوە کەچۆن (مۆر)و(بەڵگە) تەزویریان دروستکردووەو بەناوی ئەوکەسەوە پڕی دەکەنەوە و پێی دەچنەوە بوتاوشار...*

*بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە بیرەوەرییەکانی کاك چەتۆ هەر لەم کتێبەدا بڵاوکراوە تەوە.



## گەڕانەوەی پارتیزانەکانی کەرکوك
# بەرەو شاخی پیرەمەگروون

لەرۆژی 8/10/1990 بێتەلی (ئارام) بە بروسکەیەك (شاباز) ئاگادار دەکاتەوە:
شاباز.. شاباز.. لەئارامەوە .. بگەڕێنەوە ... بۆ شەوی دواتر بەڕێ دەکەون وبەسێ
شەو وسێ رۆژ دەگەنەوە کۆمەڵگای پیرەمەگروون و پاش پشوویەك لەوێشەوە
بەچاوساغی(ماد شێر)دەگەنەوە حەشارگەی پارتیزانەکان لە شاخی پیرەمەگروون.
- چەند رۆژێك لەلای هەڤاڵانی رەتڵی9ی سورداش دەمێننەوە،لەوماوەیەدا چەند
جارێ هاتوچووی هاوکاری پارتیزانەکان لەکۆمەڵگای پیرەمەگروون دەکەنەوە،
دواجار هەریەکە وبەگرانی پترلە 35کغم کەل وپەل خۆراك و پێداویستی دەخەنەناو
کۆلەپشتییەکانیان وبەرەوچیا دەگەڕێنەوە،لەشوێنێکدا کەپێی دەگوترێ (دۆڵەبی)
دەکەونە بۆسەو کەمینی جاشەکانەوە،پاش شەڕێکی دەستەویاخە، بەزەبری گڕی
چەکەکانیان وئازایی خۆیان،دوژمن تێك وپێکدەشکێنن و بەسەلامەتی دەرباز دەبن.
هەڤاڵەکانیان کەگوێیان لە تەقەکان دەبێت هەڵۆ ئاسا لە شاخەوە دێن بەهانایانەوە،
بەڵام ئەوان زوودەگەنەوە پێیان و لەسەلامەتی خۆیان دڵنیایان دەکەنەوە و هەموو
پێکەوە دەچنەوە ئەشکەوت.

بۆ شەوی دواتر لەڕێی هاوکارەکانیانەوە هەواڵیان پێدەگات کە لەکەمینی شەوی رابردوو دوو پیاوی ئەمن بەناوی (خلف علی محمود وخالدعباس حسین) کوژراون.

## بازنەی پەیوەندی

پارتیزانەکانی کەرکوك جگە لەراپەڕاندنی ئەرکەکانی سەرشانی خۆیان،لەڕێگای کاك(چەتۆسالح)و (مام رسول کرژەیی) یەوە دەتوانن رایەڵەیەکی پەیوەندی باش لەنێوان رێکخراوی سلێمانی و پارتیزانەکان ون و سەرکردایەتی دروست بکەنەوە، رۆژانە بەجیهازی راکاڵ پەیوەندیان لە گەڵ بەڕێز مام جەلال وکاك نەوشیروان و مەکتەبی سیاسی یەوە هەبووە.

## بەخشینی جیهازێکی راکاڵ

لەبەر ئەوەی پارتیزانەکان لەوشوێنەدا پێویستیان بە دووبێتەلی راکاڵ نەبوو،بۆیە لەسەربڕیاری کاك نەوشیروان یەکێکیان دەدەن بە کاك خالیدرەزا،تابیباتە ناوشار و بەبێتەبازنەی پەیوەندی نێوان(رێکخراوی سلێمانی - پارتیزانەکان - سەرکردایەتی) جیهازەکەی ناوشارناو دەنێن(سۆفی سمایل)وجیهازەکەی لای کاك ئاکۆسووریش ناو دەنێن (سۆفی قوربانی) بۆ دڵنیابوون لەگەیشتنی جیهازەکە رادیوی شۆڕش (دەنگی گەلی کوردستان) بروسکەیەك دەخوێنێتەوە :

( لە/ سۆفی سمایل

بۆ / سۆفی قوربانی،دیارییەکەتان گەیشت.....)

زۆر سوپاس

***



# غەریب هە ڵەدنی ...

## پێشمەرگەو پاسەوانی شوێنەوارومێژووی نەتەوەیەك

هاوڕێ پەنا یەکێك لە هاوڕێیانی ڕێکخراوی سلێمانی بیرەوەری خۆی دەگێڕێتەوە: لە ساڵی ۹۸۸ لە زنجیرەی تاوانەکانی ئەنفال دا ڕژێمی بەعس توانی ناوچە ئازادکراوەکانی شۆڕش داگیربکاتەوەو زیاتر لە ٤۰۰۰ چوار هە زار گوندوئاوایی کاول بکات و زۆربەی خەڵکەکەی ئەنفال بکات ،کە بە۱۸۲هەزار کەس خەمڵێنراوە. پێشمەرگە پاشەکشەی کرد بۆ سەرسنورەکان و ناوخاکی ڕۆژهە ڵاتی کوردستان . تەنهاچەندمەفرەزەیەکی بچووك بەپارتیزانی مانەوە لەناوچ چۆڵکراوەکانی ئەنفالدا. ئەو دەمە شەڕی ۸ ساڵەی عێراق . ئێران وەستابوو ، ڕژێمی بەعس هە موو توانای سەربازی و دەزگا ئەمنی یەکانی خستبوەگەڕ بۆ سەرکوتکردنی گەلی کوردستان و لەناوبردنی هێزی پێشمەرگەو شۆڕشی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان. بۆیە پاش شکستی پێشمەرگەوچۆڵکردنی ناوچەئازادکراوەکانی شۆڕش،بەعس

بەرنامەی (ئەنفالکردنی ڕێکخستنە نهێنی یەکانی) داڕشت وکەوتەجێ بەجێکردنی، ئێمە ئەوکاتە لە (ڕێکخراوی سلێمانی کۆمەڵەدا ) زۆر چالاکانە کارمان دەکرد ...

لە کۆتایی ساڵی١٩٨٩دا کەوتینەبەرشاڵاوی دەزگا ئەمنی یەکانی بەعس وچەندین بەرپرس وهەڤاڵی ڕێکخستنە نهێنی یەکان دەستگیرکران...شەهید عەتای برام و باوکم و وەستا برایمی برام دەستگیرکران ومنیش فەرمانی گرتنم بۆ دەرچوو.

پاش زیاتر لە ٦مانگ خۆشاردنەوەو ئیختفای ماڵان و شاران، زۆر بەزەحمەت دەربازبووم و لە شەوی 1990/5/24 بەهیمەتی هە ڤاڵان (شەماڵ عبدالوفا و کاك ڕەووف (هاوڕێ بارام) و کاك ڕەسوڵ تەلانی و کاك بەکر تەلانی) خۆم گەیاندە ئۆردوگای پیرەمەگرون وئەوشەوە شەهیدغریب هەڵەدنی و ٨ پێشمەرگەی پارتیزان هاتن بەدوامداو ڕزگاریان کردم و چوینە چیای سەرکەشی پیرەمەگرون ...

ئیتر منیش بووم بەپێشمەرگە.کاتێك من بوم بەپێشمەرگە شۆڕشی نوێی گەلەکەمان توشی شکست و هێزی پێشمەرگەی کوردستان پاشەکشێی کردبوو بۆ سەرسنورو ناوخاکی ئێران (ڕۆژهە لاتی کوردستان )وهەرچی ناوچەی ئازادکراوی شۆڕشە لەلایەن جاش و سوپای بەعس داگیروکاولکراوو چۆڵکرا بوو !...

تەنها چەند مەفرەزەیەکی پارتبزانی لە پێشمەرگەکانی (ی.ن.ك) لە گەرمیان و شارباژێرودۆڵی جافایەتی وچەمی ڕێزان و کەرکوك ودەشتی هە ولێر دامابونەوە (یان بۆی گەڕابونەوە !)...

لێرەدا بۆ مێژوو ئامارە بەڕۆڵی شەهید غریب هە ڵەدنی ئەمر ئەدەم لە سەرپەرشتی و ئیدارەدانی پارتیزانەکانی (رستی سورداش ) کە چەندین چالاکی پێشمەرگانەیان پاش ئەنفال ئەنجامدا،تا لەلایەن سەرکردایەتی وڕەوانشاد کاك نەوشیروان مستەفا ئاگادارکرانەوە بۆماوەیەکی کاتی هیچ چالاکی یەکی پێشمەرگانە ئەنجام نەدەن و تەنها خۆیان بپارێزن و لەناوچەکەدا بمێننەوە بۆ کاتی پێویست !...

لەوکاتانەدا غریب هەڵەدنی پارچەکی شوێنەواری ئەدۆزێتەوەو دەیشارێتەوە و دەیپارێزێ لە لای خۆی !...

لەڕۆژی 1990/6/10 لەودۆخە ناخۆش و پڕنەهامەتی و تەمتومانەدا شەهید غریب هەڵەدنی نەمر بۆ یادی ٢٠ ساڵەی (کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان) لەچیای سەرکەشی پیرەمەگرون سیمنارێکی ٢ سەعاتی سازکرد بۆ تەنها (١٧ ) پێشمەرگەی پارتیزان. تیایدا باسی چۆنیەتی دامەزراندن و گەشەکردنی ڕێکخستنەنهێنییەکان وبەرنامەی سیاسی وفکری کۆمەڵەی کرد لەساڵی1970دا. ئینجا ڕۆڵی کۆمەڵە لە دامەزراندنی (ی.ن.ك) و هەڵگیرساندنەوەی شۆڕشدا ، ناکۆکی و ململانێی ناوخۆیی کۆمەڵەو جیابونەوەی (حسك و ئاڵای شۆڕش ) و کارەساتی شەڕی ناوخۆیی وکارەساتی هەکاری و قرناقاو پشت ئاشان و (مفاوەزات )ودەست پێکردنەوەی شەڕ و ڕێکەوتنی حزب ولایەنەکان و پێکهێنانی (بەرەی کوردستانی) رزگارکردنی قەزاوناحێکان و کارەساتی هەڵەبجەوبەکارەێنانی چەکی قەدەغەکراوی کیمیاوی و پرۆسەی بەدناوی ئەنفالەکان ....

هەمووی بەوردی خستەڕوو..ئێمەش بەپرسیارو سەرنج ورەخنە بەشداریمانکرد.. غریب هەڵەدنی پیاوی تەنگانەوسەردەمە سەختەکان بوو,کادرێکی هۆشیارو بەئەزموون و فەرماندەیەکی لیهاتوو بوو ....

ڕۆژی 1990/7/4 بەبروسکە کاك نەوشیروان ئاگاداری کردین کە دەبێ شەهید غریب هەڵەدنی و چەند پێشمەرگەیەك (ڕیبواری حاجی ئەحمەد ـ هاوڕێ پەنا ) بهێنن وبگەڕێنەوە بۆ قاسمەڕەش ، بە ٦ ڕۆژو شەو گەیشتینەوە قاسمەڕەش.



# بیرەوەری

# کاك علی بچکۆل :

# پارتیزانی دوای ئەنفال

## لە قەلاسێوکە و چەمی رەزان

سەرلە ئیوارە پۆلێك فرۆکەلەئاسمانی ناوچەکەدا باڵەژەهراوییەکانیان لەبەرتیشکی خۆرچریسکەی لێوەدەهات. لەحەمی رەزان وچەندشوێنیکدابۆمبەکانیان هەڵرشاند. لەسەرچیای خالخالان وکێوەچەرمەڵەوە گۆپتەپە و عەسکەر یشیان کرد بە نیشانە. ویژدان وهەستی مرۆڤایەتی لەنێو دەروونی خۆیان و رژێمەکەیان دا نەمابوو، هەرچی ماڵ ومنداڵی جوتیارانی ناوچەی قەلاسیوك بوو هەموویان ژەهەرباران کرد.

- رۆژی ۱۹۸۸/٥/۳رۆژێك بوو ویژدانی بەعسیەکان هەمووشتێکی دەسووتاند،مەرو ماڵات و پەلەوەری ئەرزی وئاسمانی وزیندەوەری ناوئاوەکانیشیان دەخنکاند.. منداڵە چاوگەشەکانی کورد بەر ئەو بێ ویژدانییەی بەعس کەوتنوون،ئەوانەی مردن مردن،ئەوانی تر دەمووچاویان سوتابوون،پێستەکانیان رەش هەلگەڕابوون، خۆم ودەستەکەم لە(هەوارسوور)ی گوندی شێخانی سورقاوشان بووین،کە زانیمان بۆردومانی کیمایی گۆپتەپەو عەسکەر کراوە..بەرەو گوندی عەسکەر کەوتینەڕێ،

لە پشتی ماڵانی گوندەکەوە دیمان ژن ومنداڵێکی زۆر بە چەکی کیمایی زامدار بووبوون،فرمێسك بە چاوەکانیاندا دەهاتەخوارەوە،دیمەنێك بووناتوانم باسی بکەم، دوای بینینی خەڵکەکەدەستەیەك پێشمەرگەمان بینی هەواڵی خەسارمان لێپرسین؟ هاوڕێ کاك(غەریب عەسکەری)و هۆشیار عەبدولکەریم هەلەدنی وکاك(مەلافەرمان)و مامۆستاجەمال محەمەدفەرماندەی تیپی31ی شارباژێڕ لەگەل کۆمەڵێك پێشمەرگەی قارەمان،هەمووماندوبوونیان پێیانەوە دیاربوو، بۆنی خەردەل هیلاکی کردبوون، لەگەڵ بەکر ومەریوانی برازام وخزمی خۆشەویستم کاك عوسمان عەسکری و هەندی رۆڵەی دڵسۆزی تر بەرەو رووداوەکە بەرێ کەوتین، تێکەلاوبەئازارەکەبووین، بیرمان لەوەکردەوەچۆن تیپی 25 و هێزەکانی دەشتی قەلاسیوکە کۆ بکەینەوە..؟ چی بکەین و چۆن برۆین بۆناو عەسکەر و گۆپتەپە تاسۆراغی خەڵکەکەی بکەین.؟ هەوڵمان دا کاك رەهبەر و کاك عەدنانی حەمەی مینە و هەڤاڵانی تر بدۆزینەوە، کاك غەریب گوتی ناتوانین بڕۆینە ناوگوندەکەوە.چونکە ژیانی تێدانەماوە،چەند هاوولاتیەك شەهیدبوون،ئەبی چاوەرێ بکەین.هەموومان سەرمان پێکەوەنا،ئەوەی هەموومان پێی رازیبووین ئەوەبوو تا بەتەواوەتی لە جموجولی دوژمن نەگەین هەنگاوەکانمان لەسەرخۆو بەوریایی بنێین، بۆ خۆپاراستن لەو رۆژگارە زۆر سەختە بڕیارمان دا بکشێینەوە چەمی(قەلای جوڵندی) و(تەنگی ساچوغ) بەدیار ئەوخەلکە لێ قەوماوەی گوندی عەسکەرەوە خۆمان لە قوتە ولوتکە بەرزەکانی خۆر ئاوای (چەمی رەزان) چاودێری هاتنەپێشەوەو هەمووجموجولی هیزەکانی دوژمن بکەین. بەرەبەیانی 1988/5/6 لە هەموو دەشتەکانی قەلاسیوەکەوە دوژمن هێرشی هینا، دەگەیشتنە هەر شوێنێك ئاگریان تێبەردەدا،شەرێکی دەروونی روخێنەربوو، لەولاشەوە هەر هەموو بە رزایەکانی گردو شاخەکانی گوندی سرد و سێکانیان و دەرەنارو شیخ زەبنەڵ و بەرزاییەکانی گوندی زەرزی وهەموو بەرزایی گوندەکانی

(عەودڵان و گەورەدێ و کەڵەشیرە و کانیبی وسەروچاوە)شیان گرتبوو،ئەوڕۆژە چەندپێشمەرگەی تیپی 23ی سورداش کەکاك سابیر کۆکەیی و کاك عەبدوڵلاخڕەو فەقی وشیارو چەندانی تر ڕووبەرووی هیزێکی دوژمن بوونەوە..
شەریکی جوامیرانەیانکرد..هەرچۆنێك بوو خۆیان لەئابلۆقەی دوژمن رزگار کرد، خۆیان گەیاندەپێشەلانی قەلآی شۆرش(چەمی رەزان) هەوارگەی رابەری کوردان سەرۆك مام جەلال،لەوێ یەکمان گرتەوە،لەخەمی دابڕانی تیپی٢٥خالخالان بووین، دەگەڕاین بۆ دۆزینەوەیان.بۆشەوەکەی پێشمەرگەی سورداش سابیر وفەقی وشیارو کاك عەبدوڵلا خڕە و عومەرکەریم بەگ و محەمەدی حاجی قادر..چاوساغیان کردین بەنێوانی گوندەکانی عەودالآن و کانی هەنجیرو قۆجەبلاخ و شۆرناخ و شیلەخان و ئەمبەروئەوبەری دولکان دا رۆیشتین بەرەوگوندەکانی سوسێ وموغاغ وبناری چیا. لەوێشەوە بۆدۆلی چڕی دۆلەبی پیرەمەگرون ، هەر ئەو رۆژە دوژمن پێی زانین وسێ کۆپتەرو چەندان ناقیلەو جاش وسەرباز دامانیانە بەرتەقەی دوورهاویژ،ئێمە جوابمان نەدانەوە و پشوویەکماندا،بیری هەڤالآنی تیپی٢٥خالْخالانمان دەکردەوە، بەرۆژ هاتووچۆمان بۆنەدەکرا..دوژمن ناوچەکەمانی ئابلۆقەدابوو،بەدەیان هەزار جاش وسەرباز هاتبوون بۆ قڕکردنی ئێمە، هێزەکانی دووژمن بۆ رۆژی چوارەم زیاترهاتنە پێش، هێزێکی مغاویریان ناردە دەوروبەری گوندی قەرەچەتان، مەترسی ئەوەمان لاپەیدابوو بەهێزی ئاسمانی لەسەرشاخی پیرەمەگرونەوە بۆمان دابەزن و ئابلۆقەمان بدەن،بەرپرسەکان کۆبووینەوە..بریارماندا بگەڕێینەوە بۆ چەمی رەزان،بەلآم یەك دوو پێشمەرگە بە شەوچاویان کزبوو.. ئەبوو ئێمەش هەر بەشەوان هاتوچۆ بکەین. هەندێ پێلاویان دڕابوو،لەرێی عەبدول کەریم هەڵەدنی و عەتا کافرۆشی ومەلاوشبارەوە دەوری ١٨ کەسمان نارد بۆ گوندی باینجان بۆ ماڵی کورەکانی حەمە بەگی موغاغ، کاك حەسەن و عوزەیر وخوشکمان (ئەرەکسین خان)

بە هاوکاری رێکخستنی سلێمانی بەتایبەت وەستا بەکری دارتاش و بە هیمەتی سەید مستەفاو سەید حاجی لە شاری رانیە، ئەم ١٨ (پ.م)ە بگەیەننە مەڵبەندی سێ لە (بەلالوکاوی) و (تۆتمە)ی بالیسان و دەستیان خۆش..لەو رۆژە سەختەدا، دەربازکران،ئێمەش بارمان سوك بووبوو، هێزەکەمان گەیاندەوە گوندی زەرزی، بەیانی زوو جوینە ناو(چەمی رەزان)خوار گوندی قۆجەبلاخ، زۆرماندوو بووین، حەرەسمان داناو سەرخەوێکمان شکاند، لەپرێکا ئاگادار کراینەوە دوو کەسیان بینیوە بەرەو لای ئێمەدین،وردە وردە دوو بەرگ بۆرەکە لە برادەرانمان نزیك بوونەوە دەرکەوت شەهید سەرداری کویخا نەریمانی کەڵەشێرەیە، ئەوەکەی تریش کادرێکی وشیارو دێرینی خۆمان (مامۆستا شێرکۆعەسکەری) بوو..

سەردار پیاوێکی ئازاوبەجەرگ بوو،خەڵکی گوندی کەلەشێرەو،زۆرچاونەترس بوو. وتی کەچومە بن بەردێکەوە دیم مامۆستا شیرکۆ زەختی دابەزیوە و ئەو چەند رۆژە خوێی نەخواردووە. منیش خوێم پێبوو هەندێکم پێداو وردەوردە زیندوو بۆوە، بەوانەوە ژمارەمان چووە سەروی ٥٠ پێشمەرگە،مامۆستاشێرکۆ هاتەوەسەرخۆی، بۆیان باسکردین کەتیپی٢٥خالخالان کەوتونەتەوە لای قۆجەلەرو لە ئەشکەوتی عەلی شالی،هەلێکی چاك بوو،رامان سپاردن برۆن بۆلایان وئاگاداریان بکەنەوە کەبێنەوە بۆلای ئێمە..ئەو کاتە من ئەندامی دەزگای پێشمەرگایەتی بووم،دوای شەوێك هەڤاڵانی تیپی(٢٥)خالخالان وشەهیدسەرداروو شێرکۆ گەیشتنەلامان، لە باڤلەکەی چەمی رەزان سەنگەرمانگرت ، دەستەیەکی چالاکی تیپی(٣١)سلێمانی بەسەرپەرشتی مامۆستاجەمال حاجی محەمەدو براکانی وچەندپێشمەرگەیەکی تر. کاك رەهبەری سەید برایم وکاك وریا ئاغجەلەری ژیرو خاوەند ئەزمون، هەروەها مامۆستاعادل شەریف وئیسماعیلی برای وچەندین پێشمەرگە،کاك رەفعەت عەبدوڵا وهەندی کوری کۆیی چالاکی تر،ئیمەیش دەستەیەك بووین کاك شیخ فەرهاد و

بەکری برازام و پێشمەرگەی دریرین شەهید مەریوانی برازام ،سەربازی راکردوو نەسرەدین کەرکوکی وکادروپێشمەرگەعوسمان عەسکەری ومحمدی شیخ حسین و ئاراز حمەدەمین فەقی مستەفاوسیروان و شوانی برازام لەبن دارگوێزێکدا بووین،وەك گروپیك خواردنمان پێکەوەبوو،عوسان عەسکەری وتی من چەند برادەرێك دەبەم و لەو ئەشکەوتانەدا ئازوقە کۆدەکەمەوە، پێمان چاك بوو، یەکێك لەوانەی لەگەڵ خۆی بردبووی نەسرەدین بوو،گوێدرێژێکیان دەست کەوتبوو لەگەل نوێنەری گروپەکانی تردا بۆ هێنانی کۆکردنەوەی پاشماوەی شوینەواری راکردووەکان لەو بن بەردانەدا.. لەکاتی گەڕانەوەدا نەسرەدین سواری پشتی گوێدرێژەکە دەبیت..لەپڕچەند جاشێك میلی تفەنگی لێ رادەکیشن و دەی رفینن، کاتێ پێمانزانی هەموو گروپەکان بۆی دەرپەڕین،دیمان گەلە جاشێك ئەویان پێش خۆیان داوە..لەبەرئەوەی دوور کەو تبوونەوە،بە کەلك نەدەهات تەقەیان لێ بکەین، بردیان ورۆیشتن..دواتر کەسوکاری بەپارە کڕی بوویانەوەوخۆشی کورێکی دڵسۆزو چاك بوو..نەی گوتبوو کە ئێمە لەوچەمەداین،چەند رۆژدوای ئەوە، دەوری چەم بەجەیش وجاش گیرا،نەمان ئەتوانی جولە بکەین..چونکە لەسەر شاخەکانەوە دەیان داینە بەر(بی کەی سی) و(ئارپیجی)و(هاوان) بۆیە شوێنێکمان دەست نیشان کرد،زۆر چڕبوو، هەندێ ئەشکەوتی بچوك بچوکی تیدابوون بەناوی(گردەگروێ) بەراستی لە رۆژانی سەرەتای هاتنمانەوە،بۆ ئێمە وەك سوپەر وقەڵای بەرگری بوو. رۆژی 1988/5/9رۆژێکی زۆر دژواربوو ئێمەش جگە لەوهەموو ماڵ و منداڵەی گوندی عەسکەر لە نزێکی هیزەکەمان چوینە لایان و قسەمان لەگەڵکردن کە ئێمە ئەتوانین چیتان بۆ بکەین ؟ ئەوانیش بۆیان باسکردین کەدوو کەسیان ناردووە بۆ لای شێخ مەحمودی کاریزە لەدەربەندی بازیان،بۆ شەو دەگەڕینەوە، ئیترئەڕۆین بۆ دەربەندی بازیان،لەولاشەوە ئێمە چەند ژنێکمان لەگەڵ بوو:

- دایکی حاجی سەمەدی حەمەپەری کەکوك
- ناهیدەخانی ژنی حاجی سەمەد
- روناك خانی شێخ مەحمود(هاوسەر)م
- حەلاوەخانی ژنی شێخ فەرهاد
- ناهیدەخانی ژنی شێخ سەعید

بەراستی بارێکی گرانبوون ئارەزومان دەکرد ئەوانیش بەلایەکدا دەرباز بکەین، بەڵام کارێکی ئاسان نەبوو،بەدوی هەڵێکدادەگەڕاین،ئێوارەبوو حاجی کەریم و عەبدورەحمان و دوو هاوولاتی لەدوژمن یاساغ بوون، هاتنەلام و گوتیان بەداوای بووردنەوە ئێمە خزمەکانمان کارئاسانیان بۆ کردوین و ئەمانەویّ بگەڕێنەوە بۆناومالّ ومندالّەکانمان،بەڵام پەیمان دەدەین باستان ناکەین، هیچ زیانمان نابێت، منیش ئەو هەلەی بەدویدا دەگەڕام دەستم کەوت و پێم گوتن باشە بەڵام چاکەیەکمان لەگەلّ بکەن..! ئەو دووسیّ ژنە لەگەلّ خۆتان بەرن تا نزیك جادەی دوکان - سلیمانی لەوێوە خۆیان دەرۆنەوە بۆشارەکان، شەوبەڕێمان کردن.. بەراستی کارێکی ئاسان نەبوو،لەبارو دۆخی ئەوها سەختدا ژن و منداڵت لەگەلّ بیّ بەڕاستی ئەوانیش قارەمان و خۆگربوون، ئەوەندەی لەگەڵمان بوون،بەتایبەت کیماوی هەناسەی ژن ومندالانی عەسکەری وەك خەڵوز لێکردبوو،دوو شەو دەستی رووناکم رادەکیشا. چونکە چاوی نابینابووبوو، بەکری برازاشم بەهەمان شێوە دەموچاوی تێکچووبوو، ئەویش مەریوانی برای بەدوی خۆیدا رای دەکیشا،دووای ئەوە ،چووین بەرەوبافڵەکەی چەمی رەزان لە ئێوارەیەکی درەنگدا لە دارەبن و درکەزییەکان تووشی کاك غەریب عەسکەری وسەربەست ئەحمەد بووین، هەندێك پارەمان لە دەزگای پێشمەرگایەتییەوە بۆ هاتبوو،موچەی دوومانگمان دا بەکاك غەریب و داواشمان لێکرد لەگەڵمان بێت و لێمان دانەبڕێت،چونکە کاك غەریب

سەرەڕای ئەوەی پیاوێکی ئازاو قارەمان بوو، شارەزایەکی چاکی دەربارەی چەمەکە هەبوو چونکە دووسێ ساڵ بوو ماڵەکەشی لە گوندی زەرزی بوو،هەروەها داوامان لێکرد بۆ رۆژی 1988/5/12 لەکوێدا خۆمان پەنابدەین، ئەو پێی وابوو ئەگەر لە چەم و بیەکانی خوارکەلەباش ببین باشە،ئێمە ئەوێمان بەدڵ نەبوو،بۆیە هەر لە چەمەکەی بەرابفڵەکەوە خۆمان حەشاردا.. بەڵام کاك غەریب چووە دورگەکەی بەرابەر رەزەکەی حەمەخرەی زەرزی، واتە دووئاوانی چەمی رەزان ئێمەش چووینە پشتی دارگوێزەکان،دووسێ کەلاوەی لێبوو،ئاگرمان کردەوەو ناوساجی بۆ سێ ژەمی رۆژی 13ی مانگمان ئامادەکرد..رۆژی 13ی مانگ هێزێکی زۆری جاش و سەرباز هاتنە ناو چەمی رەزانەوە، بۆ ئەو شوێنەی ئێوارە ناوساجیمان لێکردبوو، شوێنەکەمان نەسرپیبۆوە،بوویە دڵنیابوون کە چەم خەڵکی تێدایە، ئەورۆژە گروپی ٣١ سلێمانی و هەندێك لەگروپی کادرو پێشمەرەکانی سورداش،هەروەها دەستەی دەزگای پێشمەرگە لەوێ بووین، جاشەکان زۆر لێمان هاتنە پێش هەر ئەوەندەی مابوو پەنجە بە پەلە پیتکەی تفەنگەکانماندا بنێن وشەڕێکی دۆڕاوبکەین، سوپاس بۆ خۆگری پێشمەرگەکان و گوێگریان پاش تەقاندنی دوو سی (ئار پی جی) و دەستڕێژ. جاشەکان خۆق چڕی دارەستانی چەم گرتنی و کشانەوە و لەو شەڕەش دەرباز بووین، ئیتر تێگەیشتین چەم مەجالی ژیانی لی نەماوە،هەر بۆیە ئیوارەی ١٣مانگ بەرەو پیرەمەگرون کەوتینەوە رێ. ئیوارە 13ی مانگ لە بافلەکەی چەمی رەزان و هەوارگەی (سەرۆك مام جەلال) هوە بەرەو بناری پیرەمەگرون بەریکەوتین، من دەمێك بوو لە ئەنجامی لێدانی زیندانی بەعس بربڕەی پشتم ترازا بوو، کەهەندی ئەرۆیشتم لەبەرئازار ئەبووهەندێك بۆی بووەستم، لەتەنیشتمەوە عەبدولکەریم هەڵەدنی وەستابوو پێم گووت :

بەراستی زۆر ماندوو بووم و وزەم نەماوە..لە پێش رۆژ ئاوابۆنەوە بەردەوام لەرێ

دا بووین..قورە شلکەی ئەودۆڵە کەنەفتی کردبووم بەلام چارە هەرئەوەبوو ئەبوو خۆمان بگەینینە ئەو دۆڵەی دەستە راستی بیران، تینمان دایەخۆمان و گەیشتین، کۆمەڵێك قارەمان لەو دۆڵەدا لە پاڵ گابەردەکاندا خۆیان لەبۆسە دابوو، کە ئێمەیان دیت هاتنە پێشوازیمان..راستیان گوتووە کورد شاخەکان پشت و پەنایەتی،دۆژمن لەوپێدەشتی سوسێ یەدا بەهەزاران سەربازو جاشیان لە کەمین دابوو لە قەلاسێوکەو شوان و شێخ بزینی و دەشتی کۆیەو دوڵی سورداشدا تەنها دوکەڵی رەش بەرەو ئاسمان هەڵدەکشا..هاتووچۆ تەنیا و تەنیا بۆ دووژمن ودەست و پێوەندەکانیان هەبوو،بەلام پێشمەرگەقارەمانەکان وکیوی پیرەمەگرونی سەربەرز. لەسەختی ئەوبارودۆخە باکیان نەبوو، رۆژێك دووان چوینەوە دۆلەبی پیرەمەگرون، ئاوی تێدابوو ئازوقەی شاراوەی فیرار وخەڵکی پێشتری تێدابووسودمان لێدەبینی. هەندێ لە هێزەکەمان چوونەوە بۆدەوروبەری ئاغجەلەر،بۆئەشکەوتی(عەلی شاڵی) کاك مەلافەرمان و چەند برادەرێك جوون بۆدەوروبەری شوان،گوندەکانی تیژەوتلیان بۆدابینکردنی ئازوقە و شوێن،عەبدولاخرە وعومەری کەریم ئاغاو سابیر کۆکەیی و محەمەدی حاجی قادر و چەند تێکۆشەریکی تر لە دۆلەکانی پیرەمەگرون بوون، ئازوقەیان پاشەکەوت کردبوو،بەلام هەڵسوکەوت زۆر گرانبووبوو، ئەبوو هیزەکەمان بەش بەش بکەین. بۆ ئەوەی خۆمان بپاریزین، محەمەدوعومەری کەریم ئاغاو چەند برادەرێك ئازاو شارەزامان راسپارد لە پیرەمەگرون و دەوروبەریدا خۆیان بژێنن، تا هیزەکانی دوژمن لە ناوچەکە کەم دەبنەوە،چەند برادەرێك گوتیان ئێمە ئەتوانین خۆمان بگەیەنینە (مەڵبەندی سێ) دووبرادەر فەقێ وشیارو ئاوات وتیان ئێمە دەکەوینە (بازیان) و پەیوەندی بەشارەوە دەکەین و ژیانی خۆمان دابین دەکەین، کاك عەبدول کەریم هەڵەدنی و فوئاد و مامۆستا کامەران گووتیان دەچینە سەری پیرەمەگرون و بشکنینی دۆڵی شەدەڵەو مێرگەپان دەکەین، ئەگەرڕێگامان دەست

کەوت ئاگادارتان دەکەینەوە.تا لەوێوەهێزەکە دەرباز بکەین بۆشاخی ژیلوان و لەوێوە بۆدۆڵی شیخ محەمەد پاشان بۆ سەفرە وزەرون وسەرسنوور، تێکەلاوی هێزەکانی خۆمان دەبین،ئێمەش گوتمان دەگەڕێینەوە چەم رەزان بۆ ئەوەی لەگەڵ کاك رەهبەرو مامۆستا جمال محمد یەك دەگرینەوەو مەلا فەرمان و براکانی ترمان دینەوە لامان، گەراینەوە چەمی رەزان ،هەر هیزە بەرێی فەرمانی خۆیدا رۆیشت.. کاك مەلا فەرمان و هەڤاڵەکانی نیازیان وابوو بگەنە شێخ بزێنی خوارەووتا لەوێوە بپەڕنەوەبەرەو دەشتی هەولێر .من پێم خۆش نەبوو دابرێن،چونکە کاك مەلافەرمان کادرێکی شارەزاو پیاوێکی زۆر دڵسۆزبوو، بۆیە داوام لێکرد کە بگەرێتەوە لامان .. بەگوێی کردم و هاتەوە لامان .کاك رابەرو مامۆستا جەمال و هێزەکان هاتنەوە بۆ (چەمی رەزان) ئێمەش پرسیارمان کرد، زانیمان رێگامان لەشەدەلەو میرگەپانەوە دەست ناکەوێ، بۆیە لەگەڵ کاك عەبدولکەریم و برادەرانیان یەکمان گرتەوە و هاتینەوە بۆ چەمی رەزان لە هەموو ئەوکەینو بەینەدا گەیشتینە ئەوەی هەوڵ بدەین تا هێزێکی حەساوە لە سەرکردایەتیەوە دەنێرنە خوارەوە.. ئێمە دریژە بە پارتیزانی بدەین ،کاك سابیرکۆکەیی پێشمەریەکی ئازاو دلسۆزبوو، لەکۆبوونەوەی هەندی لە هیزەکەمان لەپیرەمەگرون حەماسەت گرتی و گوتی: با برۆین لەسەر جادەی سلیمانی دوکان کەمینێك دابنێن زیانێکی زۆریان لێبدەین..

بەلام پیشنیارەکەی کاك سابیر بۆ ئەوکاتەی ئێمە سودی نابوو،بەڵکو ئەبوو بەهۆی ئەوەی هێزەکەمان بلاوە بکات، هەر بۆیە خۆپاراستنمان هیوای زیاتری دەبەخشی بەگەلەکەمان و هەروەهاشمان کرد،دووکوڕی ئازای کۆیی لەلای مامۆستا نازم پێشمەرگە بوون،لە کاك رەهبەریش نزیکتربوون..شێرانە خۆیان گەیاندە لامان بۆ چەمی رەزان،گوتیان ئێمە شارەزاین و ئەتوانین لە بەری کۆیەوە برۆین ودەربازبین. سەرەتا بۆی کۆبووینەوە.لەسەر ئەوەرێکەوتین کە کێ ئارەزووی هەیە با بروات

بۆ سەركردایەتی بۆناوزەنگ.لیستێكی40 پێشمەرگەیمان ئامادەكرد، پێمان باش بوو برادەرانی تیپی ٣١سلیمانی تیدابێ،چونكە ئەوان شارەزای ناوچەكە نەبوون، كاك سابیركۆكەیی ومەلافەرمان وشێخ فەرهادو بەكری برازام پێشتریش كەرەسەی دروستكردنی كەڵەكێكیان بۆپەرینەوە لەزێی دوكان ئامادەكردبوو، لەخوارگوندی بۆڵقامیش شاردوویانەوە..بۆ ئەوهێزەمان بەكەڵك هات،لە چەمەوە هێزەكەمان بەشەوگەیشتنە گوندی بۆڵقامیش، ئەبوولەوێ دەرنەكەون بەرێكەوت ئەورۆژە چاش هێرش دەبەن وئەدەن بەسەر شوێنی برادەرەكاندا،ماینەكەو تفەنگێكی ناوهەگبەو باری ماینەكەی كاك سابیر كۆكەیی دەگرن.. برادەران دان بەخۆیاندادەگرن، خۆیان لەشەری نابەرانبەر رزگاردەكەن، ئەو هێزەمان بە ماندووبوونێكی زۆر و بی زیان گەیشتنە لای هەڤاڵانی سەركردایەتی لە مەڵبەندی سێ.

ئێمە لەهەفتەی بەكەمەوە پەیوەندیمان دروست كرد،كاك عەبدول كریم هەڵەدنی مان بەنامەیەكەوە نارد بۆ لای شەهیدی نەمر وەستا بەكری دارتاش چەند رۆژێك لە سلیمانی مایەوە.لەوسەفەرەیدا پەیوەندی دروستكردبوو، لە بەینی رێكخستنی سلیمانی ومالی كاك حەسەنی حەمەبەگی موغاغی دا،كە ئەوسا لە كۆمەلگای زۆرەملی باینجان بوون، لەرێی ئەو پەیوەندییەوە هەندی پارەمان ناردبوو بۆكرینی پێلاو و جگەرەو گۆرەوی ومەعجون وفلچەی ددان و پێویستی رۆژانەمان، هەروەها لەرێی كاك عوزیری برای كاك حسن حەمەبەگ وسەید مستەفاوە دە هەزار دینارمان پێ گەیشت،بەو هۆیەوە زوو زوو مانگانەی برادەرەكانمان دەدا..ئەوماوە زۆرە لەم ژیانەدابووین،بەلام دانەبراین،هەر بەهۆی ئەو خەتەی رێكخسنتی سلیمانی ولەرێی كاك عەبدولكەریم و عەتا كافرۆشییەوە توانیمان رەفعەت عەبدولا كە لە نزیك ئاغجەلەر مار پێوەیدابوو،بەسەیارەی تایبەت وبەنهێنی بگەیەنینەشاری سلیمانی و پاش چاكبوونەوەی لەری كاك(سەیدحاجی)یەوە گەیاندرایەوە بارگاكانی ناوزەنگ.

پاش ئەوەی٤٠ پێشمەرگەکەمان بەرێ کرد،زیاتر لەنیوانی قۆجەلەرو دەوروبەری ئاغجەلەر و گوندی کەلەشێرە و چەمی رەزان دا جەولەمان دەکرد ، ماوەیەك بوو هەستمان دەکرددوژمن پێمان دەزانێ وئەیەوێ پەلامارمان بدات.

بەیانی تاریك و روونی رۆژی 5 ـ 7 ـ 1988 بوو، ئاگادارکراینەوە هێزەکانی رژێم بەنیازن ئابلۆقەمان بدەن.. هەربۆیە ئێمەش بۆ بەرگری لەخۆمان دابەشبووین، بەتایبەت لەدەوروبەری(مەکۆکە)شوێنێك بوو بەردی گەورە وداری چڕی هەبوو، هەروەها بن تاشە بەردیکی گەورە بەدارو توترك داپوشراوی لێ بوو.. پێیان دەگوت (کەرخۆر) نێوانی هێزەکەمان و دوژمن تەنیا150مەتر دەبوو، دوژمن هاتە شوێنی حەوانەی شەومان لەسەروچاوەی چەمی رەزان،لەلایەن جاشەکانەوە سوتیندرا، هێزەکەی دوژمن بوونە 6 بەشەوە، لەئەم بەرو ئەوبەری شاخەکە،لە ناوقەدی شاخەکە،لەخواروی چەمەکە،لەجادەی چەمەوە بەشی خوارو ئەشکەوتەکانیان دایەبەر(ئارپی جی)ودەستریژی گولە..کویرانە بەهەر چوار لادا ئاگریان دەخستەوە، ئێمە بەشێکمان لەبن بەردەکەی کەرخۆروپاڵ دارەگەورەکان،خۆمان بۆشەڕە نەویستراوەکە ئامادە کردبوو.مەریوان و عەبدولکەریم و عوسمان عەسکەری لەپاڵ بەردێکی گەورەدا بەدووربینەکانیانەوە چاوەدێریان دەکردن،لە مەکۆکەیشەوە کاك رەهبەرو مامۆستاعادل شەریف و چەند پێشمەرگەیەکی چاونەترس بە هەرچوار دەوری خۆیاندا چاودێری هەڵسوکەوتی هێزەکانی دوژمنیان دەکرد، هەردوولامان پەیوەندێکی بەردەوامان هەبوو،ئاگاداری یەکتریمان دەکردەوە، دوژمن لای ئێمە تێپەرین بانگمان کرد قەندیل دوو ئاگاداربن بۆ لای ئیوەوەهاتن....

تکایە خۆتان دەرمەخەن،با دوچاری شەڕنەبین جونکە کات زۆری ماوە هەروەها دوژمن لەگەورەدێ وکانی سێشەوەهاتوون،ژمارەیان یەکجار زۆرە،وەلاّم بەڵی باشە.. ئەوەجاشەکان چوونەسەر(کانی شیخ عەولا)تادەست نویژ هەلگرن،ئەوە هەندێکیان

دوور کەوتنەوە ئەترسێن،ناوێرن خۆیان بکەنەوە..ئەوە دووجاش بەرەو مەکۆ هات، لە پڕێکا ڕیزێ تەقە لەمەکۆوە دەنگی هات،هەلۆ قەندیل دوو..!ئەوتەقانە چیبوو.؟ بەڵی قەندیل یەك سێ جاش هاتەناومانەوە وایاندەزانی سەربازی ڕاکردوین، ئەیانەویست بمانگرن و بمانکەن بەدیاری دەستیان..بماندەنە دەستی دوژمن،ئەوە برادەرانیش بە سەزای گەلیان سپاردن،شەر دەستی پێکرد..ئێمە نەمان دەویست چونکە کاتژمێر لەدەوری ۱و۲دابوو، بۆ هاتنی کۆپتەر زۆر زووبوو،جگە لەوەی ژمارەی ئێمە لە(30) پێشمەرگە تێنەدەپەڕی،لەهەموو ناوچەکەشدا هەرئەوەندە مابووینەوە،فیشەکمان هەر ئەوەندەهەبوو،کەپێمان بوو،ئەشمانزانی دوای شەڕەکە ئەگەر سەرکەوتووش بین ناتوانین لەوێ بمێنینەوە، بەهەر حاڵ ڕیش بۆ بە توشەوە ئەبێ شانەی بۆهەڵگرێ.مامۆستاعادل شەریف گوتی:(قەندیل یەك ژمارەیەك چەکدارمان ئابلۆقەداوە بەنیازین بیان گرین) هاورمان کرد تکایە زۆر وشیاربن نەکو بەفێل بن بەکورتی شەڕ لای ئێمەشەوە دەستی پێکرد، هەنێ لەکورەئازاکان پێشیان لەوهێزە سەربازییەگرت کە لە گەورەدێ وە هاتبوون،بەنیازی ئابلۆقەدانمان بوون، شەڕلەهەردوو قۆڵەوەگەرم بوو، کردمان بەفشەو بە جهازەکانمان رامانگەیاند ئەوە هێزێك پەلاماری گەورەدێ دەدەین هێزێك پاشەڵی هێزی دوژمن دەگرن،هێزێك بەرێوەن بۆ هاوکاریمان..تائێوارە تاریك داهات هێزەکانی دوژمن شکان وهەڵاتن.... زیانی زۆریان پێکەوت،لەقۆڵی کاك رەهبەر ومامۆستا عادیل ەوە 14جاشولکە لەوانەی کە تازە بوو بوون بەجاش، بە چەکەکانیانەوە خۆیان دابەدەستەوە...

لەقۆڵی ئێمە کاك مەلافەرمان گوللەیەك بەرسنگی کەوت، زامەکەی مەترسیداربوو، بەڵام پێشمەرگەی مشوور خۆر(عوسمان عەسکەری) و کۆلەپشتەکەی دەربازیان کرد لە مەترسی و زمەی کلاشینکۆفەکەی بە یۆدولەفاف ساریژی زامەکەی بۆ کرد، بۆ ڕۆژی دوواتر کاك عەتا وکاك عبدولکەریم بردیان بۆ ماڵی(حەسەن حەمەبەگ)و

لەویشەوە بۆشاری سلیمانی.شایانی باسە(ڕێکخراوی سلێمانی) پاڵپشتێکی باشبوون،هەقەهەمومان سوپاسی بێپایانیان بکەین،تایبەت خاڵەبەکری دارتاش و هاوڕێ جەباری حاجی ڕەشید. هەروەها سوپاس و پێزانینمان بە کاك حەسەن و کاك عوزێرو کاك عەبدولای ئامۆزای(ئەرەکسین خان) وکاك عەلی کاکەڕەش کە هاوکارو ئازا و دڵسۆزبوون. ناکرێ کاك عەتاو کاك عەبدولکەریم هەڵەدنی لەیادبکرێن،کە هێشتا مەلا فەرمان مان بەڕێ نەکردبوو، هێشتا هەر لە ژێر چاودێری عوسمان عەسکەریدابوو،شەوی شەڕەکە دیلەکانمان لە(کانی شێخ عەبدولا) کۆکردەوەوهەندی قسەمان بۆکردن و پێمان گووتن بە ناوچەمی ڕەزاندا برۆنەوە، ئیمەش بەدواتاندادێین.بەلام ژیان بۆئێمەلە چەمەکەدا نەمابوو،دەمانزانی بۆسبەی بەفرۆکە وێرانی دەکەن وهەرچی هێزیان هەیە کۆی دەکەنەوە، بۆیە سەرپێی کۆبووینەوەو بریارمان دا برۆینە گوندی قۆجەلەرو دەورووبەری کە نزیکی ئاغجەلەرو ڕەبایەکانی دوژمنە. کەم تر جێگای گومانەو لەوێدا خۆمان دەپارێزین..
بۆ بەیانی رۆژی دووای شەڕەکەبوو،لەناورەزەکانی خوارماڵەکانی گوندی (قۆجەلەر) خەریکی چێشت لێنانبووین. مامۆستا عادل دەست ڕەنگین بوو،گەنمەکۆتاوی بۆ لێناین، نانمان بەتەواوەتی نەخواردبوو، حەرەسەکەمان هاواری لێ هەلسا..خۆمان پی کۆنەکرایەوە گەلەجاش وسەرباز پەلاری ناو گوندەکەیان دا..هەرئەوەندەمان پێکرا دەست بدەینە تفەنگەکانمان و بەرەو بەرزای گردۆلکەی لاشانی گردەقارەمان برۆین،هەندێ لەبرادەرانمان لەچەمەکە مابوونەوە زۆرلەوە ترساین بگیرێن، مەریوانی برازام وئاراس حەمەدەمین عەسکەری و عادل شەریف و یەکدوو برادەری تربوون.دوژمن کەوتە ئاگردانی پووش وپاوانەکان،ئاگرکەیان دوکەڵێکی چڕی دوست کرد،هەمومان بە هۆی دووکەلەکەوە لەچاوی دوژمن بزر بووین،لە ترۆپکی گردەکەدا خۆمان جێگیر کرد. وردە وردە ئاگرەکە بۆلای ئیمە دەهات، مەترسیمان

بۆهات بۆیە هەربەکەمان لای خۆمانەوە لقەدارێکی تەرمان بڕی، کە ئاگرەکە نزیک دەبووە بە هیواشی دەمان کوژاندەوە ئەو رۆژە دووجار ئەو هێزەی دوژمن دەگەڕانەوە ناو ئاغجەلەرو دەهاتنەوە بۆقۆچەلەر،باشی شوێنەکەمان لەوەدابوو چوبووینە بن ریشیانەوە، تەسەوریان نەدەکرد پێشمەرگەبتوانی لەوێدا بژێت،لەلایەکی ترەوە رەبایەکانی لوتك ئێمەیان دەبینی..بەڵام بەهێزەکانی خۆیانمانیان ئەزانی، ئێوارەی ئەورۆژە برادەران مێش هەنگوینێکیان دوزیووە، لەیەکی لەکەلاوەکاندا دووکەڵ شەپرزەیان کردبوو،ئەوانیش بە هەلیان زانیبوو هەرکەسە هەندێکیان لیّ هێنابوو، پاشان ئاگرمان کردەوەو هەر دەستەیەك بۆ خۆیان بەشی دوورۆژ ناوساجیان کرد، نان و چاو ناوساجیمان خواردو پاشان نانە بەرەکانمان لە پشت بەست و بەرەو نزیکتر لە دوژمن چوینە ئەشکەوتی (کونەگورگ) لە پشتی گوندی(کانی بۆگەنە) رووبەرووی مەرکەزەکەی ئاغجەلەر، ئەورۆژەش حەرەسەکانی سوپا کە دەگۆرا چاومان لێبوو، بەڵام ئێمە تێکەیشتین ژیانی ئێمە لەناوچەکە لە مەترسیدایە..

بۆیە بریارماندا بپەرینەوە بۆدەشتی کۆیە،یەکدوو برادەرمان چوبوون بۆسلیمانی و جهازێکی راکاڵمان دابوو بە رێکخراوی سلیمانی هەتا فێریان بکەن،چۆن کاری پێبکەن.دووسی رۆژ لەدۆلەدریژخۆمان راگرت،کە برادەرانمان گەڕانەوە، بەرەو (قەلای گان)ی نیوانی گۆپتەپەو بۆڵقامیش چووین،لەوێوە پەڕینەوە(کانی بی) بەری کۆیەو لەوێشەوە بۆ هەوارگەی(میر سەید) لەپشتی کۆیە.

(شەهیدان قاسم و ئەحمەدجوتیار وهەژار مەغدید لەهاورێیانی مەلافەرمان بوون، دەوری جوامێرانەیان هەبوو لە گەیاندنی40 پێشمەرگە بەسنووری مەڵبەندی سێ)



# پارتیزانی دوای ئەنفال

## ڕەهبەری ســـەید برایم

پێشمەرگە وپارتیزانی دوای ئەنفال و

سیاسەتمەدار و ڕۆژنامەنووس و نوسەر و شاعیر

- لە ۲۷/۷/ ۱۹۵۷لە گەرەکی (بایزاغا)ی کۆیە،لەخێزانی ڕووناکبیر لە دایك بووە.

- بەشی ڕۆژنامەنووسیی لەپەیمانگای تەکنیکی لەشاری سلێمانی تەواو کردووە، دیبلۆمی لە ڕۆژنامە نووسیدا وەرگرتووە.

- بەشی ڕاگەیاندنی کۆلیجی زانستەمرۆڤایەتیەکانی زانکۆی سلێمانی تەواو کردووە .. بەکالریۆسی لە ڕۆژنامە نووسی وەرگرتووە..

- لە(۳/۷/۱۹۷۹)وە بووەبەپێشمەرگە،لەژیانی پێشمەرگەیتداچوارجار بریندارکراوە.

- خانەوادەکەی،بەتایبەت باوکی ۱۱جار لەسەر کوردایەتی وپێشمەرگایەتی گیراون.

- چەندین لێپرساویەتی وەرگرتووەو لەگەڵ دنیای ڕۆشنبیریی وفکری دا گونجاوە.

- ئەندامی سەرکردایەتی (ی.ن.ك)ە و پڕ بە بڕواوە سۆشیال دیموکراتە.

- ساڵی(۱۹۷۹)بووەبەئەنداد ناوچە

ساڵی(۱۹۸۱) کراوە بە لێپرسراوی ناوچەی کۆیەی (ی.ن.ك)و لەگەڵ دامەزراندنی (یەکێتی شۆڕشگێڕانی کوردستان)دا بووە بەلێپرسراوی ناوچەی کۆیە.

- ساڵی(۱۹۸۳)بووە بەجێگر وساڵی(۱۹۸٤) بووە بەسەرتیپی(۹۳)ی کۆیە،

- ساڵی (۱۹۸۷)بەسەرتیپی گوازراوەتە بۆ تیپی(۲۵)ی خاڵخالان.

- ساڵی(۱۹۸۹) کراوە بەئەندامی فەرماندەیی گشتی (هـ.پ.ك) تا ڕاپەڕین.

- ساڵی(۱۹۹۱)، لەڕاپەڕین دا لێپرسراوی میحوەری کۆیە بووە،

دواتر بووە بەئامیر بەتالیونی کۆیە، ئینجا فەرماندەی هێزی (۷) ی کۆیە.

- ساڵی(۱۹۹۲)بووە بەقائمقامی شەقڵاوە، دواتر بووە بەسەرۆك ئەرکانی قیادەی مەنتیقەی هەولێر لەسوپای یەکگرتوی کوردستان، ئینجا بووە بەفەرماندەی قیادەی مەنتیقەی کۆیە،دواتر بووە بە فەرماندەی(۱۵)ی قەرەچووخ لەهەولێر.

- ساڵی(۱۹۹۹) بووەبەجێگرمەڵبەندیرێکخستنی پێشمەرگە،دواتر بووەبەکارگێڕی فەرماندەیی گشتی سەرپەرشتیاری فەوجەکانی سکرتاریەتی هەڤاڵ(مام جەلال).

- لەمانگی(10ی2005)وەکراوەبەسەرۆکی دەزگای کاروباری پێشمەرگە دێرینەکان.

- خاوەنی ئیمتیازی گۆڤاری(رۆژنامەوان)گۆڤاری(کەکۆن) ە.

- سەرپەرشتیاری بەشی راگەیاندنی کۆمەڵەی پێشمەرگە دێرینەکانی کوردستانە.

- ئەندامی سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستانە،

- ناسنامەی نێودەوڵەتی رۆژنامەوانی جیهانیی هەیە.

- خەڵاتی رێزلێنانی کوردستانی نوێ و بەدرخان ووەزارەتی رۆشنبیری وەرگرتووە.

- ئەندامی یەکێتی نوسەرانی کوردە.

- لەکۆنگرەی(3)و(4)ی (ی.ن.ك )دا بە ئەندامی سەرکردایەتی هەڵبژێردراوە.

## چاپکراوەکانی نووسەر:

| | |
|---|---|
| ١. گردار | ٢٠٠٦ |
| ٢. پەیڤین لەگەڵ رۆح | ٢٠٠٧ |
| ٣. سایەی هەیبەسوڵتان | ٢٠٠٨ |
| ٤. مەشخەڵان | ٢٠٠٩ |
| ٥. رۆژنامەوانی لەکوورەدا | ٢٠٠٩ |
| ٦. بەبەختی حاجی | ٢٠١٠ |
| ٧. پزگاری - دەنگی (ی ش ك) | ٢٠١١ |
| ٨. شنەی شاخ | ٢٠١٣ |

# نامەی کاك نەوشیروان

# بۆ کاك رەهبەری سـەید برایم

برای بەرێزم کاك رەهبەر

سلاوێکی گەرم  هیوادارم هەردەم لەخۆشی دابن

سلاو لە براپێشمەرگەکان ئەکەم ئومێدەوارم سەلامەت و سەربەرزبن.

کاکە گیان  بەگوێرەی هەلومەرجی نوێ ی کوردستانی عێراق سەرلەنوێ

بڕیاری ڕێکخستنەوەی هێزەکانمان داوە بەجۆرێك کەلەگەڵ

قۆناغی سەختی ئیستەدا بگونجی

وا کاك رۆستەم هاتەلاتان بۆسەرپەرشتی و رێکخستنەوەی پێشەرگەکانی

21+23+25+27+29 لە 3 تیپی رێك وپێك دا بەجۆرێك کە بیرمان لێ کردۆتەوە.

مانەوەو خۆڕاگریتان لەو ماوەیەدا بۆئێمەو میللەتەکەمان جێگەی سەربەرزی و شانازی بووە،ئومێدەوارم بەهیمەتی هەموتان سەرلەنوێ بتوانین هێزەکان رێك بخەینەوەو  هێزی پێشمەرگە و گەلەکەمان ئەمجارەش لەم تەنگوچەڵەمەیە دەرباز بکەین .

دوبارەسلاو وهەربژین بەخۆشی.

واژۆ

1988/7/14

## بیرەوەری

## سـەردەمی پارتیزانی

دوابەدوای کیمیابارنکردنی ئاوایی گۆپتەپە و عەسکەر وپەلاماری هێزەکانی رژێم، پێشمەرگەکانی ئەوسنوورەیش کەوتنە قۆناغێکی نوێی خەباتەوە،هەڤاڵ رەهبەری سەیدبرایم و هاورێکانی بەرەو ناوچە سەخت و شاخاوییەکان هەڵکشان..

بابزانین کاك رەهبەر چۆن بیرەوەری ئەو رۆژانە دەگێراوەتەوە :

- دوا بەدوای ئەوەی هێزەکانی دوژمن ناوچەئازادکراوەکانیان داگیرکرد،زۆربەی پێشمەرگەکانی مەڵبەندەکانی یەك و دوو رووبانکردە سنوورەکانی مەڵبەندی سێ و بناری قەندیل،جگەلەوان چەند دەستەی جیاجیا لە ناوچەکانی گەرمیان وشوان و شێخ بزێنی ودەشتی کۆیەو هەولێر مابوونەوە،ئێمەدوو هێزی پارتیزانی بووین لەستووری خاڵخاڵان و کێوەچەرمەڵە وچەمی رێزان مابووینەوە، بەشێك لەهێزەکە لەگەڵ من و بەشێکی تر هەڤاڵ(عەلی بچکۆل) سەرپەرشتی دەکردن..

## خۆرێکخستنەوە

- بۆخۆرێکخستنەوەوخۆسازدان بۆخەباتی پارتیزانی چەندکۆبوونەوەمان ئەنجامدا، کەوتینە جوولە بۆ پەیداکردنی پێداویستی ژیان و دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ رێکخستنەکانی شاروئۆردوگاکان،لەولاشەوە هێزودەزگاکانی دوژمن کەوتنە گەڕان وپشکێن و کێوماڵکردن..فرۆکەی هەلیکۆپتەری چاودێری لەئاسمانەوە چاودێری دەکردین،سەرباز وجاشیش لە زەوی هەوڵی دۆزینەوەی پارتیزانەکانیان دەدا..

## شەڕی چەمی ڕێزان

بەرەبەیانی 7/5 1988هێزەکانی رژێم کەوتنە کێومالکردنی ناوچەکە بەمەبەستی دۆزینەوەی پارتیزانەکان ،لە قۆلی (کەلەشێرە)وە شۆڕبوونەوە بەرەو خەشارگەکانی ئێمە،تەرو وشکیان ئاگردەدا، ئێمە بڕیارمان وابوو تا بکرێ خۆمان رایگرین وهەوڵ بدەین زووبۆدوژمن ئاشکرا نەبین،بەڵام بێ سوودبوو لەقۆلی(کانی شێخە)هاتنەسەر حەشارگەوسەنگەرەکانمان وشەڕی دەستەویاخەدەستی پێکرد،هێزی دووەمیشمان بەفەرماندەیی کاك عەلی یچکۆل لەقۆلی(کەرخۆر)ەوە رووبەڕووی دوژمن بوونەوە، شەڕی توندی مان ونەمان دەستپێکرد،دەیان هێرشی یەك لەدوای یەکی دوژمن بەرپەرچدرانەوە.دوژمن زیانی زۆربوو،شەڕتاسەعات حەوتی ئێوارە درێژەی کێشا. لەوشەڕەدا حەوت کەس لەهێزەکەی رژێم بەدیل گیران و(15)کلاشینکۆفی موزەلی دەسکەوت بوو، کەلوپەل و خواردنێکی زۆریشمان کەوتەبەر دەست،کە لەبرسێتی دەربازی کردین.دوای تاریك بوون توانیمان بازنەی گەمارۆکە بشکێنین و لەو دەڤەرە دووربکەوینەوە،هەرئەوشەوە دیلەکانمان ئازادکرد،لەوشەڕەدا تەنیا هەڤاڵ (مەلافەرمان)بریندار بوو،ئەویشمان لەگەڵ خۆمان دوورخستەوە.شایانی باسکردنە ئەم هەڤالانە لەقۆلی ئێمەوە زۆر بەهەلمەت بوون:

(مامۆستاعادل شەریف،مجیدمحمودکافرۆشی،شەهیدسمایل شەریف،

شەهیدسەرکارئیسماعیل تیژەیی، هەژارمغدید،دڵسۆزبکرفتح الله،دڵزار امین،

امجدفتاح، شاخەوان حەویز،دڵزارسدیق،جوامێرکاکەمەم

کەلەشێرەیی،سەردارکوێخانەریمان ).

# پارتیزانی دوای ئەنفال
# هۆشیارمەلاعەبدوالرحمان ئاوبارە
# پیرەوەرییەکانی خۆی دەگێڕێتەوە



لەکۆتایی مانگی چواردا دوای پەلاماری سنوری مەڵبەندی یەك و گەرمیان لە ٣/٥ / ١٩٨٨ پەلاماری سنوری دۆڵی سورداش و قەڵاسیوکە و خاڵخاڵان و چەم خاسە وبان شوان و ساڵەیی و شێخ بزێنی خواروی دا. پێشمەرگەکانی سنوری مەڵبەندی یەك ئێوارەی کیمیابارانکردنی گۆپتەپە و عەسکەر لەسنوری تیپی ٢٥ ی خاڵخاڵان بوون وهێزێك لەگەل ئاواتی شێخ جەنابدا وتیپی ٥٩ ی حەمرین لەئاوبارەبوون و بۆ رۆژی دوایی لەچەندین قۆڵەوە رژێم هێرشی هێنایە سنوری تیپی٢٥ی خاڵخاڵان هێزێکی گەورە چەمچەماڵەوە بەپێشقەرەوڵی(جاش)ی کورد، کاتژمێر ٢ ی پاشنیوەڕۆ گەیشتنە(تەکباسان)کە گوندەکە پێشتر چۆڵکرا بوو،تەنها یەك پیاوێکی بەتەمەنی کۆزەبۆرەیی لەگوندەکەدامابوو کەباوکی(شەهید سوارە) و شێخ سەلامی کۆزەبوورەبوو. سەرەتا جاشەکان وەکو پیشەی هەمیشەییان کەوتنە دەستڕێژ وپاشان چوونە ناوگوندەکەوە،بێ ئەوەی هیچ بەرگریەك هەبێت، پاشان جەیش هاتە تەکباسان، ئەو رۆژە تەنها کەرتێکی تیپی ٢٥ ی خاڵخاڵان لە نزیك ـ شێخ پاڵەوان تەقەیان لە هێزەکەی دوژمن کرد، جگە لەوە هێزەکان هەمووی لە گوندەکانی خاڵخالان بەهەردو دیویدا بڵاوەیان لێکردبوو...بۆ رۆژی دوایی هێز گەیشتە دیوی کارێزە وخاڵخالان.بەشێك لەهێزەکەی مەڵبەندی یەك لە ئاستی گوندی قوزڵوو پەڕینەوە بۆ دەشتی کۆیە،بەڵام هێزێکی زۆریان بەسەرکردایەتی (انور دۆڵانی) لەهەردەی ماسقەلان لەگەڵ ئێمەدا مانەوە، بۆ ئێوارە بە شارەزایەکەوە بەرەو جادەی کەرکوك ـ سلێمانی بەڕێمان کردن ..

بۆ بەرەبەیان کاك انور هاتەوەلامان زۆربەی هیزەکەی پەڕیبوونەوە ،چونکە ڕێگاکانی پەڕینەوە بەشەو ورۆژ قافڵەی بەسەرەوە بوو پاشان جارێکیتر ناردمانەوە بەرەو سنوری گەرمیان.لەو ڕۆژگارە ڕەشەدا کێشەی سەرەکی ئێمە منالەکانمان بوو، کەباوکم ڕێگەی نەدا پێش شالاوەکە بەرەو شار ڕەوانیان بکەین ،ڕۆژانەش کۆپتەر وجاش لەوچەم وهەردانە بەدوامانەوە بوون و خۆفرۆشانیش لەهەردەی ماسقەلانیش لەکۆڵمان نابوونەوە،لەهەردەی(سیرستانە)چەند کۆپتەرئینزالیان کرد. وامانزانی ئاشکرابووینە، بەلام پاش ڕۆیشتنی کۆپتەرەکان بۆمان دەرکەوت،کە (تەراکتۆرێك)ی لەنزیك ئێمە بینیبووە پاش چەنددەسترێژ تەراکتۆرەکەی سوتاندو لەکۆڵمان بوونەوە.بۆ ئێواریێ لەگەڵ (کوێخا سیروان)هەوڵێکماندا منالەکانمان بەرەو کەرکوك بنێرینەوە، بەلام ئەو هەوڵەشمان سەرینەگرت و کاتێکمانزانی هەندێك لە پێشمەرگەکانی تیپی ۳۱ سلێمانی وابزانم (جمال ابوو شوارب) ئامر کەرتیان بوو، منالەکانم ودایکمیان گەیاندبۆوە ماڵی کاکە حەمەی مەلا محمود...

دیسانەوە بەمنالی شیرەخۆرەی برسی ونەخۆشەوەماینەوە... کۆپتەروجاش و مێشولەومەلاریایش گالەیان بەمنالەکانمان دەکرد،پاش هەفتەیەك فریادڕەسێك فریامانکەوت..ئیوارانێك باوکم گوتی (کاکەحەمەی مامەرەزا*)هاتۆتە ئەم سنوورەو لەهەردەی (گەلەکەمردوو)ەلای کارێزە، ئێمەیش چوین بۆ سەردانی،جگە لەوەی کۆمەڵێك لەخزمانی گوندی گۆپتەپەی بریندراری کیمیابارانکراوی لەگەلدا بوو، مامۆستایان (عبدالله کاکە عبدالقادر) و(فائق) ی قەمچۆغە، کۆمەڵێك لەخزمانی (مامەڕەزایی)ڕێدارهاتبوون،کاکەحەمە بەرەو مەڵبەندی ۳ بەرنەوە،بەلام کاکەحەمە قەبوولی نەکرد.گوتی ئێوە هاتون من رزگار بکەن زۆر مەمنوتانم ولەجیاتی من وەرن ئەم منالانەی کاك ئەوڕەحمان وکوڕەکەی رزگار بکەن، یەکێکیان صالح کوێخا قادر بوو باوکی شەهید عبدالرحمن لەشەڕەکانی مانگی ۹ ی قەندیل شەهید بوو بوو،

ئەویتریشیان لەژیاندا ماوە لە سەرچناری کەرکوك دادەنیشێت تاکۆتایی ژیانم خۆم بەقەرزاریان دەزانم... ئیتر من لەگەڵ هەڵویستەکەی کاکە حەمەدا ئەوەندە بەختەوەر بووم وامدەزانی ئەو رۆژە لە زیندان ئازادکراوم... ئەو پیاوە گەورەیە، کە ئەوەندە بەتەمەن بوو پڕ بەچنگێکی لێمابوو گەورەیی ولێبووردەیی خۆی نواند و ئێمە لە رۆژگارە رەشەدا گەشاندەوە. ئەنفال کۆستێکی گەورە بوو کەس فریای کەس ناکەوت وهەر کەسەو لە خەمی خۆیدا، بەڵام مرۆڤی گەورە وخۆنەویست هەر گەورەیە و تەنگانە وخۆشی و لەگەورەیی کەمناکاتەوە،ئەنفال رۆژە رەشێك بوو،کە پێشمەرگەی یەك حیزب لەیەکتر دڵنیانەبوون،هەندێك شەو لەهەندێك بەناو پێشمەرگە خۆمان دەشاردەوە. لەو تەنگانەیەشدا رژێم لەکەناڵەکانی خۆیەوە هەوڵی دەدا تا هەندێك پێشمەرگە شەهید بکەن وخۆیان رادەست بکەنەوە،هەر لەو ماوەیەشدا لە سنوری چەم خاسە نامەردێك،پێشمەرگەیەکی بەناوی(حیدر)کەلە دەستەکەی کاك شۆرش قەرەهەنجیری بوو شەهید کرد و تەسلیم بوونەوە،هەر لەو رۆژگارەدا کۆمەڵێکی تر لە سنوری تیپی ٥٧ سەگرمەدەستەیەك پارتیزانی حیزبی شیوعی کوردستانیان شەهیدکردو لێپرسراوەکەشیان بە زیندویی رادەستی ئەمنی چەمچەماڵ کردەوە،کە ئەمەیان کارێکی زۆر قێزەون وبەدەر بوو لەهەموو نەریتێکی شۆرشگێرانە... بۆئێستاش بەڵەیەکی رەشە بەنێوچاوانی ئەنجامدەرانیەوە... لەو رۆژگارەدا پشت وپەنای ئێمە ئەزمونی باوکم بوو، کە چەندین جار شەوانە دەکەوتینە کەمینی جاش وحەیشەوە جارێك لەناسرومیسر وجارێك لە مەحمەخان و جارێکیش لەقەبرستانەکەی تلیان،لەهەموو کەمینەکاندا شارەزایی باوکم،نەك ئازایەتی خۆمان رزگاری دەکردین..دیسانەوە دەیڵێمەوە ئەنفال کۆستێك بوو بەسەر هەموو گەلەکەماندا هات وخەڵکی ناوچەکە پاش ئەوهەموو ماڵوێرانەیەش هێشتا بەدەنگمانەوە دەهاتن و پێیان دەوتین نەکەن تەسلیم ببنەوە..

ئەمە ئامۆژگاری پیاوێك بوو،کاك حەمەی مەلامحمودی کارێزەش لەو رۆژگارەدا پیاوێکی بەهیمەت وورەبەرزبوو هەمیشە ئامۆژگاری دەکردین.ئیتر پاش ئەوەی منالەکانمان ناردەوە باوکم زۆر دلخۆش بوو،دوای ناردنەوەی منالەکان ئیتر ئازادبووین لەجەولەی دووورودرێژ وقەتیسمان لەناوچەیەکی دیاریکراودا و شەوانە دەڕۆیشتین تا سنوری تەوەکەلەکان و سەرتاف ویەغمەشەو پاشان دەگەڕاینەوە بۆ هەردەی ماسقەلان وگلەکەمردوتەپەکوڕوتەرەقە ودوشیوان و پاش دووڕۆژمانەوە دیسانەوە دەکەوتینەڕێ بەرەوئاوبارە ومەحمەخان بەدوای پەیداکردنی خواردندا..

نازانم چەندەمین رۆژی ئەنفال بوو سەربازێك بەچەمی شیوەسوردا سەربەرەوژور هاتبوو بە گازقیادەیەکەوە تا گەیشتە بەردەم(شەهید شەوکەت)بەدیلگرتیان و پاشان ئازادیان کرد،هەر لەوماوەیەدا هەلیکۆپتەر لە خوارمانەوە هێزی دابەزاند، کەچەند پێشمەرگەیەك لەکاتی خۆشۆردندا بینرابوون پێموایە چەکی یەکێك لە پێشمەرگەکانی هەلگرتبۆوە..لەهەندێك لەم جەولانەدا مامۆستا عبداللەی گۆپتەپەو مامۆستا فائقی قەمچۆغەشمان لەگەلدابوون، بەلام پێشتر وەکو باسمکرد ئێوارانێك قەول بوو مستەفای حاجی عبداللە ی ئامۆزام هەندێك پێداویستیمان بۆ بهێنێت، بەلام لەرێگە کەوتینەکەمینەوە..دیاربوو پێشتر هێزەکانی رژێم لەسوری ناوشاخانی تلیان و مەرخوادەی خواروی چاودێری ئێمەیانکردبوو،چونکە پێش ئەوەی بگەینە ناو گوندی مەحمەخان کەوتینە بەر رێژنەی دەستڕێژی دۆشکەی ناقیلە وجاشەکان پاش 5خولەك تەقەکردن..ئێمە خۆمان مەلاسدا،تەنها دوکەسمان سوارە بوون ئەسپیان پێبوو.کە خلیل بێدەری و فەلاح حمد عزیز برای ابووزێد و سلاح وبەلێن بوو،(بەداخەوە لەنەوەدەکان شەهید کرا) لە سەر ولاخەکانیان کەوتنە خوارەوە. باوکم گەیشتە سەریان و پاش دلنیابوون لەوەی،کەنەپێکراون و ئینجا هاتە لای ئێمە وگوتی هەموو سەلامەتن ورێگەیەکی بۆ دیاریکردین ودۆلێك بوو بەرەوگوندی

(کانی گەوهەر)دەرۆیشت لەوێوە دەربازبووین وگەیشتینە(کانی گەوهەر) گوندەکە چۆڵ بوو،تەنهارەوەقازێکی لێبووقازەگەورەکانمان سەربڕی و خواردمان، دوای ئەوە جەیش وجاش هاتنە ئەوسنورەو ئەوخەڵکانەیان دەستگیرکرد، کە خۆیان لەو چەمانە حەشاردابوو، لەسەر خواردن پەیداکردنی توشی ڕوداوی سەیر سەیر دەبووین،هەفتەی یەکەم لەهەردەی ماسقەلان کاك رزگاری برای مامۆستاعومەری (شێخ پاڵەوان) کاریلەیەکی بچوکی دۆزیەوە کارەکە زۆر بچکۆلەبوو هەرکەوڵی کرد لەماوەیەکی کورتدا ئاگرمان کردەوە برژاندی و من زۆر برسیم بوو دەستێکی کارەکەم بەرکەوت وەکو بەرکوڵ گۆشتەکەی نیمچەکاڵ وگەرم بوو شیلاوگی ناودەمارەکانی بەدەم وچاومدا تەقی دەم وچاومی سوتاندو تاهەفتەیەك چاوم ئاوی دەکرد و خەڵکی وایان دەزانی. کە پێشتر بریندار بوومە ..خۆشم لەڕوم ناهات سەرگوزوشتەکە بگێڕمەوە..جارێکی تریش خلیل بێدەری گیسکێکی دەستکەوت لەبێدەر خواردمان.. ،بەڵام ئەمجارە پەلەمان نەکرد و ئەزمونی ماسقەلانم هەبوو، بۆ ئێوارەکەی باوکم گۆشتی بەرخ وکۆمەڵێك چەکداری (مجلس الاعلی الاسلامی) لیوای (بدر)یان لەگەڵ خۆیان هێنابوو ، کە پەراگەندەی بەری قەراخ بوون وبە ناشارەزایی هاتبوون تا دەست باوکم کەوتبوون ، لەگەڵ خۆی هێنابوویانی،پاشان بۆ کۆتایی مانگی حەوت گەیانمانە سنوری مەڵبەندی ٣ و لەوێشەوە بۆ قەندیل وئاودیوی ئێران کرانەوە کە ژمارەیان ٨ کەس بوون ، یەکێکیان ناوی (سید ناسر)و خەڵکی (ناسریە) و سوق الشیوخ بوو،مەخزەنێکی ٧٥و دووربینێکی پێدام تا پێشکەشی باوکمی بکەن.. پێمگوت خۆت ماندو مەکە ، چونکە باوکم دیاری وا قەبوڵ ناکات ، ئەگەر هەردەتەوێ چاکەی باوکم بدەیتەوە، ئەوا بڕۆ پرسی پێ بکە وبیدەرە من ، بەڵام بەرەزامەندی باوکم ... باوکم پێ وتبوون تا من بمێنم ئێوەش پارێزراون وپێکەوە رزگارمان دەبێ، چونکە بڕکەیەکی تریان هەر لەوناوە

**لێکدابرابوون پێموایە لە بۆڵقامیش کوشتوبوویانن، یا رادەستی سوپای عێراقیان کردبوونەوە، بەڵام ئێمە لەگەڵ خۆمان پاراستمانن تا گەیشتینەمەڵبەندی ٣ لەبەر بێ خواردنی بەرەو ئێران بەڕێمان کردن ..هەروەها پارەیەکی زۆریان پێبوو هەمووی ٢٥ ی عێراقی بوو، نەبێتە گەندەڵی ١٠٠٠ دیناری پێدام و پێشتریش بەئیجازەی باوکم مەخزەنەکە و دوربینەکەی پێدابووم، کەلەدۆڵەکۆگێ پێشکەشی مامۆستا (جەلال جوهەر)م کرد . کە ئەو هێشتا لەبەرەی شەڕ بوو لە سورەدێ وقڕناقاوپشتئاشان ..لەو رۆژگارە ڕەشەدا جگە لە تەسلیم بوونەوەی پێشمەرگە و چۆلکردنی دێهاتەکانی بەرەو شاروشارۆچکەکان،هەندێ ڕوداوی ناخۆش رویاندا لەهەندێك شوێنی سنورەکە ، کە گەورەترینیان کارەساتی ئەنفالکردنی چەمی (بابەڕوشە) ی نێوان جەلەمۆرد و چوخلیجە بوو، کە زۆربەی خەڵکی ئەو گوندانە وبەشێکی خەڵکی بەرکەوتوی کیمیایی گۆپتەپەبوون..لەوێدا دەستگیرکران، جگە لەوێ لەچەمی (خەنەتیلکەکە) ی نیوان ئاوبارە وگەڕاو و ئەسکەندەربەگی ودارەقوتە کۆمەڵێك خیزان دەستگیرکران، کەمنالەکانی کاك (بەکر تەلانی)شیان لەگەڵدابوو بەشێکیتر لە خزمانی خۆم مەحمەخانی لەدووئاوانی قولقولە ـ گردەگەڕاوی دەستگیرکران، کە یەکێك لەو خێزانانە ئامۆزای ئێمەبوون وخۆیی و ژن و٨ منالی ئەنفالکران، دوای ئەوە رۆژانە جاشەکان بە چەم ودۆڵەکاندا دەگەران بۆ دەستگیرکردنی خەڵکی سڤیل وتالانکردنی مەڕومالات...**

---

*(کاکە حەمەی مامە رەزا سارێکی بەتەمەن وبچکۆلەو بەریقار، بەڵام خاوەن هەڵوێست و وردیەکی بەرز یەکێك لە کورەکانی بەناوی(شێخ هاوڕێ) سەرتیپی تیپی ٢٩ کەلکەسماق بوو، کە زۆربەی پێشمەرگەکانی خەڵکی سنوری خۆمان لەخزمانی مامەرەزایی و هەندێکیان مامەرەزایی دڕنازەڵەو ئەوناوە بوون ... ئەم تیپە جگەلەوەی بەشێك لە پێشمەرگەکانیان لەکیمیابارانی گۆپتەپە شەهیدبوون لەشەڕەکانی کۆتایی ئەنفالیش لەقەندیل لە پێشی پێشەوەی سەنگەرەکان بوون و پاش ئەنفالەکانیش هەموو تیپەکەو ماڵ ومناڵیان لە دەوری شارۆچکەی سەردەشت و دۆڵی واران گیرسانەوە.



## بریندار بوونی پارتیزانی دوای ئەنفال
## پێشمەرگەی دێرین کاك مەلافەرمان

**مەلافەرمان هاوڕێی پێشمەرگایەتیە بوو لەشۆڕشی ئەیلول، لە دوای نسکۆی 1975 یش هاوڕێم بوو،لەخەباتی نهێنی( کۆمیتەی ئاگر )ی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان، لە شۆڕشی نوێشدا جارێکی تر پێکەوە چووینەوە شاخ وبووینەوە بە پێشمەرگە لەهەرێمی 2ی کەرکوك، دوای ئەنفالیش لەگەڵ دەیان هەڤاڵی تر لەسنووری چەمی ڕەزان بە پارتیزانی مانەوە ،لە بەرگرییەکی قارەمانانەدا زۆر بەسەختی بریندار دەبێت،لە چاوپێکەوتن وچەند سایت و تۆڕەکۆمەڵایەتیدا بەم شێوەیە بۆمان دەگێڕێتەوە :**

ئەنفال جگە لەوەی کارەساتێکی زۆر گەورەبوو لە مێژووی گەلەکەمان، کوردقڕان بوو، ڕوداوێك بوو هیوای لای زۆر کەس مراند،جگە لەخۆبەدەستەوەدانی دەرونی و جەستەیی لای زۆرێك لە تاکی کورد و بەشێ لە سیاسیەکانی هیچ چارەسەرێکی تر نەبوو،بێ ئومێدی زۆرزیاتربوو لەکاتی ئاشبەتاڵ.ئەمانە وەك بەفری بەهار توانەوە. ئیتر تەواو هیوا نەما. دوای چەند ڕۆژێك، ڕێکخستنەکانی سورداش و بازیان و سلێمانی هەواڵ و داودەرمان و خواردنی گەرمیان گەیاندە ئەو کۆمەڵە پارتیزانەی لە چەمی ڕێزان و دۆڵی سورداش مابوونەوە، جیهازە ڕاکاڵەکەش کەوتەوە کار، لە کاتی پێویستدا دەکەوتە پەیوەندی لەگەڵ (م.س)ی یەکێتی نیشتمانی کوردستان.

لە ١٩٨٨/٦/٢٦ نامەیەکی کاک نەوشیروان مستەفا گەیشت،لەنامەکەدا داوا دەکات ئەو جیهازە راکاڵە بنێرینە بۆ ناو شاری سلێمانی و بدرێت بە ریکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان لەسلێمانی.جیهازەکە نێردراوگەیشت وکەوتەکار، بۆ من ئەو نامەو ئەو داواکارییە سەرەتای هیوایەکی باش و دڵخۆشکەربوو، چونکە نامەی کەسێکی سەرکردەیەو لە نزیکەوە دەزانم قسە بەبێ هۆ ناکات، کارێك ناکات بەرنامەی بۆ نەبێت،خۆی تێیدا دەستبەکار نەبێت"لەبەر رۆشنایی ئەو نامەیە، لەگەڵ برادەرەکانم قسەم کردو ئەو پێشمەرگانەی وەك ویست و توانا لێم رادەبینی پێم گوتن (من دەمەوێ وەك مەفرەزەیەکی پارتیزان لە ناوچەکە بمێنمەوە)هەمو برادەران پێیان باش بوو،بەلآم بەداخەوە لە ١٩٨٨/٧/٦ توشی شەڕێ بووین لە چەمی رێزان/ خوار گوندی کەڵەشێرە و هەمو بەرنامەکان تێکچو...

لە 3 ـ 5 ـ 1988 شالأوی ئەنفال قەلأسیوکە،سورداش،بازیان وچەمی رێزانی گرتەوە، ئەوسا من لێپرسراوی رێکخستنی (تیپی23سورداش) بووم.

لە 5/3 /1988لەگەڵ کاك غەریب سەعید لە گوندی عەسکەر بووین.

سەعات 3 پاشنیوەڕۆ گوندی عەسکەروگۆپتەپە بەگازی کیمیاوی بۆردومان کرا.

سەرلەبەیانی 5.4 هێزی پیادە هێرشی سەر ئەو ناوچانەی کرد. لەبەر بەربلأوی هێرشەکە بڕیاردرا شەڕ لەگەڵ ئەو هێزە نەکەین، کشاینەوە بەرەو چەمی رێزان و سورقاوشان.چەندرۆژێك دواتر لەگەڵ بەشەکەی تری تیپی23 و تیپی37 شاربازێڕ (مامۆستا جەمال محەمەد) سەرتیپ بوو. یەکمان گرتەوە. دواتر تیپی 25 خاڵخالأن گەیشتنە لامان.(کاك رابەر سەید ئیبراهیم) سەرتیپ بوو. کاك عەلی بچکۆل سەرپەرشتی هێزەکەی دەکرد.

## بروسکەی کاک نەوشیروان

لە سەرەتای مانگی 6 بە بروسکەیەك کاك نەوشیروان ئاگادارمانی کردەوە کە جیهازە راکاڵەکە بنێرینە سلێمانی، بدرێت بە رێکخستن.
لە 1988.6.25کاك عەلی بچکۆل جیهازەکەی ناردبۆ سلێمانی.
لەوێوە بەو جیهازە پەیوەندییان بەسەرکردایەتیەوە دەکرد.
لە 17 .6. 1988 بروسکەیەکم بۆ کاك نەوشیروان کرد، پێشنیاری دروستکردنی مەفرەزەیەکی پارتیزانیم لەناوچەی سورداش کرد.بۆئەم ئەرکە ئامادەیی خۆم دەربڕی لەگەڵ 6 پێشمەرگەی تیپی 23ی سورداش بمێنینەوە. کاك نەوشیروان ئەم پێشنیارەی زۆر پێ باش بوو.ئاگاداریشی کردمەوە کە مام رۆستەم لەگەڵ نزیکەی 70پێشمەرگەی ت21کەرکوك بۆ ئەو مەبەستە دێنە سنوری کەرکوك، داوای لێ کردین پەیوەندیان پێوە بکەین. تەنها تێبینم لەسەر ئەو هێزە.. زۆری ژمارەکەی بوو، چونکە ئەو ژمارە زۆرە ئیدارەی ئاسان نەبوو، لەو کاتەدا. پێشنیارم کرد لە سنوری هەر یەك لە تیپەکانی 23، 25، 21 سێ 3 مەفرەزەی 5 تا 7 کەسی هەبێت.کاری ئەم مەفرەزانە: کاری ئەم هێزانە شەڕکردن نەبوو لەگەڵ هێزەکانی دوژمن. بەڵکە دوو کاری سەرەکیان پێسپێردرابوو:
1. دوبارە پەیوەندیکردن بە رێکخسنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان لە ناو شار و ئۆردوگاکان.
2. داڵدەدان وگرتنەخۆی ئەوئەندامانەی لە ناو شارەکان ئاشکرا دەبن.
ئەم بەرنامەیەی سورداش سەری نەگرت. چونکە لە 1988.7.5 لە چەمی رێزان نزیك گوندی کەڵەشێرە توشی شەڕ بووین، لەو شەڕەدا بەسەختی من برینداربووم. دوای شەڕەکە کاك عەلی بچکۆل و کاك رابەر بە هاوکاری برادەرانی بازیان و سلێمانی هیمەتی باشیان کردبوو بۆ دەربازکردنی هێزەکە بۆناوچەی مەڵبەندی 3.
لە 1988.8.30 دوای چارەسەکردنم لەسلێمانی بەیارمەتی رێکخستنی سلێمانی بە رێگایەکی تایبەت گەرامەوە قەندیل،لەسەرلوتکەیەکی تەماوی سەردانی کاك نەوشیروانم کرد.بۆ رۆژی دوایی بۆ چارەسەر بە رێکەوتم بەرەو ئێران.

## کۆبوونەوەی ناوزەنگ

لە سەرەتای 1989 کاك نەوشیروان و کاك فەرەیدون عبدالقادر کۆبوونەوەیان بە سەرجەم مەسئول رێکخستنەکانی کۆمەڵە کرد. لەو کۆبوونەوەیە کاك نەوشیروان بەم شێوەیە باسی بارودۆخەکە و بەرنامەی کارکردنی کرد: وەزعمان زۆر خراپە لە هەمو رویەکەوە، ماوەیەکی تر رەنگە ئێرانیەکان بوواری ئیشکردنمان نەدەن.

مام جەلال ومن دەنێرنە شوێنیك کە خۆیان دەیانەوێ.ئێوە و هێزەکەش دەبەنە ئۆردوگاکان. لەکۆتایی کۆبوونەوەکەدووخاڵی باسکردکەگەشبینی لیّ بەدی دەکرا:

1- ئەو ریکخستنانەی لامانە بیدەینەوە بە ناوەندی کۆمەڵە.

2- ئەگەر بتوانین شەش مانگ خۆمان بگرین،چاوەڕوان دەکەم وەزعمان باش بێت.

3- مەفرەزەی بچوکی پارتیزان دروست دەکەین و دەچینەوە نزیك شارەکانی خۆمان،من خۆم لە گەڵ مەفرەزەکان دەچمە خوارەوە.

4- بە راشکاوی وتی:ئەوەی ناتوانێت بێتە خوارەوە با لە ئێستاوە بڵێت". هەمو برادەران ئامادەییان دەربڕی لەگەڵ پارتیزانەکان بچنە خوارەوە. تەنها من و مامۆستا محەمەد سوڵتان (بە هۆی برینداریيەوە) رامانگەیاند کە ناتوانن بەشداری بکەین. کاك نەوشیروان وتی( ئێوەشەل وسەقەتن،دەبنە بار بەسەر مانەوە).

من بروسکە و نامەکان و کامێرەکەم لە چەمی رێزان شاردبووەوە، بەداخەوە بەهۆی برینداریيەکەمەوە لەژێرزەوی هەمو بێکەڵك بوون.

دۆشکەکەمان بە جیا لە شوینیّ تر شاردەوە،بەڵام پاش ماوەیەك برادەرێك لەگەڵ خۆی بردییەوە بۆ حکومەت. بەداخەوە ئەو برادەرە لە شەڕی ناوخۆ شەهید بوو.*

---

* مەلا فەرمان / ماڵپەڕی سبەی



# پارتیزانی دوای ئەنفال
# صابیرحەمەصالح رەسول
# ناســراو بە (وەستا سابیر)

- لەساڵی 1963 لەشاری کەرکوك لەدایك بووە
- لەساڵی 1979 پەیوەندی کردووە بەرێکخستنەکانی(کۆمەڵە)ەوە
- لەساڵی 1982 بووە بەپێشمە، گە لەهەرێمی2ی کەرکوك.
- تاساڵی 1988 بەشداری دەیان چالاکی کردووە،
- پلەکانی پێشمەرگایەتی بڕیوە تا بووە بەفەرماندەی کەرت لەتیپی21ی کەرکوك.
- لە شەڕی بەرگری لەشاڵاوەکانی ئەنفالی یەکدا لە نزیك (شارستێن) بریندار بووە.
- لەشاڵاوی ئەنفالی چوار لەناوچەی شێخ بزێنی ڕۆڵی هەبووە لە دەربازکردنی خەڵکێکی زۆر بەرەو دەشتی هەولێر....

- دوای مانەوە لەگەڵ پێشمەرگەکانی کەرکوك لەسنووری خۆشناوەتی لەشاخەکانی پشتی وەرتێ ومەلەکان و کەژۆست، کاتێك مەڵبەندی 3 وبەشێك لە فەرماندە باڵاکان بڕیاری پاشەکشە دەدەن..وەستا سابیر دەبێت بە فەرماندەی یەکەیەکی پارتیزانی کەژمارەیان(40)پێشمەرگە دەبێت،دەکەونەڕێ بەروە سنووری کەرکوك.

- بەناو سوپای ئەنفالچی و سەدان مۆڵگەی سەربازیدا دەگەنەوە دەم زێی بچووك لەشێخ بزێنی خواروو..

- بڕیار دەدات هێزەکە دابە شبکات بە چەند دەستەیەك، هەڤاڵ(عەلی چیمەنی) رادەسپێرێت بەخۆی نۆپارتیزانەوە بڕۆن بەرەوهەڵەتەکانی(ماسقەلان)و(بان شوان). هەڤاڵان(خەلیل بێدەری)وکاك (هیوارەش) و(8)پارتیزان بۆشێخ بزێنی سەروو و دەوروبەری قەڵاسێوکە.

- خۆی و(19) پارتیزان لە چەمەکانی(تولکی وشەوگێڕ و هەلەتەکانی مەرزیخەو حەسەنقەباغ..دەمێنێنەوە.

- پاش مانگێك هەڤاڵان(مام رۆستەم)و(کوێخاسیروان)لەگەڵ (30)پارتیزانی تردا دەگەنەلایان،دەرۆژ دواتر کاك(ئازاد سەگرمە)و(30)پارتیزانی گەرمیان دەگەنەلایان پاش دووڕۆژ حەسانەوە بەرەوگەرمیان بەڕێیان دەکەن.

ئەم هەڤاڵانەیش لەوسنوورە رۆڵی باشیان هەبووە لەهاوکاری پارتیزانەکان:

1 ـ احمدمحمد(ئەحەدۆم)

2 ـ جاسم سێگرتکانی (جاسەلات)

3 ـ شوانە بیبانی

*چاوپێکەوتنی نووسەر لەگەڵ هەڤاڵ(وەستاسابیر) بارەگای ئەنجومەنی ناوەندی لە رۆژی 2019/12/16



# مامۆستا ئەحمەدی گۆگجە

## پارتیزانێکی تری کەرکوك

دوای ئەوەی فڕۆکەکانی ڕژێم کیمبارانی گوندەکانی(گۆپتەپە)و(عەسکەر)دەکەن لە ٣-٥-١٩٨٨[1]هێزێکی گەورەی ڕژێم بەپاڵپشتی تانك و زرێپۆش وهەلیکۆپتەری بارهەڵگرو جەنگی هێرش دەکەنەسەرناوچەکەو لەماوەی چەند ڕۆژێکدا هەموو گوندەکان دەروخێنن و خەڵکێکی زۆر شەهید وئەنفال دەکەن.. تیپەکانی سەگرمەو حەمرین وگەرمیانیش دوای ئەوەی ناوچەکەیان ئەنفال دەکرێ، ڕوودەکەنە سنوری تیپی ٢٥ی خاڵخاڵان و تیپی 21ی کەرکوك ، لە(قەلاسێوکە)و(شێخ بزێنی سەروو). ئەوکات(مامۆستائەحمەدی گۆگحە) فەرماندەی کەرتی تیپی تایبەتی تۆپخانەی شۆڕش دەبێت، بەناچاری تۆپ وکاتیۆشاکان حەشاردەدات وکەرتەکەی دەکات بە چەنددەستەیەکی پارتیزانی ودەست دەکەن بەخۆحەشاردان.

تا٢١-٦- ١٩٨٨[1]لە سنووری قەلاسێوکەو بناری خاڵخاڵان و هەردەی ماسقەلان و شیوەسوور و چەمی هەنارەدەمیننەوە.پاشان بەرەومەڵبەندی سێ بەڕێ دەکەون و پەیوەندی بەکاك کۆسرەتەوە دەکەن،ئەویش دەیانێرێت بۆ دۆڵی مەلەکان بۆ لای

کاك سیروانی کۆخانەجم کە سەرپەرشتی تیپەکانی (21)ی کەرکوك و(٢٥) ی خاڵخاڵانی دەکرد. ئەویش لەوێوە دەیانێرێت بۆ لای هەڤاڵان مامۆستا باپیر و کاك عەبدوڵاسیاسی جێگری فەرماندەی کەرتی تۆپخانە...

تا٢٢_٨_١٩٨٨ لە خۆشناوەتی دەمێننەوە، پاشان مام رۆستەم لەمەلەکان دەست دەکات بەدروستکردنی یەکەپارتیزانەکان لەگەڵ کاك سیروان وەستاسابیر و یەکەکان دێنەخوارەوە بۆسنێ‌ری کەرکوك.بەر لەهاتنەخوارەوە لەگەڵ ئەم هەڤاڵانە شۆڕش قەرەنجیری ومامۆستاباپیرو کاك رەوەندوحاجی هەڵمەت وعەبدوڵاسیاسی تۆپبارانی سەربازگەکانی دەوروبەری چوارقوڕنە و بێتواتە دەکەن.

پاشان لەسەربریاری کاك کۆسرەت هێزەکان پاشەکشە دەکەن بۆ دۆڵەکۆگێ وبناری قەندیل، پارتیزانەکانی کەرکوکیش هەواڵەی سەرشاخی گوڵێ دەکات.

شەوی٣٠/٣١ی ئاب لە سەرشاخی گوڵێ چاوەڕوانی دەلیلەکە دکەن، بەلام فریایان ناکەوێ.. ئەوشەوە (١٤٠)پ م لەوسەرشاخەکە دەمینێنەوە،بەیانی تاریك و ڕوون سەیردەکەن هەموودەوربەریان هێزی سەربازی رژێمە،بەناچاری بلاوە دەکەن و جگەرەکێشان وئاگرکردنەوە قەدەغەدەکەن، لەچیاکەی بەرانبەریان بەسەردەکەون و لەجادەی کۆپتانەوە دەپەڕنەوە کەدەچنەخوارەوە لەناوقەد شاخەکە تووشی هێزێکی زۆری بەرەی جوود دەبن.کۆپتەرێکی بارهەڵگر دەگاتەئاسمانی ناوچەکە و دەبێتە رەسەدو تۆپبارانێکی چڕوپردەکرێن .ئەورۆژە هەمان ئەورۆژەدەبێ کە کاك ئازاد هەورامی تێدا شەهیدبوو.شەولەگەڵ کاك شۆڕش ومامۆستاباپیرو کاك رەوەند بیرلەوەدەکەنەوە چۆن چارەسەری هێزەکە بکەن..بریاردەدەن کە مامۆستاباپیروکاك شۆڕش لەگەڵ بەرپرسی دارایی مەڵبەند بچن بۆلای (سوارا ئاغا) تا چارەسەرێکی وەزعەکەیان بۆبکات... دوای ئەوەی کاك شۆڕش وهەڤالانی هەمان شەو دەچنە لای (سواراغا) ناگەڕێنەوە.سوارائاغا باوڕپێکراوێکی خۆی دەنێرتەلایان وپێمان ئەڵێ:

لەوئەشکەوتەبمێننەوە خواردنتان بۆدێنین،تاریکایەکتان بۆ دەکەینەوە. نزیکەی دوو رۆژ دەمینێنەوە، پاشان سواراغا نۆ(جێب)یان بۆ دەنێرێت، تاکو (کفرەدۆڵ)ی نزیك حاجیاوە دەیانبەن،شەودرەنگ لەرێگەی (حاجی احمد) ناوێکەوە کە خەڵکی دێی (گەرمك) دەبێ چاوساغی دەکرێن و بەرەو ناوچەی خۆشاوەتی بەرێ دەکەون. پاشان بەرەوهەیبەت سوڵتان و دەشتی کۆیە،پاش تێپەربوونیان دوژمن یەکسەر بەئاگادێتەوەو دەکەوێتە پشکنینی ناوچەکە ...

رۆژی ٦ـ٩ـ١٩٨٨ بڕیاری لێبوردنی گشتی دەردەچێ.پاشان لەگەڵ کاك رەوەند و سەفەرقولیبەگی و شەهید هیواکەلۆری وکاك حاجی هەڵمەت بەرەو سێگردکان دەکەونەرێ .لەوێ تووشی مام رۆستەم وکاك سیروان دەبن.. ئەوکاتە تەنها عوبێد برای وشەهید سدیق احمد کلاوقوتی لەگەڵ دەبێ،دەپەڕنەوە بەری(دەرماناو)و دەچنەلای کاك(سەربەستەدرێژ)و کاك حاجی احمد وکاك عارف (بیراڵکی) لەدێی (پەڵکانە) دوای شەڕەگەورەکەی چەمەکانی(توڵکی)مامۆستائەحمەد وکاك رەوەندو وەستاسابیرو حاجی هەڵمەت ومام لاو وبراکانی ئاکۆسوورشەوگێڕی و نزیکەی (١٤٠)پێشمەرگە،دوای ئەوەی سوێندبەگۆڕی شەهیدان دەخۆن کەخیانەت نەکەن. بەناچاری سوود لەلێبووردنە کە وەردەگرن و روولەدوژمن دەکەن وتەسلیم دەنەوە. تاپێش راپەرینەکەی 1991 خۆپارێزی دەکەن و دواتر سەرلەنوێ پەیوەندی بە شانەچەکدارەکانی بروسك دەکەنەوە و بەشداری راپەڕین دەکەن.

*ئەم زانیارییانەم لە هاوڕێی دێرینم بەڕێز مامۆستا ئەحمەد گۆگجەیی) فەرماندەی کەرتی تۆپخانەوپێشتر جێگری شەهید مامەریشە وەرگرتووە.



## پارتیزانی دوای ئەنفال

### جەبار ستیف

لە پاش ئەنفالی جوار,لە نگی7/1988دا بارەگاکانی تیپی21 کەرکوك لە مەلەکان و سەنگەری پێشمەرگەکانیش لە سەرشاخی کەژۆست بەرامبەر شاخی شیشاری بیتواتە دەبێ, دۆشکایەکیان لە سەرلوتکەی شاخەکە دەبێ کە جەبار ستیف و سامی و عومەر مشەوەش وکاك عومەر سالەیی..لەسەردەبن. بەحوکمی ئەوەی لەسالآنی 1983و1984 عەدەدۆشکا بووبوون,شارەزایی باشیان لەبەکارهێنانی دەبێ. ماوەی دوو مانگ لەو سەنگەرانە دەمیننێنەوە..

لە کۆتایی مانگی 8 کەشەڕی ئێران وعێراق دەوەستێ دوژمن هەرچی هێزی دەبێ لەڕانیە وچوار قورنە کۆی دەکاتەوە لەهەموولاوەدەست بەهێرشی بەربلاو دەکات.. لەوسەروبەندەدا ئاگاداردەکرێنەوە کەخۆیان ئامادەبکەن وبەرەوبناری قەندیل بڕۆن. کاك کۆسرەت وهێزەکانی مەلبەندی4و3 لەبالیسان دەبن,ئەوانیش دەگەنە مەلەکان, تا بەرێ بکەون بەرەوقەندیل,ئەوسا کاك شوڕش قەرەهەنجیری جیگری فەرماندەی تیپ دەبێ,بەکاك کۆسرەت ئەڵێ:ئێوەبڕۆن,با زوو هەموو هێزەکان تێپەڕبن,ئێمە پارێزگاریتان لێ دەکەین..ئەوڕۆژە تا ئێوارە لەسەر شاخی(کەژۆست) دەمێننەوە.. تا هەموو هێزەکان تێپەڕدەبن..بەلآم پێشترهیچ حسابێك بۆشارەزایی رێگاکە ناکەن, کەسیان شارەزایی رێگای کاڕۆخ نابن..بێ دلیل بەدوای ئەواندا مل دەنێن,بەدۆڵی گولانەدا دەچنە خوارەوە..

ئەوشەوە بەناچاری لە ماڵەچەکدارەکانی(سواراغا) تەوزیع دەبن,چەکی پێشمەرگەو جاش لە پاڵ یەکتردا بەدارا دەکرێن, پاشان شارەزایان لەگەڵ دەنێرن بەرەوشاخی کێوەرەش,بۆ پەرینەوە لەجادەی دۆڵی پڵینگان ورانیە. هەتا لەوێوە بەرەودۆڵی شەهیدان و قەندیل برۆن.چەن رۆژێك پێشتر سیروان کوێخانجم و مەفرەزەیەك بەرەو ناوچەکانی خۆیان چوو بوونەوە,بۆئەوەی شوێن وبنکە ئامادەبکەن بۆ هێزەکەی تیپی 21 کەرکوك و تیپی 25ی خاڵخاڵان..تابە پارتیزانی بمێننەوە ..

بۆ رۆژی دوایی هێزەکە لەکێوەرەش دەکەونەبەرهێرشی تۆپباران ورۆکێتی کۆپتەر. ناتوانن زیاتر برۆن,بەناچاری دەکشێنەوە..ئەورۆژە رێکەوتی رۆژی شەهیدبوونی کاك ئازادهەورامی دەبێ,هێزێکی زۆری دوژمن لە دۆلی شەهیدان دەبێ, هەربۆیە رێگای کشانەوەیان نامینێ..بەناچاری چەن رۆژێك لەبناری کێوەرەش دەمێننەوە. لە پاڵ داربەڕووەکاندا خۆیان حەشاردەدەن..بۆشەوی سێیەم نانەرەقەکەشیان تەواو دەبێ,بۆ ئەوەی خەمێ لەخۆیان بخۆن لەوبنارە بڵاودەبنەوە..



**جەبار ستیف یەکێك لەو پێشمەرگە پارتیزانانەی کەرکوك دەگێرێتەوە:**

(من وهاورێیەکم خراپمان بەسەردا هات,زۆردوورکەوتبووینەوە زۆرمان برسی بوو, چاومان دەگێرا هەتا شوێنێك, شوانێك,گاوانێك بدۆزینەوە,ئەوەبوودۆزیمانەوە.. چووینە بن دارگوێزێکی گەورە,جوان پاك وتەختکرابوو,ئاگردانی شوانێکی لێبوو, هاورێکەم گوتی:کوائێرەکەس لێ نییە..؟ گوتم سەبرت هەبێ ئێستادێ, گەرماو برسیەتی وتێنوێتی هێزی لەبەر بریبووین.تاخم و پشتمان لێکربوو وەوە..

هەردوو خەومان لێکەوت, من لەسەردەم خەوتبووم, شەرواڵەکەم لەچۆکم گیرببوو, کەواتەقاچم ڕووت بوو,هەستم کرد شتیکی سارد لەسەر پوز و پێم یاری دەکات.. کەمێك قورس بوو. خەبەری کردمەوە هەڵسام وئاوەڕم دایەوە کەوتمە سەر لا سەیرم کرد زەردەمارێك مەترێك دەبوو, دوومەتر دوور کەوتەوە و وەستا..ئاوڕێکی لێ دامەوە,سەیری دەکردین چاو سەوز و زورجوان بوو,منیش ڕووم تێکردو گوتم: بڕۆبڕۆ مادام پێمەوەت نەدا شەرتبێ دەبێ نەتکوژم..لەسەرخۆ ملی کزکردو ڕۆیی. پاشان هاوڕێکەم هەڵساند,بۆم باسکرد ووتی توخوا بەڕاستتە هەستە با بڕۆین ..! گوتم برا با شوانەکە بیت..نیوەڕۆیەکی گەرم بوو, خواکردی کاکەی شوان پەیدابوو. گەیشتەلامان و بەسەرسامییەوە سلاوێکی لێمانکرد..

ووتی برا ئیوە پێشمەرگەن..؟ ووتمان بەلێ براگیان زۆرمان برسی یە..

کۆڵەکەی لەبەر دەستمان دانا..مەتارەیەکی 5 لیتری ئاوی پێبوو,بەگونیە زۆرجوان بەرگی بۆکردبوو. ساردو خۆش بوو, کۆڵەکەشی پڕبوو لە تەماتە وخەیار و پیازو بیبەرو قوتویەك ماست وسفرەیەك نایلۆن وچەقۆیەك..دەسم کرد بە ووردکردنی تەماتەوخەیارەکە هەندێ ئاوم کردەناوماستەکە وجوان شلقاندم تاکردم بەماستاو. فەرمووومان لەکاکی شوان کرد.. ووتی:من تازە لە نێو گوندەوە دێم نانم خواردوە, بەڕاستی خوشترین خواردن بوو, بیری برادەرانیشم کرد,بەلام 200پێشمەرگەبوون زۆردووریش کەوتبوینەوە.. نانەکە.. تەنکەنان بوو, زورخوش بوو, ئەوەی مایەوە ووتی بیبەن لەگەڵ خۆتان.. منیش دوایی بردم و دامە هەندێ لە برادەرەکانم...)

پاش ئەوە مامۆستاباپیر وچەن کەسێك دەچن بۆلای(سواراغا)بۆئەوەی ڕێگایەکیان بۆبدۆزێتەوە بۆدەرچوون لەبناری کێوەرەش. ئەوشەویش 5 چەکداری دەمامکدار دەنێرێ بۆ ئەوەی کەس نەیان ناسێ,بە کۆڵەپشتی ئاو و خواردنیان بۆدێنن,پاش نانخواردن پێشیان دەکەون بۆ بناری شاخی ماکۆك, هەمووسەرشاخەکە جاشی

(ئەنوربەگ)ی پێوەدەبێ,لەبناری شاخەکە لەشوێنێکی پەنا حەشاریان دەدەن. بۆسەعات7ی شەو خواردنی(200)پێشمەرگە لەنان و گۆشتی کولاو وبرنج وشلە و مریشکیان بۆدەبەن,تەنانەت دەیان جووت لە پێلاوی (ئەدیداس) یشیان بۆ دەبەن, تا ئەوانەی پێلاویان دڕاوەدەبێ هەرکەس ژمارەی پێی خۆی هەڵگرێ,بۆشەوی دواتر بەئاگاداری سەرکردایەتی,هەموویان دەگوازنەوە بۆ مەقەڕی(ح.د.ك - إیران) لەوێش چەندسەیاریەك ئامادەدەکەن وهەرپێشمەرگەیەك کیسەیەك نان و دوو قوتی گۆشت (معلبات)ی دەدەنێ ودەیانگوازنەوە بۆ دێیەك لە نزیکی سەرکەپکان, دووشەو لە ماڵی چەند چەکدارێکی(سواراغا) حەشاریان دەدەن و خزمەتی باشیان دەکەن و خۆیان دەشۆن و هەندێکیان تراش دەکەن..

شەوی سێیەم نانیان بۆ دەپێچنەوەو خەڵکی شارەزایان لەگەڵ دەنێرن بەرەودوڵی هیران ونازەنین..بەنێوان معسکەرەکاندا بە ناو گۆل و وزەلکاودا دەربازیان دەکەن... لە دوڵی هیران و نازەنین لە دێیەکی خاپورکراو,لە ژێرخانێکدا کەپێشتر شوێنی مەڕومالات دەبێ تائێوارە دەمێننەوە,بۆشەوەکەی هەمان جەماعەت دێنەوە بۆلایان, دەیانبەنە ئۆردوگایەك,دیارە پێشتر چەندماڵێك ئاگادار کرابوونەوە, کە خواردن ئامادەبکەن,کەدەگەنە ماڵەکان دەبینن خواردنی باشیان بۆ ئامادە کراوە,لەوێش تێردەخۆن و پشوویەکی باش دەدەن..

دوای ئەوە بە ڕێیان دەخەن بەرەو شاخی کۆسرت,پێیان ئەڵێن لەم گوندەوە بۆ بناری کۆسرەت ماوەکەی دوورە..ئەگەر خێرا نەڕۆن دوایی رۆژتان بەسەردا دێت, رۆژانە لەودەشتاییە کۆپتەرەکان دەسوڕێنەوە,دوایی هەرهەمووتان شەهید دەبن, ئەوشەوە تا بەیانی بەو بارەگرانەی چەك و کۆڵپشتی و پێداویستیانەوە ڕادەکەن تادەگەنە بناری کۆسرەت.لەڕێگا لاشەی چوار شەهیدی پارتی دەبینن کە بەبەرد داپۆشراو دبن.. لەسەرکانی وئاوێك بۆ ماوەی دووشەو دەمێننەوە, کاك شوڕش و

ماموستاباپیرلەگەڵ شارەزاکان دەگەڕێنەوە,سەرپەرشتی هێزەکەبەحاجی هەڵمەت و کاك رەوەندوکاك رەنجە دەسپێرن..بۆ شەوی سێیەم بەرەو هەیبەت سوڵتان بەرێ دەکەون,هەشت پێشمەرگەیان بەهۆی پۆقژەی پێ وماندووبوونەوەتوانایان نامینێ. بڕیاردەدەن ئەوڕۆژە لەبناری(هەیبەت سوڵتان)و نزیك مۆڵگاکانی دوژمن خۆیان حەشاربدەن.یەکیك لەو هەشت کەسە بەناوی فوئاد موالدی 1974دەبێ دەمەو ئیوارە بێترس دەچێتەسەرجادەوە دەچێتەوە بۆشار..ئەوحەوت کەسەیش بۆشەو بەشارەزایی شەهید(ئازادکۆیی) بەرێ دەکەون بەرەو شوینی دیاری کراو کە کەلاوەکانی گوندی (ئیلەللا)دەبێ..

لەوێ لە ناورەزێك دا لەگەڵ هەڤاڵانیان یەکدەگرنەوە,تیر میوە دەخۆن و پشوویەکی باش دەدەن. بۆ رۆژی دواتر بەرەو دەشتی کۆیە دادەبەزن,بەڵام بەهۆی ئەوەوە رژێم بە دابەزینیان دەزانێ ئەوڕۆژە هێزێکی زور دەکەونە کێومالْ و کۆپتەرو پیلاتۆز دەکەونە سووڕانەوە,ئەوانیش لە نێو شینایی و چەم و دۆڵەکاندا تا ئیوارە خۆیان حەشاردەدەن و بۆ شەوی دواتر لە ئاست گوندی (تاڵەبان) لەجادەی کۆیە ـ تەقتەق دەپەڕنەوە بەرەوحاوی سێگردکان ..



جەبار ستیف یەکیك لەو پارتیزانانەیە ئەم وێنانە بە کامیرای ئەو چرکێندربوون

**جەبار ستیف لەبیرەوەری خۆیدا دەگێڕێتەوە:**

(دوای گەیشتنمان بە چەمەکانی سێگردکان,بڵاوەمان لێکرد,دەستەدەستە کەوتینە گەڕان بۆ دابین کردنی ئازوقەی پاشماوەی ماڵە وێرانەکان, ئیمە 6 کەس پێکەوە لە شوێنیك بوین, هەندێ ئازقەمان دۆزیەوە, برنج و فاسولیا و تەباخیکی نەوت و هەندێ پێداویستیمان دابین کرد.ژمەخواردنیکمان ئامادەکرد..

ئەوڕۆژە ئەوڕۆژەبوو لەبەری کەرکوکەوە رژێم هێرشی کردە سەر دەستەکانی ترمان لەحاوی(تولکی)لەو هێرشەدا (نەجات کۆچەکی) و(پەرژین)ی خێزانی (ابونور) و دووپێشمەرگەی تر شەهید بوون. بۆ ڕۆژی دوایی(کوێخاسیروان) هات کۆبوونەوەی پێکردین,تازە رژیم لێبووردنی دەرکردبوو, رێگای گەڕانەوە بۆ قەندیل نەمابوو,پێی گوتین:هەڤاڵان ئەم هێزەی ئیمە زۆرە ناتوانین ئاوا درێژە بەپارتیزانی بدەین,من وەك ئیوەنیم ناتوانم تەسلیم ببمەوە.

ئیمەی سەرپشك کرد,ئەوەبوو هەندێك مانەوە,هەندێك بەرەو بنەسلاوە و هەولێر..

ئیمەیش 5 کەس ملمان نا بەرەو تەقتەق لەوێ چوینە ماڵێکەوە,دوای نان خواردن کوڕی ماڵەکە لە گەڵمان هات بۆ کۆیە,لەوێ خۆمان رادەستکردو وەرەقەمان بۆکراو بە خۆم و کامیراو ئەلبوومەکەمەوە چوومەوە بۆکەرکوك,سێ ساڵ بەناخۆشی ژیاین, بەڵام خۆمان نەدۆڕاند, تا پەیوەندیمان بەڕیکخستن و شانەچەکدارەکانی بروسکەوە کرد و لە راپەڕینی 1991 دا کەرکوکیشمان رزگار کرد. *)

* سەرچاوە: بیرەوەری پارتیزانی دوای ئەنفال(جەبارستیف)



## پارتیزانی دوای ئەنفال

# نەقیب ناصیح بیبانی

پارتیزانی دوای ئەنفال (نەقیب ناصیح بیبانی) لەگەڵ هاوڕێکانی لەسەرەتای ئەنفالی چوار تاکۆتابی 1988 لە ناوچەکەمانەوەو دریژەیان بەخەباتی پارتیزانی دا لەدرێژەی چالاکییەکانیاندا لەمانگی ئابی 1988دوای مانەوەی چەند مانگێك لەناوچەکانی هەولێر وخۆشناوەتی،جارێکی تردەگەڕێنەوە بۆسنووری کەرکوك.. سەرەتای مانگی تشرینی دووەم لەچەمەکانی (شەوگێڕ) و(پەڵکانەی دەرماناو) لەشێخ بزێنی دەبن..دوای ئەوەی دوژمن زانیاریی لەسەر بوونیان لەناوچەکە کۆدەکاتەوە، بەیانیانێك لەچوارقۆڵەوە هێزەکانی رژێم دەست بەپشکنین وکێوماڵ و گەڕان دەکەن:

- لە پردێ بەرەو قەرەسالم و توڵکی
- لەشیوەسوور وشوانەوە بەرەو شەوگێڕ وکاولەسوار
- لەتەقتەقەوە بەرەو سیگردکان وسێکانی
- لە لەقوشتەپەوە بەرەو سارتك وئاوماڵ...

بەوبەیانی زوو پارتیزانەكان بێتەل(جیهازی راكاڵ) وهەندێ لە كەلوپەلەكانیان بەپەلە دەشارنەوە و بەرەو هەڵەتەكانی(كاولەسوار)هەوڵی خۆدوورخستنەوە دەدەن. لە نزیك(كەلەسوورك) چەندهەلیكۆپتەرێكیان لێ پەیدا دەبێت ودەكەونە سووڕانەوە بەئاسمانی ناوچەكەدا،زۆربەنزمی بەسەرشوێنی ئەوانیشدا دەسووڕینەوە،بەڵام بەهۆی شارەزایی وخۆحاشاردانیان لەئاودڕەكان وخۆشاردنەوەیان بەدڕك ودار ئاشكرانابن،لەوكاتەداچەندئۆتۆمبێلی سەربازی تێدەپەڕن بەرەو چەمەكان. تاتاریك دادێ لەهەڵەتی(كاولەسوار)دەمێننەوە،بۆ شەوەكەی دەچنە (هەنارە) لەنزیك گوندی وێرانكراوی(حسەن قەباغ)..

هەرئەوشەوە بەسوود وەرگرتن لەوئازووقەیەی پێشتر لەوەێ حەشاریان دابوو بایی پێداویستی هەفتەیەك نان وپەپكەسوورە(ناوساجی)درووست دەكەن و بەرە بەیان بۆ ئەوەی لەبازنەی پشكنینی دوژمن دووربكەونەوە لەكەل سەردەكەون و لەنێوان گوندی(قولیی بەگ)و(عەلی بەیان) لەچەندشیووئاودڕێكدا خۆیان دەپارێزن..

بۆشەوی دواتر دوورتر دەكەونەوە،دەچنەهەردەی(سێویزان)لەنێوان كوندەكانی (بیرەسپان)و(بیراڵك)و(تولكی) بۆماوەی سێ شەو وسێ رۆژ لەنیو شیو ودۆڵ و لە ژێر بنەكفردا خۆیان حەشار دەدەن،دوای كشانەوەی هیزەكان بەسەلامەتی دەگەڕێنەوە بۆ بنكەكانی خۆیان لەناوچەی (شێخ بزێنی)*

* سەرچاوە : پارتیزانەكانی كەركوك/ناراس ئیلنجاغی/2012



## پێشمەرگەوپارتیزانی دوای ئەنفال

# چەتۆصالح سعید(سەربەست)

**دوای ئەوەی ( د. هادی ) برای کە لە( شاناخسێ )**

**بەکیمیاوی شەهید دەکرێ ، باوك و پێنج برای تری لە قەسابخانەکانی رژێمدا بێسەروشوێن دەکرێن وبرایەکی تری لە ( رەحیماوا ) ی کەرکوك بەبەرچاوی جەماوەرەوە گولەباران دەکرێ . بابزانین ئەم گەنجەدڵبریندارە ملی چ رێگایەکی سەختی گرتۆتەبەر**

## کارەساتی ئەنفال

دوابەدوای پەلاماری ئەنفالی چوار،بۆبناری خاڵخاڵان ولەگوندی (مۆردخوادە)ی خواروو،هەڤاڵ (سەربەست)و(نەجات تەنکەر) پێشمەرگەی (تیپی21کەرکوك)لەرێی چەکدارێکی خفیفەوە بەناوی(اسماعیل)روو لەشارۆچکەی (تەکیەی کاکەمەد) دەکەن،پاشان بەخۆی وبەسەیارەیەك وچەند چەکداریکیەوەدەیانگوازێتەوە بۆشاری کۆیە،ئەوچەکدارەبەوهەڵوێستە جوامێرانەیەیئەوان و ژمارەیەکی تر پێشمەرگەی دەربازکردبوو.لەودیوی هەیبەت سوڵتان لەنزیك گوندی (میرسەید)ئازادیان دەکات،ماوەیەك بەراکردن دەرۆن،تا لەمەترسی دووردەکەنەوە، دەگەنەوە ناوچەی ژێرکۆنترۆڵی پێشمەرگە قارەمانەکانی مەڵبەندی3ی هەولێر، کەئەو کات کاك کۆسرەت سەرپەرشتی دەکرد، ناوچەکە ئارام و ئاسایی دەبینن ، دوتردەچن بۆلای کاك کۆسرەت لە گوندی خەتێ..سەربەست زۆر عەوداڵی هەواڵی چارەنوسی کاك دکتۆرهادی برای دەبێ، چونکە بەرئەنفالی یەك کەوتبوون. یەکێك دەیووت ماوەو یەکێکی تر دەیووت شەهید بووە،هەربۆیە یەکەم پرسیاری هەواڵی دکتۆرهادی

دەبێت، کاك ملازم عومەریش لەویٚ دەبێ،هەواڵی شەهیدبوونی کاکە دکتۆر هادی برای پیٚ ڕادەگەیەنێت ،ئەوان لەرێگای بێسیمەوە تەواوی هەواڵی شەهیدبوو نەکەیان زانیبوو،زۆرڕێزی دەگرن وموراعاتی دەکەن، داوای لیٚ دەکەن بچیٚ بۆ ئێران و لەوێشەوە بۆ گوندی شاناخسیٚ ،ئەو شوێنەی کەدکتۆرهادی برای بەچەکی کیمیاوی لیٚ شەهیدکرابوو،ئیتر بەرێدەکەویٚ تاکو دەگاتە بارەگاکانی (گوێزیٚ)و (دۆلەکۆگە) لەقەندیل،لە گوێزیٚ دەچێتە لای کاك نەوشیروان ئەویش ڕێزێکی زۆری دەگریٚ، ماوەیەك لەوناوە دەبیٚ، دواتر کاکە( ئازادهەورامی) دەبینیٚ و لەگەڵ خۆی دەیباتەوە بۆ(دۆلە کۆگە)کەماڵەکەی لەویٚ دەبیٚ،چەند حەفتەیەك لەویٚ دەبێت، خۆی وخاتوو شنۆی خێزانی زۆرخزمەتی دەکەن و سۆزوموحیبەتیان زیاد لەپێویست دەبیٚ،بەجۆرێك کە هەست بەخەم و ئازارنەکات،کەلەماوەی ساڵێکدا لەخێزانێکی یازدە کەسی تەنها خۆی مابووەوەو ڕێگای هات و نەهات و غەریبی گرتبووە بەرو لەناوشاریش تەنها دووکەس مابوونەوە کەئەوانیش دایکی و سەباحی برای بوون..

ئەوماوەیە تاڕادەیەك هەستدەکات بەئاسودەیی دەکات،لەماڵی کەسێکی گەورە ،لەماڵێك پڕاوپڕ لەجوانی،خوێندنگایەکی نمونەیی،خێزانێکی میهرەبان ،ئاخر کاك ئازادهەورامی پێش خەباتی پێشمەرگایەتی هاوڕێیٚ شەهید دکتۆرهادی و مامۆستامەهەدی برای دەبیٚ.. ئێوارانێك کاکە ئازاد پییٚ ڕادەگەیانیٚ کە خولێکی گرنگ لە ئێران لەتاران هەیە. بچێت و بەشداری بکەیت، تۆزێك دووربکەویتەوە لەخەم و ئازارو مەقەڕو ئەودۆڵ وشیوانە،هەروەها لەخوولەکەیش سودمەند بیت، زۆربەخۆشحاڵیەوە قبووڵی دەکات،لەگەڵ(99)کەسی تردەچن بۆ تاران بۆخولەکە، خولەکە 45 ڕۆژ دەبیٚ..بەداخەوە لە ناوەڕاستی خولەکەدا هەواڵێکی شەهید بوونی کاك ئازاد هەورامی بڵاودەبێتەوە ، دوای تەواو بوونی خولەکە دەچێتە شاری بانەو

لەویٚ پیٚی ڕادەگەیەنن کە بچیٚ بۆ گوندی (بلەکیٚ) ی سەرسنوورچونکە تیپی21ی کەرکوك لەویٚ دەبیٚ، ماوەیەکیش لەویٚ دەبیٚ،لەسەردانیٚکدا لەگەڵ(نەجات تانکەر) بۆشاری بانە سەردانی ماڵی کاك دڵشادحافیز برای کاك شیٚرزادی جیٚگری فەرماندەی تیپی 21ی کەرکوك دەکەن، کە ئەوکات کاك دڵشاد نویٚنەری یەکیٚتی و، بەرپرسی عیلاقات دەبیٚ لەشاری بانە،مەبەستی سەردانەکە بۆ ئەوەدەبیٚ کاك دڵشاد پسولەی ڕیٚگاپیٚدان (بەرگە)ی بۆبکات،تاکو بچیٚت بۆگوندی شاناخسیٚ و گۆڕی شەهید دکتۆرهادی برای بدۆزیٚتەوە،تا دڵنیابیٚت و بۆدوارۆژ شارەزای شویٚنەکەبیٚت،کاك دڵشاد کارەکە جیٚبەجیٚ دەکات، کاتیٚك دەگەنە نزیك گوندی شاناخسیٚ،هەست بەجموجوجوٚڵیٚکی نائاسایی هیٚزەکانی رژیٚمی ئیٚران دەکەن ، دەچنە لای برادەرانی تیپی 37ی شاربازیٚر، ئەوکات دەزانن کەئیٚران بڕیاری ڕاگرتنی جەنگی داوە،دەستی کردووە بەپاشەکشیٚ،چونکە شاناخسیٚ سنوری عیٚراق بوو. دەبووایە هیٚزی پیٚشمەرگەش ناوچەکەی چۆڵ بکردایە،هەرچۆنیٚك دەبیٚ پیٚشمەرگەکانی لەشاربازیٚر، دەیگەیننە سەرگۆڕی شەهید دکتۆرهادی..

ئیتر پەلەپەلی لیٚدەکەن،پیٚی ئەڵیٚن لەبەر ئەوەی ئیٚران بەنیازە پردەکان بتەقیٚنیٚتەوە فریای گەڕانەوە بکەون ..

بۆئەوەی گۆرە پیرۆزەکەی شەهید نیشانە بکەن،شتیٚکی وایان دەست ناکەویٚ، بەناچاری لەگەڵ کاك نەجات بارووتی چەند فیشەکی دۆشکادەردەهیٚنن و هەربەوباروتە لەسەر بەردیٚك دەنووسن(شەهید دکتۆرهادی)و دواجارئەو باروتە دەسوتیٚنن تائەونوسینەی پیٚوەبمیٚنیٚتەوە ولەگەڵ پیٚشمەرگەکان گەڕاینەوە بۆبانە.

## بارەگاکانی تیپی21ی کەرکوك لە گوندی بلەکیٚ ی سەرسنور

- ساڵی 1989گوندی (بلەکیٚ) دیاری دەکریٚ بۆ ژمارەیەك لەتیپەکان ، ئەو گوندە کەوتبووە بناری سورێن واتە ئەو شاخەی ئیٚران وعیٚراقی لیٚك جیا دەکردەوە،

بلەکێ گوندێکی گەورەو خۆش بوو، خەڵکەکەی زۆرباش بوون و لەشاری بانەوە زۆرنزیك بوو،دوای چەند ڕۆژێك کاك ڕەفعەت عبدالله بانگی دەکات، پێشنیاری بۆدەکات کە بچێ بۆ سنوری ڕانیە و قەلآدزێ، بۆئەوەی سۆراغێکی دایك وبراکەی دەس بکەوێت،پێی ئەڵێ: من چەند کەسێکی زۆردڵسۆزو قارەمان دەناسم ،کە لە ڕێکخستنە نهێنیەکانن لە ڕانیە. هەرئەوان منیان ڕزگارکرد و گەیاندیانمە بناری قەندیل و متمانەی تەواویان پێ بکە،ئەوان بەشێکیان چەکداری حکومەتن،بەلآم سەربەرێکخستنەکانن...

هەرلەوێ ئەدرەس ونەخشەی تەواوی شوێنەکانی بۆ دەکێشێ، هەرچەند ئەم کارە زۆر قورس بوو، بەلآم دوای ئەوەی بە تفاصیل شتەکانی بۆباس دەکات واتە بەرنامەی ڕۆیشتنەکەو چۆنیەتی گەیشتن بە ڕانیە.. پێی دەڵێ بەیانی وەرەوە بۆلام ئەو نامانەت بۆ ئامادەدەکەم هەم بۆ سەرسنوور بۆ برادەرانی عیلاقاتی خۆمان و حیزبی دیموکرات وهەروەها هاوڕێیانی ناوشارپیویستت دەبن..

بۆبەیانی دەچێتەوە بۆلای هەمووشتەکانی بۆ ئامادەدەکات،بەوردی ئامۆژگاری و ڕێنیۆنی دەکات پێی ئەڵێ ئاگای لەخۆی بێت وئەو ڕۆیشتنە بەرەزامەندی مەکتەبی سیاسیە واتە یەکێتی ئاگادارە

## بەرێکەوتن بۆناوخۆی وولآت ..

1989/12/8

دەگاتە لای برادەرانی(ی.ن.ك) لەنزیك گوندی (سونێ)ی سەرسنوور ئەو نامەیەی کاك ڕەفعەت یان پیدەداو ڕێزێکی زۆری لێدەگرن، پێی ئەڵێن چاوەڕوان بە تاکو کارەکان لەگەڵ برادەرانی دیموکرات جێ بەجێ دەکەین، دوای دوو ڕۆژ دەیبەن بۆ بارەگای برادەران دیموکرات و شەوێك لایان دەمینێتەوە،بۆ ڕۆژی دواتر سەعات 7ی بەیانی لەگەڵ برادەرانی حیزبی دیموکرات کە وەك مەفرەزەیەك دەبن، جلی

خۆیانی لەبەردەکەن وچەکێکی پێ دەدەن و لەگەڵ خۆیان سەریدەخەن، تاکو ڕانیە زۆرئاسایی و بی ڕاگرتن بگرتن،بەسەلامەتی دەگەنە بارەگاکەیان لەڕانیە،شەوێك لەوێ دەبێ، بۆ ڕۆژی دواتر برادەرێکیان بەجلی ئاساییەوە دەیبات،بۆماڵی کاك عبداللەی حاجی رسول ،کە لە ئۆردوگای ڕانیە بوو، ئیتر ئەو برادەرە خواحافیزی لێ دەکات،کە لەدەرگادەدا دایکی دەرگای لێ دەکاتەوە، فەرمووی لێ دەکات..

لێێ دەپرسێت کاك عبدالله لەکوێیە..؟ ئەڵێ تۆزێکیتر دێتەوە، خێزانی کاك عبدالله وخوشکەکەی بەخێرهاتنی دەکەن، زۆرگەورەیی و خانەدانی و میهرەبانیان پێوە دیاردەبێ،پاش چەندسەعاتێك کاك عبداللەدەگەڕێتەوە.. دوای هەندێك دانیشتنی دووبەدوو نامەکەی کاك رەفعەت دەداتە دەستی، ئیتر لەدوای ئەوەوە کاك عبدالله دەست بەکاردەبێ،دەیبات بۆماڵی کاك(سید حاجی)ئەو نامانەی پەیوەندی بەخۆیەوە دەبێ،ئەوانەی پەیوەندی بەبرادەرانی ڕێکخستنەوەدەبێ، بۆئەو هێلە تایبەتانەی کەلەکاتی ئەنفالەکاندا لەگەڵ هێلەکانی سلێمانی وشوێنەکانی تر ئەرکی گواستنەوەی پێشمەرگەکانیان لەئەستۆگرتبوو،بەتایبەتی بریندارەکان، هەمووی وەردەگرن،نامەکەی خۆی بۆئەوەدەبێ کە بۆ ماوەیەك لەلایان بمێنمەوە.. بیپارێزن، تاوەکو کارەکەی تەواو دەبێت، ئەو برادەرانەش زۆر برادەری چەکداری ڕژێمیان دەبێ و فەوج وسریەیان دەبێ،کە ئەوانیش کاك(سیدحاجی وبراکانی )و (کاك عبداللەی حاجی رەسوڵ) خەڵکی بناری قەندیل و برادەرێکی تر بە ناوی(کاك مستەفا عزالدین) خەڵکی کەرکوك دەبێ.کاك سیدحاجی کەسێکی زۆر ئازاو دڵسۆزو لەخۆ بردوودەبێ،ماڵیان بە تەنیشت مخابەراتی ڕانیەوەدەبێ،لەیەکێك لە ژورەکانی ماڵەکەیان لەلایەن کاك مستەفا عزالدین کە بەناوی( کاتب فوج خفیفە)وە تابعەیەکی لێ دەبێ. دواتر دەزانێ کە کاك مستەفا شارەزاییەکی باشی لەدروست

کردنی ناسنامەو نوسراوی میری و دروست کردنی مۆری (تەزویر) لە سەردەمی ئەنفال دا بۆ دەربازکردنی پێشمەرگەوبریندارنی شۆڕش هەبووە..

لە چەمی ڕێزانە چەندین بەرپرسی پ.م هەروەها پێشمەرگەی بریندار لەلایەن کاك سیدحاجی و کاك مستەفاو کاك عبداللەوە ناسنامەی تەزویر (أمنی عام) یان بۆ کرابوو، کەبەسەیارەوپاسەوانەکانی کاك سیدحاجی دەرباز کرابوون بۆ ڕانیەو دواتریش لە ڕێگای بارەگاکانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانەوە لەڕانیە کەئەو کات هەماهەنگی باش هەبوولەنێوان یەکێتی نیشتمانی کوردستان وحیزبی دیموکراتەوەبەهاوکاری ئەوان پێشمەرگەبریندارەکان بەسەیارەکانیان دەگوازرانەوە بۆبارەگاکانیان لە بناری قەندیل وەهەندێك جارخێزانی پێشمەرگەکانیشیان دەبردەبناری قەندیل وەبەشێك لەو پێشمەرگەو بەرپرسانەیان دەربازدەکرد،وەك (کاك علی بچکۆل وکاك ڕەفعەت عەبدولا)

دوای ماوەیەك بەهۆی ئەوەی کاك مستەفاعزالدین خەڵکی کەرکوك دەبێ، لەسەربەست دڵنیا دەبێت،هەمو کاروبارەکانی خۆی هەروەهائەو نهێنی وکەرەستەی دروستکردنی ناسنامەو بەڵگەوپسولەی ڕێگاپێدانی دام ودەزگاکانی ئەمن و استخبارات وشێوازو چۆنیەتی دروست کردنی پێ نیشان دەدات، وئاشنای دەکات بەهەمو کارەکانی.....چەند جارێك لەگەڵ کاك مستەفا و کاك سیدحاجی وکاك سیدئەحمەدی برای وهاوڕێیەکی خۆشەویستیان بەناوی احمد قەسرۆکی کەپێشمەرگەیەکی کەرکوکی دەبێ،ئەویش پسولەی ساختەی دەبێ.. چەندجارێك سەفەری سلێمانی وکەرکوك و هەولێردەکەن، بەحوکمی ئەوەی کاك سیدحاجی بەرەسمی ئامرسریەی خفیفەدەبێ،سەیارەی مۆدێل بەرزی پێ دەبێ،زۆرجار بەخەتی عەسکەریدا لەبازگەکانی ڕژێمەوە دەڕواوڕاناگیرێت، ناسنامەوپسولەی تەزویربۆ سەربەستیش دروست دەکەن، لەسەردانی شارەکانەدا هەڤاڵانی

ڕێکخستنی دەبینی،هەروەها زانیاری لەسەردام ودەزگاکانی ڕژێم کۆدەکردەوەو دەینارد‌ەوەبۆسەرکردایەتی ..

لەوماوەیەدا سەربەستیش شارەزایی باش لە نووسرای تەزویرو دروستکردنی مۆر پەیدا دەکات..دوای نزیکەی مانگێك هەرلەڕێگای ئەو هاوڕێیانەوە توانیٚ بچێتەوە چمچمال،کە دایك وسەباحی برای لیٚ دەبیٚ،لەمالٚ ئامۆزایەکی دایکی بەناوی کاك (حمیدگۆگجەیی) دوای ئەوەی چاوی پێیان دەکەوێت، دایکم ئەوەندە ئاسودەو دلٚخۆش دەبیٚ وادەزانی بەهەموو کورەکانی و هاوسەرەکەی هاتوونەتەوە ،ناوخەلٚك بلاودەبێتەوە کە خۆی تسلیم کردۆتەوە،ئەوکاتەش لێبووردنی گشتی هەبوو، ئەوەش بۆئەوزۆر باش دەبیٚ،جونکە لەچەچمالٚ کەمتردەناسرا،دوای چەندڕۆژێك لە گفت وگۆو ڕاوێژکردن قەناعەت بەدایکی دەکات کە لەگەلٚ خۆی بیبات بۆڕانیە، بەلاٚم کاك سەباحی برای زۆربەزەحمەت قەناعەتی دەکات، لەنزیك مالٚی کاك عبدالله خانویەکیان بۆدەگریٚ و هەندێك پارەی باوکی وەك ئەمانەت لای کوڕێکی پووری بەناوی عمربازرگان دەبیٚ، دەیهێننەوەو وەك پڕۆژەیەك بەکاری دێنن،بە( 2000) دیناری سویسری.دوکانێکی باش بۆکاك سەباح دادەنێن..

## ئاشکرابوونی هێلەکانی ڕێکخستن

لەڕێگای کاك (احمد قەسرۆکی)یەوە ئاگاداردەکرێتەوە کە لەسلیمانی زۆرێك لەو هەڤالانەی ڕێکخستن دەست گیرکراون، ئەوەش لەئەنجامی پێدانی زانیاری لەلایەن هەندیٚ لەو پێشمەرگانەوە کە تسلیم بووبوونەوە بۆئەوەی ڕژێم لێیان ڕازی بیت،یاخودهەندێك پارەو پول و امتیازێکیان پیٚ ببەخشێت، ئەو پێشمەرگانەش لەو کەسانەبوون ئەم ریکخستنە نهێنیە تێکۆشەرو جوامێرانە لەکاتی ئەنفالەکاندا دەربازیان کردبوون، ئیتر هەموشتەکانیان بۆدام و دەزگاکانی ڕژێم ئاشکرابووبوو، کاتێك کاك مستەفادەبینن سەیردەکەن زۆر بێتاقەتە،خەریکی ئامادەکاری بۆ

خۆحەشاردان و شاردنەوەی شتەکانی دەبێ و لای یەقین دەبێ کە نۆرەی ئەوانیش دێت، بۆبەدبەختی کاك سیدحاجی،لەو کاتەدا کابرایەکی سەربەڕژێم دەکوژرێت بەناوی( مستەفای جوتیاران)کە کەسێکی ناوداری ناوچەکەش دەبێ، تاوانەکەیش دەدرێتە پاڵ کاك سیدحاجی و لەناو خەڵکیش بڵاودەبێتەوە،ئاکۆی عباس ئاغاش لەسەرئەو مەسەلەیە دەسگیردەکرێ،بەلأم بەهۆی ئەوەی ئاکۆی عباس ئاغا مستشاروکەسێکی بەهێزی ناوچەکەدەبی،هەروەها خاوەن ئیمکانیاتێکی زۆردەبێ، ئەوڕزگاری دەبێ ،دوای دەسگیرکردنی کاك سەید حاجی وچەند هەڤاڵێك ، کاك مستەفاعزالدین زۆرشپرزەو سەخلەت دەبێ، بەسەربەست دەڵێ:( تۆ هیچ مەترسە، نەناوت هەیەلای ئەمن..نەناسراوێکت لێرەیە، من شتەکانی خۆم زۆربەی لای تۆدادەنێم، ئەگەرئێمە تووشی گیران بووین، تۆ لەجیاتی ئێمە ئەو کارانە بکەو ئاگات لەخۆت بێت ،تۆو کاك احمد قەسرۆکی پێکەوەبن..) ئەوەندەی پێ ناچێت کاك مستەفاش عزالدین یش دەسگیردەکرێ، فەرمانی گرتن بۆ کاك عبداللەیش دەردەچێت، کەئەوکات سەربازدەبێت،بەلأم چونکە ئاگاداردەبێتەوە، خۆشبەختانە ناگیرێت.. چەند جارێکیش ئەمن لە شەو وڕۆژدا بەسەرماڵیاندا دەدەن..

ئەمە بۆ هاوڕێیانی ناوشارو بۆبەکێتی نیشتمانی کوردستان گورزێکی زۆرکوشندە وکەمەر شکێن دەبێ، دوای چەندمانگێك لەبێسەروشوینکردن وپینەدانی مواجهە بەبڕیاری محکمەی بەناو سەورەوە بڕیاردرا بە لەسێدارەدانی کاك(سیدحاجی) وکاك(مستەفا)و هاوڕێکانی تریان لەسلێمانی دەردەچێت و بەشێکیان دواترئازاد دەکرێن، بەشێکیان حوکمی هەتا هەتایی دەدرێن ..

ئیترلەگەڵ کاك احمدقەسرۆکی تووشی شۆك وسەرلێشێوان دەبن، کاك احمد وەزعی زۆرتایبەت ودووژنی دەبێ،ماڵ ومنداڵی زۆر ودەستی کورت دەبێ، چەندحەفتەیەك خۆ لەڕانیە دوردەخەنەوە، لەدەوروبەری کەس وکارەکانی کاك سەیدحاجی دەبن، و

کاك سیدابرایم خزمێکی کاك سیدحاجی زۆرپێیانەوە ماندوو دەبێت ئیتر سەربەست وەك پارتیزان لەدەوروبەری شارۆچکەی چوارقوڕنە وڕانیە و ئیختیفا دەکات.. دوای ڕەوانەوەی ترسەکان بەوشتانەی کاك مستەفا هەڵدەسێت، دەست بە دروست کردنی چەندین پسولەی ڕێگاپێدانی سەربازی واتە(اجازە)ی دابەزینی 7ڕۆژی بەوجۆرە تۆزێك بەئازادی تر جموجۆڵ دەست پێدەکەنەوە،دواتر کاك سیدابرایم خەمی کاك احمدقەسرۆکی دەخوات و هەرلەدەوروبەری خۆیان خانووی بۆ بکرێ دەگرێ و ئاگای لێیان دەبێت، سەربەست یش بەو بەڵگانەوە ئاسایی دەتوانێ جموجۆڵ بکات،دواتر دە چێت بۆ کۆمەڵگای پیرەمەگرون، بۆ ناوئەو خزم و ئاسیاوانەی باوکی کەلەوێ بوون..

## ڕۆیشتن بۆ پیرەمەگرون بەمەبەستی چونە ناوپارتیزانەکان

لەرۆژی 1990/2/1 لەسەردانێکدابۆشارۆچکەی پیرەمەگرون بۆلای دۆستێکی دێرینی باوکی. سەردانی بنەماڵەی حاجی عبداللە وکریم داودو پێشمەرگەی دێرین کاك(بەکرتەلانی) دەکات.کەپیاوێکی زۆرقارەمان و سەرجەم ماڵ و منداڵەکەی ئەنفالکرابوون ئەویش بەلێبووردن هاتبووەوە ماڵی براو کەس و کارەکانی خۆی، لەوێ دەزانێت پارتیزانەکان لەچیای پیرەمەگرونن و خالە بەکریش پەیوەندی هەیە، هەوڵدەدات لەرێی ئەوەوە بچێ بۆناو پارتیزانەکان،کاتێك خالە بەکر دەبینێ و پێکەوە قسەماز دەکەن،ئەویش ئەڵێ:(هیچ خەمت نەبێت، برادەران بە قەد چیای پیرەمەگرونەوەز. هاتوچۆی ماڵی ڕسوڵی برام دەکەن ،هەموو پێداویستی و نامە گۆڕینەوەکانیان لەڕێگای ئێمەو چەند ماڵێکەوەیە،هەروەها دڵنیابە لەنزیك ترین کاتدا کاك(غریب هەلەدنی)یش دەبینیت، تائەوکاتەش دەتوانی لای ئێمە بیت) دوای چەند هەفتەیەك خالەبەکرتەلانی هەموشتەکان بۆکاك غریب باس دەکات، زۆری پێخۆشدەبێت چاوی پێ بکەوێت، نیوەڕوانێك لەناو ئۆردوگای پیرەمەگرون

پێی ی ڕادەگەیانێت کەئەمشەو برادەران دێن،دەبیات بۆماڵی کاك ڕسوڵی برای، ماڵی کاك ڕسولٚ لەنزیك دام ودەزگاکانی ڕژێم وماڵی برای یەکێك لەچەکدارەکانی سنورەکەش دەبێت.. سەعات نزیکەی11شەو پارتیزانەکان بەهێمنی وریایی وخۆیان هەڵدەدەنە ناو حەوشەکەوە،ئیتر لەژورەوە بەدیداریان شاددەبێت،کە بەرێزان (کاك غەریب هەلەدنی و کاك هێمن تەلانی و دوو برادەری تر)دەبن ،دەکەونە گفتوگۆ، زۆرئاسایی و وەك ئەوەی لە یەکێك لە شوێنە رزگارکراوەکان بن، کاك غەریب پێی ئەڵێ (ئێمە بەدوای خەڵکانی وەك تۆدا دەگەڕێین،هیچ خەمت نەبێت، تۆ هەرپێشمەرگەیت و لەم کاتەوە تۆ هاوکارێکی ئێمە بەو بەڕۆژ لەناو مجمع زانیاریمان بۆ کۆبکەوە،هەروەها لەجموجۆلەکانی ڕژێم، بەڕۆژ ئەو ڕێگایانەشمان بەباشی ببینە کە ڕێگای هاتن و دەرچونمانن و هەروەها هەوڵ بدە لەناو شارخەڵکانی تر ئامادە بکە وەك ئەم ماڵە کارمان بۆ بکەن، چونکە ڕۆژێك دەبێت ڕژێم ئەم شوێنانەی لائاشکرادەبێت وئێمەش توشی شکست دەبین)ئەویش بێ دوودڵی ئامادەیی نیشان دەدا،پێیان ڕاگەیاند من پێشمەرگەم وبەم ناسنامە تەزویرانە زۆرئازادانە دێم ودەچم، ئیتر دوای ئەو قسانە ئەوان پێداویستیەکانیان دەکەنە ناوکۆلەپشتەکانیان و خواحافیزی دەکەن و دەڕۆن سەربەست یش ناوخزمان دەمینێتەوەودەست بەکاردەبێت، بەڕۆژ کەسێکی ئاسایی وبەشەویش لەگەڵپارتیزانەکان دەبێت.دوای مانگێك لەماڵی حاجی مەولود دەبێت، بەیانییەك خالە بەکرتەلانی بەچریەوە پێی ئەڵێ: (ئەمشەو کاك غەریب لەلامان بوو،ڕاسپاردەیەکی هەیە ئەویش ئەوەیە دەبێت بچیت بۆ(نەجەف وکەربەلا)ولەوێ ئەوبەردەنوێژانەی شیعە بەکاری دەهێنن وپێی ئەڵێن(توربە)پەیدا بکەی..چونکە لەکاتی هاتن وگەڕانەوەدا لەسەرسنور پاسدارەکان داوادەکەن لەگەڵ خۆتاندا بۆمان بەێنن وئەمەش گەورەترین شتە بۆئەوان)...

دواتر کاك بەکر بڕی50(پەنجا)دیناری پێدەدات،هەمان ڕۆژبەپانتۆڵ وقەمیسێکەوە بەرەو کەرکوك و جنوب بەڕێ دەکەوێ، بەخەتی بەغدا سواری پاص دەبێ، لەناو پاصەکەدا دووهاوڕێی خۆی دەبینێ، کەپێشترپێشمەرگەبوون،خۆیان تسلیم کردبووەوەو سەربازبوون،زۆرپرسیاری لێدەکەن،خۆی لەپرسیارەکان دەربازدەکات، دواتر لەشاری بەغدا وە،دەروا بۆشاری نەجەف، ئەوەی زورجێگای سەرنج دەبێ، ئەوهەمووسەربازگەو فڕۆکە و تانك و زرێپۆش و ئەوبازگانە ...دەبێ، بەراوردکاری دەکات لەگەڵ ئەوژمارە کەمەی پێشمەرگە..

- بەهەرحاڵ دەگاتە نەجەف ولەهەرە بەردە باشەکان دووعەلاگەی پڕدەکرێ و بەسەلامەتی دەگاتەوەکەرکوك، لەوێشوە بەسەلامەتی دەگەڕێتەوە پیرەمەگرون، بەردەکان دەداتە دەست کاك بەکرتەلانی وبەهۆی ماندووبوونەوە چوار ڕۆژ لەماڵی کاك حاجی مەولود لەجێگادا دەکەوێ،کاك بەکرتەلانی دەچێت بۆلای و سڵاوو سوپاسی برادەرانی پێ ڕادەگەیەنێت،وتی زۆریان پێ سەیربووە،تۆ سەرکەوتوانە ئەوکارەت کردوەو چویتە قوڵایی سنورەکانی ڕژێمەوە،ئەم کارە جێگای ئەوپەڕی دەست خۆشییە. دوای حەفتەیەك لەماڵی ڕسوڵ تەلانی برای کاك بەکر چاوی بە برادەران دەکەوێتەوە،کاك غەریب هەڵەدنی چەندجارێك بەجیهازکاك نەوشیروان، لەچالاکییەکانی سەربەست ئاگاداردەکاتەوە..

لەڕێکەوتی 1990/5/1 کاك غەریب ئاگاداری دەکاتەوە کەبەڕێزکاك نەوشیروان بۆناوچەکانی دەوروبەری(کەرکوك وشوان وشێخ بزێنی) لەهەوڵی دروست کردن وناردنەخوارەوەی مەفرەزەیەکی تری پارتیزانییە..داوا دەکات ئەگەر دەتوانێ لەگەڵیان بیت، لەڕوی ئیداری و چاوساغییەوە هاوکاریان بکات،وەك ئەوەی رابردوو کردوویەتی؟ لەوەلامدا بێ بیرکردنەوەوسلەمینەوەیەکسەرئەڵێ: بەسەرچاو...

## دابەزینی کاك ئاکۆسورو
## گەیاندنیان بۆناوچەکانی خۆیان

لەڕێکەوتی1990/5/25 لەلایەن کاك ڕسولَ تەلانی یەوەئاگادار دەکرێتەوە کە کاك غەریب هەڵەدنی دەیەوێت بیبینێت،برادەرێکی تازەش لەسەرکردایەتیەوە هاتوە، ئەمشەو لەگەڵیاندادێتەخوارەوە،سەعات 10/10دقیقەی شەو لەگەڵ کاك بەکروکاك ڕسوڵی برای لەچاوەڕوانی برادەران دەبن، کاك غەریب و دووکەس دەچنە ژورەوە، یەکێك لەوبرادەرانە دەناسێتەوە،کە(ئاکۆسوور)دەبێت،پێشتر لای شەهیدمەلائاراس لەتیپی 21ی کەرکوك بینیبووی، ئەویش لەکاتی ئەنفال دووبرای گەورەی شەهیدکرابوون ،ئەوی تریش دەناسێتەوە کەکاك عاید(هێمن تەلانی)دەبێ، لەگەڵ کاك ئاکۆ قسەدەکەن،بەرنامەدادەڕێژن،دەستەکەی کاك ئاکۆ(8)هەشت کەس دەبێ، بەرنامەکەیان بەجۆرێك دەبێ. کەقۆناغ بە قۆناغ بەڕێ بکەون وئەمیش بەناسنامەی تەزویرو لەشارەوە ویستگەبەویستگە بەپێی ڕۆیشتنی ئەوان ئەرکەکان راپەڕێنێ، بەرەبەیان کاك ئاکۆ دەگەڕێتەوە بۆلای برادەران وئەویش ئامادەکاری خۆی دەکات.

### قۆناغی یەکەم

بنکەی سەرەکی رەتڵی سورداش لەشاخی پیرەمەگرون و لەپشتی دۆلەبیەوە لەسەرکانیاوێك ولەجێگایەکی زۆرسەخت وقایم دەبێ،لەسەر مەوعیدێك ڕێك دەکەون، باسی ئەوەش دەکەن هەرکات دابڕانێك بوو بە بێسیم بنکەی سەرەکی ئاگاداربکەنەوە وئەوانیش لەرێگای بنکەی ماڵەکانەوە ئاگاداریان بکەنەوە، شوێنی قۆناغی یەکەم سەرشاخی تۆکمەی نێوان بازیان وئۆردوگای پیرەمەگرون دەبێ، سەربەست لەپێشەوە دەچێتەکۆمەڵگای باینجان دەچێتەماڵی پێشمەرگەی دێرین کاك قادری مام عەودل خەڵکی گوندی مۆردخوادە، بەبێ دەنگی پێی ئەڵێ:

(پێویستیم بەهاوکاریت هەیە)ئەویش ئەڵێ بەسەرچاو،پێکەوەدەچن چوارتەبەقە هێلکەوبەتاتەو چەندگلۆزێك پاکەتی جگەرە دەکڕن، هەندێ پاتری بچوك و شقارتەو شتی وردە دەسێنن و دەچنەوەماڵ،خێزانەکەی هێلکەو بەتاتەکە دەکوڵێنێ،نانی خۆماڵیش ئامادەدەکەن، بەیانی زوو بەجلێکی کوردییەوە شتەکان دەخانە هەگبەیەکەوە بەکۆڵدا دەدات،بەبەردەمی ڕەبیەکانی پشت گوندی(کوپەلە) لەنزیك گاڕانی گوندەکەوە بەرەوشاخەکە دەڕوات وبێکێشە تێپەڕ دەبێ،کەدەگاتە گاوانەکە سلاوی‌لێ دەکات،دوای نیوسەعات لەدورەوە کەسێکی بێ چەك دەکەوێتە بەرچاوی،کە لێی نزیك دەبێتەوە،دەبینێ کاك ئاکۆسوورە،کۆڵەکەی لێ وەردەگرێ و بەدەم ڕێگاوە هەندێ دەمەتەقێ دەکەن..

بەدەم ئەوقسانەوە دەگەنە سەرلوتکەی شاخی تۆکمە ،کاتێك برادەران دەیان بینن هەریەك لەبن دارێکەوە بەرەو ڕوویان دێن،هەتا دوای عەسرلەگەڵیان دەمینێتەوە...

## سەربەست پارتیزانەکان چۆن دەبینێ..؟؟

### 1 ـ کاك ئاکۆسور

بەرپرسی مەفرەزە کاك ئاکۆ پێشمەرگەیەکی ئازاوپالەوان چوست وچالاك وریا و زیرەك بەهەڵمەت وبەئەزمون و ورە پۆڵایین ماندونەناس بەرێز وبەهەڵوێست چی سیفاتی پیاوی گەورەو سەرکردەوفەرماندەهەیەلەو پیاوە کۆبووبوونەوە

ـ مەخابن لەشەڕی نەگریسی ناوخۆ شەهیدبوو، تێرهەناسەی ئازادی هەڵنەمژی..

### 2 ـ کاك ئاواتەرەش ئاوات کەرکوکی

گەنجێکی قۆزو بالابەرز کەسێکی ئازاو پالەوان سادەو ساکارو دەم بەخەندەو سەربەرزو بەورەو پیاو بەمەعنای وشە مەخابن ئەم ئەزیزەش وەك کاکە ئاکۆی هاوڕێی تێرهەناسەی ئازادی هەڵنەمژی و زووشەهیدبوولەشەڕی نەگریسی ناوخۆ جێگای داخە جگە لەخۆی دوبرای تری شەهیدبوون.

3 ـ خاڵە بەختیارمەرزیـخـەیی

ئەم پیاوە مەزنە پڕاوپڕبوو لە هەرچی شتی جوان هەیە..پێشمەرگەیەکی ماندوبەڵام لەڕوالەت وهەڵس وکەوتدا وەك پڵنگ جولەی دەکرد خالە بەخە ئەوەندە قارەمان بوو فشەی بە ترس دەهات ئەو هەموئەو ناخۆشیانەی بینیبوو لەدەستپێکی شەڕی ناو گوند بەکۆپتەرسەرخرابوو لەشەڕدا لەداستانی مۆردخوادە ی سەرو مەخابن ئەم فەرماندە هەڵۆیەش هێندە هەناسەی ئازادی هەڵنەمژی و زووشەهیدبوو .

4 ـ کاك ابراهیم فازل حمەرحیم ناسراوبە( ئیباو )

کاکە ئیباویش پێش ئەنفال لەتیپی 21ی کەرکوك پێشمەرگەیەکی نمونەیی و ئازاوپالەوان و کوڕێکی ڕوح سوك و خۆشەویست و کراوەو گویٚ ڕایەڵ و توندوتۆڵ و کەسایەتیەکی بەهێز لەسیمایدا و جوامێری لێدەباری مەخابن چارەنوسی ئەویش وەك هاوڕێکانی زووشەهیدبوو.

5 ـ کاکە وریا ناسراوبە ( وریاقەفاری )

کاکە وریا گەنج ترین واتە کەم تەمەن ترین پێشمەرگەی ئەم مەفرەزەیەدەبێ، گەنجێکی جوان و بەشان وشەوکەت و وریا وەك ناوەکەی پالەوان وئازاوگران وسەنگین مەخابن ئەم گەنجەش هەرزوشەهیددەبێ

<u>ئەو سێ هەڤاڵەی خوارەوە ئێستا لەژیانداماون:</u>

6 ـ کاکە فخرالدین سمایل بەگی

7 ـ کاکە نەقیب ناسیح

8 ـ کاکە پۆڵاهەیبەیی

دوای بەجیهێشتنیان وخواحافیزی ڕێگا دەگۆڕێ و بەگوندەکانی قازان وکەلەباش و گەبەو گولیجەدا بەڕێگایەکی ناخۆشدا بەرەو کۆمەڵگای پیرەمەگرون دەڕواتەوە.

## قۆناغ دووەم

مەوعیدی دووەم (تەکیەی کاکەمەند)دەبێ، لەو شارە خەڵکێکی زۆرسەربەستیان دەناسی،چونکەزیاترخەڵکی دەوروبەری خاڵخالآن بوون،ئەم سەفەرەقورس تردەبێ.
دوای عەسرێکی درەنگ دەچێتە بازاڕ و گونیەیەك دەکڕی وشەش گلۆز(تەکە)ی پاکەتی سومەردەکڕێ و لەتەنیشت مەرکەزەکەشەوەلە خواردنگەی وەستا تاهیر 8 هەشت نەفەر کەبابی سەفەری ونان وسەمونێکی زۆر ئامادە دەکات وجلە کوردیەکەی لەبەردەکات و هێواش هێواش بەرەولای چمچماڵ شۆڕدەبێتەوە..
بەحوکمی ئەوەی پێش ئەنفال ناوچەی خاڵخالآن وقەلآسێوکە باش شارەزا دەبێ، زۆرناڕوات توشی دووشوان دەبێ،بەچەند پرسیارێك گومانی شوانەکان دەڕەوێنێتەوە کوڵەکەی پشتی نزیکەی 35کیلۆ دەبێ، ڕێگایەکی دورو درێژو هەورازونشێو بێ چەك تەنانەت چەقۆشی پێ نابێ، تەنیا چەکی بیروباوەڕو ڕق وتۆلە دەبێ بەرامبەربە دوژمنان، لەوڕێگا یەدا چەندین دیمەنی جۆراوجۆری باوك و براشەهیدەکان دێنەوە پێش چاوی، ئەو شتانەیش دەکات بەهێزو هاوڕێ و هاودەنگی بۆ بێ کەسی خۆی،ترسەکانی پێ دەڕەوێنێتەوە، زۆر دەڕوات، هەتا چاو بڕکات تروسکەیەك بەدیت ناکات، جاربەجاریش گوێی لە فیشکەی مارو لە دەنگی گیانداری سەیرو سەمەرە دەبێ،شەو زۆر شەکەت وماندوودەبێ.بەهۆی ئارەقە کردنەوەگیانی خاودەبێتەوە ، تۆزێك سەردەنێتە بان کوڵەکەی ودواتر بە ئاراستەی چیا گەورە دەڕوات،هەرچەند کۆتایی مانگی شەش دەبێ، بەرەبەیان لەدورەوە دیواری چەند کەلاوە یەك دەبینێتە بەرچاوی،بەتەنیشت گوندەوێرانەکانی(تیژە)و (تلیان)دا گوزەر دەکات ،بەوناوەدادەگەڕێ ، دەچێتە سەرتاشە بەردێك و دەکەوێتە بانگ کردن.. سەرەتا بە دەنگێکی نزم ودواتر بەدەنگی بەرز:

هۆ وو برادەران لەکوێن؟من هاتوم وەرن شتم بۆتان هێناوە،کەباب ونان و جگەرە، کاك ئاکو کاك ئاوات کاك فخرالدین لەکوێ،؟؟ ، نزیکەی 3سەعات لەوناوە دەبێ، زۆر تینوی دەبێ ،بەزەحمەت ئاودەدۆزێتەوە،پاشماوەی باران لەنێو چاڵی شوێن تایەی تراکتۆرەکان، تێرلەو ئاوە دەخواتەوە،ئیترشتەکان لەشوێنی مەوعید بەزەقی دادەنێ ونازانێ هۆکاری نەهاتنی برادەران چی یە؟

بەباشیدەزانی بگەڕێتەوە،ئەمجارە ڕێگاکە دەگۆڕێ،بەئاراستەی گوندی تەوەکەڵ، تادەگاتەوە تەکیە،لە نێوان ئەو شوێنانەدا چەندین دیمەنی دڵتەزێن وجەرگ بڕ دەبینێ،کەرەستەو شت ومەکی هاونیشتمانیان، جل وبەرگی پیاوەکان هی ژنان مەمەی منداڵ وکەرەستەی بارییە ساکارەکانی ئەو سەردەمەی منداڵان وبەتانی وباوڵ وجانتای ئەوکاتانە زۆرجارئەو جل و بەرگانە دادەپۆشێ چونکە هی خوشکانی نەتەوەکەی بوون.بەبینینی ئەم دیمەنە ناخۆشانەوە و بێ ئومێدی لەموعیدەکە دەگەڕێتەوە بۆ پیرەمەگرون،تاکولەڕێگای بێسیمەکەی برادەرانەوە موعیدی تازەو هەواڵی چوونی بۆموعیدەکەو دانانی شتەکان رووون بکاتەوە، خۆشبەختانە هەم موعیدی تازە دیاری دەکەن و هەم شتەکانیشیان دۆزیبووەوە...

## قۆناغی سێیەم

## - ناوچەی تەق تەق - بناری خاڵخاڵان 1990/ 7/7

دیاری کردنی مەوعیدی سێیەم کەلەلایەن هەردووبێسیمەکەی کاك غەریب لە شاخ ودەستەکەی کەرکوکەوە دیاری دەکرێ، وەك جوفرەیەك ئەڵێن:( با هەڵۆکە بفڕێت بۆ ئەوگوندەی کەوەکو ناوی گوندەکەی خۆیان وایە واتە گوندی مۆردخوادەی سەروو)گوندەکەی خۆیان مۆردخوادەی خواروبوو،مەوعیدی ئەمجارە ڕوون دەبێ، هەربۆیە ئەمجارە ڕوودەکاتە شارۆچکەی تەق تەق و لەم شارۆچکەیەش ماڵی چەندخزمێکمان دەبێ،کوڕێکی گەنجیش بەناوی (عادل) پێش ئەنفال لەگوندی

سەرچناری خاڵخاڵان دەبێ، بەداخەوە لەکارەساتی ئەنفالدا تەنها خۆی دەرچووبوو، ئەویش لەوماڵانە دەبێ، دایکی پورزای باوك سەربەست دەبێ، ئەم کورە کوڕی مجید ئاغا دەبێ. پێش چەندڕۆژێك لەمەوعیدەکە قسەی لەگەڵ دەکات،بەبێ هیچ دوو دڵی یەك ئامادەیی نیشان دەدات، پێی ئەڵێ:(دەمەوێت بچم بۆ مۆردخوادەی سەروو مەوعیدێ هەیە،هەندێ شت دەبەین بۆبرادەران،بەتایبەت زۆر زەروورن بۆپاتری جیهازەکەیان، پێش هەموشتێك دەبێت پاتری پەیدابکەین..)

پێکەوە دەچن بۆلای دوکانەکان وپاتریەکی بچووکی سەیارە دەکڕن و هەرلەوێ فول شەحنی دەکەن، ئیتردەکەونە تەگبیر کردن لەکوێوە بڕۆن، هەرچەندسەردێنن و سەردەبەن، جگە لەپەڕینەوە لەپردەکە ڕێگای ترشك نابەن، سەرپردەکەش بازگەی ئەمن وئیستخباراتی لێ دەبێت،لەدوورو نزیکەوە سەیرێکی سەیتەرەکە،کاتی بەیانیان بە باشترین کات دەزانن،پردەکە لەهەردوو بەرەکەی شوێنی تایبەت کراوە بۆ ڕێرەوی پیادەو تەنانەت بەیانیان هەرجی مەڕو ماڵات و گاگەل هەیە بەوجێگایەدا دەڕۆن، سەیتەرەکە حەقی نابێ بەسەرکەسەوە،بۆبەیانی لەوکاتەدا کاك عادل کە منداڵ تردەبێ، خۆی وەك شوان لێ دەکات وبێ کێشەدەپەڕنەوە، هەرچەندناوچەکە(محرمە)دەبێ وڕێگاکەیش زۆردووروودەبێ،لانی کەم چوارسەعات، بەلاڕێگاکاندا دەڕۆن،بەتەنیشت گوندی جەلەمۆرد دا تێدەپەڕن چەند پشیلەیەك کەدەیان بینن خۆیان دەشارنەوە،وەك پشیلەکێوی لەمرۆڤ دەترسن دواتر ئاسەواری سەردەمی ئەنفالەکان دەبینن، کە چۆن ئەو کەل و پەلانە بەتایبەت جل وبەرگی ئافرەتمان لە چەمانە بەجێماوە..

لەگوندی مۆردخوادە نزیك دەبنەوە گوند کەلاوە و ڕەزو باخەکان سەرەڕای هەمووئەو وەزعانە هەرسەوزدەبێ،هەردەکیان شارەزادەبن ،بە ناو ڕەزەکاندا،بەرەو سەرچاوەی ئاوەکە دەڕۆن، بەو ئومێدەی برادەران لەوێ بن ،هەرکە دەگەنە سەر

کانیەکە دووکەس بەدەردەکەون،ئەوانیش چاودێری ئەمانیان کردبوو، کەنزیك دەنەوە، دەبینن کاك(ئاوات)وکاك(ئیباو)ن،دوای بەیەك شادبوون و خوشی دەربڕین کاك عادیل یان پێ دە ناسێنێ، تاکو سەعات سێی عەسر پێکەوە دەبن،بەرنامە ڕێژی تەواوبۆداهاتوودەکەن،ئەوان ناوچەی (شێخ بزێنی)خوارووبان هەڵبژاردبوو، واتە مەبەست دەوروبەری تەق تەق بوو،وا ئیتیفاق دەکەن، برادەران هەوڵ بدەن بۆ دۆزینەوەی ئەو ئازوقەو خواردەمەنیە وشکانەی کە پێش ساڵ و نیوێك لەکاتی ئەنفالەکان خەڵکی گوندەکان لە بن شاخ و ئەشکەوتەکان.. لەناو بەرمیلی گەورە حەشاریان داون، چونکە زۆرجار ئەوحالەتانە دەبینران،هەر بۆیە بەکاك (ئاوات) کاك (ابرایم) ئەڵێن زۆر زەرورە کەکۆیان بکەنەوە و سودی لێ ببینن، دواتر کاك ئاوات وئەوان باسیان دەکات کەئەواییش هەرویان کردووە، گوایە شتی باشیان دۆزیوەتۆوە ..ئیتر سەرلەئێوارە خواحافیزیان لێ دەکەن، موعید بۆ داهاتوو دیاری دەکەن ،کە گوندی (جگیلە)ی نزیك تەق تەق دەبێ،بەهەمان ڕێگاو بەهەمان شێوەبەدوای شوان وگاوانەکان دابەسەلامەتی دەگەڕێنەوە بۆ تەق تەق..

## خەمی سۆراغی کەسوکار

لەوە بەدواوە برادەران عەوداڵی دەنگ و باسی کەس وکاریان بوون، لەو هەشت هاوڕێیە بڕواناکەم یەك کەسێکیشیان لەدوای کارەساتی ئەنفالەوە بچوکترین دەنگ و باسی کەسوکاریان زانی بێت هەربۆیە لەسەرداوای خۆیان لەسەرەتادا کاك ئاوات نامەیەکیان پێدەدات تاکوبیگەیەننەماڵی باوکی وئەدرەسی ماڵیانی پێدەدات، دوای دوو ڕۆژسەربەست دەروا بۆکەرکوك،دەچێتە ماڵیان لەگەرەکی(الماس) لەنزیك حدیقەی ام الربیعین،کاتێك باوکی ودایکی دەیبینن زۆر خۆشحاڵ دەبن،بەلایانەوە سەیردەبێ، بەڵام متمانەی تەواویان دەبێ،چونکە لەسەردەمی پێش ئەنفال کاك ئاوات یەکێك لەوبریندارانەدەبێ،کە شەهید دکتۆرهادی چارەسەری بۆدەکات،دوای

ڕێزێکی زۆرو نان خواردن ئەو ماڵە پێشمەرگەیەش دەبێتە بنکەیەکی تر بۆ ئەنجام دانی کارەکان وکەس وکارەکەشی بەهەمان شێوە دەبنە هاوکار..

## قۆناغی چوارەم

## - مەوعیدی گوندی جگیلە

گوندی جگیلە لەدووشوێنەوە دەکرابۆی بچیت، یەکیان هەورازەکانی خوارتەق تەق بەرەو کەرکوك. بەدەستی ڕاست بۆخوارەوە، بەماوەیەکی زۆرکەم دەگەیشتیتە ناوگوندەکە،ڕێگایەکی تریشی هەبوو کەئەوە باشتر بوو، لەبەرامبەردەواجنەکانی حاویەی قەرەناو دەڕۆیشتیت تۆزێك دوربووبەلآم لەڕوی ئەمنیەوە باشتربوو، ماوەیەك بووچەندماڵێك مۆڵەتیان وەرگرت بوو هاتوچۆ و زەرعات بکەن، بۆیە تۆزێك ئەهەوەن تربوو. یەکەمجار لەڕێگای سەرەکیەوە دەڕوا و لەسەرڕێگای گوندەکە دادەبەزێ، بەلآم کۆل وشت لەگەڵ خۆی نابات براده‌رانیش لەو دەم زێیانە ولەو ناوە ئازوقەو شتیان دەست دەکەوێ ، کاتێك بەودیوی گوندەکەدا دەڕوا لەنزیك چەم و دارەکان کاك ئاکۆو کاك فخرالدین لەشوێنی مەوعیدەکە دەبن، وەلآمی نامەکەی کاك ئاوات و کۆمەڵێك زانیاری و وەزعی ناوچەکەیان پێ دەگەیەنێ، بەتایبەت هەواڵی ناو شارۆچکەی تەق تەق و هەڵوێست وجموجۆڵی خۆفرۆشان و تێبینیەکان لەسەرپێشمەرگە تسلیم بووەکان و زۆرشتی تر،هەرلەوێ کاك فخرالدین نامەیەکی پێدەدات لەگەڵ ئەدرەسی ماڵی دایکی لەشوێنێك بوون کە پێیان دەوت(ڕەوزەکە) دوای چەند سەعاتێك مانەوە لەگەڵیان،لێیان دەپرسێ شتی چیتان پێویستە ئەمجارە لەلای پشتەوە ی ئاوایی بەپێ دێم و بەکۆڵ بۆ دێنم ، پێویستیان بەهەندێ حەپ ودەرمان دەبێ، لەگەڵ دەرزی ودەزوو، هەروەها هەندێ پێداویستی تری بچووك،دوای گەڕانەوە بۆ تەق تەق،هەرئەو ڕۆژە لەگەڵ کاك عادل دەچن بۆ ماڵی کاك فخرالدین،دایکی ژنێکی ژنانە...وئازاو بەخزمەت و میوان دۆست، لەوێش

بنکەیەکی ترم دابین دەبێ بۆ مانەوەو ئەنجام دانی کارەکان،بەڵام کێشەیەك دەبی، لای ماڵی دایکی کاك فخرالدین ژنێکی عەجول دەبێت زۆر سەرەتاتکێ و ئەمسەرو ئەوسەردەکات، خزمەکانیشی زۆربەیان پیاوی حکومەت دەبن، ئەو ژنەش پیاوی خەراپ هاتوچۆی دەکات، بەلاّم دایکی کاك فخرالدین هەر زووسەربەست بە کچەزای خۆی دەداتە قەلەم، بۆئەوەی دووری بخاتەوە لەگومان، شوێنەکە کۆنە قاعە بوو، ئەوچەندماڵە جیایان کردبووەوە ،دایکی کاك فخرالدین چەندین ڕست هەنجیری وشکەوە بووەوەی دەبێ، زۆرجار رستێك دەداتە سەربەست تا ڕێگا بیخوات، جارێکیان بۆبرادەرانیشی دەبات ،وردە وردە بەرچاویان لەسنورەکە ڕوناکتر دەبێتەوەو زاڵ دەبن بەسەر کاروبارەکاناندا،برادەرێکی تربەناوی کاك نەوزاد تەنەکەچی،کاتی خۆی هاورێی نزیکی شەهیددکتۆرهادی و،کوڕی خاڵی کاك مستەفاعزالدینیش دەبێ، کاك نەوزاد بەڕوالەت بەعەرەبی تکریت و زیقاردەچێ، عەرەبیەکەی فوول دەبێ، سەیارەیەکی لاندکرۆزەری مۆدێل 1979کاتی پێدەبێ، زۆرکات مەفرەزەکانی ئەمن و استخبارات بەکاریان دەهێنا، کاك نەوزاد دیشداشەو جلەکانیشی زۆرجار قتعتین دەبی، واتە بەجلی ئەمنەکان دەچێ، شواربێکی شۆڕو رەشیشی دەبێ، ئەگەرکەسێ نەیناسیبایە وای دەزانی یەکێکە لە پیاوە گرنگەکانی ئەمن و استخبارات، لەسەردانێکدا بۆ لەماڵیان کەبەرامبەرمزگەوتی اخوان دەبێ، لە(ڕحیم ئاوا) قسەی لەگەڵ دەکات کە برادەران دابەزیون و لەدەوروبەری کەرکوکن، ئەو زۆری بەلاوە سەیردەبێ. بەلاّم کاك نەوزاد پیاوی تەنگانەو لەهەموو ڕوەکانەوە هی ئەوە دەبێ وەك ئەڵێن بیبەی بۆناو ئاگر، لەبەرامبەرداواکە زوربەحەماس و گەرم وگوڕەوە ئامادەیی نیشان دەدات، ئەڵێ:حەزدەکەیت ئێستا بابڕۆین،ئەو پیاوەش وماڵەکەی بەهەمان شێوە هێزێکی تری پێ بەخشن...

بۆموعیدێکی تر کەهەرلەجگیلەدەبێ، لەچەم و حاویەکانی تەق تەقەوە دەڕوات، ڕێگایەکی باشتردەبێ، بەڵام دەبوو تاریك وڕوون دەرچێت بۆئەوەی پێش ئەو ماڵانەی دەچوون بگاتە ئەوێ،برادەرانیش شەو درەنگ دەگەیشتن، کاك ئاکۆسوورو کاك فخرالدین دەچن، بۆمەوعیدەکە.. هەندێ پێداویستییان بۆدەبات،داواکاریە بچوکەکانی خۆیان و وەڵامی نامەکانیان وەردەگرنەوە،مەسەلەی کاك نەوزادیشیان پێ ڕادەگەیەنێ و ئەڵێ ئیتردەتوانین بارێکی باش باربکەین وبەو لاندگرۆزەی کاك نەوزاد بیهێنین،کاك ئاکۆ زۆری پێ خۆش دەبێ،ئەڵێ هەرکات سەیارەکە هات من دەمانچەیەکم لەبن خاك دەرهێناوەتەوە کە هی شەهید مەلا ئاراسەو لەگەڵ چەکێکی کلاشنکۆف ئەیدەم پێتان با لاتان بێت، بۆ پارێزگاری کردنی خۆتان، دواتر لەسەرمەوعید وساتەکەی ڕێك دەکەون،کە بێینەوە هەمان شوێن دوونامەی تریشی دەدەنێ، ئەوڕۆژە لایان دەمینێتەوە، وەك وئەوان ئیختفا دەبێت، تاکو ماڵەکان دەگەڕێنەوە بەڕێگا ڕەسمیەکەداوئەویش بەڕێگاکەی پشتەوە دا دەچێتەوە بۆ تەقتەق،دواترکەدەچێتەوەبۆلای کاك نەوزاد و سلاوڕێزی برادەرانی پێ ڕادەگەیەنێ ،کات وسات وشوێنی مەوعیدەکە پێ ئەڵێ،لەسەروبەندی مەوعید شەوێك لەماڵی نەوزاد دەخەوێ بۆ ئەوەی بەیانی شەبەقی بچین بۆ گوندی جگیلە، کاتێك دەگەنە بازگەکان کاك نەوزاد واخۆی دەگۆڕێ خۆی و سەیارەکەی ترتیب دەکات، کەبەوعەرەبیە بەقوەتە قسەدەکات،کەس ڕێگریان لێ ناکات،کاتێك دەگەنە جگیلە زۆربێمنەتانە وەك ئەوە خۆیان نیشان دەدن کە پیاوی حکومین و دەگەڕێن وزانیاری کۆدەکەنەوە ،ئەو جارە کاك ئاکۆو کاك نەقیب و کاك ئاوات دەبینن،کەل و پەلەکان داگرن کە دووفەردەی ئاردی گەورە و هەندێ شەکر و برنج و ڕۆن دەبن .. کاك ئاکۆسوور دەمانچەکەو تفەنگەکەیان دەداتێ، کاك نەوزاد بەحوکمی ئەوەی تەنەکەچی سەیارە دەبێ، دەرنافیسێك دەردێنێ وهەرزۆربەئاسانی لەپێش چاوی

ئەوان بەرگی دەرگای سەیارەکەی دا دەماڵێ ودەمانچەکە بەپەڕۆیەك دەپێچێ و تفەنگەکەش دەخاتە ناودەرگاکەو وەك خۆی لێدەکاتەوە،ئەوجا دەڕۆن، برادەران بەوە زۆرسەرسام دەبن، لەکاتێکدا ئەو شوینە جێگای ئیختیفایەی ئەوان بوو ،لەنزیك گوندی دەرماناو کەنزیکە لەکەرکوکەوە،لە گەڕانەوەدا بەهەمان شێوە دەگەڕێنەوەبۆکەرکوك،بۆشەودەرگای سەیارەکە دەکاتەوەو دەمانچەکەی دەردێنێ و لەجێکایەك حەشاری دەدات. کاك نەوزاد بەوکارە سەردانە زۆردڵخۆش دەبێت، وەعددەدات هەموشتێك بکات. بەکاك سەربەست ئەڵێ : هەرکاتێك چویت بۆلایان ڕازی نابم بەتەنهابچیت ئەگەر سەریشم تیا بچێت من دێم لەگەڵت، تۆهەرخۆت ماویت ومن بەسەروماڵەوە نامادەم لەگەڵتان بم،کاك نەوزاد زۆردڵتەنگی بەشەهید بوونی مستەفا عزالدین وخزمێکیشی پێشمەرگەدەبێ بەناوی کاك(محمدصقر) هەر بۆیە سەربەست دەبا بۆلای دایکی شەهید مستەفا،ئەویش بەو سەردانە زۆر دڵخۆش وئاسودەبێ..

## بردنی منداڵەکانی شەهید ئاکۆ بۆ مەرزیخە

چەندجارێك کاك ئاکۆ پرسیاری ماڵ ومنداڵەکەی دەکات،ئایشارێتەوە کەزۆر بیریی (دارا)ی کوڕی دەکات، سەربەست رادەسپێرێ سەردانێکیان بکات،ئەویش سەرێکی کۆمەڵگای کەوەرگۆسك دەدا،زۆربەزەحمەت دەی دەدۆزێتەوە وکاتێك دەچێتە ماڵیان ئەوان هەندێك حەزەری لێ دەکەن، دواجار ئەڵێ: مام ئەحمەد من برای شەهید دکتۆرهادیم و لای کاك ئاکۆوە هاتوم،هەواڵ ودەنگ وباسی ئەوانم بۆتان هێناوە، مام ئەحمەد و دایکی سەریان سوڕدەمینێ،ئەڵێن: مەبەستت ڕەمەزانە ؟ ئەویش ئەڵێ ڕەمەزان کێیە ؟ دایکی ئەڵێ کوڕم ئاکۆ ناوە ڕاستیەکەی ڕەمەزانە، ئیتر لەیەك حاڵی دەبن وبانگی ژن ومناڵەکانی دەکەن،هەمووی لەدەوری کۆدەبنەوە، نیوەڕۆ نا هێڵن بڕوات ،سەرەبەست پێشنیار دەکات نازەنین خان بچێت بۆتەقتەق تا

لەوێوە مەوعدێك تەگبیربکەن کاك ئاکۆ بێتە شوێنێك و چاوی پێیان بکەوێ،لە وەلأمدا ئەڵێ بۆناوئاگریش بێت دێم،دوای بەرنامە دانان،نازەنین خان و نەنە مریەم دایکی شەهید ئاکۆو دارای کوڕی کاك ئاکۆ دەگەنە ماڵی کاك فخرالدین لە ناو رەوزەکەو بۆبەیانی زوو لەگەڵ ئەوان ودایکی کاك فخرالدین ،دەچن بۆشوێنی مەوعید(چەمی سەیناغ)لە حاوی (مەرزیخە))کەشوێنێکی قەمیشەلأن وچڕ دەبێ، بەگەیشتنیان بەیەك هەمووشا و شکور دەبنەوە..

پاش چەندسەعاتێك، بڕیار دەدەن نازەنین و دارا لەگەڵ کاك ئاکۆ بمێننەوەو ئەوانیتریش بەهەمان سەیارە دەگەڕێنەوە، نازەنین خان دەبێتە پارتیزان و ئەوانیش بەسەلامەتی دەگەنە وە تەقتەق ..

## سەردانێکی تر بەسواری ماتۆڕ

لەسەر پێشنیاری کاك نەوزاد مەوعدێکی تر بەسواری ماتۆڕ لەکەرکوکەوە دەچن بۆ گوندی مەرزیخە ،پێش ئەوەی بەڕێ بکەون بڕیار دەدەن کە کەباب هەندێ پێداویستی تر لەگەڵ خۆیاندا ببەن،لە هیچ یەکێك لە سەیتەرەکان ڕایان ناگرن، دەگەنەگوندی(کانی رەش) کابرایەکی باخەوان لێیان دەپرسێ کاکە ئەوە بۆ کوێ دەجن، کاك نەوزاد خەریك دەبێ خۆی لێ بکاتە عەرەب و پیاوی حکومەت بەلأم سەربەست بەکوردی ئەڵێ خالە گیان بەنیازین هەتاکو ئەوپێشەوەو ئەو چەمە بچین و هەندێ رەفیقی ترمان لەوحاویانەی ئەودیوەوە هاتون و ڕاوی پۆڕدەکەین.. کابرا زۆرپیاوانە پێیان ئەڵێ سەعاتێك پێش ئێستا قوەت دەرچوە ئاگاتان لەخۆتان بێت،ئەوپیاوە رازی دەکەن ماتۆرەکە دادەنێن وکەل وپەلەکان هەڵ دەگرن، نزیکەی 20 دقیقەیەك دەڕۆن، گوێ بیستی تەقە دەبن،ئیتر دەزانن ئەوە کێومالێ(تمشیط)ە، لەدورەوە کەسێك ئیشارەتیان بۆدەکات وەرن بۆ ئێرە..!

وادەزان کە برادەرانی خۆیانن،بەپەلە دەگەنە لایان ئەڵێن ئەوە قوات هاتوەو تمشیت دەکات،ئێمەش وەك چاوشارکێ چاوشارکێ دەکەین،ووڕن بابڕۆین،تۆزێك دوردەکەونەوە،خواردن وکەل وپەلەکانیان پێدەدەن، بەتایبەت کەبابەکە، ئەوانیش برسی وهیلاك، هێزەکە تادرەنگ دەمینێتەوە ئەوجادەکشێتەوە ، کاك ئاکۆ ئەڵێ باش نەبوو ،نازەم نەهێنابوو. لە بنکەکە بەجێم هێشت بوو، بارو دۆخەکە زۆر دژوارە ئەمجارە ئەگەر هاتنەوە لەگەڵ خۆت بیبەنەوە، هەرچەند ئەم ماوەیە نان وچێشتی بۆکردوین وزۆرباش بوو لەگەڵمان بێت .

دواتر برادەران بەڕێیان دەکەنەوە، تاکو نزیکی ئەوشوێنەی ماتۆرەکەیان لێ دانابوو

## بردنەوەی نازەنین خان بۆشار

لەمەوعدێکی تردا بۆحاوەی نیلینجاغ و هەربەوڕێگایەی ناوحاویەکانەوەو برادەران کاك ئاکۆوخالەبەخەو کاك فخرالدین وکاك ئاوات ونازەنین خانیش ئامادە دەبن ، کاك ئاکۆسوور داوادەکات کاك ئاوات لەگەڵ خۆی بەری،ئەویش ئەڵێ:

ئەگەرئێوەش ڕازی بن ئەمجارە(عدم تعرز) وشتی بۆپەیدا دەکەم ولەماڵیشیان ناسنامەکەی دهەێنم و لەگەڵ خۆم دەیبەم) کاك ئاوات زۆری پێ خۆش دەبێت، برادەران تا مەسافەیەك بەرێیان دەکەن ، ئیتر لەگەڵ نازەنین خان و دارا پێکەوە ملی ڕێگادەگرن و بەبێ هیچ کێشەیەك دەگەیانەوە ماڵی کاك فخرالدین لەتەقتەق..

## هێنانی کاك ئاوات بۆناوشاری کەرکوك

پاش ماوەیك بەڕێدەکەونەوە بۆچەمی جگیلەولەگەڵ خۆیدا هەموشتێك ئامادەکات، پسوولەی تەزویر و ناسنامەکەی کاك ئاوات و هەندێ وینەی کۆن، هی معاملات بەلأم بەدایکی نالێ بۆ ئەو شتەیە، ئێیوارەیەکی درەنگ دەگاتە لای برادەران، تەنها کاك ئاکۆو کاك فخرالدین ئامادەدەبن ،ئەڵێن دواتر ئاوات وخالەبەخە و ئیباو

پێکەوە دێن،دوای سەعات ونیوێك دانیشتنی بەرمانگە شەو،ئەوانیش دەگەنە لایان بەرەو لای رەزەکان و قەراغی زێیەکەشۆڕدەبنەوە، دەبووتاکوبەیانی تاریك وڕون چاوەڕوان بووینایە،ناشتوانن ئاگربکەنەوە،ناچار لەدەوری یەك دادەنیشن،شەوێکی سارد دەبێ،بەو حالە تاکو دنیا ڕووناك دەبێتەوە دەمینێنەوە، شتەکان بۆکاك ئاوات لەبەرڕۆشنایی لایت تەرتیب دەکەن،ئەو(قاتە شاڵەی)رەنگ رەساسییەی خالەبەخە لەگەڵ خۆی لەئێرانەوە هێنابووی، لەگەڵ پشتێنێکی گەنجانە..

وردە وردە تاقم و تفەنگەکە لەکاك ئاوات دادەماڵن،کەدنیا ڕون دەبێتەوە بۆدڵنیابوون سەیری شتەکان دەکەنەوە،موعیدی کاری داهاتوو یەکلادەکەنەوەو خواحافیزی لەبرادەران دەکەن، بەسەلامەتی دەگەنەوە ناو تەقتەق، لەوێشەوە پێکەوە دەچن بۆ پیرەمەگرون، لە ڕێگا زۆرڕێنمایی کاك ئاوات دەکات، کە چۆن هەڵس وکەوت بکات،لەسەیتەرەکان چی بکات،تەنانەت چۆنیش دابنیشێت و دەبووایە هەموئەو شتانەی پێ بگووتایە،چونکەسەیتەرەکان ئەزمونیان هەبوو، تەنانەت لەخوێندنەوەی دەم وچاوی کەسەکان وئاشکراکردن و گرتنی خەڵك، بەڵام کاك ئاوات هەر زوو هەموشتەکانی بەباشی و ئاسایی وەردەگرێ، بێ کێشە دەگەنە پیرەمەگرون،دەچنە ماڵی خالە ڕسولْ کرژەیی،ئەو پیاوەمەزن ودڵسۆزو تێکۆشەرە..

هۆکاری ئەوگەڕانەوەیەش بۆ دوو مەبەست دەبێ، یەکەم لەڕێگای برادەرێکی ئەوانەوە پەیوەندی هەردولا ببەستن بەیەکەوە، چونکە دەیانزانی لەزستاندا دەبێت بگەڕێینەوە بۆبنکەی سەرەکی لەچیای پیرەمەگرون،دووەم بۆ بردنەوەی کاك ئاوات بوو بۆکەرکوك، کاتێك لەگەڵ کاك ئاوات دەچنە لای کاك بەکرتەلانی وئەوان ، کاك ئاوات یان پێ دەناسێنێ،کاك بەکرزۆردەست خۆشی لێ دەکات پێی ئەڵێ:

(چەندجارێك کاك غەریب هەڵەدنی باسی ئەو کارانەی کردوە، کە کاك ئاکۆسوور بەبێسیم بۆی باس کردووە،برادەرانی ڕێکخستنی ناوشاری سلێمانییش

دەیانەوێت پەیوەندیت لەگەڵ ببەستن،لێرەبن رەنگە ئەمشەو یان سبەی شەو برادەران بێن وئەوان تفاصیلیان لایە) ئیتر لەگەڵ کاک ئاوات بەئارەزوی خۆیان لە مجمعی پیرەمەگرون دەگەڕێن ،بەردەوام دەچنە دەوروبەرو ناوپیرەمەگرون ورێگاکان شیدەکەنەوەو بە تەنیشت رەبیەی جاشەکان ودام ودەزگاکانی ڕژێمدا دەرۆن و دوجاریش دەچنە سلێمانی. کاک ئاوات برادەرە پێشمەرگەی سلێمانی زۆردەبێ، لەناو شارو لەبازاڕ لەشەقامی مەولەوی و دووکەس بەرەو ڕویان دێن ، لەگەڵ کاک ئاوات چۆنی وچاکی دەکەن دەپرسن : لەچیایی و چی دەکەیت لێرە..؟

ئەویش سوپاسیان دەکات ئەوان ئەڵێن: کاکە ئێمە تسلیم بووینەوەوهەمووی فشەیە..قسەی نابەجێ بەکوردو شۆڕش ئەڵێن، بەڵام کاک ئاوات خۆی تێك نەداو بە دڵی ئەوان قسەدەکات، خۆیان لێیان ڕزگاردەکەن ودەگەڕاینەوە بۆپیرەمەگرون..

## پەیوەندی نێوان سەربەست و ڕێکخراوی سلێمانی

کاتێك کاك غەریب دێتەوە پیرەمەگرون،چاوی بەسەربەست دەکەوێتەوە،ستایشی هەڵویست وکارەکانی دەکات وئەڵێ: (خۆزگە چەندکەسی تری وەکوتۆمان دەبوو، ئینجا بزانە چەند مەفرەزەی تردەهاتنەخوارەوە ،ەتەنانەت تائێستادوومەفرەزەمان لەبەرئەوەی کەس نەبووە هاوکاریان بێت گەڕاونەتەوە ، لەکاتێکدائەو شوێنەی تۆی لیێت لەگەڵ کاك ئاکۆ وهەڤاڵەکانی لەهەموو ڕویەکەوە جیاوازی هەیە ) ئیتردەچنە سەرباسی چۆنیەتی بەستنی پەیوەندی لەگەڵ برادەرانی شاری سلێمانی..

غەریب درێژە بەقسەکانی دەدات:( برادەرانمان ئاگادارکردۆتەوە بۆزستان دەگەڕێنەوە لای خۆمان لە پیرەمەگرون ولەگەڵ ڕێکخستندا سەرپەرشتیان بکەن، لەئێستاوە کارلەسەر وردەکاری پەیوەندیەکان دەکەین، بەیانی سەعات 10 هەرلێرە ناومجمع پیرەمەگرون لەسەرجادەی گوندی کرژە لای ماڵەکانی سەرفەرعەکە کەسێك سەیارەیەکی تاکسی بەرازیلی پێیەو ژمارەکەی 25 سلێمانیە و قەمیسێکی سپی

وپانتۆڵێکی رەشی لەبەردایە دەگاتە ئەویَ جەریدەیەك بەدەستەوە دەگرێت ، لێی بچۆرە پێشەوەو پێی بڵێ هاوڕێ پشتیوان چۆنی..؟! ئەویش بەهاوڕێ سەربەست ناوت دەبات و تۆ نهێنیەکەت سەربەستەو لە پیتی( س ) ە کانیت لای رێکخستن سلێمانی ...) لەهەمان مەوعیدوشوێن ونیشانەکان کەسەکە ئامادەدەبێ، لێی دەچێتە پێشەوە. هاوڕێ پشتیوان چۆنی؟ ئەڵێ بەلێ هاوڕێ سەربەست باشم ئیتر تەوقەدەکەن ولەگەڵی سواردەبێ بەرەو سلێمانی،بەدەم رێگاوە هەموو بەرنامەو وردەکاری کاری داهاتوو تاوتویَ و دیاری دەکەن، لەگەڵ هاوڕێ پشتیوان دەکەونە کارکردن ولەمەوعیدەکان یەکتر دەبینن..

## بردنەوەی کاك ئاوات بۆ کەرکوك

لە بەرەبەیانێکدا لەماڵی خالە ڕسوڵ کرژەییەوە سەربەست و کاك ئاوات دەچنە گەراج و سواری پاص دەبن بۆ سلێمانی،ئەوکات سەیتەرە تەنیا لەبەرزاییەکەی تاسلوجە هەبوو .کاتێك دەگەنە سلێمانی تاکسیەك دەگرن و دەچنە گەراجی بەغدا، سواری پاصەکانی سلێمانی کەرکوك دەبن، لەناوپاصیش لە ڕیزی دوای شوێنی سایەقی پاصەکەوەدەبن..ئیتر بەرێدەکەون وبێکێشە دەگەنەوە شاری کەرکوك ، تاکسیەك دەگرن و لەدوری ماڵی کاك ئاواتەوە دابەزن،پێشتر چاوێك دەگێڕن بەدەوروبەری ماڵی کاك ئاوات دا بەکۆڵانەکاندا ،بە چۆڵترین کۆڵاندا خۆیان دەگەیەننە ماڵی کاك ئاوات بەڵام بەدرەنگەوە دەرگایان لێدەکەنەوە ....

لەپڕ دایکی کاك ئاوات دەرگاکە دەکاتەوە، بەهەرحاڵ کەدەچنە ژورەوە وەزعی ماڵەکەیان بەتەواوی دەگۆڕێ،دایك وباوك وهەرچی خوشك برایە لێیان کۆدەبنەوە، بەو چونەی ئەوان توشی شۆك دەبن،بەڵکوگومان دەکەن خۆیان تسلیم کردبێتەوە، زۆر پرسیاریان دەکەن چۆن هاتن بەسەیتەرەکاندا؟ ئەی دەوروبەرو جیران کەس نەتانی بینی..؟ئەڵێن نەخێر هیچ خەمتان نەبێت،ئێوە نهێنی ئەم هاتنە بپارێزن.

خەمی هیچ شتێکتان نەبێت. شەو لەوێ دەمێننەوە..،بەهەرحاڵ بۆ بەیانیەکەی ئاوات بەجێ دەهێڵێ و خۆی و خۆی دەگەڕێتەوە بۆ مەوعید ودەچێتەوە بۆلای برادەران لەدەوروبەری حاویەی جگیلەی شێخ بزێنی...

لەوێ پێیان ئەڵێ هیچ خەمتان نەبێت کاک ئاوات ئێستا لەماڵی خۆیانە لەکەرکوك، لەگەرەکی(تەپە)ئیترزۆریان پێ خۆش دەبێ، دوای چەندین پرسیارو وەڵام، ئەوەندەی ترمتمانەو بڕوایان زیاتر دەبێ، هەست بە ئاسودەیی دەکەن،هەربۆیە دەکەونە نامە نووسین بۆکەس وکاریان، ئەدرەس و ڕاسپاردەکانیان ئامادە دەکەن و هەرلەو مەوعیدەدا کاك نەقیب وکاك وریا نامەی پێدەدەن،کێشە ئەوەبوو هەندێکیان ماڵی باوکیان لەبەر حالەتی ئەمنی جێ گۆڕیان کردبوو، لەوشوێنانەی خۆیان نەمابوون بۆیە بەناچاری نامەکان بۆماڵی خوشك و براکان و ئامۆزاکانیان دەنارد، دوای دیاری کردنی مەوعیدی ئاینده دەگێتەوە بۆکەرکوك و هەردونامەکەم لەیەك ڕۆژدا دەگەیەنێ ، یەکەمیان ماڵی خوشکێکی کاك وریا بوو ماڵیان لەسەرووی کۆڵانی سلێمانیەکانیان دەبی لەڕحیم ئاوا، مێردەکەی ناوی کاك مەناف دەبێ، کاتێك دەچێتە بەردەم دەرگاو پرسیار دەکات : حەپسە خان لەماله ؟

خوشکەکەی دەرگادەکاتەوە...ئەڵێ: خوشکە گیان دەتوانم بێمە ژورەوە، ڕاسپاردەیەکی کەسێکی خۆتم پێیە،ئەڵێ بەسەرچاو فەرموو، کاتێك دەچێتە ژورەوە، پێی ئەڵێ:من لای براکەتەوە هاتووم، ئەم نامەیەشی بۆتان ناردوە، ئیترئەم ژنە تێك دەچێ، دەست ەگریان دەکات، دەپرسێ بۆ وریا ماوە..؟

کاکە گیان تۆلەکوێوە هاتیت،فریشتەبوویت بۆئێمە، دایکم ئەمە بزانێ لەخۆشیا دەبێت چی بکات..؟ ئەویش ئەڵێ بەڵێ ماوە،ئەی دایکی لەکوێیە؟

مەناف دوکانی قەسابی دەبێت ژنەکەی دەنێرێ بەدوایا بەپەلە بچێتەوە، ئەویش چاوەڕوانی دەکات..کاتێك دەچێ دەم وچاوی بشوات لە ژووری بەرانبەر چاوی بە

تفەنگێکی کلاشنکۆف دەکەوێ دەکەوێتە گومانەوە،ئەڵێ: حەپسەخان دەتوانم پرسیارێك بکەم ..؟ دەڵێ فەرموو کاکە گیان تۆ وەك وریا وایت بۆمن، ئەو تفەنگە چیە؟ ئیترپێدەکەنێ..ئەڵێ دڵت هیچ نەکات،هی مەنافە،بەناو(جیش الشعبیە)یە چی بکەین ئەوەندە هاتنە سەرمان و بانگی پیاوەکمیان کرد ئیتر بەم چەکە ڕزگارمان بوو، هیچ خەمت نەبێت ،پاش نیوسەعاتێك کاك مەناف دەچێتەوە، زۆر بەخێر هاتنی دەکات و، نایهێڵێ بڕوات، ئەڵێ: ئەگەرپێت باشە دوای نان خواردن پێکەوە دەچین بۆ چمچماڵ، ئەویش ئەڵێ: زۆرباشە بەڵام هەرلەم دەوروبەرە دەچمە ماڵێکی ترو راسپاردەیەکی هاوڕێیەکی خۆم و وریام پێیە بۆیان دەبەم ودێمەوە، لەوێوە دەچێت بۆماڵی ئاموزاکەی کاك نەقیب بەوناونیشانەی ئیشی سەب تێکردن (خەباتە)یان دەبێ، ئامۆزاکەی ناوی کاك هیوا بوو، پێیان دەوت( هیوا لاڵ) چونکە سەرزمانی دەگرت، کاتێك لەدەرگایان دەدا ئافرەتێك دەرگا دەکاتەوە،دەپرسێ ئەمە ماڵی کاك هیوایە؟ ئەڵێ بەڵێ، زەحمەت نەبێت کاك هیوا بانگ بکە، کاك هیوا دەچێتە دەرەوە وچۆنی وچاکی دەکەن..

دەپرسێ دەتوانم بێمە ژورەوە ڕاسپاردەیەکی کەسێکی خۆشەویستیم پێیە؟؟!

ئەویش زۆربەڕێزەوە فەرمووی لێدەکاو لەژورەوە نامەکەی پێدەدات...

کاتێك دەیخوێنێتەوە ئەڵێ زۆربەخێربێیت،من وەڵامەکەت بۆئامادەدەکەم و ئەمە ماڵی خۆتەو من لە خزمەتدام هەرچیتان پێویستە پێم بڵێ،ئەویش ئەڵێ : تەنها ئەم نهێنییە بپارێزن.بۆخۆتان ومنیش باشە،منیش هیچم ناوێ ،یەکسەر دەگەڕێتەوە بۆماڵی حەپسە خان،ئەم دومالەیش بۆئەو دەبنە دووبنکەی هات وچۆو پشوودان ، دواتر هەردوو خێزانەکە دەبنە هاوکارێکی باشی پارتیزانەکان،بۆئەوسەردەمە هەرچەندە ماڵ وشوێن هەبووایە بۆمانەوەو خۆحەشاردن وگۆڕینی شوێنەکان ئەوەندە پارێزراودەبوویت، لە تۆرەچاودێریەکان دوردەکەوتیتەوە، دوژمن پەی پێ

نەدەبردیت.. بەهەرحاڵ کاك مەناف سەیارەیەك ئامادەدەکات لەگەڵ کاك مەناف و حەپسەخان ودومندالی دەچن بۆچەمچەماڵ،بۆماڵی دایکی کاك وریا، دوای تۆزێك دادەنیشن،دایکی وخوشکەکانی دەپرسن ئەمەکێە..،بۆچی هاتون،...؟؟
حەپسەخان ئەڵێ :دایە ئەم برایە لای ئەیوبی برامەوە هاتووە، نامەی ئەوی هێناوە،ئەیوب ناونیشانی ماڵی ئێمەی پێداوە،ئیترئەو ژنە وەك وگوڵ دەگەشێتەوە، ناهێڵن ئەو وماڵی کاك مەنافیش برۆن،بۆشەویش خزمانی جێی متمانە لەخۆشیاندا دەوریان لێدەدەن ،برادەرێك بەناوی حسن کەخوشکەزای میم سەدری دایکی وریا، کوڕێکی زۆرباش دەبێ، دیتە لایان دوای دڵنیایی پێکەوە دەچنە دەرەوە، ئەوە باشدەبێ لەو ئۆردوگایە خەڵك کەم یەکتردەناسن، ئەم ماڵەیش دەبێتە مەکۆیەکی تر بۆ داهاتووی پارتیزانەکان.هەرچەند هەڵکەوتەی جێگاکەی ماڵی دایکی کاك وریا زۆرباش وگونجاو دەبێ، بەڵام چونکە زۆر قەرەباڵەغ دەبنن، ئیتر دەگەڕێتەوە بۆلای ماڵی کاك ئاوات، لەوێش خزمە هەرە نزیکەکان لەهات و چۆدادەبن، بۆرۆژی دواتر کاك ئاوات جل وبەرگی شاریی بۆدابین دەکەن و جلەکانی خالەبەخە قاتەشاڵەکە لەگەڵ خۆیان هەڵدەگرن و خواحافیزیی دەکەن..،بەو جۆرەوبێ کێشە دەچنەوە بۆ پیرەمەگرون،بۆماڵی مام رەسوڵ کرژەیی.

## ناسینی هاوکارێکی تر

لەوسەروبەندی سەردانەکەی ماڵی کاك ئاوات دا کاك سەربەست کوڕە پورێکی دەناسێ بەناوی(رەمزی فلامەرز) کاك رەمزی برای کاك ئەکرەمەرەش،پێشمەرگەی تیپی23ی سورداش دەبێ. فەرماندەی سریەوچەکداری خفیفەدەبێ،کاك رەمزی وەعدی هەموو هاوکاریەك بەپارتیزانەکان دەدات، ناسنامەیەك پێ نیشان دەدا کە رەنگی شین وەی(امرالمجموعه)دەبێت،ئەڵێ:

ئەم هەویەیە زۆرباشە و لەبازگەکان راتناگرن،دوودانەی پڕنەکراوەشیان بۆدەهێنێ، وێنەی شێوەی مۆرەکەودووکلیشەبەتاڵەکە لەگەڵ خۆیان دەبەن بۆ پیرەمەگروون، لەوێ مۆرەکە دروست دەکەن، ئەو هاوکاریەی کاک رەمزی بۆ ئەو سەردەمە زۆر گرنگ وپشتیوانێکی مەعنەویش دەبەخشێت بەسەربەست وهاوڕێ پارتیزانەکانی، جگە لەوەش چەندجاری تر هاوکاری وکارئاسانی باشیان بۆدەکات ..

دوای ئەوەی ئیش وکارەکان بەباشی دەبەن بەڕێوە،وایان پێ باش دەبێ بگەڕێنەوە بۆبنکەی سەرەکی لەشاخی پیرەمەگروون،گوندەکانی دۆلەبی و بیرانی لە پێش ئەو دۆلەبوون کە بۆ بنکە سەرەکیەکە دەچوو، لەگەڵ کاک ئاوات چاودێریکی باشی هەموو ڕێگاکان دەکەن،وەزعەکان زۆرئاسایی دەبینن، تەنیا کێشە رەبیەکانی پشتی گوندی قەرەچەتان دەبێ، دەبوو خۆمانی لێ بپارێزن،ئێوارە لە(مجمع) دەرچن و بەڕێ دەکەون،ڕێگاکە دووردەبێ،کاتێك دەگەنە دۆلەکە، واتە پشتی گوندی بیران و دەسوڕێنەوە بەئاراستەی سەرکەوتن.. گوێیان لە دەنگە دەنگێك دەبێ، برادەرانی خۆیان دەبن، خەریك خۆ ئامادە کردن دەبن، تاکوشەو بەڕێ بکەون بۆ ناو مجمع، کاتێك ئەمان دەبینن تۆزێك دەسلەمێنەوە،دەیانەوێ دەنگیان بدەن، چونکە هەرگیز بڕوا ناکەن بەوکاتەزووە دووکەس بگەنەئەوێ، ئیتر هاواردەکەن: خۆمانین،لێیان دەچنە پێشەوە . باش هەواڵ پرسین وگفتوگۆ،ئەڵێن:بەس ئێمە دابەزیوین وباقی هەموویان لەسەرەوەن، ئیتر ئەوان بەجێدێڵن و سەردەکەون، ڕێگا زۆرسەخت و ماندووبونی زۆر.کاك ئاوات شارەزادەبێ، کاتێك دەگەنە سەرکانیەك لەوێش چەند پێشمەرگەیەکی تردەنگیان دەدەن...ئەوانیش جێ دێڵن و بەژێر بەردێکی گەورەدا دەگەنە لای کاك خالیدی کاروبار،کاك عوسمانی مام کریم ، کاك شوان موغاغی و چەندهەڤاڵێکیتردەبن،ئەوشەوەتابەیانی وبەیانی وتادوای نیوەڕۆ لەوێ دەمێننەوە، لەو شوێنە دڵگیر وخۆشە چەندوێنەیەك بۆ یادگاری دەگرن ...

## بردنەوەی کاك وریا قەفاری بۆ چەمچەماڵ

دوای چوونەوە بۆحاوی ئیلینجاغ.بەرەزامەندی کاك ئاکۆوبرادەران لەسەرداوای دایکی کاك وریاوکەس وکارەکەی وئامادەباشی کاك وریا بۆهاتنەوە بۆناوشار، بەرنامەسازی بۆدەکەن، مەوعیدێکی نزیك دادەنێن، هەموشتەکان بۆکاك وریا تەرتیب دەکەن،پاشان دەچێ بەشوێنیدا،برادەران لەمەوعیدەکەو کاك وریا ئامادەکردەکەن، بەهەمان جلەکانی خالە بەخەوە ئەوان بەجێ دێڵن، لەرێگا بەهەمان شێوەی کاك ئاوات رێنمایی دەکات.بەحوکمی ئەوەی وریا لەتەمەندا زۆرمندالً و، زۆرجێی گومانناب‌ێ، تارادەیەك بردنەوەی ئاسانتر دەبێ، چەمچەماڵ وشوینی ماڵ دایکی ئەوەندە بۆئەویش مەترسی نابێ،هەرچۆنێك دەبێ دەگەنەچەمچەماڵ و تاکسیەك دەگرن و لەکاتێکی گونجاودا خۆیان دەکەن بەماڵ دایکی کاك وریا دا، کاتێك دایکی چاوی پێمان دەکەوێت ئەوەندە کت وپڕدەبێ،بڕوا بەخۆی ناکات، خوشك وبراژن وئامادەبووان بەلایانەوە سەیردەبێ، هێندەی نەماینێ بیکەن بەهەرا، بەپەلە هێوریان دەکەنەوە،زۆر تامەزرۆ یبینینی دەبن،چونکە لە کاتی ئەنفالەکانەوە نەیان بینی بوو، بەبێ هیچ بنەمایەکیش پێشتر وا هەواڵیان بۆ چووبوو کە کاك وریا شەهیدبووبێ، زیاترئەمە کاریگەری لەسەریان دەبێ، لەو چەند ڕۆژەی پێکەوە لەوێ دەبن،خزمان وماڵی خاڵی واتە کاك حسنیش بەخاوو خێزانەوە ئەوچەند رۆژە هەرلەماڵی کاك وریا دەبن،شەوێك بۆ شوێن گۆڕین دەچنە ماڵی کاك حسن، لەوچەند ڕۆژەدا کچێکی شۆخ وشەنگ زۆرگرنگی بەکاك وریا دەدا، دوی کاك وریا خۆی باسی دەکات کەئەوکچە ناوی سعادخان و، خوشکی کاك حسن و کچە خاڵی کاك وریا و دڵیان پێکەوەدەبێ.هەرلەوچەندڕۆژەدا هەردوولاو کەس وکاریشیان کۆدەنگ دەبن لەسەرئەوەی کە لە ئایندەیەکی گونجاودا بیانکەن بە هاوسەری یەك،

دوای چەندڕۆژ کاتی خۆئامادەکردن بۆگەڕانەوە دێ،کاك وریاخۆی ئامادەدەکات، ناسنامەو پارە و جل وبەرگ وچەند وردەپێداویستی وەردەگرێ، بە پاك وتەمیزی ماڵ ئاوایی لەکەسوکار دەکات، بەبەرنامەوبەسەلامەتی دەگەڕێنەوە بۆپیرەمەگرون، لەماڵی خالەڕسوڵ کرژەیی وئەوچەندڕۆژەی لەمجمع دەبن،موعیدەکانی ڕێکخستنی سلێمانی لەگەڵ هاوڕێ پشتیوان توندوتۆڵ دەکەنەوە،پێکەوە لەسەرئەوە ڕێك دەکەون وبووین کە هەندێك چالاکی بکەن ودەست لە خۆفرۆشان بووەشێنن...

پاش چەندڕۆژێك نامەیەکی پێچراوە لە ڕێکخراوی سلێمانیەوە دەگات، ناوەڕۆکی نوسراوەکە رەخنەی توندەبێ،لەسەرکێشەیەی بەنیازدەبن بیکەن..ئاگاداریشیان دەکەنەوە ئەگەر دوژمن بەوکارە بزانێت،هەمووڵامان بەر گورزی کوشندە دەکەوین، دواتر دەگەڕێنەوە بۆلای کاك ئاوات لەبنکەی سەرەکی لەشاخ..

## بەرنامەی گەڕانەوە بۆبنکەی سەرەکی پیرەمەگرون

وەرزی زستان نزیك دەبێتەوە،سەرکردایەتی بەبێسیم ئاگاداریان دەکەنەوە بۆ زستان وەرنەوە بۆ بنکەی سەرەکی پیرەمەگرون، تاکو زستان تەواو دەبێت،دوایی خۆمان ئاگادارتان دەکەینەوە، سەربەست وئاوات لە مەوعیدەکەی پێشوودەگەنەوە شێخ بزێنی و لەوێ تاوتوێی ئەو باسەدەکەن، کاك ئاکۆسوور ئەڵێ: بەبێسیمیش پێیان ڕاگەیەندووین بۆزستان بگەڕێینەوە،هەڵوێستی ڕێکخستنی سلێمانی یان پێ ڕادەگەیەنن، کەبەرنامەیان دارشتووە بۆهەموو هاوکاریەك، ئیتر لەسەرئەوە ڕێك دەکەون لە ماوەیەکی نزیکدا ئامادەکاری گەڕاندنەوە بکەن و بگەڕێنەوە...

لەدوای چەندرۆژێك بەسەلامەتی و بێ ئەوەی تووشی هیچ کێشەیەك ببن، دەگەنەوە بنکەی سەرەکی شاخی پیرەمەگرون ...

## بردنی کاك ئاکۆسور بۆ(مجمع کەوەرگۆسك)

لە بارەگا سەرکییەکەدا هەڵسەنگاندن بۆ ئەوقۆناغە دەکەن ،دواتر دینە سەرباسی مانەوەیان بۆ چەند مانگێك بەسەرکەوتویی لەناوچەکەی خۆیاندا و بێ ئەوەی خۆیان ودۆست وهاوکارەکانیان تووشی هیچ زیانێك بەکەن،پەیداکردنی هاوکاری باش ، سەردانی کەسوکاری هەڤاڵەکان و چەند بابەتی تر...

لەکۆبوونەوەکەدا کاك ئاکۆسوور پێشنیاربۆ سەربەست دەکات کە بەرنامەی دابەزاندنی بۆ ناو شار بۆدابنێت و ناسنامەی بۆتەرتیب بکات، ئەوە کارێکی ئاسان نابێت، لەبەر دووهۆکار ، یەکەم چونکە ئەولێپرسراوە پێویستە برادەران سەرو ئاگاداربن ، دووەم کاك ئاکۆ دوو کێشەی دەبێ:

1 ـ هیچ بەڵگەیەکی عێراقی پێ نابێ..

2 ـ کاك ئاکۆ نەخۆشی (پەرکەم)ی هەبوو دوای هەواڵی شەهید بوونی براکانی تووشی هاتبوو...بەهەرحاڵ سەروو ڕەزامەند دەبن وخۆشی بڕیاری تەواودەدات..

دوای ئەوەی بابەتەکە یەکلادەکەنەوە،هەرچۆنێك بێت ناسنامەیەکی (ئامرالمجموعە) لەو دووکلیشەیەی کاك ڕەمزی دابووی پێیان، زۆربەباشی وەك و ئەسڵی تەرتیب دەکەن وقاتەشاڵە ڕەساسیەکەی خاڵە بەخەی لەبەر دەکەن و لەشاخ دابەزن و بۆشەو دەگەڕێنەوە کۆمەڵگای پیرەمەگروون و دەچنە ماڵی کاك ڕەزا کەپیشەی پەنچەرچی دەبێ، خۆی وخێزانەکەی زۆر ڕێزیان دەگرن، کاك ئاکۆ وردەوردە وەزعەکەی لا ئاسایی دەبێتەوە، بۆبەیانی زوو لەوکاتی دیاری کراو کاك ڕەزا لەخەوهەڵیان دەسێنێ و ئیتر لەگەڵ کاك ئاکۆبەرەو گەراج دەڕۆن ،تاریك وروون دەگەنە گەراجی بەغدا لەسلێمانی ، سەربەست پێشنیار بۆ ئاکۆسوور دەکات کە

سواری پاصی موصڵ ببن ،چونکە سەیتەرەکان بێ کێشەتر وهەم ماڵی باوکیشی لەنێوان موصڵ وهەولێرە ولەوێ دادەبەزن ئەوە باشترە..

سواری پاصی موصڵ دەبن تا دەگەنە تاسلوجە دونیا بەتەواوی ڕوناك دەبێتەوە لەپشتی شوفێرەکەوە سواردەبن، لەنزیك بازگەکە هەندێ قسە لەگەڵ کاك ئاکۆدەکات: کاکەگیان ئیستا تۆ(ئامرمەجموعە)یت هیچ خۆت تێك مەدەو لەبازگەکان زۆرئاسایی بەو ئەگەرئەمن واستخباراتەکان داوای هەویەیانکردیان بەدەوری پاص ونەفەرەکان سوڕانەوە تۆش سەیری ناوچاویان بکە و هەرئەم شتانە جێبەجێبکەومن دڵنیام ئەمڕۆبەکەس وکارت شاد دەبیتەوە، ئیتر دەگەنە یەکەم بازگەو ئینزیباتێك دەچێتە پێشیان دەبینێ سەیارەکە خەتی موصڵە چونکە هەمو پاصێك پارچەبەك نوسراوی بەناوی هێڵەکەیەوە لەبەردەم جامی سایەق دەبێ، دەرگا دەکاتەوەو سەلام دەکات،دەپرسێ هەموتان بۆموصڵ دەچن..؟

سایەقەکە دێتە جواب : بەڵێ .. داوای ناسنامە لەدوکەس لەنەفەرەکانی دواوە دەکات و بەعەرەبی دەڵێ (برۆن) لە تاسلوجە شۆڕدەبنە کاك ئاکو بەسوعبەتەوە ئەڵێ : هاکوڕی باش هەرئەمەش بوو والێی دەترساین ... لەهەردوسەیتەرەکەی چەمچەماڵ ودەروازەی کەرکوکیش ئاسایی ئەوپرسیارە تقلیدیانە دەکەنەوە: هەمونەفەری موصڵن....؟ تێدەپەڕن دەگەنە ڕەحیماوا،لەچێشتخانەیەك بەرامبەر (حاجی متعب)بۆئیسراحەت و نان خواردن و نویزکردن لادەدات، بەڵام بۆئەوان مایەی نیگەرانی زۆر دەبێت،چونکە بۆ سەربەست هەم گەڕەکی پێشوی خۆیان بوو، بۆ کاك ئاکۆش کەخەڵکی دەوروبەری کەرکوك بووخەڵکی زۆر دەیانناسی بەناچاری ئەوان دانەبەزن وخۆمیان خەریك دەکەن و سەردەنێن بە کورسیەکانەوە و جاربەجاریکیش سەر هەڵدەبڕن وتەماشای ئەو دەوروبەرە دەکەن،زۆر خەڵك دەناسنەوە، لەوکاتەدا پیاوێکی بەتەمەن دەچێتە ناو پاصەکەو ئەڵێ:

ئێوە بۆدانابەزن بۆنان خواردن ئەگەرمشکلەی پارەتان هەیەفەرمو میوانی من بن..؟ یان شتێکتان بۆدێنم..! کابرا نەفەری پاصەکە دەبێ، شتێك لە ناوجانتاکەی دەردەهێنێ، ئەم پشودانە زیاتر لەنیوسەعات دەخایەنێت،نەفەرەکان سواردەبنەوەو لەرەحیماوا دەردەچن ، لەبازگەکانیش بێ ئەوەی داوای ناسنامەیان لێ بکرێت لەهەولێریش تێدەپەڕن،کاتێك دەگەنەراست ئەو ڕێگایەی کەلای دەدا بۆکەورگۆسك بەسایەقەکە ئەڵێن: زەحمەت نەبێت ئێمەلەڕاست ڕێگای(کەوەرگۆسك) دادەبەزین، هەرلەوێ سەیارەکانی مجمع وەك گەراج نەفەر سواردەکەن، بۆ ناومجمع واتە تاکسی دەوەستێ تاکو نەفەرەکان سواردەبن، کاك ئاکۆ زۆرسەرسام دەبێ بە چەندوشەی جوان وبەنرخ ستایشی سەربەست دەکات، دوای چارەکە سەعاتێك دەگەنە ناو کۆمەڵگاکەو پێش ئەوەی بگەن دەپرسێ:تاکیدی ماڵمان دەدۆزیتەوە،ئەویش ئەڵێ: خەمت نەبێت ئەوکۆمەڵگەیە زیاتر خەڵکی هەرکی وسورچی و زرارەتی لێ یە نەمن ناناسن،ماڵی باوکی نەیاندەزانی ئەوشەوە دچێتەوە، ماڵیان لە گەراجەکەوە سێ وچواردقیقەیەك دوردەبێ،سەربەست لەپێشەوە دەچێتە بەردەرگاکە، بە کاك ئاکۆ ئەڵێ: جارێ خۆت مەکە بە ژووردا بامن هەستێکی ژوورەوە ڕاگرم ،دڵنیابم لەوەی میوان و خەڵکی ترلەماڵتان نین، کاتێك تەماشا دەکا بت دەبینێت مام ئەحمەد لەبەرهەیوانەکە دانیشتووە. لەدورەوە ئەڵێ : یاالله مام ئەحمەد سەلام علیکم و بەرەو ڕوی دەچێت و دەپرسێ: کەسی غەریب لەماڵتان نیە..؟

ئەویش دوای وڵامی سلاوەکە: نا والله فەرموو بابچینە ژوورەوە ..

ئەیش ئەڵێ من میوانێکی ترم لەگەڵدایە بابیهێنمە ژوورەوە،وئیتر خۆی وژن و منداڵەکان دەکەونە چرپە جرپ و مقۆمقۆوسەرەتاتکێ، تابچنە دەرەوە ،

بەپەلە کاك ئاکۆ دەباتە ژوورەوە ،مام ئەحمەد هاوار دەکات:ئۆخەی ئەوە ڕەمەزانە دەکەوێتە بانگە بانگ وهەراوهوریا ژن ومنداڵ هەموو بەڕاکردن بەرەو پیری کاك

ئاکۆ دەچن، یەکێك ماچی دەکات، یەکێك دەستی دەگرێ، یەکێك بۆنی دەکات، دایکی باوەشی پێدا دەکات.. هەرلەوێ کاك ئاکۆ دانیشنت وهەمویان بەدەوریەوە بەجلی رەشەوە کۆدەبنەوە، دەنگە دەنگ دروست دەکەن، کاك ئاکۆوباوکی ئارامیان دەکەنەوەو دەیانبەنە ژوورەوە،بۆنیوەڕۆ نان ئامادەدەکەن،ئەو رۆژە تا ئێوارە سەرجەم ئەو خێزانە رەش پۆشە زۆر دڵ خۆش دەبن ،بۆبەیانی دەنێرن بەدوای کەس وکارە نزیك وباوەڕپێکراوەکانیان کاك ئاکۆ دەست دەکا بەکاری رێکخستن و هەرلەوماوەیەدا خزمێکی نزیکی لە قەڵەم فوجێکی سەربازی بوو چەندین پسولەی مۆڵەتی سەربازی بۆدابین دەکات دوای دوو رۆژ سەربەست دەگەڕێتەوە،دوای دڵنیابوون لە سەلامەتی کاك ئاکۆسوور و پاراستنی لەلایەن کە سوکاریەوە..

ئەوماوەیە کاك ئاکۆسوور لەماڵی خۆیان دەبێ،ژمارەیەکی زۆرلەرێکخستنەکان بەتایبەت ئەوانەی جێگای متمانەو نزیکی خۆی دەبن دەبینێ، هێڵێکی تایبەت دروست دەکات کە بۆئەو سەردەمەزۆرپێویست وگرنگ دەبێ..

دوای حەفتەیەك دەچێتەوە بەدوایداو بەسەلامەتی دەگەنەوە پیرەمەگرون و دەچنەوەماڵی خاڵە رسولْ کرژەیی و دواتربنکەکەی خۆیان لە شاخی پیرەمەگروون.

## بەرپابوونی جەنگی عێراق ـ کوێت

دوای ئەوەی حکومەتی بەعس گرتنی وڵاتی کوێت رادەگەیانێ، کوێت بە بەشێك لە عێراق و بە نۆزدەیەم پارێزگای عێراق ناوزەد دەکات، ئیتر دۆخێکی زۆر دژوار باڵ بەسەر عێراقدا دەکێشێ،دواترکۆدەنگی جیهانی بەدوای خۆیدا دێنێ وئیتر رژێم دەکەوێتە قەیرانەوەوباروودۆخەکە وای لێ دێت رژێم ئاگای لەکوردستان نامینێ و چەکدارەکوردەکانیش گۆڕانیان بەسەردا دێ وسەربازە کوردەکانیش دەست بە هەڵاتن دەکەن.. هەرمەترسیەك هەبووایە شەوانە وەك وپێشمەرگە پۆل پۆل شاریان بەجێدەهێشت و روویان دەکردەهەردەودۆڵەکان ولەمانەوەشیاندا کەسوکاریان

دەچوون بۆلایان وخۆراکیان بۆدەبردن، ئالێرەوە هەست بە شپرزەیی ڕژێم دەکراو تەوقی ترس پچڕاوچەکدارەکوردەکانیش هەڵوێستیان گۆڕا، تەنیا دەزگا ئەمنیەکان لە بازنەیەکی دیاریکراودا بوونیان مابوو، زیاترکۆمەڵگاکان وابوون، ڕۆژ دوای ڕۆژ دەسەلاتی ڕژێم بەرەو لاوازی دەچوو، لەوکاتەدا (ئیزگەی دەنگی گەلی کوردستان ) تاکە سەرچاوەی گەیاندنی هەواڵ وزانیاری وگۆڕانکاریەکان بوو ڕۆڵێکی زۆرگرنگ وبەرچاوی هەبوو بۆزەمینە سازی کردن وئامادە..ازی ڕاپەڕین، وهەبوونی پێشمەرگەپارتیزانەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستانیش لە بنکەو حەشارگاکان لەناوچەکانی نزیک کەرکوک وگەرمیان گوڕوتین وئومێدو ورە بەخش دەبیبن بۆ هاولاتیان وڕێکخستنەکان و سەربازە هەلاتوەکان، هەروەها ئەو پێشمەرگانەی لەکارەساتی ئەنفال دابڕابوون.هەرلەو سەروبەندەدا خەڵکانێکی زۆر پەیوەندی دەکەن زۆربەی سەرۆک جاش و موستەشارەکان نامە دەنووسن و ئامادەیی خۆیان دەردەبڕن بۆ پشتیوانی شۆڕش. ئەو دۆخە وا دەکات ئیترهاتن بۆناوشاروگەڕانەوە تاڕادەیەك ئاسایی دەبێتەوە، زۆرجارخەڵکی لەسەرکۆلان وپەناوپەسێرەکان چاویان بەپارتیزانەکان دەکەوت هاوکێشەکە وا گۆڕابوو زۆرێك لە پیاوانی ڕژێم مەمنون دەبوون تەنها کاریان پێ بسپێردرێت و پێشمەرگە بزۆربەیبینن ..

## سەفەرێك بۆ ناوزەنگ بۆلای کاك نەوشیروان

سەربەست لەرێی کاك سەباحی برایەوە مامۆستا (عادل شریف) پێشمەرگەو فەرماندەی دێرینی کەرکوکی دەناسێ،بەهەندێ هۆکاری تایبەت و بەئاگاداری سەرکردایەتی پەیوەندی دەبێ بە( فرقەی 24 )ی چوارقوڕنەوە، بەپێی زانیاری کاك سەباح لەهەفتەیەکدا بەموافەقەتی استخباراتی عێراق دوجار دەچێ بۆسەرسنور بۆگوندی سونێ، کەنزیك بوو لە بارەگاکانی پێشمەرگەوە..

لەسەردانێکدا بۆلای مامۆستا عادیل دوای هەندێ قسەکردن بۆی دەرکەوێت کە مامۆستا عادیل پەیوەندی هەیەو لەسەربیروباوەڕی کوردانەی خۆی ماوەوخاوەن شەهیدیشە،دوای چەندجار دیدارو مناقشە متمانەی پێ دەکات و پێی ئەڵێ:

من پێشمەرگەم و لەگەڵ پارتیزانەکانم و دەمەوێت بچم بۆلای کاک نەوشیروان بۆسودوەرگرتن لەو هەلومەرجە سیاسیەی جەنگی(عێراق ـ کوێت)...

زۆرجوامێرانە خۆشحاڵی دەبڕیت و ئامادەیی خۆی نیشان دەدات،ڕۆژێك لەرێی کاك صبحی برایەوە ئاگاداردکرێتەوە کە مامۆستا عادیل دەیەوێت ببینێت، ئەویش سەردانی دەکات ، پێی ئەڵێ:خۆت ئامادە بکە بەیانی زوودەردەچین.. بەیانی پێکەوە سوارسەیارە(شلەخەجیێ)کە دەبن کە لاندگرۆزەرێکی پاش بەتاڵ دەبێ، کەدەگەنە بازگەی دەربەند استخباراتەکان مامۆستا عادیل دەناسنەوە، ڕێگایان پێ دەدەن.بەناوسەنگەسەر وژاراوە و بەتەنیشت قەڵادزێ دا تیدەپەڕن.. لەدوا مۆڵگەی هێزەکانی رژیم دەربازی دەکات ولە سەر ڕێگای(ناوزەنگ)دایدەنێ، هەر لەوێ بۆ چاوەڕوانی گەڕانەوەی دەمینێتەوە، تاکو بیباتەوە بۆشاری ڕانیە، دوای مەسافەیەك ڕۆیشتن دەگاتە خاڵی پشکنینی برادەرانی پێشمەرگە و بەبەرپرسەکەیان ئەڵێ: من لەخوارەوە هاتووم و دەچم بۆلای کاك نەوشیروان..

ئەوانیش کارئاسانی و ڕێنوێنی دەکەن وبەناو بەفرێکی زۆردا پاش چەند سەعات دەگاتە بەردەم بارەگا تایبەتەکەی کاك نەوشیروان وخۆی دەناسێنێ، پێشمەرگەیەك بە ناوی کاك سەیوان ئەڵێ: کاك نەوشیروان لەدەرچونە بۆگوندی قاسمەڕەش و لەگەڵ ئێرانیەکان مەوعیدی هەیە،بەڵام کاتێك دەدات بەتۆ فەرموو بچۆ ژوورەوە پاش بەخێرهێنان وپرسینی دەنگ وباسی برادەران وناوچەکە بەگشتی وپرسیاری گوزەرانمان وهەڵوێستی سەرۆك جاشەکان ...

بە شێوەیەکی زارەکی بەرچاوڕونی ووەڵامی پرسیارەکانی دەداتەوەوستایشی ڕۆڵێ جوامێرانەی دەکات،دوای چەند پێشنیارو گفتوگۆ سەیوان بانگ دەکات و پێی ئەڵێ: کاك چەتۆهەندێ داواکاری وپێشنیارێ هەیەو من زۆرم پێ باشەو پێکەوە تنسیق بکەن ودواتر بەرنامەڕێژی و وردەکاریەکان باس بکەن وبەزوترین کات دەست بەکاربن... وە لێی دەپرسێت لەگەڵ کێ وچۆن گەیشتیتە سەرسنور لەوەڵامدا ئەڵێ: برادەرێکی خۆمان بەناوی مامۆستا عادیل شەریف جەنابت دەیناسیت ومن متمانەم پێی هەبوو ئەو هێنامی وسلاویشی هەبوو ئێستا لە دەوروبەری گوندی سونێ یەو چاوەڕوانمە...ئیترخواحافیزیی دەکات ودواترلەگەڵ کاك سەیوان دەچنە قولە هەرمێ و هەمووداواکارییەکانی لەماوەیەکی کەمدا بۆجێبەجێ دەکات و دەیباتە لای کاك سەرکەوتە ڕەشی عددجیهاز و لەوێوە پەیوەندی بەپارتیزانەکانەوە دەکەن، لەکاتی پەیوەندییەکەدا کاك سەرکەوت ئەڵێ: ئێستا برادەرێکی خۆتان لێرەیە ڕەنگە بروانەکەن وپێیان ئەڵێ:بزانم دەیدۆزنەوە ئەوەی قسەی لەگەڵ دەکات کاك فخرالدین دەبێ،ئەڵێ هەبێ ونەبێ(سەربەست)ی خۆمانە لاقیتەکە دەداتەدەستی و قسە لەگەڵ هاوڕێکانی دەکات .دوای وەرگرتنی داخوازیە سووکەکان لە پێداویستی چاپ و ڕاگەیاندن و بەرنامەڕێژی بۆ گەیاندنی ئازووقەو پێداویستییەکانی تر لەرێگای کاك صباح و مامۆستا عادیلەوە .. دەیگەیەننەوە .... بەهەمان ڕێگاو شوێن بێ هیچ کێشەیەك دەگەنەوە ڕانیە..

## گواستنەوەی ئازوقەو خواردەمەنی

## لەناوزەنگەوە بۆ ڕانیەو پیرەمەگرون وتەکیە

ئیتر لەوکاتەدا رژێم بەهۆی ئابلووقەکەوە رێگا بەخەڵك دەدات بەئازادی بچنە سنوورو ئازووقە دابین بکەن.کاك سەباح و کاك عادیلیش ئەوە بەهەل دەزانن و بەپێی ئەوبەرنامەیەی برادەرانی لای کاك نەوشیروان دایان نابوو زۆرسەرکەوتوانە

دەست بەدەست وبەچەندقۆناغێك بێ ئەوەی كەس بزانێت كەئەو ئازوقەو خواردەمەنیانە هی شۆڕشن وەجبەی یەكەم دەگەیەننە ڕانیەو لەرێی چەند باوەڕپێكراوی مامۆستا عادیلەوە دەیگوازنەوە بۆ كۆمەڵگای پیرەمەگرون و چەمچەماڵ و تەكیەی كاكەمەند..دواكاروان باری لاندكرۆزەرێك ئازووقە بەسەیارەی كەسێك ناوی كاك زرار دەبەنەماڵێ كاك رەسوول كرژەیی لە پیرەمەگروون، مامۆستا عادیلیان پێ دەناسانێ ئەڵێ: ئەم پیاوە خاوەن شەهیدەو لە ناوشۆڕش فەرماندەی كەرت بوو..ئەم ناسینەوەو دۆزینەوەی مامۆستا عادیل لەوسەردەمە دژوارەدا لەناوچەیەكی وەك ڕانیە مایەی ئەوپەڕی هێزو خۆشحاڵی دەبێ چونكە جگە لەخۆی لەشاری ڕانیەو دەوروبەری ولەچەمچەماڵ وتەكیەش چەندین كەسی باشییان پێ دەناسێنێ لەوانە لەتەكیە پیاوێكی زۆرئازاو دڵسۆز بەناوی مامۆستا جەلال و زۆرێك لەكەس وكارە نزیكەكانی دەست بەكاردەبن بۆ كاركردن وبەشێكی زۆری ئەو ئازوقەبەلای خۆیان جێ دەكەنەوە و لەشاری چەمچەماڵیش هەرلەڕێگای مامۆستا عادیلەوە كاك مەردان برای حاجی كاكەولای چنارتووی كەڵەشێرە كە بنەماڵەیەكی گەورەی ئاغجەلەرن كاك مەردان باوكی لەیلا خێزانی مامۆستا عادیل وماڵەكەیان لەگەڕەكی حی العسكری نزیك قەبرسانەكەی چەمچەماڵ بوو.

ئەو پیاوە بەڕێزەش خۆیی وكوڕەكانی زۆركاری باش دەكەن هەرلەڕێگای مامۆستا عادیلەوە ئەویش بەهۆی كاك مەردانەوە (عمراسعد) یش پەیوەندی دەكات...

گەیاندنی ئازوقەو پێداویستیەكان دەكەونە سەرسكەی خۆیان و ناهێڵن ڕژێم هەستی پێ بكات ،دابینك كردنی خواردەمەنی وئازوقە بۆئەو سەردەمە زۆر سودبەخشبوو،بەگەیشتنی ئەو شتانەئەرك وقورسایی سەرماڵەكان وڕێكخراوی سلێمانی كە زۆرقورس بوو نەما...

---

* عەمید چەتۆ لەپارتیزانیدا بە(سەربەست) ناسرابوو.



# پارتیزانی
# لەبیرەوەری پارتیزان
# حەسەن عەبدولرەحمان (حەسەن شورتە)*

هەڤاڵ حەسەن عبدالرحمن ناسراوبە(حەسەن شورتە) دوابەدوای پێشەکییەکی کورت دەستی بەگێڕانەوەی بیرەوەرییەکانی خۆی کردوە: لەدەسپێکی ئەنفالی چواردا لەگەڵ پێشمەرگەکانی کەرتی 1ی ساڵەیی دوای بەرگرییەکی قارەمانانەو رزگارکردنی سەدان خێزان بۆ ئەوبەری زێی بچووك شەوی 5/4 ـ 5 ـ 1988 لەجادەی کۆیە هەولێر پەڕینەوە بەرو گوندی(کانی بی) لە نزیك چیای باواجی ، لەوێوە بۆ سماقولی بۆ 10ی مایس گیشتینە (شیرێ)بارەگای (کەرتی 1ی ساڵەیی) مان بردە گوندی(هەرمکان)پاشان لەسەر شاخی (پانی سەر) و (قەڵاتە جوو) ئەرکی بەرگریکردنمان وەرگرت،دوای مانگێك چووینە گوندی گەرەوان و لەشاخی (چاکی) واجبمان پێ سپێردرا..تامانگی حەوت لەوێ بووین،دواترگەڕاینەوە (مەلەکان)دوای رێکخستەوەی هێزەکە کاك،کوێخا سیروان) وەك فەرماندەی تیپی 21 کەرکوك و (وەستا صابیر)وەك فەرماندەی کەرتی 1ی ساڵەیی لێپرسراومان بوون، ژمارەمان 60پێشمەرگەدەبوو،کاك وەستا صابیر کۆبوونەوەیەکی پێکردین، لەکۆبوونەوەکەدا پێی ڕاگەیاندین کەسەرکردایەتی بڕیاری داوە نزیکەی 40 پ.م بەچوار دەستەی جیا جیا بگەڕێینەوە بۆسنووری تیپەکانی 21 ی کەرکوك و25ی خاڵخاڵان.

## دەستەکەی یەکەم :

. دە کەس بووین کاك سیروان گۆگجەیی کرا بەلێپرسراومان، کەبریتی بووین لە : (سیروان گوگجەیی،علی ناپروجەیی،مام رەئووف کاولەسواری،یونس احمدگەردی (برای ئاکۆسوور)،لەتیف ناصیح بیبانی،خدرمام امین بیرەسپانی،جوامیر حمەصالح (برای وەستاصابیر) ، رفعتەسوور بیبانی ، رەزا نارووجەیی، کاکەمەند حمەصالح (خاڵەبەخە)،(حەسەن شورتە)

## دەستەی دووەم :

کاك (علی چیمەنی) سەرپەرشتی دەکردن بریتی بوون لە 10 پێشمەرگە دوای گەیشتنەوەیان بەسنووری خۆیان زۆربەیان تەسلیم بوونەوە.

لەگەل هەردوودەستەکەی کەکاك ئاکۆ و کاك هیوارەش سەرپەرشتی دەکردن ..

رۆژی 1988/8/1لە(مەلەکان)ەوەبەرێکەوتین بەروسێگردکان وشوان وشێخ بزێنی.

رۆژی 1988/8/8 گەیشتینە چەمەکانی سێگردکان ، بەنیازبووین بپەرینەوە بەری کەرکوك، لە پرێکدا بووبەتەقە، گرداری57ملم دەچوو بەئاسماندا، بەهۆی رادیۆوە زانیمان کەشەری (عیراق ـ ئیران) راوەستاوە.

ئەوهەواڵە بۆ ئێمە زۆرناخۆش بوو،پاش چەندرۆژێك مام رۆستەم وکوێخا سیروان و رەنجەی شێخ عمر و چەند پێشمەرگەیەك گەیشتنە سنوورەکە.، لیژنەمان پێکهێنا بۆ کۆکردنەوەی ئازووقە جێماوەکانی دوای ئەنفال، تەنیاماڵ کەتا ئەوکاتەمابۆوە هاوولاتییەکی گوندی (دەرماناو)بوو بەناوی(شفیقەدرێژ).دوای ئەوەی ئەویش زانی مانەوەی بەوحاڵەمەحاڵە،بڕیاریدا ئازوقەکەیمان پێبفرۆشیت،بەبری(200)دیناری سویسری لێماز کری، ئەویش بەماڵەوە چوو بۆ ئۆردوگاکانی دەوروبەری هەولێر، پێش گەرانەوەی ئێمە ئەم هەڤالانە هەرلەوناچانە مابوونەوە (عمر ناصر و عوسمان جمیل وکاکە مەند وکاکە ئەحە ومام فاروق و چەند پێشمەرگەیەکی تر، لەحاوی (تولکی)حەشارگەیان دروستکردبوو، دایکی کاکە ئەحە لەهەولێرەوە هاتبوو، رامانسپاردکە هاوسەرکەم بهێنێ، پاش چەند رۆژێك گەیشتە لامان لەچەمەکانی

(پەڵکانە)وەستاصابیر چەند ئەرکێکی پێ سپاردین، وەك خواردن ئامادەکردن و شاردنەوەی چەکە زیادەکان وپەڕاندنەوەی پارتیزانەکانی گەرمیان..

دوای چۆڵکردنی سنووری مەڵبەندی 3ی هەولێر و کشانەوەیان بۆ بناری قەندیل ئەوپێشمەرگانی کەرکوك کەلەوێ بوون بەهاوکاری دۆستەکانمان لە رێی بتوێنەوە بەدەشتی کۆیەدا گیشتنەوەلامان،بە زۆربوونی هێزەکەو نزیکبوونەوەی پایز ژیان و مانەوە لای ئێمە ئاستەنگتر دەبوو،سەرەتای مانگی ئەیلول رژێم لێبووردنی گشتی راگەیاند، خۆم وهاوسەرم چووین بۆ(حاوی تولکی) لەوێ(گوڵە)ی هاوسەری کاك (عمرمغریب)و(پەرژین)ی هاوسەری کاك(ابونور)یش هاتبوونەوە.وەك پیاوان خۆیان بەپارتیزان دەزانی. رۆژانە خەڵك لەشارەکانەوە دەهاتن،هاتووچۆ نائاسایی بوو، هەربویە رۆژی دواترخۆم وهاوسەرەکەم گەڕاینەوەبۆشوێنی پێشوومان لەپەڵکانە.*

## هێرشێکی تری رژێم بۆ چەمەکانی تولکی

سەرلەبەیانی 1988/9/13 هیزێکی زۆری رژیم دەگەنە سەر(چەم قەلا) کە زاڵ دەبێ بەسەر هەموو ئەوچەمانەدا بارەگاو حەشارگەی پارتیزانەکانی لێ بوو،لە پڕێکدا چەند قوات جاصەپێشڕەوی دەکەن، هێرشەکە دەکەوێتە بەرهەڵمەتی پارتیزانەکان، ئەفسەرێك وچەند سەربازێك دەکوژرێن،ئەورۆژە تائێوارە شەڕێکی قورس درێژە دەکێشێ ،دوژمن دیل وکوژراوی دەبێ،ئەم چوار قارەمانەیش شەهیددەبن:

1 . پەرژین کانەبی احمد هاوسەری هەڤاڵ (ابونور)

2. رحمان صالح کریم (خاڵخۆزای شەهیدمەلائاراس)

3 . مشعان حسین سلیمان شیخ زەرد (بۆڵی)

4 . نەجات عبداللە حسن (نەجات کۆچەکی)

دوایی تاریك داهاتن تەرمی شەهیدەکان حەشاردەدەن و، خۆیان و 12 برینداریش لەنێو ئابلوقەی گەمارۆی دوژمن دەچنە دەرەوە، یاریدەدەری پزیشکی(د.تاهیر)یان لەگەڵ دەبێ، بەگیشتنی بریندارەکان بە گوندی دەرماناو دەستوبرد یەك یەك تیماریان دەکات، رۆژی دووەم هێزێکی زۆری تری رژێم دەچنەوە حاوی تولکی هەمووچەم ودۆڕگەکان دەپشکنن،تەرمی کوژراوەکانی خۆیان دەبەنەوە، پارتیزانە

شەهیدەکانیان نەدۆزیبۆوە،دوژمن بەسەرشۆڕی کشابۆوە،سێیەم ڕۆژ پێشمەرگەکان دەچنەوەشوێن شەڕەکە،تەرمی پیرۆزی هەرسێ شەهیدەکە دەبەنەوە گۆڕستانی گوندی (پەڵکانە)بەجلك وبەرگی خۆیانەوە دەیان نێژن.

ڕۆژی 1988/9/16 مام ڕۆستەم و کوێخاسیروان کۆبوونەوەیەکیان پێ دەکەن، پێیان ئەڵێن: لەبەر ئەوەی ئێمە ژمارەمان بۆ خەباتی پارتیزانی وپانتایی جوگرافی سنوورەکە گونجاو نییە،پێویستە چارێك لە حاڵی خۆمان بکەین، سەرپشکیان دەکەن بەم شێوەی خوارەوە:

- کێ دەتوانی خۆی بگەیەنێتەوە بارەگاکانمان لەسەر سنووری ئێران با بفەرموێ..
- کێ دەیەوێ سوود لەو لێبووردنەگشتی یە وەربگرێ، بەمەرجێك خیانەت لەڕێبازی شەهیدان نەکات دەتوانێ بچێتەوە بۆ شار و لە داهاتووش دا هاوکاریمان بکات..
- کێش ڕێگای مان ونەمان وڕۆژەسەختەکانی پایزوزستانی داهاتوو وهەڵبژێرێ دەتوانی بمێنێتەوە..
- مام ڕۆستەم لەگەڵ سامالٚ مەلارحیم(سامالٚەشێت) دەروا بۆ سنووری گەرمیان.

پاشان ئەوانەی بڕیاری مانەوە دەدەن، دەبن بە سێ دەستە:

**دەستەی یەکەم بۆسنووری شێخ بزێنی:**

1 . ڕەمەزان احمد گەردی (ئاکۆسوور) 2 . ڕەنجە بیرەسپانی 3 . یونس احمد گەردی 4 . تالیب مام فاروق 5 . علی محمد ناروجەیی 6 . کاکەمەندحمەصالح (خاڵەبەخە) 7 . نەهرۆ ڕەش 8 . نقیب ناصیح بیبانی 9 . فاتیح عبدالله(کاروان دووبزی) 10 . رحمان عەنتەر سەربیری 11 . حسن عبدالرحمن(حسن شورتە)

**دەستەی دووەم بۆسنووری شوان:**

1 . محمد سەقەر(سەردەستە) 2 . پۆلا هەیبەیی 3 . پشکۆ هەیبەیی 4 . مودیر چیمەنی 5 . وریا قەفاری 6 . ئارام چیمەنی 7 . خلیل مام ڕشی 8 . ڕزگار چیمەنی 9 . خلیل تۆماری 10 . مامەقالەچیمەنی 11 . ابراهیم فازل حمەرحیم(ئیباو)

**دەستەی سێیەم بۆ بناری خاڵخاڵان:**

1 . سیروان کوێخا نجیم 2 . سەربەستە درێژ 3. خلیل بێدەری 4 . عادل شریف 5 . وریا ئاغجەلەری 6 . مستەفا چالاوی 7 . ابراهیم احمد(سەرکەوت) 8 . هیوا ڕەش

9 . سیروان گۆگجەیی 10 . جمال رباع 11 . عوسمان رحمان مەرزیخەیی(کوردۆ)
12 . خیرولا (جوتیار) 13 . نیزام حاجی محمد قادرعلی 14شەمال شۆرشگێران .
. خێزانی حسن شورتە و کاك عمر مەغریب دەنێرنەوە بۆ هەولێر، نەخۆشی مەلاریا لەنێوان پارتیزانەکاندا بلاودەبێتەوە، باری تەندروستییان نائاسایی دەبێ ناوە ناوە دەنگۆی خیانەت وتەسلیم بوونەوە تووشی دلەراوکێیان دەکات، پەیوەندییان بە رێکخستنەکانی ناوشارەوە دەپچڕێ،رۆژێك لەحاوی پەلکانەو دەرماناو دەبن لەپڕ دووگەنج دەگەنەلایا ن کە ئەوانیش :
1 . فارس قادرئیلنجاغی(سوارە)
2 . مەردان قولیبەگی دەبن. سوارە پێشتر پێشمەرگەبوو، لە لێبووردنەکە تەسلیم بووبۆوە، کاروان ئەلێ: با لێکولینەوەیان لەگەل بکەین ، ئەگەر دەرکەوت رژێم بۆسیخوڕی ناردوونی دەیانکوژین،ئەلێن: راستیمان پێبلێن ئیوە بۆ چی هاتوون..؟
- سوارەئیلنجاغی ئەلێ: بەلێ راستی لەسەرداوای کەسوکاریان هاتووین بەدوای ئیباوخلیل تۆماری دا تا سود لەم عەفووە وەربگرن وبگرێنەوە، ئەلێن: ئەوان مانگێ دەبێ لە ئێمەدابڕاون.لەکاتی گفتوگۆدا(سوارە)چەکەکەی خۆی بەدەست پێشمەرگەیەکەوە دەبینی.دەست دەکات.. وەك گریانی باوك مردوو..
هاوڕێکانی دلی دەدەنەوەئیترئەلێ:من ناڕۆمەوە،وەرمبگرنەوەدەبمەوەبەپێشمەرگە، کاك ئاکۆسوور کاکەسوارە جیا دەکاتەوە لەجیاتی مانەوە داوای لێ دەکات کە بچێتەوە شار و ناوە ناوە دەرزی و دەرمان و خواردنیان بۆ داین بکات،بەوشێوەیە رازی دەکەن، پێداویستییە کانیان بۆ بێنێت بۆ چەمی (جگیلە)

---

* سەرچاوە : دستنووسێکی هەڤال حەسەن شورتە



## بێستون سابووراوایی

# پارتیزانی دوای ئەنفال

1- ناو: بێستون عەبدولڕەحمان کاکە حمە

2 - لەدایکبووی سنوری قەزای دوکان.گوندی گەڵنێری، بناری چیای کۆسرەت.

3 - خوێندن: ماستەری ئابووری.

4 - نوسین: نوسەر لەبوواری(کاروباری فکری وڕێکخراوەیی، ئابووری ودارایی و پلاندانان، ڕۆژنامەوانی) یەکەم سەرنوسەری گۆڤاری ڕێبەری پێشمەرگە، یەکەم سەرنوسەری رۆژنامەی دێرین، ئەندامی دەستەی نوسەرانی ڕێبازی نوێ.

5 - زمان زانین: کوردی،عەرەبی، فارسی، ئینگلیزی

6 - پەیوەندی ڕێکخراوەیی: 1975 کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان

7 - پەیوەندی پێشمەرگایەتی:1980 دوای ئەنفال وپارتیزان بووە..

لەڕاپەڕیندا سەرپەرشتیاری ڕاپەڕاندنی دوکان و پیرەمەگرون بووە.

8 - هەموو پلەکانی ڕێکخستنی بڕیوە لە ئەندامەوە تاکو لێپرسراوی مەڵبەند، لەوێشەوە بۆ ئەنجومەنی ناوەند (خولی یەکەم). 2009

9 - ساڵی 2002 یاریدەدەری سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران بووە تاکو 2005

10- لەدەیان داستانی بەرگری پێشمەرگانەدا بەشدار وچوارجار بریندار بووە.

11- خەڵاتی بەڕێزمام جەلال وەرگرتووە بەبۆنەی دەرچوون بەیەکەم لەخولی سێی پەیمانگای کادرانی هەولێر تەموزی 1993.

12- مەدالیای پارتیزانی لەلایەن بەڕێز مام جەلالەوە لە 1994پێدراوە.

13- خەڵاتی سەرۆکی حکومەتی هەرێم بەبۆنەی دەرچونی بەیەکەم لەبەشی ئابووری کۆلێژی کارگێری و ئابووری لە 2005 وەرگرتووە.

14- مەدالیای سەروەری پێشمەرگەی دێرینی دانەبڕاولەلایەن کۆمەڵەی پێشمەرگە دێرینەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە 2010 پێدراوە.

15ـ دەیان خەلاتی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی وئۆرگانە جیاوازەکان و دامودەزگاکانی ڕاگەیاندن وەرگرتووەلەپای پێشکەشکردنی وانەوچاوپێکەوتن و سیمیناری جۆاوجۆر

16 ـ لەکۆنگرەی چوار بووە بەئەندامی ئەنجومەنی گشتی سەرکردایەتی..

17ـ دانیشتووی:بەکرەجۆ یە لەسنوری سلێمانی.

## پارتیزانەکانی کەرکوك

## لە یاداشتنامەکەی بێستوون سابووراوایی دا

<u>**هاتنە خوارەوەی مەفرەزەکەی شەهید ئاکۆ سوور**</u>

سەرەتای مانگی حوزەیرانی ـ1990

کاك نەوشیروان مستەفا کەئەوکات سکرتێری کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بوو، بانگی کردم بۆ بارەگای ناوەندی کۆمەڵە، ئەوکات بارەگا کانی سەرکردایەتی یەکێتی لەقاسمەڕەش و زەڵێ و تووژەڵە و ناوزەنگ بوون، لەسنوری قەزای پشدەر بانگردنەکەی کاك نەوشیروان بەمەبەستی ئەوەبووکە مەفرەزەیەکی پارتیزانی بگەیەنینە دەستی شەهید غەریب هەڵەدنی کە ئەوکات فەرماندەی ڕەتڵی سورداشی پارتیزانەکانی کوردستان بوو. مەفرەزەکەش شەهید ئاکۆ سوور و هاوڕێکانی بوون:

1ـ شەهید ڕەمەزان ئەحمەد حمەعلی (ئاکۆ سور) فەرماندەی مەفرەزەکە.

2 ـ فەخرەدین محمود محمد (فەخرەدین سمایل بەگی).

3 ـ نقیب ناصح احمد بیبانی

4 ـ شەهید ئاوات رشید محمد (ئاواتەڕەش).

5 ـ شەهید وریا عمر عبدالله.

6 ـ شەهید ابراهیم فازل (ئیباو)

7 ـ پۆلامحمد صدیق.

8 ـ شەهید بەختیار محمد (خاڵە بەخە).

## ئامادەکاری بۆ هاتنە خوارەوە:

1- دوای ئەوەی کاك ئاکۆ و هەڤاڵەکانیانمان بینی ،ڕێکەوتین کەچۆن بەچەك و کەلوپەلەوە بکەوینە ڕێ بەرەوئاشکان..بۆئەومەبەستە بیرم لەوەکردەوە پێشمەرگەی دڵسۆزو باش هەڵبژێرم کە هاوکاریم بکەن بۆ گەیاندنی مەفرەزەکە هەروەها مەلەوان و کەسی شارەزا لەناو پەیدا بکەین بۆ ئەوەی لەزێی (هەرزنێ) دەربازمان بکەن بۆ سنوری ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی چیای ئاسۆس و مەرگە. بۆ ئەو مەبەستە کاك حەیدەر سەعید (حەیدەر حاجیتانی) کەئیستا بەڕیوەبەری ئاسایشە لەسنوری ڕاپەڕین و کاك انوەر تەلانی کەناسراوە (بەبیستون تەلانی) کە ئێستا کادری پێشکەوتووی یەکێتی یە لەسنوری قەزای دوکان ئامادەیی خۆیان دەربڕی..

هەروەها مەلا عوسمان مەلا محمود کلێسەیی و مەلا تاهر و مەلاڕەشید کلێسەیی ئامادەییان دەربڕی بۆ ئامادەکردنی کەڵەك وئامرازی پەڕینەوە لە ئاوی هەرزنێ.

جگە لەوانەش چەند پێشمەرگەیەکی ترمان ئامادەکرد بۆ چاو ساغی و شارەزایی لەسنوری گەناو و عیسێوێ و بەری پشدەر. کە ئەمانەی لای خوارەوە بوون:

1- عەلی حمە سور (علی ئەشکەنەیی)
2- بەکر قادر (بەکرئسێوێ)لەڕاپەڕیندا شەهید بوو.
3- حمە ئەمین سنجەڵەیی.
4- حسن دەوژانی
5- خدری محمود جاف.. *

* شارەزای باشی لە لوغم و تەقینەوە هەبوو، ساڵی 2012 کۆچی دوایی کرد

- شەوی21ـ1990/5/22 لەگوندی(بێتوش)ە وە چوین بۆ گوندی (ئاشکان) ئەو ڕۆژە لە سنووری سەردەشتەوە هاتبووین..ئەوەی لیرەدا تۆماری دەکەم و دوبارە دەینووسمەوە هەمان ئەو یاداشتانەن کە لەو دەفتەرەدا تۆمارم کردبوون کە لەجەولەی یەکەمی هاتنە خوارەوە بۆ کاری پارتیزانی یاداشتەکانم تۆمارکردبوون.. واتە ئەم هاتنەخوارەوەیەم بۆ کاری پارتیزانی جەولەی دووەم و،لەمانگی 2ـ1991 یشدا بۆ جاری سێ یەم و دواین جار هاتمە خوارەوە بۆ سەرپەرشتی ڕاپەڕینی سنوری دووکان و پیرەمەگرون.

تێبینیم کردووە هەندێك لەو برادەرانەی لەگەڵ مەفرەزەکەی شەهید ئاکۆ هاتنە خوارەوە ئێمە ڕێبەرو شارەزایان بووین لەسەر شێوازی هاتنە خوارەوەکەو سەرەتاکانی خۆ ئامادەکردنەکە گێڕانەوەی جیاوازیان هەیە.هۆیەیەکەشی ئەوەیە تەنها پشتیان بەیادەوەری خۆیان بەستووە،نەك بەنوسین لەوانەیە هەمو شتەکانیان تۆمار نەکردبێت.بەڵام ئەوەی من لێرە تۆماری دەکەم لەودەفتەرە دەرم هێناون کە بەردەوام لە جەولەکانی پارتیزانی دا پێم بووە ....

- لەگوندی (ئاشکان)هەموو شارەزاکانی تریشمان لەگەڵدا بوون کۆی هەمووان بەمەفرەزەکەی شەهید ئاکۆسوریشەوە هەژدەکەس بووین لەوێوە بەرەو ڕۆژئاوای ئاشکان،واتە بە ئاراستەی پشدەر بەڕێکەوتین،لە(تەپکەسورە)و لەوێشەوە بەرەو (بەردکێشان) پاشان بۆ(سەرشیوێ)و شەو لە(چۆمە)ماینەوە.

1990/5/22 بەیانی زوو لەخەو هەڵساین هاتینەدۆڵی(ڕمبەڕمبە) سەعات شەشی بەیانی بوو، ئەودۆڵە لەمەترسی ڕبایەکانی سوپای داگیرکەری عێرق دەیپاراستین بۆیە تاکو نیوەڕۆ لەوێ ماینەوە و پشوماندا هەرلەوێ نانی نیوەڕۆمان خوارد ..

لە دەفتەری بیرەوەرییەکانمدا کە هەرلەهەمان ڕۆژدا شتەکانم تۆمارکردووە :

(ئەم ڕێگایەمان بۆیە هەڵبژارد چونکە حکومەتی عێراق ماوەیەکە ڕبایەو کەمینی هێناوەتە سەرچەمی هەرزنە لەدۆڵی سەفرەوزەرون و گەلاڵەوە .هێزێکی زۆری هێناوەو دایناوە چەند قاچاخچیەکی عیراقی و ئێرانی کەوتبوونە کەمینەکەیانەوە و بەحاڵێکی زۆر خراپ رزگاریان بوو بوو،یەکێك لەوانە(خەلیل بێدەری)بووە ..

پێشتر محاولەبەکمان کرد تا شوێنێك بدۆزینەوە لەوبەرەوە لەپشتی (سورەبانەوە ) بچینەوە (پونگینە) و(کەلکی گوێزێ) بەڵام توشی موشکیلە بووین ئەو برادەرانەی چوبوون بۆ کەشفی شوێنەکە لەگەڕانەوەدا کەوتبوونە کەمینی ئەرتەشی ئێرانەوە کەچوارکەس بوون،ئەرتەش گرتبوونی وتەحقیقی لەگەڵدا کردبوون ئێمەش لەڕێگای قەرارگای ڕەمەزانەوە پێمان بەردان..ئەرتەش و قەرارگا هەماهەنگیان پێکەوەنەبووەو نیانە، ئێستاش و ئەوساش کەهاتوینە خوارەوە ئەرتەش ئامادەی هەماهەنگی نیە لەگەڵ قەرارگای ڕەمەزان بۆیە توشی ئەم ڕێگا کوتانە بووین )



## راستییە ئەفسانەییەکان

لە هاوینی ساڵی 1990 دا بوو، بنکەی پارتیزانیمان لە ناوەڕاستی شاخی پیرەمەگروون بوو،خواری بنکەکە شاخ وهەڵدێر بوو، ژمارەیەکی چەندین هەزاریی جاش و جەیش هێرشی هێنا بۆمان، لە ئاسمانیشەوە دەیان هێلیوکۆپتەر دەسوڕانەوە، بنکەکەمان لەپەنای گابەردێکدا دروستکردبوو و، بە گەڵای داربەڕوو دامانپۆشیبوو ،لەسەرروومانەوە ئەشکەوتۆکەی بچکۆلە هەبوون لەوێ نەمانکردبوو، هێلیوکۆپتەرەکان بە شەستێر لەو ئەشکەوتۆکانەیان ئەدا و قەڤ زنجیری گوللەکان بەسەر سەری ئیمەدا بەردەبوونەوە، لە سەرزەویشەوەسەربازی رژێم تاکو ژێر چەناگەی بنکەکەمان هاتن و چیتر نەیانتوانی سەرکەون، ئێمەش خۆمان لە مەکۆ دابوو بۆئەوەی شەڕی مان و نەمان بکەین، گوێمان لە هەنسەبڕکێی سەربازەکان بوو، و دەنگێکیش بەعەرەبی بەرزبووەوە هاواری کرد ( سیدی ما نگدر نصعد بعد) واتە چیتر ناتوانین پێهەڵگەڕێین..دوای ئەوە دەنگ نەما و هێلیوکۆپتەرەکانیش ئاسمانە جوانەکەی ئێمەیان چۆڵکرد..

2017 /2 /22

*ئەم وێنەیە هی دوای ئەو ڕووداوەیە ـ سەرشاخی پیرەمەگروون، لە ئاستی گوندی سوسێ..



لاپەڕە 137 لەدەفتەری بیرەوەریەکانی پارتیزانیم کەبەقەڵەمی جاف شین نوسراوە.
لە درێژەی تۆمارکردنی باســـو خواس و ڕووداوەکانی ئەو ڕێگایەدا نوســیومە:
ئەوڕێگایەی لێوەی هاتین لەئاشکانەوە، لەچەمی هەرزنەوە دوورە، بەدوسەعات زیاتریش،پاشان وردەوردە هاتین بەچەمەکەی خوار (ڕمبڕمە)دا ڕوەو ژور بووینەوە تاکو دۆڵی(چناران)لەسەر کانیەکە،زۆر شەکەت وماندووبووین، ئیسراحەتمان کرد. ئێوارە پێش تاریك بوون هەڵساین،لەبەرانبەر ڕەبایەکانی شاخەکەی دەستەچەپمان، ( کەبەسەرچەمی باوەزێ دا دەیڕوانێ) ڕۆیشتین، لەسەرەو ژێریەکە توشی یەك تاقە خانویەك بووین.شەوهات وهەربەڕێگاوەین.شەوگەیشتینە ناو ڕوخاوەی گوندی (باوزێ) و تێپەڕبووین پێیدا، هەر بەڕێگای قاچاخچیاندا ڕۆیشتین تاکو گەیشتینە (سەرشاخان)کە لەسنوری(ئیسێوێ)دایەودەڕوانێت بەسەریدا،شەولەوێ پشووماندا لەبەرانبەرڕەبایەکان ومعسکرە سەرەکییەی(ئیسێوێ)دا لەوڕکانەداخۆمان شاردەوە.
:1990/5/23

(هەڵساین لەخەو.هەرلەوناوەماینەوە هەتا ئێوارە ،لەترسی ڕەبایەکان وسەربازەکان. شەو ڕۆیشتینە خوارەوە وکەوتینە دەستەڕاست و لابەلا.. ڕۆیشتین بەرەو چەمی هەرزنێ. کۆنە ڕێگاکەی ئیسێوێ هەرمابوو کەدەچوە سەر (بوواری ئیسێوێ).

ئێوارە کەمراقەبەی (ئیسێوێ) مان کرد کەمینێکی عەسکەری دەرچوو بۆ تەنگەکەی نزیك(ئیسێوێ)بۆیە ئێمەش خۆمان دواخست..بەڵام شەو بەتاریکی هەر گەیشتینە سەر چەمی زێی بچوك(چەمی هەرزنێ) لاماندا.... لەشوێنێکی ئەمین لێ ی خەوتین.

:1990/5/24

هەمومان پێکەوە هەر لەسەرچەم ماوینەتەوە تا عەسرێکی درەنگ..بووار هەبوو، بەڵام هێشتا ئاوەکە بەخوڕبووتاکوو سەروی کە ەرمان دەهات..بەتەنها لە بووارەکەم دا و پێم وابوو ئەتوانم بەتەنها بپەڕمەوە ..بەڵام کاك حەسەن دەوژانی کەخەڵکی ناوچەکە بوو لەگەل برادەرە شارەزاکانی تردا، زۆر لەئاوەکە ئەمین نەبوون .. کاك حەسەن بەدوای مندا هاتە ئاوەکە.. چومە ناوەڕاستی ئاوەکە لەوێ زۆر قوڵ بوو تا سنگم هات..قاچم لەزەوی نەما..کاك حەسەن زوو هەستی پێ کردم و نەیهێشت ئاوەکە دورم بخاتەوە کاك بکر عیسێوێش هاوکاری کردم، ئەوان نەبوونایە کەس فریام نەدەکەوت چونکەئاوەکەزۆرخێرابوو بەدڵنیاییەوە ئەخنکام. .کەبرادەران ئەوحاڵەی منیان بینی ترسان ..منیش بانگم کردن کەهەمویان پێکەوە لەبووارەکەبدەن و دەستی یەکتری بگرن و شارەزاو مەلەوانەکان لای خوارەوەیان لێ بگرن کاك حەسەنیش دوبارە ڕۆیشتەوە لای ئەوانو هاوکاری پەڕینەوەیانی کرد لەگەڵ شەهید بکر عیسێوێ ومام عەلی ئەشکەنەیی و کاك حەمەدەمین سنجەڵەیی. شەهید بەکر لەهەموان بەهێزترو تێرو پڕتر بوو و شارەزای بووارەکەش بوو بۆیە هەموو بەسەلامەتی پەڕینەوە لە دوای پەڕینەوەمان شارەزاکان و مەلەوانەکان و کاك خدری مەحمود جافمان ئیزندا کە بگەڕێنەوە بۆسنووری ئێران، ئیتر ئێمە لەوێوە شارەزا بووین ..دوای ئەوەی خواحافیزیمان لەیەکتری کرد، هەر بەچاوی ڕوناك بەقەد شاخی(ڕەبەن)دا هەڵگەڕاین،شەو لەسەر ئاوەکەی دۆڵی ڕەبەن ماینەوە.

1990/5/25

بەیانی زوو ،بەرەو هەوارەکانی (ڕەبەن) بەڕێکەوتین. نانی نیوەڕۆمان لەوێ خوارد.. پاش نیوەڕۆ بەکەلکی گوێزێدا هاتین،چوینە دووکانیان و لەئاوە کەللەتەزێنیەکە تینوێتیمان شکاند.هەریەکسەر بەڕێگای لاپاڵەکەدا سەرکەوتینە سەرشاخ ( کەدەکەوێتە ناوەندی زنجیرە چیای زینوی سپی وگۆمەداڵ)ئینجا دابەزینە خوارەوەو پێهەڵگەڕاینەوە بەرەو ئەوجادەیەی لە شێخ محمدەوە دێتەوە بۆ بازێرگە. هەندێك بەجادەکەدا هاتین ڕوەو ڕۆژهەلات، پاشان هەڵگەڕاینەوە بۆ ئەو زنجیرە شاخەی دەچێتەوە بۆ (گۆمەداڵ) بەلای ڕۆژهەڵاتیدا.کەچوینە سەر کەلکەکە تۆزێ پێهەڵگەڕاینەوە بۆشاخە (دادڕداڕ )ەکە و شەو لەوێ ماینەوە .

1990/5/25

بەرەبەیان بوو، نانی بەیانیمان خوارد،بەڕێکەوتین بەرەو گردی (زینوی کوونەسە) ئینجا ڕۆیشتین بەرەو(گۆمەداڵ) لای بیرەکان وهەلیکۆپتەرە شکاوەکە..

گۆمەداڵ یەکیك بوو لەهەوارەکانی ناوچەکە و چەند بیرێك و چالاوی تێدا دروست کرابوو بۆ ئاوخواردنەوە و ئاودانی مەڕومالات.

من لە جەولەی پێشودا هاتبوومە ئەوێ.ئەوەم ئەزانی ئەو هەلیکۆپتەرە لەشەڕی عێراق ئێراندا بەربووەتەوەو پڕبووە لەگۆشتی قوتوو..بۆیە هەرزوو پێش ئەوەی بگەینە گۆمەداڵ و بگرە دوو سێ ڕۆژ پێش ئەوە بەکاك ئاکۆ و جەماعەتم وت لە گۆمەداڵ دەعوەتی منن..

لەبەرئەوەی شوێنەکە زۆر کوێستان بوو بەهاوینانیش بەفری لێ دەمایەوە بۆیە قووتووە گۆشتەکان ئێکسپایەر نەبووبوون هەرچەندە بەرواریشیان بەسەرچوبوو. بەلام هەندێك قووتووهەر هەوایان کردبوو ئاوسابوون ، بۆیە ئەوانەمان نەدەخوارد.. لەلای هەلیکۆپتەرەکە چەند وێنەیەکمان گرت بۆ یادگار کە لەهەندیکیاندا منیشی

تیادام و هەندێکیشیان من گرتوومە بۆ جەماعەت.ئەوەندەی لەگۆمەداڵ ماینەوە زۆر ئیسراحەتمانکرد و تێرگۆشت و شلەی قووتوو بووین، وەکو ئەوهەوابوو هاتبین بۆ سەیران..عەسر سەعات(5:30) بەڕێکەوتین هاتینە (سیرە مێرگ) لەوێ بەشاخی(خەرتین)دا هاتینە دۆڵی(خوبێ) لەوێوە لەنزیك ڕبایەکانی هەڵەدنەوە تێپەڕبووین و بەپشت هەڵدندا چوینەوە بۆکانی(زیوکە)هەرچەند زۆرخەتەریش بوو، بەلأم چونکە زۆر هیلاك بووین لەوێ لێی خەوتین.بەلأم دلّم تەواوئیسراحەتی نەکرد.

: 1990/5/27

بۆ بەیانیەکەی زۆر زوتر لەعادەت، جەماعەتم هەڵسان ئاگرێکی بێدوکەڵمان کردەوە و چامان لێناو نانێکی زۆر پەلەمان خوارد. وەك و ئەوەی دڵم خەبەری دابێت بەهەبوونی مەترسی مەرگ!.خێرا هەموانم ئامادەکرد...ئیتر بە(هەرزنە ڕێ)دا هاتین بۆ سەر کانی (بەختوخە) لە (مێرگەپان )و خێرا خۆمان گەیاندە چەمی سپیدارەکان و کەمێك ئیسراحەتمان کرد. لەماوەی کەمتر لە دوو دەقیقەدا دوو هەلیکۆپتەر گەیشتنە سەرمان..زۆر نزم بوون وەکو سەیارەی فڕیوو بەسەرجادەی مێرگەپاندا لەشەدەڵەوە ڕوەو قزلەر ئەڕۆیشتن و دوبارە لەو سەرەوە گەڕانەوە . هەموان بڕوامان وابوو یان جەیش دێت و لێرەوە تێدەپەڕێت یان تەمشیت و کیومالّی عەسکەری هەیە..لەو قسانەدابووین سەیرمان کرد لەهەمان ئەو ڕێگایەوە کە لەهەڵەدنەوە هاتین بەسەدان سەرباز کێومالّ دەکەن و دەنگە دەنگیان دەگەیشتە ئێمە..

کەهەلیکۆپتەرەکان بێدەنگ بوون بەپەلە لەناو سپیدارەکان دەرچووین و خۆمان گەیاندە بناری پیرەمەگرون بەسەرەو هەردووکەسمان ڕامان دەکردە بن دەوەنێك.

ئیتر بەوجۆرە تاکو زۆر لەچەمی مێرگەپان دورکەوتینەوە. تاکو عەسر هەرلەبنار بووین .. ئیتر کەزانیمان مەترسی لەمێرگەپان نەما هاتینەوە خوارەوە بۆسەر چەمی مێرگەپان لەئاستی(چەمەسوتاو) پاشان سەعات 5:30ئێوارە بەڕێکەوتین و بە

(کۆچەڕێ)دا هاتبنە سەرشاخی پیرەمەگرون ، ئیتر لەوێوە دۆڵی سورداشمان لێ دەرکەوت تاکو تاسلوجە.. ئەو شەوە هەربەڕێوە بووین و نەخەوتین،

1990/5/28 :

بەرەبەیان سەعات 5:00 گەیشتینە لای کاک (غەریب هەڵەدنی) وجەماعەت لەبنکەی ژمارە یەکی پارتیزانی ڕەتڵی سورداش کەبەناوەڕاستی چیای پیرەمەگرونەوە بوو لەئاستی پشتی گوندی( بیران) و (قەرەچەتان)..لەگەڵ گەیشتنمان هەمو جەماعەت بەخەبەر هاتن کەژمارەی نزیکەی 20 پارتیزان دەبوون، زۆر بەگەرمی و ئاهەنگێکی سۆزدارەوە بەخێر هاتنیان کردین و بوو بەشای و خۆشی لەوناوشاخ و هەڵدێرە..

1990/5/29 :

(هەر لەبنکەی پیرەمەگرونین)..شەو چووین بۆناو ئۆردوگای پیرەمەگرون لەگەڵکاک غەریب و کاک ئاکۆو چەند برادەرێکی تر. مەبەستمان ئەوەبوو ئەو جیهازی (ڕاکاڵ)ەی لەسەرکردایەتیەوە هێنابوومان بیگەیەنینە دەست ڕێکخستنەکانی ناوشار و بەتایبەتی کاک (خالید ڕەزا) کەلەناوشار زۆر چالاکانە کاری دەکرد..کاک ئاکۆ لەناو ئۆردوگا لەگەڵ چەند کەسێکی چەکدار ڕوبەڕو دەبنەوە و تەقە لەیەکتری دەکەن.. دەبووایە جیهازەکە بەرێ بۆ لای خوالێخۆش بوو ئەنوەری حاجی شەریف موغاغی برای کاک شوانە موغاغی و، تەسلیمی ئەوبرادەرانەی ناوشاری بکەن ،کە هاتبوون بۆ ناو پیرەمەگرون . لەوکاتەدا کاک ئەنوەریش بریندار دەبێت و چەند گولەیەکیش بەر سەیارەکەی ڕێکخستنی ناو شاردەکەوێت..ئێمەش لەکۆڵانێکی تری ناوپیرەمەگرون بووین . ڕۆیشتین بەرەو شوێنی تەقەکان . چونکە زۆر دور نەبووین لەیەکتری،کاک ئاکۆ گەیشتەوە لای من و کاک غەریب هەڵەدنی.وتی کەمینە ئیتر هەمو بەرنامەکانمان هەڵوەشاندەوە وهاتینەوە بۆبناری پیرەمەگرون و بارەگای ژمارەیەك لەناوەڕاستی شاخەکە.بڕیارماندا لەشەوانی داهاتووداجێ بەجێی بکەین.

ـ هەرلەو شەوانەدا لەگەڵ کاک غەریب وکاک ئاکۆ چوینەوە پیرەمەگرون،کاک چەتۆی برای کاک شەهید (دکتۆرهادی)مان بینی، قسەمان لەگەڵ کرد بۆئەوەی چاوساخی مەفرەزەکەی کاک ئاکۆ بکات بۆ ناوچەکانی شێخ (بزێنێ)و (شوان) پشتی کەرکوك.

:1990 /7/2

(ئیمڕۆهەر لەبناری پیرەمەگرونین لەبنکەی ژمارەیەك ئیمڕۆکرابەجەژنی قوربان)..

:1990/7/3

شەو لەگەڵ هەندێ برادەر چوینە ناو پیرەمەگرون.. من چووومە ماڵی (قادر فەقێ ئەمین سابووراوایی) ، کەیەکێك بوو لەهاوکارە باشەکانی پارتیزانەکان..

چونکە پێشتر جوابم ناردبوو بۆ خزمان،هەمو ماڵی مامە قادرم و ماڵی خۆمان هاتبوون لەوێ چاوەڕوانیان دەکرد .. هەندێ ڕەسممان لەگەڵیاندا گرت.

:1990/7/4

شەوەکەی مەفرەزەکەی کاک ئاکۆ سورڕۆیشتن ، کاك غەریب و هەندێ برادەری تر ڕۆیشتن لەگەڵیان تاوەکو لە ئۆردوگای پیرەمەگرون دەریان کردن بەرەو بناری شاخی (تۆکمە) کەزنجیرە چیایەکە لە تاسڵوجەوە دەست پێدەکات تاکو دەچێتە چەمی ڕێزان چونکە کاك ئاکۆ وتی خۆمان شارەزاین و کاك چەتۆ ئەدۆزینەوە لەشوێنی مەوعیدەکە.

* سەرچاوە: دەستنووسێکی هەڤاڵی پارتیزان بیستوون سابووراوەیی



# پارتیزانی دوای ئەنفال
## لە بیرەوەری ڕۆژنامەنووس
# هێمن مەولوود دا

ڕۆژی 1988/5/3 ئەوکاتەی کە فڕۆکەکانی ڕژێم هەردوو گوندی گۆپتەپپە و عەسکەرو دەم رووباریان کیمیا باران کرد، من و غەنی حاجی مستەفای گەڵناغاج ، لە پاڵ مزگەوتەکەی گوندی گەڵناغاج وەستا بووین ، دیقەتی بۆردومانەکانمان دەدا،سەرەتا هەر پێمان وابوو کە بۆردوومانێکە وەکو جاران ناپاڵم و بۆمبی هێشوویی بەکاردێنن، بەڵام وانەبوو ،دەنگیشی کەمتر بوو لەبوردومانەکانی پێشووتر .ئەوەندەی نەبرد هەواڵەکە وەکو برووسکە گەیشت ، گۆپتەپەوعەسکەر کیمیاباران کراوە . خەڵکێکی زۆری هەرودوو گوندەکە و چەند پێشمەرگەیەکیش شەهید و برینداربوون، ئەم هەواڵە هەموو خەڵکی گەڵناغاجی شپرزە کردو هەرکەسە کەوتە سۆراخی ژن و منداڵ و..وکەسوکاری، لەبەر شێواوی و شۆکی هەواڵەکە بەتەواوی نەیدەزانی چی بکەن .منیش تاساوی هەواڵەکە بووم ، ئەوەندەم زانی مامۆستا ئازاد مەجید هات و سۆراخی دەرزی ( ئەترۆپین)ی دژە کیمیاوی لێ کردم و وتی مامۆستا فایەق یان بەبرینداری هێناویانە بۆ ئێرە، با فریای بکەوین .

ئەوەندەی پێ نەچوو ماموستا هاوڕێکانی بەری دەشتی کۆیەم دەرکەوتن و بۆلام هاتن،تومەز سوپاو هێزەکەی ڕژێمان دیبوو لە شاخی کەڵکە سماقەوە دێنەخوارەوە بۆ دەشتی کۆیە،ماموستا ئیحسان عەلی ماموستای گوندی کلێسا و ڕەحیم بەکر و مستەفای برای کەلای ئەوبوو بە فیراری و ڕەحمان کۆیی ماموستای گوندی کانەبی و غەسان عەلی ماموستای گوندی قزلوو گەیشتنە لام و گوتیان هاتووین لەگەڵ تۆ پێکەوەبین ، تۆ ناوچەکە شارەزایت .

دوای ئەوە حاجی مستەفا بەخۆی و تفەنگێکی کلاشنکۆفەوە غەنی کوڕی لەگەڵدابوو گەیشتینە یەك . مام حاجی پێمی گوت ئەم کلاشنکۆفە بۆتۆیە و غەنی کوڕیشم با لەگەڵ تۆدا بێت و لەیەکتیر دا نەبڕێن و پێکەوە بن غەنی کوڕیشی کلاشنکۆفێکی پێبوو ئیتر بەم 7 کەسە تەنها دوو کلاشنکۆف و 4مەخزەن فیشەکی لای غەنیمان پێ بوو.هەموومان ئەو شەوە لە شیوەکەی خوار ئاواییەوە ماینەوە و من جانتایەك کەل،و پەلی ئەرشیف و وێنە و نووسینم لە ناو کەندەکە خستە چاڵەوە بە ئومێدی ئەوەی دوای دۆخەکە هێور بێتەوە بچمەوە سەری دەری بهێنمەوە ، تەنها دفتەرێکی قەبارە چینی کە شەهید پالە پێش چوونی بۆ بادینان بە دیاری بۆی جێهێشبووم بۆ نووسین و یاداشتکردنی بیرەوەرییەکان لەگەڵ نامیلکە شیعریەکەی(شەونییە خەونتان پێوە نەبینم)ی عەبدوولا پەشێوم خستە بەخەڵمەوە وهەڵم گرتن ، ئیتر تاکو دەمەو عەسرمان لەوێ گوزەراند و بەگوێرەی سووڕانەوەی کۆپتەر لە ئاسماندا دەمانزانی هێزەکانی ڕژێم لە هەموولایەکەوە گەیشتوونەتە چ ناوچەیەك ئەو ئێوارەیە ڕژێم لە قەرەناوەوە گەیشتە دووتەقەڵ و لە ئاغجەلەرەوە گەیشتە نزیك کانی هەنجیر و لەدەشتی کۆیەوە لە بنارەکە شۆڕ ببوونەوە بۆ کلێسا و بۆگد و داوداوەو بەنازی دەم ڕووبارەکەدەهاتن.لەو دیو خاڵخالانیشەوە کۆپتەر لەسەرئۆمەرمەندان وتورکمان باخ بوولەبان شوانیشەوە

نزیکی ناسرو میسر ببونەوە، دەمەو عەسرێکی درەنگ کەوتینە هەڵکشان بەرەو خاڵخاڵان بە ئومێدی گەیشتن بە هەر هێزێکی پێشمەرگەی هەر لایەنێکی بەرەی کوردستانی . ئەوەبوو توشی دەستەیەك لە پێشمەرگەکانی لقی شەهید بەکر تەلانی حزبی شیوعی بووین کە کاك هیوا ڕەش تەپەیی جێگری لقەکە لەگەڵیان بوو تیایاندا شاهۆ ڕەحمانی گەلۆزیم ناسیەوە وکەوتینە گەڵیان و بەرەو سەری خاڵخاڵان بەرێکەوتین و شەومان بەسەردا هات، هەندێ لەناو گوندی مۆرخوادەی سەروو ماینەوە تا لە دۆخەکە تێبگەین ، دواتر بە فەرمانی هیواڕەش بەڕێکەوتین بەڕەو بان شوان و بەرەبەیان گەیشتینە گوڵم کەوە،بەڵام بەناو هێزەکانی ڕژێم دا و زۆر بەدزە و بە وریایی و پێچاوپێچ و هەست ڕاگرتن ، لە چەند شوێن لەدوورییەکی کەمەوە گوێمان لەدەنگی سەربازەکان دەبوو ، ناچار دەبووین هەست و خوست لە خۆمان ببڕین تا ئاشکرا نەبین، ئیتر بەو دەردە تابەرەبەیان گەیشتینە شیوەکانی دەوروبەری گوندی گوڵم کەوە.. کەڕەنگەزیاتر لە 500-50 زیاتری پێشمەرگەی هەموو لایەنەکانی یەکێتی و پارتی و،حسك پاسۆك وشیوعی و زۆری فیراری عەسکەریشی لێ بوون، شیوەکە لێوان لێوبوو، هەموو لە پەنابەرد و،کونە شاخ و کەلوەزەکانەوە خۆیانحەشاردابوو، ئەو ڕۆژە هەموو هێزەکان لەوێ مانەوە ، تا دەمەو عەسر،ئیتر هەرکۆمەڵە وبەلایەکدا پەرتەیان لێ کرد و ئێمەش لەگەڵ ئەوهاوڕێیانەدا تێکەڵ بەکۆمەڵێ پەل و لقی تری شیوعی بووین و بەرەوناوچەی جەباری و زەنگەنە و دواتریش داودە و گەرمیان بەدەم جەولەوە ڕۆیشتین و چەندین،جار توشی شەڕی بووین و لەگوندی(تەیمەزاوا)ش سێ پێشمەرگەی حزبی شیوعی بەدەستی چەند پارتییەك شەهیدکرابوون کە بەپاڵ ئاشنایەتیەوە دەستیان لێ وەشاندبوون. پێشمەرگەکانی حزبیش بێ ئاگابوون لەتەسلیم بوونەوەیان،هەر وایانزانیبوو پێشمەرگەکەی جارانن و،کەپشتیان تێکردبوون لێیان دابوون ، قاسم سەرپەل بوو

**لەلقی گەرمیانی حزبی شیوعی وفازڵ فەرماندەی مەفرەزە وهەڵمەتیش پێشمەرگەبوو،جەماڵ شووشە ناسراو بە(کاوە)ش بەسەختی برینداربوو، هەرئەو شەوەدوای پەڕینەوە کومەڵێ مەفرەزە تەشکیل کران ومنیش وەکو فەرماندەی مەفرەزەکەی خۆمان دەستنیشانکرام واتە مامۆستاکان و شەهید عەبدولغەنی حاجی مستەفای گەڵناغاج ، ئەم تەشکیلاتە بۆ ئەوە بوو کارەکان دابەش بکرێن و نۆرەی شوێن گۆڕین ونان پەیاکردن و کەمین بۆکاتی پێویست .دوای مانگێك جەولەی جەباری و زەنگەنەو گەرمیان و سەرخاسە گەڕاینەوە بۆ بان شوان و ماسقەلان و لەوێشەوە مەفرەزە مەفرەزە جیا بوینەوە ، ئەوکاتە ناوچەکە نەختێ ئارام تر ببووەوە و هێزەکانی رژێم لە چەند ناوچەیەکی جیاجیادا مۆڵدرابوون و جێگیر کرابوون و هات وچۆ ئاسانتر ببوو، بەلاّم هێشتا وریایی و شارەزایی دەویست،لەگەڵ جیابوونەوەی مەفرەزەکان لە گەلەکەمردوو ، ماسقەلان غەنی حاجی مستەفا و مامۆستا غەسان عەلی و مامۆستا ڕەحمان کۆیی برای حەمەڕەشی پێشمەرگەی تیپی93 ی کۆیە لە ئێمە جیابوونەوە ، هەرچەندە زیاتر لە هەفتەیەك من هەوڵم دا لەگەڵ غەنی کە نابێ لە یەکتر دابڕێین و ئەوە فەرمانی باوکیەتی بەلاّم ئەو هەر سوربوو کەبڕوات و بچێ سۆراخی ماڵی باوکی بکات و دڵنیابێ لە مانەوەیان ،بەلاّم زۆر بەداخەوە دوای دابڕانیان لە ئێمە بەچەندڕۆژێ لە بناری خاڵخاڵان و لە شیوێکی نزیکی گوندی شێخان ئاشکرا دەبن و کۆپتەر هەڵیان دەگرێت و ئەنفال دەکرێن ئێمەش دوای نزیکەی مانگێك لە بناری بنەباوێ لەڕێگەی کەریمی خزمی غەنیەوە هەواڵەکەمان پێگەیشت کە ئەوان هەرسێکیان واتە غەنی و غەسان و ڕەحمان کۆپتەرهەڵی گرتوون وئەنفالکراون .**

**ئەوماوەیەی لەناوچەی جەباری ماینەوە ناچار بووین هەرکەسەو بۆخۆی خەمی کۆڵەپشتێك بخوات و هەموویێویستییەکانی خۆی تیادا هەڵبگرێ هەر لە دەرزی و**

دەزووەوە تا کەوچك و پەرداخێك و شەکر و خویێ و قاپێکی بچووك و هتد هەموو ئەو پێویستیانەی ڕۆژانە پێویستمان پێی دەبوو ، سەرباری ئەوانە من دەفتەرێك و کتێبەکەی پەشێو و هەندێ دەرمان و دەرزی و حەبیشم پێ بوو وەکو ئیسعافاتی سەرەتایی ، واتە نیوە دکتۆرێکیش بووم تەداوی سووك و دەرزی لێدان و وردە فریاکەوتنم دەکرد . هەروەها دەمامکێکی کیمیاویشم هەبوو پێشتر ئەوەشم پێبوو ، بەلاّم لەبەر بارگرانییەکەم ، دوای ئەو جەولە دوورودرێژانە ناچاربووم قناعەکەم دایە هاوڕێیەکی تر بۆخۆی ، چونکە کلاشنکۆف و چوار مەخزەنی هاوڕێیان پێمیاندا و کۆڵەپشتەکە و داو و دەرمانەکانیش زۆربوون ،بەلاّم ناچاربووین ، جارجار ناوساجیش دەبووە میوانی کۆڵە پشتەکە ، چونکە ئەگەری زۆری ئەوە هەبوو تووشی شەڕبین ،یانیش لەحەشارگە دا گیربخۆین و نەتوانین سەر دەرکەین ، جابۆئەوەی بێ خواردن نەبین هەموو ڕۆژێ پێش جێگۆڕین وچوون بۆ حەشارگەیەکی تر دەبوو ناوساجی ئامادە بکەین و بەشی دوو سێ ژەم هەڵگرین .

بەم شێوەیە زیاتر لە مانگێ هەرسێژەمەمان هەر ناوساجی بوو ، ئەوەش بە دۆزینەوەی ئارد و ڕۆن و لە ژێر دیواری خانووە ڕووخاوەکانی گوندەکان و ناو،کونەتەیارە کە پێشتر خەڵکەکە شاردبوویانەوە بۆتەنگانەی خۆیان.لەهەموو ئەو مانگەدا جارێکیان بزنەلاتێکی هەڵەتەو ونبوومان دۆزییەوە و لێمان نا و لەگەڵەك مردووش مانگایەك ، ئەمەیان بەتێری لێمان خوارد ، بەلاّم لەبەر ئەوەی ماوەی زۆرمان نەبوو تەواو بیکوڵێنین و ئاگری باش بکەینەوە ، نەوەك ئاشکرابین هەر بەنیوە کوڵی خواردمان بۆیە تا سێ چوار ڕۆژ هەر سکچوومان گرت ، ڕۆژی دوایی ڕژێمیش گۆمانی هێزکانی ئێمەی کردبوو ، بۆیە ڕۆژی دواتر کۆتەر هات و هەموو ناوچەکەی بە دۆشکا دابێژا ،بەلاّم نەمانی دیتەوە ، ئیتر ناچار بووین بەرەوشێخ بزێنی خواروو و بەری سێگردکان بپەڕینەوە ، ئەوەبوو شەوێك لەنێوان

عەمدۆن و گاقڕاندا بەکەڵەك پەڕینەوە بەڵام زۆر بە بێ دەنگی و وریاییەوە ، چونکە سەری گاقڕان مۆڵگەی هێزەکانی ڕژێم بوو ، لەبەر کەڵەکەکە ناچاربووین لەوێ بپەڕینەوە ، زۆریش ترسناك بوو . چونکە ئاشکرا بووینایە هەرچەنمان بکوشتایە سەرەنجام هەموومان تیادەچووین بەسەلامەتی پەڕینەوە و زیاتر لە؟دوو هەفتەش لە دەوروبەری دێدەوان خۆمان حەشاردا و ئینجا بەرەو باواجی و و بنەباوێ و سماقوولی بەڕێکەوتین ، هەرچەندە لەسەرجادەی گۆپتەپەی دەشتی کۆیە و پەڕینەوە بۆ بناری باواجی کەوتینە بۆسەی جاشەوە و گوێمان لە یەکتریش بوو ، بەڵام نە ئەوان تەقەیان کرد و نە ئێمەش بۆیە بەسەلامەتی گەیشتینە سماقولی و لەوێشەوە بۆچیای سەفین و سەرلووتکەی ئاوەگرد و لەوێش نزیکەی مانگێ بارگەمان خست و لەوێشەوە بەرەو دۆڵی هیران و،نازەنین و بالیسان و مەلەکان و پڵنگان وگوڵان و تاکونەکۆتر و قەندیل ، بەڵام لە دۆڵی پێموابێ پڵنگانبوو هەندێ ڕەوەند و دەوارنشینی مەڕدارمان بینی وشەوێك لەوێ ماینەوە ، ئێوارە درەنگ گەنجێکیان هات وسۆراخی دکتۆری کردو گوتی نەخۆشێکمان هەیە، هاوڕێیانیش منیان نیشانی داو وتیان ئەمە دکتۆرمانە ، منیش سەرەتا پێمناخۆش بوو ،چونکە دکتۆرنیم ودەترسام نەخۆشێکی هیلاك بێ،کەچووم لەژێر ڕەشماڵێك دا پیرەمێردێك ناڵەناڵی بوو و لێفە و بەتانیان بەسەرداد‌ابوو هاواری دەکرد وەیبابە مردم ، منیش لێی چوومە پێشەوە و کیسە دەرمانەکەم لەتەنیشت خۆمەوە دانا و پرسیاری شوێنی ئازارەکەم لێی کرد . وتی بەرزەهارم ئازاری زۆرە واتە خوارناوکی بەلای ڕاستیدا ، بۆیە گومانم بۆ ڕیخۆڵە کوێرەکرد ، پێشتر بیستبووم ئازاری ڕیخۆڵەکوێرە بە گوشین ڕادەوستێت و بە بەردانی گوشینەکەش زۆر ئازارەکەی زیاد دەبێ ، ئیتر ناچار بووم ئەو پشکنینەم بۆ کرد و کەزانیم ئەوەیان نییە منیش هیور بوومەوە و زانیم میزەڕۆی تووشی هەوکردنێکی زۆر بووە بۆیە ئازاری هەیە و خۆشبەختانە

سێچوار دەرزی باسکۆلیسین و هەندێ پاراسیتۆڵم پی بوو ، بۆیەدڵیم دایەوە و پێم گوت هیچ نییە خاڵەگیان هەر ئێستا بەیەك دەرزی چاك دەبیتەوە و ئازارەکەت نامێنی ، هێشتا بەدەم قسەکانەوە دەرزییەکەم تەواو لێنەدابوو کابرای پیرە کەوتە دوعای خێر و لەگەڵ دەرزی تەواوبووندا دانیشت و عەلەمی تیانەما ، منیش ئاسوودەبووم . بەڵام ئیتر سرەیان بەست و منیش کەوتمە پاراسیتۆڵ بەخشینەوە ،چاری ترم نەبوو ، بەو هۆیەوە دوو نەخۆشی تریش بۆ بەیانیەکەی پێش ڕۆیشتنمان ناردبانە دوام و یەکێکیان منالێك و ئەوی تریشیان کچێکی پارچەلە بوو منداڵەکە ئازاری زۆربوو وتیان چەند ڕۆژێك پێشتر دەرزی لێدراوە بەبێ ئەوەی پێشتر کوترابێ بۆیە پێی عەردی نەدەگرت ، منیش ناچاربووم دەرزییەکی ئەلەرمینی لێدەم ئەویشم دووان پێ بوو لەترسی کیمیایی ، ئەویش باش بوو لەکاتی ڕۆیشتندا وتیان باشتر بووە و کۆمەڵێ دوعای خێری ئەو و هی کچەکەش هاتنەسەری ، ئیتر تا کو ئێندزێ و کونە کۆتر و تاتی دۆو قەرناقەو پشتئاشان و دۆڵەکۆکێ نەوەستاین ، ئیتر لەوی بارەگای هەموو حزبەکانی لێبووماینەوە و دواتر مۆڵەتێکی ١٥ ڕۆژیم لەگەڵ مامۆستا ئیحسان عەلی لەحزب وەرگرتو چووینەلای مامۆستا ئارام بەرگەی بۆ کردین بۆناو شارەکانی خانێ و نەغەدە و بۆکان و مهاباد و سەقز و هەتا مەریوان و سنە و کامیاران ڕۆیشتین...*

---

* بیرەوەری نووسەرو ڕۆژنامەنووس هێمن مەولوود



# مامۆستا عادل شەریف

## فەرماندەی کەرت لەتیپی 25 ی خاڵخاڵان و

## پارتیزانی دوای ئەنفال

## بەشێك لەبیرەوەرییەکای دەگێڕێتەوە

یەکێکی تر لەفەرماندەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەسنووری کەرکوك کە دوای ئەنفال بەپارتیزانی ماوەتەوە،هەڤاڵ مامۆستاعادل شەریف سێکانیانی یە.

ئەویَ رۆژی ئەم هەڤاڵە ئازایە فەرماندەی کەرت بوو لە(تیپی 25ی خاڵخاڵان) لە سنووری قەڵاسێوکە دوای ئەنفالی چوارقەرماندەی تیپ کاك رەهبەر سەید برایم بەخۆی دەستەکەیەوە دەگەنە لای ئەمان لە چەمەکانی (قۆجەلەر)و (چنارتوو)..

# مامۆستا عادل شەریف

## بیرەوەری ئەوسەردەمە دەگێڕێتەوە:

. من چەندبڵێی زۆر شارەزای ناوچەکەبووم،گەرچی هێزەکانی سەربەرژێم زووزوو دەهاتن بۆ ئەوناوچەیە، بەمەبەستی دۆزینەوەمان کێومالْیان دەکرد،ئەگەرچی ئێمە لاشەڕبووین بەلاّم بەاچاری چەندجارێ لەگەڵ جاشاندا تووشی شەڕەتەقەبووین، هەندێك لەسەرۆك جاشەکان لەمەرامەکانی رژێم حالّی بووبوون هەربۆیە خۆیان لەشـەڕمان لادەدا زۆر هاوکاری خەڵکیشیان دەکرد بەتایبەت چەکدارەکانی (شێخ مەحموودی کارێزە)..بۆئەوەی پەیوەندی ئێمەوخەڵکی سنوورەکە(تایبەت ئەوانەی مابوونەوە) نەپسێتەوە کاك رەهبەر داوای لێکردم جەولەیەکی سنووری (تیژە)و (تلیان)بکەم.لەگەڵ کاك دڵزاروکاك(حەمەهەڵدێر)بەرەو(کێوەچەرمەڵە) بەڕێ کەوتین، لەچەمی شیوەسوور تووشی هەندێ خەڵك هاتین،زانیاری باشیان پێداین، گوتیان بەشەوان رێی هاتووچۆبۆناو (تەکیە) هەیە ،خەڵکەی گوندەکان شەوانە دێنەوە کەلوپەل دەگوازنەوە،چووینە (باوەفەتی) لەوێ توشی دەیان خەڵکی گوندەکانی (فەقێ میرزا و تیژە وتلیان وناسرومیسر و مۆردخوادە) بووین ،لەوانیش هەنێك زانیاری باشمان وەرگرت،ئەوان پێیان گوتین کاك عەلی بچکۆل و چەند هەڤاڵێکی تر لە(چەمی رەزان)ن،من سەگێکی تولەی بچووکم پێبوو،یەك یەك بۆنی پێوە دەکردن. گوتیان ئەمە چییە..؟

گوتم ئەمە لەئێرانەوە بۆم هاتووە،کۆپتەر لە فرۆکەخانە بفرێ هەستی پێدەکات،ئەم هەواڵە گەیشتبووە پیاوەکانی رژێم،چەندجار هێزیان دەهات بۆئەوسنوورە، زۆر مەبەستیان بووئەوسەگەبەزیندوویی بگرن وبیکەنەدیاری دەسیان..

دوای جەولەیەکی چەندرۆژی گەڕاینەوە بۆلای کاك رەهبەر و هەڤاڵەکانمان، ئەوانیش هەواڵی کاك عەلی وهەڤالانی چەم رەزانیان زانیبوو، ئێوارانێك بەرێ کەوتین بەرەو لای ئەوان، لای باڤڵەکەپێك شادبووینەوە، رۆژێك کاك عەلی گوتی دەزانم ماوەیەکە گۆشتتان نەخواردووە، باماۆستا عادل لەگەڵ یەك دوو هەڤاڵی زەرزی وعەوالاندا بچێت مانگاوگۆلکی زۆربەجێماوە،بۆگورگ وجاش بیانخۆن، یەکدوودانەبێن،بائێمە تا نەمردووین گۆشتێکی تربخۆین..هەندێ مانگای بەرەلا لەنێوان دێی عەودالان وزەرزی بوون،لێیان نزیك بووبووینەوە کەبیانگرین، کاتێك سەرمان هەڵبڕی بینیمان چەکدارێکی زۆر بەسەر شاخەکانی پشتی زەرزییەوەن، واتەماشای ئێمە دەکەن.. بەپەلە گەڕاینەوە،بەکاك عەلی مان گوت کەئەوهێزە بەرەو ئێرە دێن، ئێمەشیان بینیوە،با تازووە ئێرە بەجێ بێڵین و برۆین.

گوتی کوێ لێرە باشترە تابۆی بچین..؟ گوتم:شوێنێك لەخوار(کەلەشێرە) هەیە ناوی مەکۆی درانە، زۆر قایمە،تووشی شەڕیش ببین زۆر کێشە نییە،خۆمانکۆکردەوە و کەوتینەرێ ، چووینە ئەشکەوتی کەرخۆر و مەکۆی دزان، هێزەکانی رژێم چەم وچەم هاتن، تاگەیشتنە سەرکانی وناوەکەی بەرانبەرمان، تائێوارەکە مانەوە،بەلام ئێمەیان نە بینی،لەکاتی هەڵسانیان بەنیازی رۆیشتن ،کەسێك لەئێمەیان بینیبوو، بەرەو لای ئێمەوەهاتن، ئیتر شەڕەکە ببوو بەتووشمانەوە، لەگەڵ یەکەم دەستڕێژ دووجاش کوژران،یەکێکیان برازای موستەشارەکەبوو،شەڕ تائێوارە بەردەوام بوو،ئیتر ترسی کۆپتەر نەما،ئێمە دژەهێرشمان دەسپێکرد،حەوت چەکداری جاشمان بەدیل گرت،لەوشەڕە دوژمن12 کوژراویان هەبوو، لەقۆڵی لای کاك عەلی یەوە کاك مەلافەرمان بریندار بوو..هەر ئەوشەوە بەرێ کەوتین بەرەو شاخە رووخاوی لای چنارتوو،کاك مەلافەرمان تەندرووستی باش نەبوو،بمابایەتەوە شەهیددەبوو،هەربۆیە بەنهێنی ولەڕێی هاوکارەکانمانەوە ناردمانەوە بۆسلێمانی...

لەدەوروبەری قۆجەلەرخۆمان حەشاردا،کەوتینە زخیرە دابینکردن،حاجی نەریمانی کەلەشێرە چەندمێشێکی بۆمان بڕییەوە، هەنگوینی باشی بۆ پەیداکردین، بۆشەو لە چەمە کەماینەوە. بەیانی حەرەسمان لەشاخەبەرزەکان دانا،لەپشتمانەوە دۆڵێك هەبوو،بەرەو(خەربەندەلوو)درێژدە بووەوە،گوتمان ئەگەرجاش هات بەم دۆڵدا بەرەو ژووردەبینەوە،بەرەبەیان بوو ئاگرێکی بێ دووکەڵم کردەوە، برنجە سوورەیەکم لێنا، هێشتا نەکولأبوو.حەرەسەکان ئاگاداریان کردینەوەکەهێزێکی زۆری رژێم لە ئاغجەلەرەوە بەرەو ئێرە دێن،هەتا خۆمان کۆکردەوەو شوێنەوارەکانمان سڕییەوە، لەخوارمانەوە جاشەکان دەستیان بەتەقەکرد،یەك یەك هەڤاڵانم بۆ دۆڵکە بەڕێ کرد، دواکەس خۆم کشامەوە، لەدوای خۆمەوە پووش و پاوانی ئەمبەرو ئەوبەرم ئاگردا نێوان ئێمەو ئەوان ئەودۆڵە هەمووی بوو بەئاگر و دووکەڵ..ئیتر نەیانتوانی زیاتر بەدواماندا بێن، هەمووما بەسەلامەتی دەربازبووین،بۆئێوارەچووینەقۆجەلەر،لەوێ پشوویەکماندا،دوا کۆبوونەوەیەکی سەرپێی کاك عەلی بچکۆل و کاك رەهبەر و هەڤاڵان پێیان باش بووبەرەو سنووری (مەڵبەندی3 هەولێر) بۆ خۆشناوەتی بڕۆن، (من و کاك شەماڵ و حەمەتەیارە وئاراس و جوامێر) بمێنینەوە..

بۆڕۆژی دواتر ئەوانمان بەڕێکردو خۆمانیش کەوتینەڕێ بەرەو بناری خاڵخاڵان، دوای دووڕۆژ گەیشتینە حەشارگەکەمان لەپشتی گوندی(چوخلیجە) رۆژی پێش جەژن بوو دەبوو خواردن ئامادەبکەین (ئاراس) و(حەمەتەیارە) چوون بۆلای گوندی گردخەبەر هەتاهەندێ تەماتە..پەیدابکەن،زۆری پێنەچوو حەمەتەیارە بەپەشۆکاوی هاتەوە،گوتی: فریاکەون..!ئاراس رایکردبۆناوجاشەکان،ئیترئێمەش ناچاربووین شوێنەکە بەجێبێڵین.کەوتینەڕێ بۆکێوەچەرەڵە،شەولەتافەکە ماینەوە،رۆژی دووەم کەوتینەڕێ بۆتەکیە،لەوێ کەوتینەکەمینەوە،لێکدابڕاین،من وشەماڵ پێکەوە. حەمەتەیارەوجوامێریش پێکەوە،ئێمەچووینەماڵی کوێخاحەمەشەریف،پێش ئەنفال

زۆر میوانی بووبووین، هاوکارمان بوون، بۆبەیانی جاش لەناوتەکیە دەسووڕانەوە، دەیانگوت ئەمشەو پێشمەرگە هاتوونەتە ناو شارۆچکەکەوە، بۆشەوی دووەم من و شەماڵ دەرچووین،داوامان لێیان کرد ئەودووهەڤاڵەمان بۆ بدۆزنەوە ئێمەدەچینەوە کێوەچەرمەڵە،دواتر هەر نەهاتنەوە، گوتمان دیارە تەسلیم بوونەتەوە، تەنیا من و شەماڵ مابووینەوە،شەڕی عێراق . ئێران راگیرا، قەیسەریمان لێبووبوو بەکونەمشك، خۆراکمان کۆتایی هات،ناچارجارێکی ترخۆمان کردەوە بەناو تەکیەدا،چووینەوە بۆماڵی کوێخاحەمەشەریف بۆڕۆژی دووەم تەحسینی کوڕی بردمانی بۆماڵی مامۆستاجەلال کانی شەیتانی،رۆژی دواتر ئەویش بردمانی بۆماڵی کوێخا مەردانی خەزوورم لە چەمچەماڵ،ماوەی حەفتەیەك لەوێ بووین،کاك ابراهیم ومامۆستاجەلال هەرچەندمەفرەزەیان هەبوو،بەلام هاوکارمان بوون،وەرەقەی تەزویریان بۆمانکرد، بەسەیارەی خۆیان ئێمەیان گەیاندەماڵی سەیدرەسوڵ لەچوارقوڕنە،چەند رۆژێك لەوێ ماینەوە،دواتر چووینەمەڵبەندی3لەخۆشناوەتی،کاك مولازم عومەرمان بینی، گوتی هێزێکی زۆرمان بەپارتیزانی ناردۆتەخوارەوە،کاك نەوشیروان نامەیەکی بۆت بەجێهێشتووە،نامەکەی پێدام،نووسیبووی(تەشکیلاتی نوێمان کردووە، لەبری تیپ یەکە(وحدە) مان پێکهێناوە. تۆمان کردووە بەبەرپرسی وحدەی 25 ئەوهێزانە دێنەخوارەوە بەرەولای ئێوە دەبێ هاوکارییان بکەی لە دابینکردنی هەموو پێداویستییەکانیان..) نەیزانیبوومن لەوسنوورە نەماوم،ئیتر منیش بڕیارمدا کە بچمەوە خوارەوە، کاك رۆستەم لەهیران چاوەڕێی دەکردم،منیش چووم بۆ ئەوێ لەرێ گەیشتمەوە پێیان.چەندرۆژێك لە(تیپی91ی سەفین)لای کاك(سەفین مەلاقەرە) پشووماندا، عەسرانێك رژێم کەوتە تۆپبارانکردنی سنووری مەڵبەندی سێ،هێرش دەستی پێکرد،پێش ئەوەی رێگای گەڕانەوەمان لێ بگیرێت لەدۆڵی سماقولی یەوە بەرەو پیرەرو باوەقوب بەرێکەوتین،شەو لەئاستی گوندی گۆمەشین پەڕینەوە بەرەو

ناوچەی شێخ بزێنی،لەبەستی شەرغە پشووماندا،کاك کوێخاسیروانیش لەگەڵ هێزێکی تر لەپێش ئێمەپەڕیبوونەوە بۆ بەری کەرکوك، لەئاستی(ئاومالٚ . توڵکی). .ڕۆژی دواتر ئێمەش پەڕینەوە، لە وڵاتی خۆمان یەکمان گرتەوە، چەند ڕۆژێك لای ئەوان ماینەوە.دواتر بەرەو سنوورەکەی خۆمان،بەرەو خاڵخالان بەڕێکەوتین، لەم هێزەی ئەمجارەماندا ئەم هەڤاڵانەم لەگەڵدابوو:

(کاك وریائاغجەلەری،کاك شەماڵ،کاك حاکم شەوکەت،سیروان گۆگجەیی،هیواڕەش ، اسماعیل شریف،شێرزادعەریف رەمەزان،صلاح وادی..)بەچەندرۆژێك چووینەوە سنووری تیپی 25ی خاڵخالان،ئەمجار ڕێکخرابووین، پەیوەندیمان بەسەرکردایەتی یەوە هەبوو،وەزعمان باشتربوو،بەهۆی شارەزایی وبوونی حەشارگەی زۆرەوە کارەکانمان زۆرباش بوو،بەداخەوەشەوی 1988/9/24.23لەنزیك دێی پەلکەڕەش کەوتینەبۆسەی جاشەکانەوە،لەشەڕێکی کتوپڕدا هەڤاڵ (شوکت عبداللە حمەڕەش) شەهیدبوو..پاش چەند رۆژێك هەڤاڵ مام ڕۆستەم هاتە سنوورەکەمان و داوی لەئێمە کرد کە بیگەیەنینە لای کاك ئازاد وهەڤالانی لەقەرەداغ...

بەداخەوە لەوێش کۆپتەر هاتنە سەرمان و هەڤالان (شێرکۆجدی و هەڵکەوتی جیهاز و شێرزاد عەریف رەمەزان) شەهید بوون،دوای چەند رۆژێك خۆم دەستەکەم گەڕاینەوە بۆ سنووری چالاکی خۆمان،ئیتر بە شێوەی پارتیزانی ماینەوە تا کۆتایی پایز و بەرلەزستان سەرکردایەتی داوای لێکردین بگەڕێینەوە بەرەو زەڵێ وناوزەنگ.. ئیتر هەمووهێزەکانی سنوورەکەمان کۆبووینەوە و زۆر بە زەحمەت و دەردەسەری بە نێوان هەزاران رەبیە و سەربازگەو بۆسەی سوپای عێراق وجاشاندا گەیشتینەوە سەر سنووری ئێران. *

* نامەیەکی تایبەتی مامۆستا عادل شەریف



## پارتیزانی دوای ئەنفال

**عەلی محمد رسول (عەلە کەدە)**

**بیرەوەرییەکانمان بۆ دەگێڕێتەوە**

ئێمە دوای ئەوەی لە خۆشناوەتی گەڕاینەوە،بۆ ئەوەی بتوانین خۆمان بپارێزین بووین بە چەند دەستەیەك، ئەوڕۆژەی هەڤاڵانمان لە تۆڵکی هێرشێکی گەورەیان کرایەسەرو چەندین شەهید وبریندار یان دا، بۆشەوەکەی یەکمان گرتەوە، بڕیارماندا بۆ ماوەیەك لەو دەڤەرە دوور بکەوینەوە، ەماوەیەك بوو من تەندروستیم زۆرخراپ بوو،تووشی تاولەرز( مەلاریا )هاتبووم،دەستەیەك بەسەرپەرشتی کاك (ئاکۆسوور) بە کەڵەك لەزێ پەڕینەوە بەری سێگردکان،ئێمە لەوناوچەیە چەند هاوکارێکمان هەبوو،شەوی دووەم بەرێز (عبدالله لاله مولود) گەیشتەلامان، کەمنی وا بەنەخۆشی بینی زۆربۆم نیگەران بوو،بۆ شەوی سێیەم هاتەوە ، هەندێ دەرزی ودەرمانی بۆمان هێنابوو،کاك کاروان عبدالله دووبزی(کاروانی کادیر) یەکدوو دەرزی لێدام،دووسێ لەحەبەکانم خوارد،تەندروستیم باشتربوو،هەرچەند من زۆر لەڕو لاواز بووبووم کێشم هاتبووە خوار 35 کیلۆ، دووهاوکارمان هەبوو بەناوەکانی (سوارەقادرئیلنجاغی) و(مەردان لاڵە) خەڵکی قولیبەگ ،مەوعیدمان لەگەڵیان هەبوو لە حاوی قەرەناو،وا بڕیاربوو خواردن ودەرزی و دەرمان و جگەرە و پێداویستی ترمان بۆ بێنن، کاك ئاکۆ گوتی دەبێ بپەڕینەوە و بچین بۆ شوێنی دیاریکراو،هەمان ئێوارە گەیشتینە کەلاوەکانی گوندی جگیلە، شەو هاوکارەکانمان نەهاتنەشوێنی دیاریکراو،زۆرنیگەرانبووین،دوایی زانیمان هەردوکیان لەبازگەی(قەلاتە) گیرابوون. بڕیارماندا بچینە (هەناره)ی نزیك (حسنقەباغ) بەرەبەیان گەیشتینە شیوەسوور لەخوار گوندی کانی رەش لەو قومەلانەدا شوتیەکمان دۆزییەوە،کەسمان هەرگیز

شووتی وا گەورەمان نەبینیبوو، هەڵیان گرت و لەسەر پشتی گوێدرێژەکە و لەبەردەمی مندا دایان نا،بەڵام من زۆر بێتاقەتو زەبوون بووم،بۆ نەدەگیرا، بۆئەوەی نەکەوێ ونەشکێ. شوتییەکەیان کردە تایەکی هەگبەکەوە و منیشیان کردە تاکەی تریەوە،ماوەیەکی کەم رۆیشتین هەگبەکە بەلای شوتیەکەدا لاسەنگ بوو، تفەنگێکیان کردەپارسەنگ، هەندێکی تر رۆیشتین کاك ئاکۆ بەردێکی خستە تای هەگبەکەی لای منەوە ئەوسا هاوسەنگ بووین....پێش رۆژهەڵات گەیشتینە مۆردوقامیشەڵانەکانی(هەنارە) دە پارتیزان بووین، نیوەی شوتییەکەمان بە نانەوە خوارد،نیوەکەی ترمان بۆ ژەمی ئێوارە هێشتەوە،نیوەڕۆ هێزێکی زۆری سوپاو جاش لە شوانەوە هاتن،کەوتنە کێومالکردن و گەڕان بۆ دۆزینەوەمان ،باشبوو نەیاندۆزینەوە، سەر لە ئێوار بەرەودەورو بەری گوندەکانی (پەڵکانە) و(شەوگێڕ) شۆڕبوونەوە، ئێمەش لەحەشارگەکانمان هاتینە دەرەوە، بەناچاری لەکەل سەرکەوتین بۆن یوان گوندی (جەوەجەوە)و (سمایل بەگی)لەنزیك رەبییەکانی رژێم لەشیوێکی قووڵ کەهەرگیز کەس گومانی نەدەکرد پێشمەرگە بچنە ئەو شوێنە،لە ئاو زیاتر هیچمان پێنەبوو،ئەوشەوەو رۆژی دوایی تائێوارە لەوێ خۆمان حەشاردا، شەوی دواتر لەسەر کەلی هەنارەوە بە جیهاز پەیوەندیمان بە سەرکردایەتییەوەکرد، باسی نالەباری بارودۆخەکەمان پێ گەیاندن، زانیاریمان دەربارەی شەهیدبوونی سێ هەڤاڵمان لە کارێزە بەناوەکانی (سەرکەوت و جوتیار و نیزام محمد قادرعەلی ) پێ ڕاگەیاندن .داوایان لێ کردین، ماوەیەکی تر خۆمان رابگرین،هەمان شەو گەڕاینەوە بۆ حاوی (دەرماناو)چووینەوە شوێنەکانی خۆمان، پاش دووڕۆژ بۆشەوەکەی دیسان چووینەوە بۆ (هەنار)شەو لەوێ ماینەوە، بۆ رۆژی دواتر چەند هەلیکۆپتەرێك هاتنە ئاسمانی شێخ بزێنی رێك لای مەکۆکەی ئێمە لەحاوی دەرماناو هێزی جاش وسەربازی دابەزاند،هەموو پاشماوەکانی ئێمەیان لەوێ

سووتاندو هەڵفڕینەوە، جارێکی تر داوامان لە سەرکردایەتی کردەوە ڕەزامەندی بفەرموون بگەڕێنەوە بۆبارەگاکانی سنوور،ئیترلەهەنارەوەڕێکەوتین بەرەوماسقەلان، لەوێ لەگەڵ دوودەستەی تر یەکمانگرتەوەو بەڕێکەوتین بەرو قەڵاسێوکە...

## کۆبوونەوەی گوندی بێدەر

لەگوندی (بێدەر) کۆبووینەوە،ناوی ئەم هەڤاڵانەم لەیادە:(کوێخاسیروان،ئاکۆسوور، کاکەمەندحمەصالح(خاڵەبەخە)،خلیل بێدەری،مامۆستاعادل شریف،نەقیب ناصیح بیبانی،حسن شورتە،هیوارەش،تالیب فاروق، وریائاغجەلەری،ڕەنجە عومەرصدیق، کاروانی کادیر، سەربەستە دربژ،کۆردۆرەحمان،پۆلاهەیبەیی،ابراهیم فازڵ(ئیباو)، علی محمدرسول(عەلەگەدە)، یونس احمد(برای ئاکۆسوور)،سیروان صالح، شەماڵ ئاغجەلەری..) تا گەیشتینە پشتی ئاغجەلەر ژمارەمان گەیشتە (30) پارتیزان.پاش بڕینی ڕێگایەکی زۆر و بەناو دەیان تۆڕی دوژمناندا لە گەورەدێ وە بەرەو تەپەمارەکان و لەئاستی گوندی (قەرەچەتان)ەوە خۆمان گەیاندە (قولەڕەسی) و بناری چیای پیرەمەگرون..

ئەوخواردنانەی لەکۆڵەپشتیەکانمان بوون بەرەو تەواوبوون دەچوون،لەوەش ناخۆشتر پاتری جیهازەکەمان مردبوو،پەیوەندیمان بەسەرکردایەتییەوە پچڕابوو، لەوێ توشی راوچییەك بووین،ماڵی ئاوابێ هاوکاری کردین، هەندێ زانیاری دەربارەی شاخەکەو ڕێگای چوون بۆ ناو ئۆردوگای پیرەمەگرون پێدایین،بۆشەوی سێیەم هەڤاڵان(خلیل بێدەری و سیروان گۆگجەیی و حسەن شورتە)چوون بۆ ناو ئۆردوگا،خۆیان بەماڵێکی خاوەن تراکتۆردا کردبوو،گوتبوویان ئێمە چەکداری ڕژێمین،سەیارەکەمان لەسەر جادەکە کوژاوەتەوە، پێویستمان بەپاترییەك هەیە، پاترییەکیان وەرگرتبوو،بەزۆریش پارەیان دابووپێیان ...

**هەرهەمان شەو گەرانەوە لامان،بۆبەیانی جیهازەکەمان کەوتەوە کار،پەیوەندیمان بە سەرکردایەتییەوە کرد،شوێنی خۆمان بۆ دیاری کرردن،ئەوانیش بەجیهاز رەتڵی سورداشیان لەگەیشتنی ئێمەبەسنووری ئەوان ئاگادارکردبووەوە،پاش(24) کاتژمێر کاك(غەریب هەڵەدنی وئەنوەرتەلانی و چەندهەڤاڵ)گەیشتنەلای ئێمە..**

**هەرئەوشەوە لەگەڵ چەندهەڤاڵێکی ئێمەدابەزینەخوارەوە بۆ ئۆردوگای پیرەمەگرون و لەوێ بەهاوکاری (بەکرتەلانی)بڕی پێویستی خۆراك وپێداویستی ژیانیان لەگەڵخۆیان هێنایەوە..**

**ماوەی(10)رۆژلە بنکەکانی رەتڵی سورداش پشوومانداً،لەسەرداوای سەرکردایەتی بەرێکەوتین بەرەو سنوور.بۆ ئەم رێگا دووررودرێژە هەڤاڵ(مامۆستا جەلال تەلانی) چاوساغ و شارزامان بوو، بەدووررۆژ گەیشتینە سەرئاوی (هەرزنە)بەری ئەمبەری هەمووی رەبییەو مۆڵکەی سوپای عیراق بوو،بەری ئەوبەریش هەمووی مۆڵگەی سوپای ئێران بوو،هەرلایەك ئێمەی ببینیایە تۆپبارانی دەکردین،هیچ مەجالێك بۆ پەڕینەوەمان نەبوو،چوار شەووچوار رۆژ لەوێ ماینەوە،خۆراکمان تەواو بوو. برسێتی نارەحەتی کردین، یونس برای ئاکۆسوور پێشنیاری کرد ئێسترەکە سەربڕین و گۆشتەکەی بخۆین، کەچووین ئیسترەکەبهێنین سەیرمانکرد بەرەڵابووە. ملی بە ئاوەکەوەنا بەرەو ئەوبەرەوە، هەربۆیە لەوەش نائومێدبووین،ئیتر بەناچاری (مامۆستا جەلال تەلانی و ئاکۆسووررو یونس برای و حسن شورتە) کەوتنەڕێ بەرەوە پیرمەگروون بۆئەوەی خواردنمان فریا بخەن،بەداخەوە لە ڕێگا کەوتبوونە سەرمین(لغم)و مامۆستاجەلال لایەك لە پێی قرتابوو،بۆ شەوەکەی لەبەری ئەوبەرەوە بانگیان کردین،دوای دڵنیابوونەوە لەوەی کەپێشمەرگەن وەڵاماندانەوە. سەرکردایەتی(مام جوتیارو مامۆستاصلاح)و چەندهەڤاڵی تری ناردبوو بۆ فریامان. خواردنیان بۆ هێابووین، هەندێ هیلکەی کوڵاویان ئامادەکرد،مام جوتیار هیلکەی**

پاك دەکرد و دەیکردە دەم منەوە. منیش زۆر زەبوون بووبووم بۆم قووت نەدەدرا،چەندم دەکرد لەگەرووم ئاودیو ەدەبو،گوێم لێبوو لەبەرخۆیەوە دەیگوت: وەیش بەخوا ئەگەر ئەوانی تریش ئاوابن مانای وایە تەواو بوون..هەرچۆنێك بوو تێرملنخوارد،ئاهێك هاتەوە بەرمان دەستوبردسیمێکیان بەسەرئاوەکەدا رایەڵکردوهەمووەمانیان پەڕاندەوە.لەرێگای گوندی (ئەشکان)ەوە پێمەیان گەیاندە سەرسنوور و نووسراویان بۆکردین بچین بۆ شاری سەردەشت،شەودرەنگ لە ئوتێلێك دایانبەزاندین،هێندە ماندوو وهیلاك بووین یەکسەر خەومان لێکەوت، بەیانی لەدەنگەدەنگی بازاڕ بەئاگاهاتم هاواریان دەکرد:

. یالاّ هەنار،سێو ،پرتەقاڵ ، لیمۆ

بەلامەوە دنیایەکی سەیربوو.بەیانی بۆنانخواردن چووینە خوارەوە، هاوڕێیەکی پێشمەرگایەتیم بەلامدا تێپەڕی سڵاوی لێنەکردم دوایی گلەییم لێیکرد،سوێندی بۆخواردم کە نەیناسیوەتمەوە.ئاخر ناهەقی نەبوو،خۆم گەیاندە چێشتخانەیەك، ماوەیەك دانیشتم،کەس نەهات بەلامەوە،بانگی وەستاکەم کرد گوتم :

. ئەرێ کاکە ئەوەبۆ خواردن بۆمن ناهێنن..؟ گوتی کاکە تۆ چیت..؟

دیارە وایزانیبوو من شێتم گوتم من پێشمەرگەم،گوتی لەوانەی کەچەندرۆژە گیریانخواردبوو..؟

گوتم بەڵێ..

ئیتر زۆر رێزی لێگرتم خواردنی باشی بۆهێنام،چای عێراقی بۆکردم، بە دڵ خۆم خواردنم خوارد.هەرئەو رۆژە گەیشتینەوە قاسمەڕەش و سەرکردایەتی بەگەرمی بەخێرهاتنەوەی کردین،پاش چەند رۆژێکی تر هەڤاڵان( ئاکۆ سوور و یونس برای و حسن شورتە)یش گەیشتنەوە سەرکردایەتی.



# شەهید
## غەریب هەڵەدنی

دوای نسکۆی شۆرشی ئەیلول نائۆمێدی باڵی بەسەر کوردستاندا کێشا، بەسەدان لاوی خوێن گەرمی ئەم نیشتمانە لەچاوەڕوانی هەڵاتنی خۆرێکی نوێ بوون،زۆری پێنەچوو شۆرشی نوێ هەڵگیرسا.لاوان چوونە ناوشۆڕش و بەرەنگاری دوژمنی وڵات بوونەوە،هەرزوو دەستیان دایە چەکی بەرگری نیشتمان،بەڵێ هەر لە هەمان کاتدا شەهید غەریب هەڵەدنی یەکێك بوو لەو لاوانەی زۆر زوو خۆی گەیاندە کورەی خەباتی نەوشۆڕشەی کە یەکێتی نیشتمانی کوردستان رابەرایەتی دەکرد.

شەهید غەریب وەك بەشێك لەراپەراندنی ئەرکەکانی،پەیامی هەڤاڵانی شاری بەهەڤاڵانی شاخ دەگەیاند،یەکەم دەستەی شۆڕشی نوێ لە دۆڵی جافایەتی و لەگوندی هەڵەدنو لەماڵی عەبدولقادر حاجی باوکی شەهیدا هەڵسانەوە،مافی خۆیانە شانازی بەوەوەبکەن کە ماڵەکەیان ببوو بە لانکەی ئەم شۆڕشە پیرۆزە کە کوردی باشوری گەیاندە دوای مەنزلی خۆی و سەرکەوتنی بەدەستهێنا.

شایانی باسە شەهیدی سەرکردە زۆر بەگەرمی پێشوازی لەو ئەرکە ئەکرد کە پێیان ئەسپاردو بەو پەری خۆنەویستانەوە رای دەپەراند.

کە دەکرێت بەشێك لەئەرکانی دەستنیشان بکەین:-

1- بۆ یەکەمجار دەزگای چاپی لەماڵی شەهید نارامی سەرکردەدا گەیاندە گوندی هەڵەدنو لەبناری شاخی ژیلوانی بێناز کەوتوودا؟ یەکەم بەیاننامەی یەکێتیی نیشتمانی کوردستانی بەچاپ گەیەنراو بڵاوکرایەوە.

2. لەساڵی 1988 دوای ئەنفالە بەدناوەکان بۆ سەر ناوچە ڕزگارکراوەکانی کوردستان ودوای خاپورکردنی گشت گوندو شارۆچکەکانی کوردستان لەبڕیارێکی مێژوویی‌و کەم وێنەدا شەهید غەریب و هاورێکانی دروشمی کەم ژیان‌و کەڵ ژیانیان بەرزکردەوەو بڕیاریاندا وەك پێشمەرگەی پارتیزان لەناوچەی دۆڵی جافایەتی درێژە بەخەبات بدەن‌و مەحاڵیان گۆڕی بەڕاستی.

## ژیاننامەی شەهید

. شەهید لە ساڵی "1955" لە گوندی "هەڵەدن" لە خێزانێکی نیشتیمان پەروەر چاوی بەدنیا هەڵهێنابوو.

. لە تەموزی 1975 لە مەفرەزە سەرەتاییەکان شارباژێر بووبوو بە پێشمەرگە.هەر ئەو ساڵە، خۆی و باوکی کە ئەویش ئەندامی کۆمەڵە بوو،پەناگەیەکیان بۆ چاپخانەی کۆمەڵە لە تەنگەی مادێنای حەسەن بەگ لە چیای ژیلوان دانابوو.... بە ئامێرەکانی ئەم چاپخانەیە یەکەم بەلاغی عەسکەری شۆڕشی نوێ چاپکرابوو.

. ساڵی 1978 لەگەڵ هێزەکانی یەکێتی بەرەو برادۆست بەڕێدەکەون و لە ناوچەی هەکاری دووچاری کێشمەکێش و نەهامەتییەکی زۆر دەبن.

. بەشداری کۆنفرانسی 1 و 2 ی (کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان) دەکات .

. ساڵی1985وەك کادرێکی عەسکەری دەگوێزرێتەوە بۆ مەڵبەندی یەك لە قەرەداغ.

. ساڵی 1985 دەگەڕێتەوە دۆڵی جافەتی ولەگەڵ هەڤاڵەکانی ئەرکی گواستنەوەی بارەگاکانی یەکێتی لە ناوچەی ئالانەوە بۆ دۆڵی جافەتی پێدەسپێردرێ.

. ساڵی 1987 دەبێ بەکادیر لەسکرتاریەتی سکرتێری گشتی..

- هەرئەو ساڵە دەکرێتە فەرماندەی تیپی پارێزگاری..

. ساڵی 1988 لە گوندی هەڵەدن لە کاتی شالاوی ئەنفالی 1ی دۆڵی جافەتیدا بەگازی کیمیایی جۆری خوردەل بریندار دەبێ.

. لە حوزەیراندا بەشداری لە شەرەکانی سنوری مەڵبەندی 3دا دەکات و لە ئەیلولدا وەك فەرماندەی پارتیزانەکانی ڕەتڵی سورداش دەگەڕێتەوە بۆ ناوچەکانی دۆڵی جافەتی و مەرگە وسورداش و لەو ماوەیەدا ئەرکی ڕێکخستنی پەیوەندی نێوان سەرکردایەتی و ڕێکخستنی سلێمانی دەگرێتە ئەستۆ.

. لەبەرنامەی راپەڕینی ساڵی 1991 دا یەکێ لە فەرماندەکانی قۆڵی سورداش ولە گرتنی سەربازگەی مەرگەدا بریندار دەبێ.

. ساڵی 1992 بەشداری لەکۆنگرەی یەکەمی یەکێتیدا دەکات و پاش دامەزراندنی سوپای یەکگرتوی کوردستان دەبێت بە فەرماندەی لیوای 22 ی سەربە ناوچەی فەرماندەی سلێمانی. لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا بەشداری زۆر داستان و چالاکی دەکات لەوانەشەرەکانی ئاسنگەران، ژیلوان، قەندیل، سماقوڵی، دەشتی کۆیە، قەیوان ـ ماوەت. داستانی ڕزگاری، هەڵەموند، گەرەوان، دابان، هەلاج.

ـ سەلیقەیەکی کلتوری و شوێنەواری هەبووە. ساڵی 1993 ئاسەوارێکی گرنگی مێژویی پێشکەش بە شوێنەوارناسی سلێمانی دەکات کە مێژوی بۆ چوار هەزار ساڵ پێش ئێستا دەگەڕێتەوەو زیاتر لە پێنج ساڵ پاراستبووی. هەروەها شوێنی ئاسەوارێکی دیکەی گرنگی پیشانی هەمان فەرمانگە دابوو لە دەربەندی رەبەنە لە پشت گوندی قەرەچەتان لە بناری چیای پیرە مەگرون لە ناوچەی سورداش.

بیرەوەریەکانی کەتایبەتن بە ژیانی پارتیزانی ساڵانی 1988ـ1989 ساڵی 1994 لە سلێمانی لە دووتوێی نامیلکەیەکی بچوکی 54 لاپەڕەیدا چاپ کراون.ئەو نامیلکەیە بە ناونیشانی (خۆم دەورووبەرو هاورێکانم لە بریارێکی مێژوییدا) لەچاپخانەی سەرکەوتن چاپ کراوە .



# پارتیزانی دوای ئەنفال

# شەهید غەریب عەسکەری

- حەمەغەریب سەعید تۆفیق(غەریب عەسکەری)
- لەساڵی 1943 لەگوندی عەسکەر لەخێزانێکی جوتیار لەدایك بووبوو.
- تا پۆلی سێی ناوەندی خوێندبوو...
- ساڵی1956 پەیوەندی کردبوو بە (یەکێتی قوتابیانی کوردستان)ەوە.
- ساڵی 1961 بەشداری شەڕی دەربەندی بازیانی کردبوو.
- ساڵی 1962 لەبنکەی چەمی ڕەزان درێژەی دابوو بەپێشمەرگایەتی..
- لەساڵی 1964 لەگەڵ باڵی(م.س)دا چووبوو بۆ(هەمەدان)
- لە 1964 تا 1967 دووجار بریندار دەکرێ..

- دوای یەکگرتنەوەی هەردووباڵی پارتی لە1971 لەماڵەوە دادەنیشێ...
- لەساڵی 1977پەیوەندی دەکات بە(کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان)ەوە.
- هەمان ساڵدا بەنهێنی دەستەیەك پێشمەرگە پێکدەهێنێ بۆ پشتیوانی رێکخستن.
- ساڵی 1982 دەکرێ بەسەرپەرشتیاری هەرێمی 2ی کەرکوك.
- ساڵی 1982 دبێتە فەرماندەی تیپی99ی بتوێن.
- ساڵی 1986 دەگوازرێتەوە بۆ فەرماندەیی تیپی بارەگای مەڵبەند.
- ساڵی1983 لە رەزگە بریندار دەکرێ.
- ساڵی 1988 بەپارتیزانی لەچەمی رەزان لەگەڵ هەڤاڵەکانی دەمینێتەوە..
- هاوسەرەکەی و2 کوڕ وچەندین خزم وکەسوکارێکی ئەنفال دەکرێن..
- ساڵی 1991 بەرلەراپەڕین نامیلکەی(عەسکەرلەبیرەوەری پێشمەرگەیەکدا) دەنووسێتەوە و(نووسەر) پێداچوونەوەی بۆ دەکات وبۆی بەچاپ دەگەیەنێ.
- بەشداری راپەڕینی 1991دەکات ولەچەمچەماڵ بریندار دەبێت..
بەڵام بەبرینداری فەرماندەیی هێزێك دەکات بۆ ڕزگارکردنی کەرکوك.
- دوای کۆڕەو دەبێت بەفەرماندەی تالیۆنی 15ی چەمی رەزان.
- ساڵی 1991 دەکرێت بە ج ف هێزی دوکان.
- هەرهەمان ساڵ دەکرێت بە ج ف هێزی (5)ی سلێمانی.
- ساڵی 1992 خوولی ئەفسەران تەواو دەکات ودەکرێت بە(مقدم) لە هێزی یەکگرتووی پێشمەرگەی کوردستان لە لیوای 22ی دوکان.
- ساڵی 2003پلەکەی دەکرێ بە(لیوا)دەبێتە کارگێڕی فەرماندەیی و پاشان دەبێتە سەرپەرشتیاری مەشق و پشکنین..
- بەداخەوە لە 9/4 2007 دەگاتە کاروانی سەروەری.



## پارتیزانی دوای ئەنفال

### رەمەزان ئەحمەد( ئاکۆ سوور)

- ساڵی 1955لەگوندی شەوگێر شێخ بزێنی/ کەرکوک دێتە دنیاوە.

- لەساڵی1981پەیوەندیی بە کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە دەکات..

- لەسەرداوای خۆی چالاکی رێکخستن وپێشمەرگایەتی پێکەوە گرێدەدات.

- لەساڵی 1981 لەهەرێمی دووی چەمی رێزان دەبێتە پێشمەرگە.

- قۆناغەکانی پێشمەرگایەتی پلە بەپلە دەبڕێت، لەفەرماندەی مەفرەزە و کەرت وجێگر تیپ و سەرتیپ و بەتالیۆن و فەرماندەی هێز و دوای راپەڕینیش لەگەڵ دامەزراندنی سوپای یەکگرتووی کوردستان دەبێت بەفەرماندەی فەوجی دووی پاراستنی کەرکوك بەپلەی موقەدەم،دواترجێگری لیوای تایبەتی کەرکوك. بەرلەوەش و لەدوای ئەنفالەکان ئەرکی لێپرسراوێتی پارتیزانەکانی کەرکوك و رەتڵی 9ی سورداشی پێسپێردرابوو، مەدالیای زێرینی پارتیزانەکانی یەکێتیی نیشتمانی کوردستانی پێدەبەخشرێ.

- لەزۆربەی ناوچەکانی کوردستان پێشمەرگایەتی دەکات ، لەدەیان داستان بەشداری دەکات، وەك چالاکی(سەر رێگای کەرکوک هەولێر،کەرکوك، شیوەسوور، تورکی، داستانی رزگاری،دۆڵی جافایەتی، دابان هەلاج تاد).

لەژیانی پێشمەرگایەتیدا (5) جار بریندارەدەبێت.

- لەراپەڕینی1990دابەشداربووەودەوری هەبووەلەرزگارکردنی کەرکوك دا.

- شەوی 1994/12/25/24 لە چیای سەفین شەهید دەکرێت.

## شکۆ

شیعری / شاخی



بۆ ـ پارتیزانی گەشمردە ئاکۆ سوور

ئەوسای بروسکەی هەواڵێ
گێڕامیەوە..
بۆ چەم ڕەزان و پشت هەڵشۆ.
لە(سەربڕاو)..
بووم بە پەیکەر..
بووم بەکێل و بووم بەگڵکۆ.
لەپاینی ئارامگاکەی(مەلائاراس)...
بووم بە زوخاڵ..
بووم بە پشکۆ.
لەوساکەوە..
بەگەشمردەی ولات نەبێ..
بەکەس ناڵێم خاوەن شکۆ.
ئێستایش..
لەسای ساباتەکەی (امام احمد) دا
دۆش داماوم.
سەری ڕێزم دادەنوێنم.
بۆ هەڵۆکانی ( شێخ بزێنی ) ،
بۆ شاهۆ بەرزە فڕەکە و
گیانی ( ئاکۆ ).

شەوگێڕ
2015



## پارتیزانی دوای ئەنفال

## شەهید یونس أحمد حمە علی

- لەساڵی1954لەگوندی (شەوگێڕ)ی

ناوچەی (شێخ بزێنی) تەمەنی منالی ولاوی بەهەژاری ورەنجبەری وبەسەردەبات..

- ساڵی1982پەیوەندی بەرێکخستنی(کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان)ەوەدەکات.

- لەساڵی 1987 دەبێ بەپێشمەرگە لە(تیپی 21ی کەرکوک) بەشداری شەڕەکانی بەرگری لەئەنفال دەکات..

- لەساڵی 1989لەگەڵ دەستەیەك لەپارتیزانەکانی دوای ئەنفال دەگەڕێتەوە سنووری کەرکوك وسلێمانی،بەرلەراپەرینی 1991لەبارەگاکانی سەرکردایەتی بۆی گێرامەوە لەکاتی پارتیزانیدا رۆژێك هێندەبرسییان دەبێ،خواردن دەست ناکەوێ چاودەبڕنە ئەماینەکەیان کەناچاربوون سەری ببڕن وگۆشتەکەی بخۆن..

- لەکاتی راپەڕینەکەیشدا لەگەڵ هەڤاڵەکانی بەشداری لەراپەڕین دەکات..

شەوی 1991/3/13بەپەلە دەجێتوە ئۆردوگای(کەورگۆسك)و چاوی بەدایك وباوك وکەسوکاری دەکەوێت وهەرئەوشەوە دەگەڕێتەوەهەولێروبۆبەیانی دەچێتەگۆڕی هەردوو براشەهیدەکەی لە گۆرستانی (گردەرەشە)،لەوێ بەڵێنی درێژەدان بەرێبازی شەهیدان نوێ دەکاتەوە وبەرێدەکەوێت بەرەولای هەڤاڵەکانی لە محوەری پردێ .

- رۆژی 1991/3/20 دوای بەتەواوەتی رزگارکردنی کەرکوك، لەگەڕەکی رەحیماوا لەئەنجامی کەوتنە خوارەوەی گوللەتۆپێك دەگاتە کاروانی شەهیدان...

- شەهید یونس .. برای (شەهید ئاکۆسوور)بوو.



# شەهید صمدأحمدحمەعلی

## ناسراو بە (مەلاسەمەد)

- لە 1951 لەگوندی سێگردکان لەدایك بووە.

- لەمناڵییەوە چۆتە حوجرەی مزگەوتان بەمەبەستی خوێندنی ئاینی(مەلایەتی).

- پاشان چۆتە قوتابخانە گوندەکەی تاقۆناغی سەرەتایی وناوەندی تەواوکردووە.

- لەساڵی 1981پەیوەندی کردووە بە (کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان)ەوە.

- کادیرێکی چالاکی نێوجوتیارانی (شێخ بزێنی ) بووە

- لەدوای ئەنفالەکان ماوەیەك لە بەری کەرکوك و کۆتانەکان بەپارتیزانی ماوەتەوە،

- لەمانگی ئابی 1988 لە یارگەی دەربەندی گومەسپان لەلایەن رژێمەوەدەگیرێ ..

- رۆژی 1988/10/12لەسەربازگەی (رەشکێن)ی هەولێر لەگەل (صالح)ی برای و چەندکەسێکی تر بەبەرچاوی خەلك و سەدان سەربازەوە گوللەبارانیان دەکەن.

- شەهید براگەورەی شەهیدان(ئکۆسوور و صالح BKC ویونس وعقید محمد و بکر ) و مامی شەهید (دارا ئاکۆسوور) بوو.

## شەهید صالح أحمد حمەعلی

**ناسراو بە( صاڵح bkc )**

- لە ساڵی 1954 لە بنەماڵەیەکی تێکۆشەری جوتیار وچەوساوەداچاو هەڵدێنی..

تەمەنی مناڵی ولاوی و دواتریشی هەر بەرەنجبەری وهەژاری بەسەردەبات.

- لەشۆڕشی ئەیلولدا لەدەستەکەی شەهیدی فەرماندە (د.خالدسعید) دەبێتە پێشمەرگە خەبات دەکاتانسکۆی 1975 پاشان ژیانی ئاسایی درێژەپێدەدات.

- ماوەیەك بۆکرێکاری رووڵەشاری کەرکوك و شاری بەغدا دەکات.

- لەرێی (کۆمیتەی ئاگر)ەوە پەیوەندی بە رێکخستنەکانی (کۆمەڵە)وەدەکات.

- لە1982/1/1 لەلایەن دەزگای ئەمنی ناحیەی( شوان)ەوە دەگیرێ ورەوانەی زیندانەکانی(أمن کرکوك)دەکرێ،لەوێ لەگەڵ پێشمەرگەی زیندانکراو تۆفیق تورکەیی ( کوردە ) کەلەلایەن ئەمنی شوانەوە رفێندرابوو،لەژوورێکدا پێکەوە دەبن ، لەرێگای نامەیەکەوە هەڤاڵ (مەلاشاخی ) لەئاشکرابوونی ناوی 17هەڤاڵی رێکخستن لەسنووری شوان وپردێ و تەقتەق ..ئاگادار دەکەنەوە..

پاش ئازارونەشکەنجەی زۆرهیچ نادرکێنێ لەسەرەتای مانگی ئازاردا ئازاددەکرێ.

- لە رۆژی 21ی ئازار دوای رووداوەدڵتەزێنەکەی گوندی مۆرخوادە وشەهیدبوونی کاك (علی صاڵح)وهەڤاڵکانی ،بۆئەوەی سەنگەرەکانیان چۆڵ نەبێت ئەبێتە پێشمەرگە لەتیپی 21ی کەرکوك.

- بەداخەوە ئەویش رۆژی1988/9/12لەهەولێرگوللەبارانکرا.



## پارتیزانی دوای ئەنفال
## کاکەمەند حەمەساڵح (خاڵە بەخە)

- ساڵی 1952 لەگوندی (مەرزیخە ) لەبنەماڵیەکی جوتیارچاوهەڵدێنێ.
- ساڵی 1979 پەیوەندی دەکات بە(کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان)ەوە.
- ساڵی1980دەبێتە پێشمەرگە لە هەرێمی2ی کەرکوکی (ی ن ک).
- لەرۆژی نەورۆزی1982لەگوندی (مۆردخوادە)ی سەروو لەبناری خاڵخالان لە هێرشێکی دوژمندا هەڤاڵ (علی ساڵح) وچەند هاورێیەکی شەهید دەبن.. ئەویش بەبریندار ی دەکەوێتە دەست دژمن و دوای ئازارو ئەشکەنجەی زۆر حوکمی لەسێدارەدانی بۆدەبرنەوەورەوانەی موسڵ دەکرێ بەڵام بەهۆی رەمەزانەوە حوکمەکەی جێ بەجێ ناکرێ وبۆ جەژنیش بەلێبووردن ئازاد دەکرێ.
- دوای ئازادکردنی دەچێتەوە تیپی 21ی کەرکوک و دەبێتەوە بە پێشمەرگە..
- پێشمەرگەیەکی ئازا و گورج وچالاك دەبێ..
- بەشداری دەیان چالاکی دەکات وەك(گرتنی بازگەی کەرکوک،کەمینی شیوەسوور، گرتنی قەلاتە،تەقتەق،شەری نێوان پردێ - کەرکوك،دووبزنی.سوورکەل،گۆپتەپە، ئاغاجلەر،دابان هەلاج،قەیوان - ماوەت،بەرگری لە سەرکردایەتی.)
- دووجار بە سەختی بریندار دەبێت.
- لەگەڵ ئاکۆسوور وهاورێکانی پارتیزانی دوای ئەنفال سنووری کەرکوك دەبێت.
- بەداخەوە لە دوای هێرشی گاردی کۆماری بۆ سەرهەولێر لەرۆژی 1995/9/5 لەگوندی (پونگینە) لەگەڵ 24 پێشمەرگە دیل دەکرێن و پاشان گوللەباران دەکرێن.



## پارتیزانی دوای ئەنفال
## شەهید حاکم شەوکەت

- شەهید شەوکەت عەبدوڵا حەمەڕەش(حاکم شەوکەت)
- ساڵی 1950 لەگوندی (عەلاوە مەحموود)ی خۆرئاوای کەرکوك هاتۆتە دونیاوە
- لەساڵی1980پەیوەندی دەکات بە(کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان)ەوە،
- لە 1982 ئامادەیی کشتوکاڵی لەکەرکوك تەواو دەکات.
- ساڵی 1983 لە(کەرتی 3ی شەهیدانی(تیپی 21ی کەرکوك) بووە بە پێشمەرگەو لە 1985 گواستراوەتەوە بۆ تیپی 25ی خاڵخالان و ساڵێك دواتربووەتەحاکمی شۆڕش لەسنووری(تیپی25ی خاڵخالان).
- بەشداری زۆربەی داستانەکانی (ی.ن.ك)ی کردووە، لەوانە: شەڕو نەبەردییەکانی سنووری کەرکوك و کێوەڕەش و دۆڵی پڵینگان و دابان ـ هەلاج و قەیوان ـ ماوەت و داستانی رزگاریی و شەڕەکانی بەرگریکردن لەسەرکردایەتی لەناوچەی دۆڵی جافایەتی و سەرگەڵوو- بەرگەڵوو.
- لەپاش ئەنفال وەك پێشمەرگەیەکی پارتیزان و خۆڕاگر ماوەتەوە...
- هەزارحەیف لە شەوی 1988/9/24/23 دەگاتە کاروانی شەهیدان.

# شەهیدبوونی(حاکم شەوکەت)

لەپایزی 1988دا پارتیزانەکانی (تیپی 25ی خاڵخاڵان) شەوێك دەچنە گوندی (تیژە)ی ناوچەی شوان،لەدرنگانی شەودا لایتی ئۆتوبێلێك دەبینن،دەیانەوێ لەسێریانی(تیژە - تلیان - فەقێ میرزا)پێشی بگرن، فریاناکەون،لێیان تێپەڕدەبێ، دوای ئەوەی دڵنیا دەبنەوە کەچۆتەگوندی(فەقێ میرزا) هەڤاڵان(سیروان گۆگجەیی و وریائاغجەلەری) بەرلەهەڤاڵانیان بەرەو ئەوێ دەکەونەڕێ،بەڵام دوای نزکبوونەوەو گوێبیستی دەنگە دەنگەکانیان..گومانیان لەلا دروست دەبێت کە(جاش)بن،هەربۆیە هەڵوەستەیەك دەکەن..پاش کەمێ هەمووهاوڕێیان دەگەنە لایان..

پرسیار دەکەن ئەوەبۆ نەچوونە ناوگوندە رووخاوەکەوە ..؟ ئەوانیش ئەڵێن:

(راستی گومان دەکەین چەکداری رژێم بن، بۆشرەخۆری هاتبن..)

مامۆستاعادل شریف ووریائاغجەلەری پێشنیاردەکەن خۆیان بەدووربگرن و بڕۆن..

کاك(حاکم شەوکەت)کەکادرێکی کاراو چالاکی کۆمەلایەتی و، زۆر دڵسۆزی جەماوەرو ئەویش لای خەڵك خۆشەویست دەبێ، لەپڕ دەچێتەپێشەوە وئەڵێ:

( من خواخوامە هاووڵاتییەك ببینم، شێت بووین لەم چۆلەوانییە، ئەوانە خەڵکی گوندەکەن بۆ کۆکردنەوەی پاشماوەی ماڵەکانیان هاتوون..) ئیتربەرەو گوندەکە پێشڕەوی دەکات، هاوڕێبان(سیروان گۆگجەیی وهیوارە ش وکاك وریا) بەناچاری لەگەڵی دەڕۆن، لەرێ کاك وریا پێی ئەڵێ :

( تۆ خیزاندار و خاوەن منالی لەپێشەوە مەڕۆ..)دیارە ئەوسەردەمە ئەوگیانی لەخۆبوردییە لەناوپێشمەرگەداهەبوو،ئیترهاوشان دەچنەپێشەوە،تا دەگەنە ئاسۆگە، جاشەکان بەباشی دەیان بینن و خۆیان لەبۆسە دەنێن و دەنگیان لێ دەکەن :

( هۆوو ئێوە کێن..؟)

ئەوانیش هێمنانەو لەسەرخۆ وەڵامیان دەدەنەوە خۆمانین..!بۆئەوەی هاوڕیکانیان ئاگاداربینەوە و بڵاوەی لێ بکەن..لەپڕ جاشەکان دەستڕێژیان لێ دەکەن، هەرسێکیان خۆیان بەزەویدا دەدەن .تەنیا کاك حاکم شەوکەت نەبێ..بەداخەوە فیشەکێك بە

سەردڵی دەکەوێ ویەکسەرشەهیددەبێت..پاش شەڕیکی کورتخابەن،لەبەر نزیکی ناوچەکە لە هێزەکانی رژێم و رۆژبوونەوە و هاتنی (هەلیکۆپتەر) تەرمی شەهیدەکە هەڵدەگرن و دەکشێنەوە،بەپەلە لەنزیك گوندی(پەلکەرەش)بەخاکی دەسپێرن.

دوای راپەرینی1991کۆمەڵێ لەکەسوکاروهاوڕێیان دەچن بۆ گوندی پەلکەرەش بەمەبەستی دۆزینەوەی روفاتی شەهید (حاکم شەوکەت)، بەڵام بەهۆی نەمانی نیشانەکان وگۆڕانکاری لەپێکهانەی بەرزو نزمی شوێنەکە، نایدۆزنەوە بەنائومێدی دەگەڕێنەوە.

دوای رووخانی رژێم لە ساڵی 2003 و گەڕانەوەی خانەوادەکەی بۆکەرکوك... هەڤاڵ (رەفعەت عەبدوڵا) چەندکەسێك لە هاوڕێ پارتیزانەکانی و چەندکەسێك لە هاوڕێ و خزمانی ناوچەکە، بۆجاری دووەم دەچنەوە گوندی(پەلکەڕەش) و روفاتی شەهید دەدۆزنەوەو دەیبەنەوە لەگۆڕستانی گوندی (عەلاوەمەحموود) لەنزیك گۆڕی شەهیدی نەمر (عەبدولاحەمەڕەش)ی باوکی بەخاکی دەسپێرنەوە...

## ناوی پارتیزانەکان:

1 ـ مامۆستا عادل شەریف ـ فەرماندەی کەرت
2 ـ سیروان گۆگجەیی جێگری ـ ف کەرت
3 ـ غەریب بێدەری ـ فەرماندەی کەرت ـ شەهید بووە.
4 ـ هیوا ڕەش فەرماندەی دەستە
5 ـ شەوکەت عەبدولا حەمەڕەش ـ کادری کۆمەڵایەتی
6 ـ وریا ئاغجەلەری ـ کادری کۆمەڵایەتی
7 ـ شەماڵ ـ کادری شۆڕشگێران
8 ـ شێرزاد عەریف رەمەزان ـ پ .م ـ شەهید بووە.
9 ـ ئیسماعیل شەریف ـ پ.م ـ برای مامۆستا عادل *

* سەرچاوە : دەفتەری بیرەوەری / وریا ئاغجەلەری / 2019



## شەهید رفیق کریم جاف

# ناسراو بە(حاکم ڕێبوار

چەند ئەستەمە خامە بۆ قارەمانێتی و دڵسۆزی ئەو شێرە پیاوە بنووسێ، بەلام ئەمە ژیانی راستەقینەی ئەو فەرماندە لیهاتووەیە کە بووە داستان بۆ مێژووی پڕ لەشانازی گەلەکەمان.شەهیدی فەرماندە رەفیق کەریم (حاکم ڕێبوار) گۆپتەپەیی.

- ساڵی 1953 لەگوندی گۆپتەپەی سەر بەناحیەی ئاغجەلەر چاوە گەشەکانی بەژیان هەلهێنابوو.
- ساڵی 1975 لەگەڵ دروستبوونی مەفرەزە سەرەتاییەکانی(ی.ن.ك) دەبێتە پێشمەرگە لەهەرێمی(2)ی کەرکوك.
- ساڵی 1980 لە هەرێمی(3)دەبێتە فەرماندەی مەفرەزە، دواتر لەبەر لیهاتوویی و ئازایەتی خۆی دەبێتە فەرماندەی کەرت لەتیپی (23)ی سورداش.
- ساڵی 1984 گوازراوەتەوە بۆ تیپی(21)ی کەرکوك و دواتر کراوە بەحاکمی تیپی(25)ی خاڵخالان، ئەو فەرماندە قارەمانە بەشداری زۆربەی نەبەردی و چالاکییەکانی هێزی پێشمەرگەی کردووەو دەوری کاریگەروبەرچاوی هەبووە لەهەموو نەبەردییەکاندا..
- لەڕۆژی1988/5/5 (2) ڕۆژ دوای کیمیابارانکردنی گوندەکەیان لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە، لەگەڵ پۆلێك پێشمەرگەی قارەمانی تر بۆ بەرگریکردن لەخاك و گەلەکەی بریار دەدەن بە پارتیزانی درێژە بە خەبات بدەن، بەداخەوە لەشەڕێکی قارەمانانەدا شەهیددەکرێ ودەچێتە ریزی کاروانی شەهیدانەوە.






## شەهیدبوونی (3)پارتیزان لەبناری خاڵخاڵان

دوای ئەوەی پارتیزانەکانی کەرکوك لە سنووری بتوێن وکۆیەوە دەگەڕێنەوە بۆ سنووری شوان و شێخ بزێنی.. بۆئەوەی کەمترین زیانیان پێ بکات ،دەبن بەچەند دەستەی بچووك ،هەردەستیەکیش سنوورێك بۆکار وچالاکی خۆی دیاری دەکات. لە رۆژی14 11/1988 لەکاتێکدا دەستەیەك لە پارتیزانەکانی دوای ئەنفال لە نێوان گوندەکانی کارێزە وتەپەکوڕە و(گلەکەمردوو)دا لەبنکەیەکی نهێنیدادەبن جاش وسەربازەکانی ڕژێم شوێن پێیان هەڵدەگرن ودەچنە سەریان..

دوای بەرگرییەکی قارەمانانە ودەستەویەخە چەند کەسێك لەدوژمندەکوژرێ و سێ پێشمەرگەی قارەمانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان ئەو پارتیزانانەی جێگای ئومێدی گەل بوون بەم ناوانەی لای خوارەوە دەگەنە کاروانی سەروەری:

1ـ إبراهيم أحمد خدر (سەرکەوت)

2 ـ خيرالله سعيد محمد(جوتیار)

3 ـ نیزام محمد ابراهيم (نیزام قادرعەلی)

ـ پۆلاهەیبەیی لەبیرەوەرییەکانی دا ئاواباس لەشەهیدبوونی ئەم هەڤاڵانە دەکات:

( پاش کۆبوونەوە لەگەڵ سیروانی کوێخا نەجم، من وحەمە سەقەرو شەهید سەرکەوت ئەحمەد بەرێکەوتین بەرەو هەڵەتی خوار گوندی کارێزە بۆ سەردانی بنکەیەکی قایم کە لای من جێگای گومانبوو ئێوارە هەرسێکمان گەیشتینە بنکەکە تەنیا 3 پێشمەرگەی (ی.ن.ك) لێبوون ئەوانیش کاروان دوبزی و جوتیار کەرکوکی و نیزام محەمەد بوون، بۆ رۆژی دواتر لە 1988/11/14 لە کارێزەی خاڵخالان.کە لەخەو هەستاین دونیا زوقم بەستبووی، شەهید جوتیار زۆر نەخۆش بوو، دەمەو بەیانی جاش هاتە سەرمان لەوکاتەدا شەهید نیزام حەرەس بوو،هەرلەوێ جوتیارکەرکوکی شەهیدبوو.پاشان چووینە کەڵبەزێکەوەو جاش لەهەموو لایەکەوە دەوریان گرتین.. سەرکەوت کەرکوکیش شەهید بوو، پاشان نیزامیش شەهیدبوو)

ـ رژێم تەرمی شەهیدەکانی بەکۆپتەربردەوە بۆچەمچەماڵ و لە لایەن شارەوانییەوە بەجل و بەرگەکانیانەوە نێژران، دوای راپەرینی 1991 گۆڕ بەکۆمەڵەکەیان کەهەر هەموویان لەیەك چاڵی دەمەشۆفەڵدا نێژرابوون ،هەڵدرایەوە بە مەراسیمێکی شایستە گوێزرانەوە و جارێکی تر بەخاك سپێردرانەوە.*

* سەرچاوە: بیرەوەرییەکانی پۆلاهەیبەیی 2019



شەهید جوتیار کەرکوکی

* شەهید خەیرولاسەعیدمحەمەد ورمزیاری (جوتیار)

- سالی 1954 لەگوندی باجوانی کەرکوك لەدایك دەبێ..

- خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لەکەرکوك لەگەڕەکی رەحیماوا تەواودەکات.

- لە 1983/3/5 پەیوەندی بە (ی.ن.ك)ەوە دەکات و لەتیپی 21ی کەرکوك کەرتی یەکی سالەیی دەبێت بەپێشمەرگە.

شەهیدجوتیار ئەندامێکی چالاکی رێکخستنەکانی کۆمەلەی رەنجدەرانی کوردستان بووە و ئازاو خۆراگرو چوست و چالاك بووە، بەشداری زۆربەی شەرەکانی سنوری تیپی 21ی کەرکوکی کردووە، لەشیوە سوورو سەرجادەی کەرکوك هەولێرو داستانی گرتنی بێتواتەو شەڕی گوندی گۆپتەپە و دابان هەلاج و قەیوان ماوەت و شەڕەکانی سەرکردایەتی و دواتر شەڕەکانی بەرگریکردن لەئەنفالەکان.

- لە رۆژی 11/14 1988 لە نزیك گوندی کارێزەی خالخالان شەهید دەبێت.



## شەهید

## ئەحمەد محەمەد ئەحمەد(ئەحمەد قەسرۆکی)

- لەساڵی 1952 لەگوندی قەسرۆکی بناری خاڵخاڵان چاوی هەڵدێنێ.
- بەشداری شۆڕشی ئەیلول دەکات.
- ساڵی 1980 لەڕێی شەهید(ئەحمەدبەگ)ەوەپەیوەندی بە یەکێتی یەوە دەکات.
- ساڵی 1981 دەبێتە بەپێشمەرگە لە هەرێمی2ی کەرکوك.
- لەساڵی 1982 ناوی خۆی تۆماردەکات بەپارتیزانی بچێتە باکووری کوردستان.
- بەشداری لە نەبەردییەکانی گۆگجە، سوورکەل، شیوەسوور، کۆزەبۆرە،گۆپتەپە، گرتنی سەیتەرەی کەرکوك، گرتنی تەقتەق، شەڕی گردەسۆر، کەلی سمایل بەگی. قەیوان - ماوەت ....دەکات.
- لەژیانی پێشمەرگایەتی شەش جار بریندارەبێت..
- بەرلە ئەنفال فەرماندەی کەرت بوو
- لە دوای ئەنفال ماوەیەك بەپارتیزانی لەبناری خاڵخاڵان دەمینێتەوە.
- لەکاتی هاتنە خوارەوەی پارتیزانەکان بۆسنوورە کەرکوك ، لەبتوێن وڕانیە هاوکار و چاوساغی کردوون دوای ڕاپەڕینی 1991 چەندین پلەی فەرماندەیی پێسپێردراوە وەك(سەرتیپ، فەرماندەی بەتالیۆن، فەرماندەی فەوج.
- لە 5/8/ 2001 دڵەگەورەکەی لەلێدان دەکەوێت ودەگاتە کاروانی سەروەری.



## شەهید
## مەلا ئەسعەدی پەڵکانە

**هەڤاڵان اسعداحمد(مەلائەسعەدی پەڵکانە) و( ابراهیم خورشید محمد جەوەجەوە )و (حسن عمرصالح قولیبەگی) بۆ ماوەی دوومانگ زیاتر وەك پارتیزان لەگەڵ ئێمەدا لە بناری(دێدەوار) مانەوە,دواتر لەسەردانێکدا بۆ ئۆردوگای (بنەسەراوە) لە نزیك (کانی بزرە) چەندخۆفرۆشێکی کورد بۆسەیان بۆدەنێنەوە وخۆیان وەك پێشمەرگە دەناسێنن,بەداخەوەخافڵگیریان دەکەن و بەدیاری رادەستی بەرێوەبەرایەتی ئەمنی هەولێریان دەکەن. پاش چەند مانگێك ئازار وئەشکەنجە و لێکۆڵینەوە،دواترلەگەڵ دەکەسی تردا گولەبارانیان دەکەن و لە گۆڕستانی(معمل قیر)بەخاك دەسپێرن..**

**لەدوای راپەڕینی 1991ودەستبەسەرداگرتنی دەیان بەڵگەنامە بەپێیبەڵگەنامەی ژمارە(10) لەمێژووی1988/8/25 وەفاتنامەیان بۆکراوە ..***

**کەسوکارەکانیان ئێسك و پروسکیان دەدۆزنەوە و بەخاکیادەسپێرتەوە..**

## ناوی شەهیدەکانی ناو بەڵگەنامەکە:

**( ابراهیم خورشیدمحمد،حسن عمرصالح،اسعد احمدمحمد،سەروەرهیدایەت سورە. امین ناوخۆش عبدالرحمن، ریبوار حسن ،شێرزاد باپیر مام شیخ، عیسی محمدعلی. عبدالزاق خدرمام شیخ،وریاسعید عبدالرزاق،سلیم احمد عبدالله،سەردارتەها بەکر. فازل شافی میرزا)**

* سەرچاوە: ئەنفال خالخالان/ مەلاشاخی / چاپی یەکەم 2001



# پارتیزانی دوای ئەنفال

# ئاوات رشیدمحمد (ئاواتەڕەش)

- ئاوات رشید محمد هەمەوەندی
- لە ساڵی 1950 لەکەرکوك هاتبووە دنیاوە.
- لە ساڵی 1981 لەهەرێمی 2ی کەرکوك بوو بوو بەپێشمەرگە.
- چەند جارێك بەسەختی بریندار بوو بوو.
- لە1988 تا 1990 پارتیزان بووە.
- میدالیای پارتیزانی پێ درابوو.
- برایەکی بەناوی (نەوزادرشید محمد) پێشمەرگەی تیپی 21ی کەرکوك

لە (داستانی دابان) لەگوندی کەندەشێن) شەهیدبوو بوو.

- دووبرای تری بەناوەکانی :
- ئازاد رشیدمحمد لەدایك بووی 1957 کەرکوك
- هەژار رشیدمحمد لەدایك بووی 1955 کەرکوك

لەلایەن رژێمی بەعسەوە گیران بوون و بێ سەرووشوێن کرابوون.

- ئەوئاواتەی..کەناوی ئاوات بوو لەسەرەتای لاویەتییەوە هەستی بە چەوسانەوەی گەلەکەی کردبوو هەزاران ئاواتی لە دڵە گەورەکەیدا هەڵگرتبوو، هەربۆیە رێگای بەرانگاربوونەوەی چەوسانەوە و(تەعریب وتەرحیل وتەبعیس)ی هەڵبژارد..

ئاوات ... ئاواتی گەیشتی گەلەگەی بووبە مافە رەواکانی خۆی وەك سەرجەم گەلانی تری جیهان

- بەداخەوە لە1995/3/24.23 لەچیای سورێن شەهیدکرا..



## پارتیزان نەهرۆ قەسرۆکی

- عزیز معروف قادر رەسولٚ (نەهرۆقەسرۆکی)
- ساڵی1965 لە گوندی(کانی رەش) ناحیەی تەق تەق چاوی هەڵهێنابوو.
- ساڵی1980 پەیوەندی بە(کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان)ەوە دەکات.
- ساڵی1981 پەیوەندی بەهێزی پێشمەرگەوە دەکات لە هەرێمی2 ی کەرکوك.
- لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا بەشداری دەیان نەبەردی و داستان و چالاکی کردووە لەوانە لێدانی بازگەی کەرکوك -شیوەسوور، رەبیەکانی جادەی چەمچەمال، لێدان و گرتنی ناحیەی تەق تەق،داستانی رزگاری،قەیوان ماوەت،دۆلەرەقە،دۆلی ئاکۆیان، کێوە رەش ،خەجە لەرزۆك،گرتنی ئاغجەلەر....
- ساڵی 1985 دووجار بریندار بووە لە شەرەکانی (شیوەسوور، تەوەکەڵ) .
- لەساڵی 1988 فەرماندەی کەرتی شیوە سوور بووە.
- دوای ئەنفالی چوار بەپارتیزانی لە بناری خاڵخالان دەمینێتەوە..
- لە ساڵی 1989 دوا پلەی جێگری تیپ بووە لە تیپی (21) ی کەرکووك.
- لەراپەرینی 1991 دا رۆلی هەبووە لەرزگارکردنی شاروشارۆچکەکان.
- لە دوای راپەرین لە هێزی (7 ی کۆیە درێژەی بە پێشمەرگایەتی داوە.
- لە دروستبوونی لەشکرەکان دەکرێتە جێگری فەرماندەی لەشکری کۆیە.
- لە شەوی 28/27 .8 . 1996 لە سەرشاخی کێشکە شەهید دەکرێ.
- ناوی هاوسەری: (خوناو مامند رسولٚ)ە
- ناوی مندالەکانی : (کارۆخ ـ بێلان ، بێ گەرد ، ئالان)ە.



# پارتیزانی دوای ئەنفال

# صمد محمد إسماعیل(فریاد قەسرۆکی)

* شەهید صمد محمد إسماعیل ناسراو بە (فریاد قەسرۆکی)

* لە دایك بووی سالی 1967

* لە سالی 1979 پەیوەندی کردبوو بە رێکخستنەکانی(کۆمەلە)ەوە

* لە سالی 1981 بوو بوو بە پێشمەرگە لە هەرێمی دووی کەرکوك

یەکێك لە فەرماندە ئازاکانی تیپی21 ی کەرکوك و تیپی 25 ی خاڵخاڵان بوو.

* بەشداری پتر لە دەیان نەبەرد و چالاکی کردبوو..

وەك شەڕەکانی (قەبوان ماوەت) و (سەرکردایەتی) .....

* لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا (4) جار بریندار بوو بوو.

* دوا پلەی جێگری فەرمانەدەی فەرماندەیی 63 ی شێخ بزێنی بوو..

* لە رۆژی 2003/3/28 لە کوندی (بانی شار)ی داوێنی جیای (سورێن)

لە شەڕی(جوند الاسلام)دا شەهید بوو ..

* لە گۆرستانی (شێخ احمد) بەخاك سپێردرا ..

لە کاتی بەخاك سپاردنی دا وتارێکم پێشکەشکرد(نووسەر)

ئاماژەم بەوە دا کە رۆژانی داهاتوو کۆتایی تیرۆریستان ورزگار کردنەوەی

شاری کەرکوك وکۆتایی دەسەلاتی (صدام حسین) ی دیکتاتۆرە.



## پێشمەرگەو هاوکاری پارتیزانەکان
## شەهیدفارس قادرعلی(سوارە)

ـ شەهیدی نەمر(فارس قادرعلی) ناسراوە بە(سوارە) ـ لە ساڵی1971 لە خێزانێکی هەژارو کوردپەروەری گوندی ئیلنجاخی ناوچەی شوانی پارێزگای کەرکوك چاوی بەدونیا هەڵهدەهێنێت،بەهۆی شۆرشی ئەیلولەوە خێزانەکەی ئاوارەی دیوی ئێران دەبێت، هەرلەوێ دەخرێتە بەرخوێندن...

ـ لەساڵی1974باوکی لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە دەستگیر دەکرێ وپاش ئەشکەنجەو ئازارێکی زۆر ئازاددەکرێ،بەڵام لەبەرخراپی باری تەندروستی بەهۆی شوێنەواری ئەشکەنجەکانی زیندان ڕەوانەی ئێران دەکرێت ولەنەخۆشخانە لەشاری ئەهواز گیانی پاکی دەسپێرێ..

ـ کاکە سوارە هەر لەمنداڵییەوە بەهۆی هوشیاری وزیرەکییەوە کە بەسیمایەوە دیاردەبێ،دەبێتە جێی ئومێدی خانەوادەکەی ..

ـ لەساڵی1985لەتیپە قارەمانەکەی (مەڵبەندی دوو) دەبێتە پێشمەرگەو پاشان لەسەر داخوازی خۆی دەگوێزرێتەوە بۆ تیپی25ی خاڵخالآن...

بەشداری زۆربەی نەبەردییەکانی کردووە.

ـ لە ڕاپەرینی 1991 دا ڕۆڵی بەرچاو ئەبینێ لە رزگارکردنی تەقتەق و کەرکوك..

ـ سەد مخابن لە شەوی22/21ی ئازاری ساڵی1995 لە هەڵمەتێکدا بۆ سەنگەرەکانی سوپای عێراق لەنیوان(سمایل بەگی ـ تەپەکورە)شەهیددەبێت.

# پارتیزانی دوای ئەنفال

# عوسمان گێچینەیی!



**رۆژی سێشەممە 2ی ئۆکتۆبەری 2018 وڵاتی نەرویج**

**پێشمەرگەی دێرین و پارتیزانی ڕەتڵی سورداش عوسمان گێچینەیی ماڵئاوایی لێکردین.**

**هاورێیی رۆژانی پارتیزانی (عوسمان سێدەری) بەم شێوەیە لاواندوویەتییەوە:**

هاورێ گیان ..! هەرگیز ئەو رۆژانەم لە بیرناچێ کە سێ قۆڵی (شەهید غەریب هەڵەدنی و تۆ و بەندە)، لە کۆتایی مانگی ٩ی سالی ١٩٩٠ دا لە قاسمە ڕەشەوە بەڕیکەوتین بۆ بنکەی پارتیزانەکانی ڕەتڵی سورداش لە پیرەمەگرون ، تۆیەك کە هیشتا ئاسەواری چەکی کیمیایی بەروخسارتەوە بو، بەلام بێ باك لە باری تەندروستی خۆت دریژەت بە خەباتی پیشمەرگانە ئەدا.

ئەو ماوەیەی کە پیکەوبوین بەشێکە لەو میژوە جوانەی کە بۆ هەمیشە لە یادەوریەکانما بە زیندویی ئەمێنێتەوە.هاورێ عوسمان یەکی بو لەپێشمەرگە وفەرماندەکانی هیزی پیشمەرگەی کوردستان بەشداری دەیان شەڕو داستانی دژ بە رژیمی بەعس کردوە، چەندین جار بریندار بوە و لە ئەنفالی یەکدا لەگوندی شاناخسێ بەچەکی کیمیایی بەسەختی بریندار بو، بەداخەوە کاریگەری چەکی کیمیایی بوە هۆی ئەوەی توشی نەخۆشی شیرپەنجە ببێ و لەدوای چەندین نەشتەرگەری گەورە و پاش ململانێەکی سەخت بەداخەوە ئەمرۆ ماڵئاوایی لەژیان کرد و، داخێکی گەورەشی خستە دڵی خیزان و کەسوکار و هاورێ و دۆستەکانی.

بەم بۆنەیەوە هاوبەشی خەم وپەژارەی نەرمین خانی هاوسەری وخانەوەوادە بەریزەکەی ئەکەین ولەخوای گەورە داواکارین سەبوری وئارامییان پێ ببەخشێ.*

---

* سەرچاوە : فیسبوکی Osman Sedery



مانگی تەموزی 1990 بۆلیک پێشمەرگە دابەزین بۆ بیرەمەگرون

**راوەستاوەکان لە راستە وە:**

1 ـ کاك زاهیر
2 ـ شەهید امیر قەرانگۆێی
3 ـ کاك سیامەند
4 ـ کاك خالید بنگردی (کاروبار)
5 ـ کاك عسمان شارستینی
6 ـ کاك عەلی ئەشکانی
7 ـ کاك کە مال مە رکە یی

**دانیشتووە کان لە چە پە وە:**

8 ـ حسن ابراهیم سێدەری
9 ـ سەرکەوت فتاح(سەرکەوتی جهان)
10 ـ حەمە دوکانی
11 ـ نەناسرایەوە
12 ـ محمد حاجی صالح
13 ـ نەناسرایەوە



## فەرماندەی پارتیزانی تالب فاروق

لەیادی شەهیدبوونی کاک ئاکۆدا نووسیویەتی :

ئەمڕۆ یەکێکە لە ڕۆژە ناخۆشەکانی ژیانم ، ئەوڕۆژەیە کە یەکێکیتر لە خەباتگێڕو هاوسەنگەرەکانم کاکە ئاکۆ سور شەهید کرا..

لەرێکەوتی٢٤-١٢-١٩٩٤ مۆمێکی تر لەوڕێگەیەدا داگیرسا،ئاکۆسوور پێشمەرگەی پارتیزان و درێژە پێدەری ڕێبازی یەکێتی وشەهید مامە ڕیشەومەلا ئاراس..

من وشەهید ئاکۆسووڕپێشمەرگەیەکی ئازاو دلێری بزوتنەوەی ڕزگاری کورد لە ریزەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان لە دوای ئەنفالیش وەك پێشمەرگەیەکی پارتیزان هاوخەباتی یەکتر بووین قۆناغەکانی پێشمەرگایەتی زۆر بە ئازایانەو دڵسۆزانە بڕیوە، ئاکو بوونی بە فەرماندە و شۆڕشگێر .

سلاو لەڕۆحی پاکی شەهیدئاکۆسوور وگشت شەهیدانی ڕێگای ڕزگاری.

شەهیدبوون  یژدان ئاسودە ئەکات ونەمری ئەکات بەمیدالی شەرفمەندی.




## دەستەیەك لە پێشمەرگە پارتیزانەکانی کەرکوك

1 - هیوا عبداللە احمد (هیواڕەش)

2 - تالب فارووق حمەعلی

3 - کاکەمندحمەصالح (خاڵەبەخە)

4 - عزیز (عزیزە سوور) کۆیی

5 - زولفقار علی (پشکۆ)

6 - نورالدین صالح رەمەزان( سامان)

7 - ابراهیم فازڵ حمەرحیم (ئیباو)

8 - رەمەزان محمدصاڵح نادر (پۆلا) *

9 - سلیمان حمە خان سعید (ئاسۆقە رە ناوی)

10 - ایوب عمرحیدر(وریا قە فاری)

---

* ئەم دەستەیە لە هاوینی 1990 لە پێش راپەرین لە شوان و شێخ بزێنی و جەمی رەزان و دەشتی کۆیە وکۆسرەت و بناری پیرەمەگروون بوون..

## مانگی حوزەیرانی 1988 وچەند رووداوێك

### 1ــ هەڵەتەکانی ماسقەلان

لە ناوەرستی مانگی حوزەیراندا چەند هەلیکۆپتەرێك بە مەبەستی گەڕان بەدوای پارتیزانەکانی کەرکوکدا دەچنە ئاسمانی ناوچەکە، لە 10 کم رۆژهەلاّتی گوندی (مام ڕەش)لە(چەمی مێوەکان) چەند پێشمەرگەی هێزی پشتگیری دەدۆزنەوە، هێزی کۆماندۆ وجاش دادەبەزێنن.دوای شەرێکی کتوپڕ و دەستەویاخە..

سێ کەسیان،بەبریندار ی وبەدیلی دەکەونەدەست دوژمن.کەبریتی بوون لەهەڤالاّن: (سەردارجلال محمد،ئازادجبارمحمد،حمەشکورجەبارمحمد)کەسی سێیەمیان پاش (3)مانگ بەلێبووردنی گشتی ئازادکرا،دووهەڤاڵەکەی تر تائێستا بێ سەروشوێنن. ئەم دوو کەسە برا و ئامۆزای شەهید (کەیف الدین جبار محمد)ن ؛کە لە کارەساتی هەکاری شەهید بوو.بەداخەوە هەڤاڵ(حمەشکورجەبارمحمد)یش لەراپەڕینەکەی 1991دا لە رزگارکردنی شاری کەرکوك دا شەهید بوو.

### 2 ـ بان شوان

ـ هەر لەمانگی حوزەیراندا چەند ڕووداوێکی ناخۆشی تر روویان دا

* پێشمەرگەیەك بەناوی(حیدر قادر) لە کاتی هەویر شێلاندا بۆ درووستکردنی ناوساجی لەلایەن یەکێك لە هاوڕێکانیەوە خیانەتی لێدەکرێت و بەر دەسترێژی گوللە دەدرێت و شەهید دەبێت.

پاشان تاونبارەکەخۆی رادەستی (تحسین شاوەیس) و رژێم دەکاتەوە..

* هەر لەو ماوەیەدا چەکدارێك بەناوی (ج ك ب)ەوە پێشمەرگەیەکی هاوڕیی خۆی بەناوی(خالید)ناسراو بە(کاروان)سەر دەبڕێت و کەللەسەرەکەی دەباتەوە بۆ (تەحسین شاوەیس)و رژێمی ئەنفالچی.



# شەهید عەبدول محمدرسول

- لەساڵی 1952 لە دێی حاجی جەرجیس / ناحیەی شوان لەدایك دەبێت.

- بەرلە ئەنفال پێشمەرگەی(هێزی پشتگیری) دەبێت لەسنووری خاڵخالان و برای پێشمەرگەی دێرین و پارتیزان (مام علی ناڕوجەیی) دەبێت ..

دوای ئەنفال بڕیاردەدات بەپارتیزانی بمینێتەوە...

- ئێوارەی 18 /6/1988لەگەڵ دەستەیەك لەپارتیزانەکان لەگوندی (نەیبەسەرە)وە دەپەڕنەوە بۆگوندەکانی(ناڕوچە)و(ئەحمەدرەجەب)لەنێوان ناحیەی شوان وتەقتەق چەندمەترێك لەپێش هەڤاڵەکانیەوە دەبێت،لەجادەکە دەپەڕێتەوە،لەپڕ دەکەونە بۆسەی دەستەیەك لە جاشەکانەوە،دوای ئەوەی دەنگیان لێ دەکات..

بۆفریودانی خۆیان بەپێشمەرگە دەناسێنن،دەسرێژی لێ دەکەن وشەهیدی دەکەن. پارتیزانەکان تەقەیان لێدەکەنەوە و 3 جاش بریندار دەکەن و جاشەکان بەرەوە ناحیەی شوان دەکشێنەوەوپارتیزانەکانیش تەرمەکەی شەهیددەبنەوە بۆگوندی (حەسەن قەباغ) و هەر ئەوشەوە لە گۆڕستانی مەرزیخە بەخاکی دەسپێرن و لەبەر نەبوونی(مەلا) لەلایەن شاعیری لاو مستەفا شوانی یەوە تەلقینی دەخوێندرێ ...



## پارتیزانەکانی کەرکوك

(هێزی تایبەت)

1ـ هیواعبدالله احمد (هیواڕەش)

2ـ تالب فارووق حمەعلی

3ـ کاکەمندحمەصالح (خاڵەبەخە)

4ـ عزیز (عزیزە سوور) کۆیی

5ـ زولفقار علی (پشکۆ)

5ـ نورالدین صالح ڕەمەزان( سامان)

7ـ ابراهیم فازڵ حمەرحیم (ئیباو)

8ـ ڕەمەزان محمدصاڵح نادر (پۆلا) *

9ـ سلیمان حمە خان سعید (ئاسۆقەرەناوی)

10ـ ایوب عمرحیدر(وریا قەفاری)

* پێش ڕاپەڕین ئەم پارتیزانانە تازە لە دەوروبەری کەرکوك وخاڵخاڵان گەڕابوونە وە بێ ئەوەی پشوو بدەن،پەیوەست بوونەوە بە ت21ی کەرکوك.



## پارتیزانی دوای ئەنفال

# فخرالدین سمایل بەگی

- فخرالدین محمود محمد لە ساڵی١٩٦٥

لەگوندی (اسماعیل بەگی) ناحیەی (شوان)ی پارێزگای کەرکوك لەدایك بووە .

- تا پۆلی دووی ناوەندی خوێندوە ..

- لە ١٩٨٢ پەیوەندی کردوە بە (کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان) ەوە

- ساڵی ١٩٨٣کە داوای کردووە ببێت بە پێشمەرگە،داوای چالاکیان لێکردووە،

- لەبەهاری ساڵی ١٩٨٣دا لە سەرجادەی شوان، لەناو قافڵەی عسکری ،بە دەماچەی برادەرێکی سەیارەیەکی(ئەلبی)فڕاندووە،لەگەڵ شەهیدکوێخاوحمەی خاڵەبەکر. پەیوەندییان کردووە بەکەرتی(٤)ی خاڵخالانی تیپی(٢١ی کەرکوك)ەوە..

- دواترگوزراوەتەوە بۆ تیپی(25) ی خاڵخالان وپاشان بۆ تیپی(٢٩)ی کەڵکە سماق.

- لەبەهاری(١٩٩٠ لەگەڵ شەهید ئاکۆ سور،بوون بەپارتیزان لەسنوری کەرکوك تاکو ڕاپەڕینە مەزنەکەی بەهاری ١٩٩١،بە پارتیزانی ماونەتەوە.

- برایەکی شەهیدە بە ناوی ( ناصیح محمود محمد )

- لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا چند جارێك بریندار کراوە ..

- لە ١٩٨٨-٨-٣٠ لە بناری قەندیل ومانگی دەی ١٩٩٠لە پیرەمەگرون

- جارێکیش لە ڕاپەڕین دا لە شاری کەرکوك.

- بۆزیاتر لە خەباتی پارتیزانی ئەم قارەمانە بڕوانە(پارتیزانەکانی کەرکوك) کەبەشی زۆری ئەوکتێبە جێ دەستی ئەوی پێوە دیارە.



**محەمەد عبدالقادر حاجی محەمەد**

**(محەمەد هەڵەدنی)**

برای شەهیدی فەرماندە غەریب هەڵەدنی یە.

- ساڵی 1958 لە دێی هەڵەدن / جافایەتی هاتۆتە دنیاوە

- ساڵی 1983 پەیوەندی بەیەکێتیی نیشتمانی کوردستانەوەکردووە.

- ساڵی 1985 بووە بە پێشمەرگە لە کەرتی رێکخستنی دوکان

- لە دوای ئەنفالەکان لەگەڵ هێزی پێشمەرگەدا چووە ئێران و لە سنوری سەردەشت مەڵبەندی 2 ی بانەکەلی.

- دوای ئەنفال بەشداری هاتنەخوارەوەی کردووە وەك پێشمەرگەی پارتیزانی لە ساڵی 1989 هەتا راپەڕین.



**عوسمان کەریم سوارە حەمەد**

**ناسراوە بە(عوسمان سیدەری)**

- **ساڵی 1955 لە خێزانێکی** دیاری دۆڵی جافایەتی چاوی بە دنیا هەڵهێناوە
- ساڵی 1979 پەیوەندی کردووە بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەوە.
- ساڵی 1983دەبێت بە پێشمەرگە لەکەرتی ڕێکخستنی **دوکان** .
- **درێژە بە خەبات دەدات بەبێ دابران هەموو پلەکانی پێشمەرگایەتی دەبرێت تا ساڵی** 1988 **دەبێتە (ف.ك).**
- لەپاش ئەنفال **خۆی و 10 پێشمەرگە لە هەڤاڵەکانی دەبنە پارتیزان لە پیرەمەگروون و دۆڵی جافایەتی بۆ ماوەی 10 مانگ، پاشان یەکێك لە پێشمەگە پارتیزانەکان بە ناوی رزگار یاخیانی لە شەوی 27/28ـ1ـ1991 شەهید دەبێت.**
- **لەبەتالیۆنی 15 چەمی ڕێزان دەبێتە(ف.ت) پاشان فەرماندەی هەمان بەتالیۆن.**
- **میدالیای** پارتیزانی **لە لایەن جەنابی مام جەلالـەوە پێدراوە.**
- **ئەندامی پەرلەمانی کوردستان**
- **لەکۆنگرەی چوار بووە بەئەندامی ئەنجومەنی سەرکردایەتی..**



## پارتیزانی دوای ئەنفال
## هەڤاڵ عوسمان سێدەری
## بیرەوەری شەهیدی فەرماندە و پارتیزان (رزگار یاخیانی)دەگێڕێتەوە:

شەهید رزگارمحمدامین ناسراوبە رزگاریاخیانی،ساڵی ١٩٦٧ لە گوندی (یاخیان)ی دۆڵی جافایەتی لەدایك بووە، دووەم شەهیدی بنەماڵەکەیەتی.

ساڵی ١٩٨٢ پەیوەندی کردووە بە ڕێکخستنەکانی( ی.ن.ك) و ساڵی ١٩٨٤بووە بە پێشمەرگە لە تیپی ٦٣ی جوتیاران،لەبەر لیەاتوویی دەبێتە فەرمانەدەی مەفرەزە، لە شەڕەکانی قەیوان ، ماوەت ڕۆڵی بەرچاوی هەبووە ، هەروەها لە شەڕەکانی سەرکردایەتی و ئەنفال زۆریتریش.

لەدوای ئەنفال ، شەهید رزگار یاخیانی بەشێوەی پارتیزانی درێژەی بە خەباتی پێشمەرگایەتی دەدات لەگەڵ هەڤالانی ڕەتڵی سووورداش کە بریتی بوون لە عوسمان سێدەری فەرماندەی کەرت،شەهید رزگار یاخیانی جێگری فەرماندەی کەرت،شەهید رزگار سووورداشی رابەر سیاسی،ساڵح شارەستێنی فەرماندەی

مەفرەزە،زرارشارستێنی،تەها جوبلاخی،شەهید زاهیرە بچکۆل،محمد قەلاچوالانی، مامە قالەی شارباژێر.هێمن سەراوی،کە بۆماوەی دە مانگ مانەوە و ئالوگۆر کردنی مەفرەزەیەکی شەهید غریب هەڵەدنی کە لە چیای پیرەمەگرون مابوونەوە،دوای چواردە ڕۆژ لەو سنوورە گەیشتینە پیرەمەگروون،هەرچەندە نارەحەت بوو بووین بەو ڕێگا دوورە بەلام شەهید رزگار یاخیانی زۆر دڵخۆش بوو بەو خەباتە سەربەرزانەیە و جارێکیتر شادبوونەوەبە زێدی خۆی.

لە یەکێك لە جەولەکانمان لە (بێترخێ ) بۆ چیای (ئاسۆس) و لە وێوە بۆ دۆڵی جافایەتی و پیرەمەگروون،لە کەلێنی (لۆتەر) شەوی ۲۷/۲۸/۱/۱۹۹۱ کەوتینە بۆسەیەکی ڕژێمی بەعسەوە.شەوێکی بەفراوی و سارد بوو،پەرتەوازە بووین،ڕزگار یاخیانی وتالیب چالاوایی و هێمن چنارنەیی بریندار بوون،هەرچەندە ئەو شەوە هەوڵی دەرکردنی شەهید رزگارمدا بەلام بەداخەوە نەمتوانی برینەکەی سەخت بو بۆشم هەڵنەگیرا و سەرماو سۆڵەش بێ تواناى کرد بووم،نەمئەویست بەجێی بەێڵم و رامکێشا،بەلام لەکاتی ڕاکێشانی کەوتمە ناو کاوێکەوە و شەهید رزگاریش عاسی بوو،ئیتر زۆری لێ کردم و وتی منت پێ دەرباز ناکرێ باتۆش نەگیرێیت بەردەستی دووژمن نەکەویت،بەلام تکا دەکەم مەهێڵن خوێنی من بەفیڕۆ بڕوات باهەر من شەهید ببم،بۆیە بەدڵێکی حەزین و هەستێکی ناخۆشەوە کە تائێستاش پێی کاریگەرم بە برینداری بەجێم هێشت خۆشم زۆر بە نارەحەت رزگارم بوو،قەناسەکەی شەهید رزگار و بەڵگەی پێشمەرگایەتیم دەرکرد و لە ناو کاوە کە لە پە نا لوتکە شاخەکە شاردمەوە تا دوژمن بەڵکو لێی نەگە ڕێن و نەکەوێتە دەست دوژمن .بە داخەوە کە نەمان توانی جەنازەکەشی رزگار بکەین..

خۆشم بەتەنیا دەرچووم،بە لام بە چ حالیك .

چوار لەهەڤالان بەرەو بێترخی گەڕابوونەوە و (هێمن چنارنەیی و تەهاجوبلاخی وتالیب چالاوایی)یش بەرەو پیرەمەگروون ڕۆیشتبوون، عوسمان محمد و رسولْ هەلەدنی بەرەو گوندی یاخیان ڕۆیشتبوون،زرارشارستێنی و سالح شارستێنی بەرەو چیای ئاسۆس و دەشتی بنگرد ڕۆیشت بوون و مامە سالەی سێدەر بەرەو چیای چنارنە و لەوێوە بۆ یاخیان،خۆشم بەرەو یاخیان ڕۆیشتم،دوای ١٠ ڕۆژ هەموومان یەکترمان گرتەوە و خومان ڕێکخستەوە . بریارمان دا تۆلەی شەهید رزگار بکەینە وە ..لە حەشوەی گولە ئارپیجی و چەن دەرمانێکی تر چەندین تە قینەوەمان لە شیوازی لوغمی دەبابە دروست کردو ڕۆیشتینە خوار بەرەو هەوارە بە رزە و دواتر بە رە و سنوری لوتەر...

جولەکانمان لەشەودا دەست پی دەکرد.بەوحوکمەی معەسکەری گەورەی رژیم لە ناو لوتەربوو بە مودەی دوو شەو چوینە سەر ڕێگای هاتووچوی سەیارەکانی رژێم کە رۆژانە جوندیان بە دل دە کرد چە ند تەقینەوە یەکمان داناو گەراینەوە بۆ بە رزایەکانی بە رامبە ر لوتەر کە نزیك گوندی هە وارە بەرزە و ئەو ناوە دە کات بۆ بەیانیکەی زوو جیب قیادە یەك کە چەندسەربازی تیابوو دە رۆیشتن بۆ بەدلکردنی جوندیەکانی تر لە کە لێنی لوتەر بە دوور بین سەیرمان دەکرد کەوتنە سەر تەقە مەنیەکانمانداو 4 جوندی و زابتیکیان کوژران..

دواتر مێك زەمینێکی موقەیەت کە ایسعاق معەسکەرە کە بوو هاتن بە رە و پیری کوژراوەکان لە گەرانەوەیاندا ئەوانیش بەسەر تەقینەوەیەکی تردا کەوتن و پارچە پارچەبوون . ئەو رۆژە راستە شەهید رزگارمان لە دە ست دابوو بەلام کە تۆلەیمان کردەوە هە موومان بەو چالاکیە گەورەیە . دلْخۆش بووین، کە گێرانەوەی هەر بەدەم ئاسانە.. بەلام ئەگەر بێتو تەسویر بکرایە ئەوسا دەزاندرا کە پیشمەرگە و مەفرەزەکانی یەکێتی چۆن بوون ...

# ئەو رۆژگارانەی
# ئومێدیان گێرایەوە بۆکوردستان

ئەورۆژگارەی کەوا میللەتی کورد ئەنفالکرا، گوندوشارۆچکەکانی وێرانکران، کۆمەڵێکی تر لەپێشمەرگەقارەمانەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بڕیاری خەباتی پارتیزانی باندا ..

لەمانگی تەمموزی 1990 چەند دەستەیەکی تر پێکهاتن بۆ هاتنەخوارەوە بۆ سنووری ناوچەکانی خۆیان :

1ـ دەستەیەبەفەرماندەیی(عوسمان سێدەری)بۆ سنووری سورداش وپیرەمەگروون. کەبریتی بوون لەم پارتیزانانە (عوسمان سێدەری ، رزگاریاخیانی ، زاهیر بچکۆل. رزگارسورداشی . هێمن چنارنەیی، تەها جوبلاخی ، تالیب چالاوایی ، عوسمان محمد، رسول هەڵەدنی. زرارشارستێنی، سالح سێدەری، سالح شارستێنی)

2 ـ دەستەیەکی تر بەفەرماندەیی( محمد بیکەیسی) بۆسنووری خۆشناوەتی

3 ـ دەستەی سێیەم بۆ دۆڵی جافایەتی بریتی بوون لە (کاك خالد، زاهیرسێدەری. کاك عوسمان )

4 ـ دەستەی چوارەم بەفەرماندەیی (هیوارەش) بۆسنووری کەرکوك وتەقتەق.. بریتی بوون لەم هەڤاڵانە : (هیواعبدالله أحمد (هیوارەش) تالب فاروق حمەعلی. کاکەمندحمەصالح( خاڵەبەخە)عزیز(عزیزەسوور)زولفقارعلی(پشکۆ)،نورالدین صالح رەمەزان(سامان) ابراهیم فازڵ حمەرحیم (ئیباو)، رەمەزان محمدصاڵح (پۆلا ).

سلیمان حمەخان سعید (ئاسۆقەرەناوی)، ایوب عمرحیدر(وریا قەفاری)

ئەم پارتیزانانە لەبارەگاکانی سەرکردایەتی سازو ئامادە دەبن بۆ بەرێکەوتن بە هەموو پێداویستتەکانیانەوە کورج وگۆڵ خۆ دەبەستن..

لەتۆمارێکی ڤیدیۆیی دا کە بە کامێرای هەڤاڵ(هێرۆ خان) چرکێندراوە بەم شێوەیە دەستپێدەکەن:

*** عوسمان سێدەری :**

ئێمە مەفرەزەیەکین ئامادەبن بچینەخوارەوەبۆسنووری ناوچەی سورداش وپیرەمەگروون..هەروەك لەلایەن شۆڕشەوە یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە بۆمان دیاری کراوە، دیفاع لەخاك و وڵاتی خۆمان بکەین..ئامادەین خۆمان بەکوشت بدەین بۆ گەل ونیشتمان..ئێمە مەجموعەیەك خەلکی پوختەی شۆڕشین، ئامادەین چی شۆڕش پێمان بسپێرێت جیبەجێی بکەین..

*** شەهید محمد بیکەیسی :**

ئێمە کەمەفرەزەی خۆشناوەتین دەچینە خوارەوە بۆ وڵاتی خۆمان هەربۆیە ئامادەی هەموو فیداکارییەکین بۆ بەدیهێنانی هەموومافەرەواکانی خۆمان.

*** هیوا رەش :**

ئێمە ئێستا بۆسنووری کەرکوك......دەڕۆینە خوارەوە، ئێمە وابیرمان کردەوە و بەپێویستمان زانی کەوا گەل پێویستی بەم جۆرە خەباتەهەیە،ئێمەیش هەموو کاتێك پێشمەرگەی دڵسۆزی گەلەکەمان بووینە ..ویستمان بەکردەوە بیسەلمێنین کەپێشمەرگەی دڵسۆزی گەلەکەمانین،هەربۆیە ئەم جۆرە خەباتەمان هەڵبژاردووە...

هەمووکات ئامادەین لەپێناو گەل وشۆڕشەکەمان بەئەرکی خۆمان هەڵسین..

چەند لەتوانامانداتبێت دریغی نەکەین..



**پارتیزانی دوای ئەنفال**

**شەهید إبراهیم فازڵ حەمەرەحیم (ئیباو)**

- شەهید إبراهیم فازڵ حەمە رەحیم ناسراو بە(ئیباو)
- لەساڵی 1967 لەگوندی قزلقایەی ناحیەی شوان لەدایك بووبوو.
- لەساڵی 1983پەیوەندی دەکا بە(کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان)ەوە.
- لەساڵی 1985 دەبێتە پێشمەرگە لەتیپی 21ی کەرکوك.
- لە 1988/8/1 لەگەڵ دەستەیەك لەپارتیزانەکانی کەرکوك بە فەرماندەیی هەڤاڵ(سیروان کوێخانحیم) دەگەڕێنەوە سنووری کەرکوك..
- لە 1991/4/17 لەهەڵمەتێکدا بۆ سەر رژێم لەهێزۆپ شەهیددەبێت.



# ژیاننامەی پارتیزان
# کاک سیروان کوێخا نەجیم

ناو: سیروان نجم رشید لە دایکبووی کرکوك لە ١٩٦١/١٢/١

ئاستی خوێندن: بەکالۆریۆس لە یاسا لە زانکۆی سلێمانی

ساڵی پەیوەندی بە ڕێکخستنەکانی یەکێتی: ١٩٧٩ کۆمیتەی ئاگر

ساڵی بوون بە پێشمەرگە: ١٩٨٠/١/٦

بریندار بوون: لە شە ڕی نیرە کین لە دە شتی هە ولیر ١٩٨٣

پلەکانی پێشمەرگایەتی لە پێش ڕاپەرین:

- لە ١٩٨٢ بووە بە فە رماندە ی مە فرەزە

- لە ساڵی ١٩٨٣ بووە بە فەرماندەی کە رت

- لە ١٩٨٦ بووە بە سە رتیبی ٢٥ خاڵخالان

- لە ١٩٨٧ بووە بە سە رتیپی ٢٣ی سورداش

- لە ١٩٨٨ بووە بە سە رتیپی ٢١ی کەرکوك

- کاتی ئەنفالەکان بەرپرسی پارتیزانەکانی کەرکوك - خاڵخاڵان بوو.

- لە ساڵی ١٩٩٠ بووە بە فەرماندەی بەتالیۆنی شەش لە چێوەرِو.

شوێنەکانی کارکردن لە دوای ڕاپەرین:

- لە ساڵی ١٩٩١ بووە بە فە رماندەی بەتالیۆنی شەش لە کەرکوك

- لە ساڵی ١٩٩٢ دا بووم بە جێگری هێزی شەش.

- ئەندامی مە ڵبە ندی کەرکوك

- لە ١٩٩٢ بووە بە بەرێوەبەری هە واڵگری قیادە ی منگقە ی کەرکوك

- لە ساڵی ١٩٩٣دا بووم بە قایمقامی چە مچەماڵ

- لە ساڵی ١٩٩٥دا جێگری پارێزگاری کەرکوك.

- لە ساڵی ١٩٩٩ بووە بە ئە ندامی مە کتەبی ڕێکخستن

- لە ساڵی ٢٠٠٥دا بەرپرسی مە ڵبە ندی چەمچەماڵ.

پلەی ئێستا: ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان.

- :شارەزا لەبوارەکانی سە ربازی،ڕێکخستن،ئیداری،سیاسی کۆمەلایەتی.

زمانەکانی خوێندنەوەو قسەکردن: عەرەبی، فارسی .

# هیوارەش پارتیزانێکی تری کەرکوک

## ژیاننامەی هەڤاڵ هیوارەش



- ستار عەبدوڵا ئەحمەد عەلی ناسراو بە(هیوا ڕەش)
- لە دایکبووی 1954 گوندی تەقتەق / دوبز / کەرکوک
- لەساڵی1983 پەیوەندی بە کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان وە کردوە.
- لەساڵی 1985وە بووە بە پێشمەرگە .. دەرچوی کۆلێژی سەربازی قەڵاچۆلانە.

لە دوای شاڵاوەکانی ئەنفال یەکێك بووە لە پێشمەرگە پارتیزانەکانی شۆرشی نوێ دواتر لە ساڵی(1990)دەکرێتە بەرپرسی مەفرەزە پارتیزانەکان لەبناری کوسرەت و دەشتی کۆیە وبناری خاڵخالان،سەرجەم پلەکانی پێشمەرگایەتی بڕیوەو بەشداری راپەرینی 1991ی کردوە هەر لە رانیەوە تا ئازادی کردنی شاری کەرکوك

- دواتر دەکرێت بەجێگری سەرتیپ و دواتر سەرتیپ.
- لەساڵی( 1993 ) بووە بە فەرماندەی فەوج لە سوپای یەکگرتوی کوردستان.
- لە نێوان ساڵانی ( 2000 تا 2003 ) بەرپرسی فەرماندەیی هەولێر بووە.
- لە ساڵی2005ماوەی (10 رۆژ لێپرسراوی فەرماندەی لیوای(10) بووە
- ساڵانی 2005-2008 بەرپرسی لیوای2ی سکرتاریەتی هەڤاڵ مام جلال.

پاشان لەساڵی(2008)دەکرێتە بەرپرسی لیوای (16) شانزەی سلێمانی لە سوپای عێراق تاوەکو کۆتایی ساڵی(2010)گەڕاوەتەوە هەرێمی کوردستان بووە بەئەندامی فەرماندەیی هێزەکانی پێشمەرگە.

- ساڵی 20014 کراوەتە بەرپرسی لیوای (134)ی هێزەکانی (70).
- لە جەنگی دژی داعش کراوەتە جێگری بەرپرسی میحوەری باشوری کەرکوك..
- لەکۆنگرەی چواردا دەبێت بەئەندامی سەرکردایەنی (ی.ن.ك) .



## دەستەی دووەمی پارتیزانەکانی کەرکوک

بەرلەگەڕانەوەی دەستەی یەکەمی پارتیزانەکانی کەرکوک بۆپیرەمەگروون، دەستەی دووەم کەپێکهاتبوون لە(7)پارتیزان،بە فەرماندەیی ستارعبدالله احمد(هیوارەش) بڕیاردەدەن کەبگەڕێنەوە بۆ سنووری تیپی 93ی کۆیە وتیپی 21ی کەرکوک، بەچاوساغی کەسێك بەناوی(خالّند)وبە یارمەتی هاوکاری پارتیزانەکانی بتوێن، دەگەنە شاخی کۆسرەت ودەشتی کۆیە وبناری خاڵخالان لە سنووری کەرکوک، هەرچەند نیازیان وادەبێ لەگەڵ مەفرەزەکەی پێشووی پارتیزانەکانی کەرکوک بگەنەوە بەیەك، بەلام ئەوەیان بۆ ناکرێ...

ـ لە ناوەڕاستی مانگی ئابی 1990 تاسەری ساڵی 1991 دەمیننەوە،

**<u>ناوی پارتیزانەکان:</u>**

1 . ستارعەبدولائەحمەد(هیوارەش)

2 . تالیب فاروق حەمەعەلی(ئامۆزای شەهیدمەلائاراس)

3 . سلێمان حەمەخان سەعید(ئاسۆقەرەناوی)

4 . زولفیقار عەلی هەیبەیی(پشکۆ)

5 . عزیز شیوەجانی (عەزیزەسوور)

6 . دلّزار پێبازۆکی

**7 . نورەدین سالّح رەمەزان(سامان)**

**. ئاسۆقەرەناوی لەبیرەوەری خۆیدا باسی لەوە کردووە، مەبەستی هاتنەخوارەوەیان جگە لەسەلماندنی مانەوەی پێشمەرگە،تۆمارکردنی چەندبەڵگەوگرتنی وێنەی گوندەکاولکراوەکان بووە. تابکرێن بەبەڵگەی جینۆسابد بۆ شاندی یەکێتی بۆ کۆنفرانسێك لە ئەوروپا وپشتیوانی مەفرەزەکەی پێشووی پارتیزانەکانی کەرکوك.**

**هەرئەو رۆژە ئەوان گەرانەوە بۆشار وئێمەش جێگۆرکێمان کرد و دوورکەوتینەوە.**

**ـ دوای ئەوان هەڤاڵ (جاسم سێگردکانی(جاسەلات) گەیشتەلامان و هەندێ گۆشتی قووتی وپێداویستی بۆهێنابووین،دواتر لەوێش گواستمانەوەبۆخانوویەکی بچکۆلە لەنزیك گوندی مەرزیخە شوێنێکی بێشك بوو،بۆعەسر(من وئاکۆ وتالیب ومام عەلی) چووینەحاوی(مەرزیخە)گوێدرێژەکەی(مام علی)مان گرتەوە،عەلی زۆر بێتاقەت بوو، سوارمانکرد تاحاوی (ئیلنجاغ) ئەوان لەوێ چاوەڕوانی ئێمەبوون،من وئاکۆسوور چووین بۆ جگیلە،بۆکات وشوێنی دیاری کراو،زۆر بەوریایی رۆیشتین،سەعاتێك پێش کاتی دیارکراو ئێمە گەیشتین،خۆمان جوان حەشاردا،بۆشەو ئەوانیش هاتن، نهێنیمان(فیکە)بوو،چەندفیکەفیکیانکرد، ئێمەخۆمان ئاشکرا نەکرد،تا دڵنیابووین کە هەر خۆیانن وکەسیان لەگەڵ نییە،ئەوجا بانگمانکردن، ئەوانیش دڵخۆش بوون، لەگەڵ خۆیان ئەم شتانەیان هێابوو:**

**(برێك دەرزی ودەرمان،نیو فەردەسەموونی فرنی،شەش مریشکی سوورەوەکراو..)**

**ئیتر پێکەوە دانیشتین. گوتیان دەی فەرموون نان بخۆن..!**

**ئاسۆ دەستی بۆ برد تابخوا، سیخورمەیەکم لەبن باڵی دا، دەستی کێشایەوە، گوتی فەرموونێوەش لەگەڵمان بخۆن..دیاربوو زۆر ماندوو برسی بوون،ئەوانیش دەستیان بەخواردنکرد،کات وشوێنی داهاتوومان دیاریکرد و لێك جیابووینەوە، ئەوان بۆ حاوی قەرەناو وئێمەش گەراینەوە بۆلای هاورێکانمان..**

کەچووین بینیمان ئەوانیش شوتییەکی گەورەیان دۆزیبۆوە،چووینەوە مەکۆکەمان لەخانووە بچووکەکەی کردبوومان بەحەشارگە،برادەرانی مەکۆ ساوەریان لێنابوو. کاك تالیب مام فاروق سەموونی دەکوڵی وساوەری تێدەکرد وبەکەوچك دەی پەستاو دەیخوارد.دیاربوو زۆری خواردبوو،شەوناڕەحەت بوو،بەیانی دەنگی تەقە لەخوارمانەوەدەستی پێکرد،ئێمەش بەدۆڵکاندا بەرەو لای(حسن قەباغ) رۆیشتین.. دوای کشانەوەی هێزی رژیم ئێوارەهاتینەوە،بەنیازبووین گۆشت مریشك بخۆین. بینیمان هەمووی بۆگەنی کردووەومیرووله لێی داوە..

سەموون و پاشماوەی شوتییەگەورکەمان خوارد و پشوومان دا.

چەند رۆژدواتر کاك سیروان وکاك حەمەسەقەر ودەستەکانیان گەیشتنە لامان.. باسی هاتنی ئەودووهاوکارەمان بۆکردن،کاك کویخاسیروان پێی باشبوو بیانبینێ. لەکات وشوێنی دیاریکراو لەگەڵماداهات،بەوشەوە ئەنگوستەچاوە هەڤاڵ (سوارە) بەتەنیا هاتبوو.دبسان یەك کوڵ پێداویستی هێنابوو، کاك سیروان نامەیەکی پێدا نارد بۆ سەرکردایەتی، ئەویش جوامێرانەو ئازایانە ئامادەیی خۆی دەربڕی و پاش ماوەیەك بەنامەیکی سەرکردایەتی هەندێ هاوکاری باشەوە گەڕایەوە..

لەسەرەتای مانگی تشرینی دووەمی1988دەستەکەی ئێمەش چووین بۆ دەورووبەری ماسقەلان،چەند رۆژێك لەوسنووره ماینەوە...

شەوی 17 / 11 1988 تەگبیرمان کرد بگەڕێینەوە بۆ شێخ بزێنی،سێ هەڤاڵمان زۆرنەخۆش بوون.یاریدەدەری پزیشکی(محمدسەقەر)دووپێشمەرگەی لایان مانەوە. ئێمەتەواولەوان دوور کەوتبووینەوە،سەرلەبەیانی رۆژی دواتر مەفرەزەیك جاش هاتبوونە سەریان. یەکەم دەستڕێژ هەڤاڵ (نیزام محمد) خەڵکی گوندی(قادرعلی شەهیددەبێت،باقی برادەران هاتبونە دەست وچەندخۆفرۆشێکیان کوشتبوو. کلاشینکۆفێکیشیان دەستکەوتبوو،بەداخەوە لەقوڵێکی ترەوە جاشەکان فرسەت

دێنن و دەسرێژ دەکەنەوە،کاك سەرکەوتی رابەری سیای تیپ و کاك جوتیاریش شەهید دەکەن،ئەنجام دوژمن کوژراوی زۆری هەبوو،هەڤالان( پۆلا و کاروان و محمدسەقەر) بازنەی گەمارۆکەی دوژمن شکاند و گەیشتنە لای ئێمە،رژێم تەرمی کوژراوەکانی خۆیان و هەرسێ شەهیدەکەی ئێمەی بردەوە بۆ چەمچەماڵ...

بۆرۆژی دواتر کەوتینەڕێ بەرەو شێخ بزێنی،تاریك داهات لەئاستی ناوچەوە پەڕینەوەبۆ(نەیبەسەرە)رۆژدواترلەنێوان(نەیبەسەرە ـ حسن قەباغ)خۆمان حەشاردا، کە لەوێوە بەدووربین تەماشامانکرد هەموو گوندەکانی شێخ بزێنی لە جگیلەوە هەتا قەرەسالم جاش وسوپا کۆنترۆڵی کردبوو،بەڕاستی بارودۆخێکی ناخۆش بوو، بۆشەوی دواتر بەشارەزایی هەڤاڵ علی محمد(عەلەگەدە)سەرکەوتینە سەر کەل و چووینە ناوجەرگەی ژێر دەسەلاتی رژێمەوە،رۆژێك لەنێوان گوندی وێرانەی (جەوەجەوە وسەربازگەی شوان)خۆمان حەشاردا،بۆشەوی دواتر خۆمان لەدوژمن دوورخستەوە، چووینە نێوان(علی بەیان و بیرالك) لە خڕو شیوێکی کفراوی دا تا ئێوارە لەژێرسێبەری کفر(تەروو)دا خۆمان شاردەوە،پاش چەندرۆژ برسێتی و کولەمەرگی لەنێوان گوندەکانی (سەربیر و بیرەسپان و قەرەسالم ..)دوو دوو وسێ سێ گەڕاینەوە بۆشێخ بزێنی...

ئیتر رۆژ بەرۆژ بارودۆخی وەرز لەقازانجماندا نەبوو،بەیانیان کەهەڵدەستاین پێخەفەکانمان بەهۆی ساردی وشێوە تەڕدەبوو،خۆمان گەیاندەوە گوندەکانی پەڵکانەو دەرماناو، پاتریبەکمان دابینکرد،هەواڵی شەڕەکەو ناوی شەهیدەکانمان دا بە(دەنگی گەلی کوردستان) رادیۆ شرێکمان هەبوو قەباغی پشتەوەی نەمابوو، شریتی سووڕاندنی شەپۆلەکانی پچڕابوو،بە پەنجە شانەکەمان دەسووڕاند، رەنجە ناوی نابوو(چالنجەر) هەرچۆنێك بوو بۆ ئێوارە گوێمان لە هەواڵەکان وهەواڵەکەی خۆمان بوو.دەستە دەستە جاش دەهاتن خۆیان حەشار دەدا تا بماندۆزنەوە هێزی

**تر بهێننەسەرمان.ئیترجارێکی تر جیهازەڕاکاڵەکەمان خستەوە کارو پەیوەندیمان بە سەرکردایەتییەوە کردەوە،پاشان پەیوەندیمان بە رستی سورداشـەوە کرد، کە ئەو رۆژە لەشاخی(ژیلوان)بوون،خۆمان کۆکردەوە و بەرێکەوتینەوە بەرەو ناوچەی شوان ولەوێوە بۆناوچەی قەلاسێوکەو لەوێوە بەرەوگەوردێ وشاخی پیرەمەگرون. بە دەربازبوونمان لە جادەی (سلیمانی ـ دوکان) ئەورۆژە تا عەسر لەسەر کانی و ئاوی (قوولەرەش) پشووماندا،دواتر من وخلیل بێدەری وکوردۆرەحمان چووینە سەرمەرقەدی پیرەمگروون، پێخەفی باشی لێ هەبوو شەولەونزیکەوە لە دۆڵێکدا خەوتین،رۆژی دواتر چووینە کەلاوەکانی قزلەر(13) فەردە ئاردمان دۆزییەوە. ناوساجیمان دروستکرد، ئەوان هەردوکیان لەوێ مانەوە منیش هەندێك ناوسجیم کردە ناوکۆڵەپشتییەکەم و بەرەوکانی قولەڕش هەڵکشام، رێگاکان شارەزا نەبووم. ئاگرێکم لەسەر شاخ بینی، گومانم کرد سوپا پشتەوەمانی گرتبێت، تا سەعات 2ی شەو ئەوجا گەیشتمەوە لایان،دوایی بەدوادا چوونمان بۆ ئاگرەکە کرد، دەرکەوت راوچی بوون،ئەوان رۆژی پێشوو من و کۆردۆ وخلیل یان بەدووربین بینی بوو. وایانزانیبوو قوات خاصەین،بەیانی من وئاکۆسوور ویونس وتالیب ونقیب ناصیح گەیشتینە قزلەر ولەگەڵ کوردۆ وخلیل بێدەری چەندمان توانی ئاردمان هەڵگرت و هێنامانەوە بۆ برادەرانمان،بۆ رۆژانی دواتر بەشارەزایی راوچییەکان گەیشتینە شوێنێك پێیان دەگووت(دۆڵەبی)و لەوێشەوە شارەزای هاتووچۆی ئۆردوگای پیرەمەگرون و لەوێ پاترییەکی تراکتۆرمان بۆجیهازەکەمان دابینکرد..**

**پەیوەندیمان بەرەتڵی سورداشەوە کرد، رێگا سەلامەتەکانیان بۆ دیاری کردین. ئاو وناوساجیمان کردەکۆڵ و لەدۆلە رووتەوە بۆ هەڵەدن و چالاوا و شاخی (ژیلوان) رۆیشتین..برادەرانی سورداش مان دۆزییەوە، ئازوقەمان لێ وەرگرتن. شەکرو ئاردمان تێکەڵ دەکرد ودەمانخوارد،ناویشمان لێی نابوو(حەلوا).**

جارێکی تر پەیوەندیمان بەسەرکردایەتییەوەکردەوە..
رۆژی 21 / 12 /1988 دووئیستری بەرەڵامانگرتەوەو کەلوپەلەکانمان لێبارکردن و بەرو سەرسنوور بەرێکەوتین،ئەوماوەیە تووشی ناخۆشترین بارودۆخ بووین،ئاو رێگای پەرینەوەی نادائین،خورراکمان کۆتایی هات،مین بە هاورێیەکماندا تەقییەوە، زۆر بەزەحمەت فریامان کەوتن و گەراینەوە بارەگاکانی سەرسنوور. *



پارتیزانی دوای ئەنفال سامالْ مەلارەحیم(سامالْ کەرکوکی)
یەکێك لە پێشمەرگەکانی دەستەکەی مام رۆستەم

* سەرچاوە: بیرەوەرییەکانی پارتیزان ئاسۆقەرەناوی

## هاوکاری پارتیزانەکان
## لەسنووری سورداش و کەرکوک

1 . بکر تەلانی
2 . مام ڕەسوڵ تەلانی
3 . ڕەسوڵ قادر کرژەیی
4 . ڕۆووف محمد دوکانی
5 . هێمن سێوکانی
5 . شیخ عوسمان(مام شێن)
7 . غالب تەها (زریان)
8 . عبدالرحمن محمدعمر(شەوگێڕی)
9 . خونچە حسن ئیلنجاغی
10 انور حاجی غفور
11 . سعید احمد عبدالله(سۆران)
12 . نەوزاد کەرکوکی (شێردڵ)
13 . حاجی غفور سمایلبەگی
14 . رمزی فلامورز هەمەوەندی
15 ـ رسول محمد تەلانی
16 . کازم عباس مەرزیخەیی
17 . عبدالرحمن عمر إسماعیل
18 ـ عبدالله عمر إسماعیل *
19 ـ حەمەی خاڵە فایق(هاوڕێ سیدەکان)
20 ـ علی عوسمان ساڵح (سەیدۆ)
21 ـ خدیجە محمد(هاوسەری حاجی غفور)
22 ـ مەلەك عبید(هاوسەری انورغفور)
23 ـ عائیشە محمود محمد(خێزانی هاوڕێ ئارام)
24 ـ قومریە حاجی محمود(خێزانی هاوڕێ سروود)
25 ـ عزیزحاجی چراغ (هاوڕێ سالار)
26 ـ عبدالرحمن محمدامین (سەلام)

*خۆی و عبدالرحمانی برای مینیان هەڵدەگرتەوەو بۆ پارتیزانەکانیان دەنارد.



**فەرماندەو..**

**پارتیزانی دوای ئەنفال**

**شـــەهید عبدالرزاق سێگردکانی**

- ناوی چواری : عبدالرزاق محمد عومەر مەولود سێگردکانی
- لەساڵی 1948هاتۆتە دنیاوە..
- شوێنی لە دایك بوون: گوندی ئۆمەر گوومەت ، قەزای کۆیە : پارێزگای هەولێر
- ئاستی خوێندن : پەیمانگای زانستە ئیسلامیەکان لە هەولێر تەواو کردووە.
- باری خێزان : خێزاندارە
- ناوی خێزان : شوکری علی محمدامین
- ناوی منداڵەکان : هەڵمەت ،تارا ، تۆلە، ئالان.
- لە ساڵی 1955پەیوەندی دەکات بەرێزەکانی یەکێتی قوتابیانی کوردستان
- لە ساڵی 1971 پەیوەندی دەکات بە کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان.
- ساڵی ١٩٧٥ دەبێتە لێپرسراوی شانە نهێنی یەکانی کۆمەڵە .

- ساڵی ١٩٧٦ دەبێتە لێپرسراوی ڕێکخراوی کۆمەڵە لە هەولێر و کرکوك .

- ساڵی ١٩٧٨ دەگیرێت و دوای دوای ١٨ مانگ ئازارو ئەشکەنجە لەبەر ئەوەی هیچ نهێنی یەك نادرکێنی بەلێبوردنی گشتی بەردەبێت ودەستدەکاتەوەبەکاری نهێنی..

- لە هەردوو کۆنفرانسی یەك و دوو بە ڕووپۆشەوە بەشداری کۆنفرانس دەکات ،و لە کۆنفرانسی سێی کۆمەڵە داوای لێ دەکرێت خۆی ئاشکرا بکات و خەباتی نهێنی بگوازێتەوەشاخ.دەبێتە لێپرسراوی دووی ڕێکخراوی کۆمەڵە و لە پێشمەرگایەتیش کەسێکی خاوەن ورەو بڕیارو خۆشەویستی ناو خەڵك و پێشمەرگەبوو ..

- دوای پرۆسەی ئەنفال و خۆڕێکخستنەوەی هێزی پێشمەرگە لە سەرسنورەکان دەورێکی قیادی بینی لە دانانی بەرنامەو پلان و دابەش کردنی هێزی پێشمەرگە و تیپ بە تیپ و بەتالیۆن بە بەتالیۆن بەسەری دەکردنەوە .

- لەدوای ئەنفال سەرپەرشتی پارتیزانەکانی بناری دێدەوان وشێخ بزێنی دەکرد.

- ڕۆڵی بەرچاوی هەبوو لە داڕشتنی بەرنامەی ڕاپەڕیندا..

- بەشداری کاریگەری ڕاپەڕین بوو لە ڕانیە،کۆیە، شەقلاوە ، هەولێرو کرکوك .

- یەکەم ڕۆژی ڕزگارکردنی کەرکوك(خولە)ی برای لەکەرکوك شەهید دەبێت ، شەهید عبدالرزاق تەنها لەناشتنی بەشداری کردو گەڕایەوە کەرکوك .

- ڕۆژی ٢٤/٣/١٩٩١ باوکی دڵی لەلێدان دەکەوێت و کۆچی دوایی دەکات بەڵام لەبەر هەستیاری ئەو ڕۆژەی ناوشاری کەرکوك لە مەعەسکەر خالید مایەوەو بەشداری پرسەی باوکی نەبوو .

- ڕۆژی ٢٨/٣/١٩٩١ لە شاڵاوی بەعسیەکان بۆ سەر شاری کەرکوك لە نزیك گوندی باجوان نێوان دووبز کەرکوك لە بەرگریەکی بێوێنە دا گەیشتە کاروانی ڕێگای ڕزگاری کوردستان .



# هەڤاڵ مەلا بەختیار بۆ سالیادی شەهید عبدالرزاق :
# بە دەرپەڕاندنی 54 هەزار تەعریب تۆڵەم کردیتەوە

**هاوڕێم عەبدولرەزاق !**

تۆ شەهیدیتو من هێشتا شەهیدنەکراوم. هەرچەندە من پێش تۆ، ڕێگەی پێشمەرگایەتیو شەهیدبونم گرتەبەر. بەڵام دڵنیام تۆ لەناو ئارامگای نەمریدا، ئاسودەیت. دڵنیابە، من هێندەی تۆ، ناخم ئاسودە نییە.

**هاوڕێم !**

بیرمە.. لەگەڵ هاوڕێ ئازیزەکەی هەردووکمان، شەهید ئازاد هەورامی، سەرەتای مانگی (12)ی 1975. لە کەرکوکی نەهامەتی دوای هەرەسی (1975) کە یەکمانبینی، هێشتا تەنها هەرسێکمان، شادەماری ڕێکخستنمان بەدەستەوە بوو، تۆ هاوڕێی شەهید:

- بەرپرسیاری هەولێر بوی.
- ئازاد هەورامی.. هاوڕێی شەهیدی ترمان، بەرپرسیاری کەرکوک.
- منیش، هاوڕێیەکی شەهیدنەکراوتان.. بەرپرسیاری خانەقینو گەرمیان..

هاوڕێ عەبدولرەزاق.. تۆ، کێوی ورە بویت. تۆ، مێشی فاشی میوانت نەبوو...

تۆ.. باشم لەبیرە، چەند مانگێك بوو، دوای ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە، دابڕابویتو چاوەڕوانی بەستنەوەی شارەکانت دەکرد.شەهید ئازاد..

ناخی پڕ بوو لەداخی لێقەومانی بێپەنا. نەیدەزانی کۆمەڵە هێشتا ساوایەو ساڵەهای بەبەرەوە ماوە پێبگرێ. بەسەرسوڕمانەوە لێی دەپرسیت:

- کۆمەڵە بۆ سەرکردایەتیەکەی جێهێشتین؟

- کۆمەڵە بۆ.. دەستی بە شۆڕش نەکرد؟

- کۆمەڵە بۆ.. چەکی نییە، پارەی نییە، شوێنی خۆشاردنەوەی نییە؟

**هاوڕێم عەبدولرەزاق !**

ئیتر لەوڕۆژەوە،گەرچی جاروبار،بیرمان لەسەرشۆڕش کردن و نەکردن ،ڕەخنەگرتنو نەگرتن،هەڵسەنگاندنو هەڵنەسەنگاندن، جیاواز بوو، بەڵام بیرمە، خۆشتدەویستم. بیرمناچێتەوە خۆشمدەویستی.

تۆ.. شەهید، بەهەموو شتێك ڕازی نەبوی. بەڵام پێچەوانەی بۆچونەکانت، هەموو بڕیارەکانت جێبەجێ دەکرد. چونکە پەروەردەکراوی کۆمەڵە بویت. هەر تۆ بویت، یەکەمین مەفرەزەی کۆمەڵەی دەشتی هەولێرت پێکەوەناو هاوکاری شەهید عەلی ساڵحت کرد لەگەڵ شەهید محەمەد عەجەم و شەهید عەلیو ئاسۆ ئاومالْ، لەگەڵ شەهید نامیق تەقتەقی.. پاشان لەگەڵ شەهیدان ئەحمەد سماقەو شەهید ئەحمەد قەمبەر.. هەروا، شەهیدان شاخەوان، ڕێباز، نەبەز و شەهید فاروق.. مەفرەزەی کۆمەڵەتان پێکهێنا. ئەوان لە شاخو تۆش لە شار هاوکاری شەو و ڕۆژیان بویت.

**هاوڕێم.. شەهید عەبدولرەزاق !**

ئەرکی شۆڕشورێکخستن..وایە،هاوڕێی خۆشەویست،یان بەزیندویی،بەشێوەیەکی کاتی، یان بە شەهیدبون، بۆ هەمیشەیی، لێکدادەبڕێ.تۆ گیرایتو زیندانی کرایت..

منیش چومە شاخ و جاروبار هەندێك لە قسەکانت، بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، هاتنەدیێ. بەڵام، ماوەکە کورتخایەن بوو. کۆمەڵە باڵای کرد، من تۆم نەبینیەوە، لە دووەمین کۆنفرانسی کۆمەڵەدا نەبیێ. لە کۆنفرانسەکەشدا، هەر چاکخوازو هەر برای برایەتی بوی. پاشان، کۆمەڵەو بزوتنەوە بوون بە جمگی شۆڕش‌و یەکێتی. بەڵکو پێکەوە یەکێتیان پاراستو سەرخست. پێکیشەوە، خوێنی شەهیدانمان.. شیهابو هاوڕێکانی لە زیندان.. عەلی عەسکەریو هاوڕێکانیشی لە شۆڕش، قەڵبەزەی کاروانی شەهیدان بون. هەروەها.. پێکڕاو تێکڕا.. هەتا راپەڕین گەیشتینە جێ.

**هاوڕێم !**

یەك چیرۆکین.. بەڵام بەسەرهاتەکەشمان جیایە. منو تۆ هەتا ئێستاش یەك ڕێگاین، من، هەر خۆم بە چەپو بە دیموکراتو بە دادپەروەرخواز دەزانم. دڵنیام تۆ مابای، هەمان ڕێگات دەبوو، بەدووریشی نازانم، هەروەکو یەکەمین کۆبونەوەی کەرکوكو کۆبونەوەکانی تر لە هەولێر، لەگەڵ شەهیدان ئاراس، محەمەد زەنگەنە، مەلا غەفور و مەنگوڕی.. پێکەوە دانیشتینایەو دیسان جاروبار، بیرمان لێکهەڵبەزایە.. ئای کە چەند خۆشە، بیر لەیەك هەڵبەزێ. بەڵام رەوشتو گەوهەری شۆڕشگێڕانە هەر یەك بێ.. نەك رەوشتو گەوهەر پەرشو بڵاو، بەڵام بەرواڵەت بیر یەککگرتوو.. نەفرەت لە بیری یەککگرتووی رواڵەت ئامێز.

**هاوڕێم !**

تۆ.. لە رزگارکردنی کەرکوکدا شەهید بوی. دڵنیابە، دوای (12) ساڵ من لە خانەقین بە بەرپەراندنی (54) هەزار تەعریب، تۆڵەم کردیتەوە.

**هاوڕێم !**

**تۆ شەهیدیت. ئێمەش زیندوین. بەڵام ئاسودەبە کەرکوکەکەت ئازادەو ئێستا تەقتەق وەکو چلەکان بەستراوەتەوە بە کەرکوکیش. ئێستا سێگردکانی زێدی کۆنیشت، چاوێکی لە کەرکوکە.**

**بنو هاوڕێم ..**

**دیسان دەیڵێم: تۆ نەمریتو هەتاهەتایە بە کێلی بەرزت دیارە ئاسودەیت..**

**بەڵام منو هاوڕێکانم.. تاقیکردنەوەی سەختمان لەبەردەمدایە.. بتوانین وەکو تۆ، زیندویەکی ئاسودەو شەهیدنەکراوێکی پڕ لە دڵەڕاوکێ نەبین.**

**بەڵێ.. تاقیکردنەوەی سەختی.. یەکێتی لەکاتی نەخۆشی رابەرمان مام جەلال.. تاقیکردنەوەی بەدیهێنانی باقی ئامانجە دوورەکانی نەتەوەکەمان.**

**هاوڕێم !**

**تۆ بڵێی.. هەموومان چونیەك لەخۆمان ببورین بۆ یەکێتی،هەتا یەکێتی، ئامانجە بەدینە هاتوەکانی تریش.. بەئەندازەی خۆی بەدیبێنێ.**

**تۆ بڵێی..وەکو سەرەتای شۆڕش. وەکو پەروەردەی ناو کۆمەڵەو یەکێتی.. جیاواز بین، بەڵام یەك گیانو یەك هەڵوێستو یەك سەنگەری شەهیدانی وەکو عەبدولرەزاق بین؟**

**تۆ بڵێی..؟**

**بەهیوام.**

**مەلا بەختیار**

R–https://www.facebook.com/permalink.php?story_fbid=973958815102727&id=14755351540092&_tn_=K



# پارتیزانی دوای ئەنفال

# ئازاد حسین تۆفیق (ئاسۆ سوور)

*هەڤاڵ ئازادحوسێن تۆفیق شێخ بزێنی ناسراو بە(ئاسۆسوور)

- لەساڵی 1966 لە گوندی شەوگێڕ چاوی بۆژیان هەڵهێناوە

- لەبنەماڵەیەکی زەحمەتکێش تەمەنی لاوی بەرەنجبەری دەستپێ دەکات.

- لەساڵی1980پەیوەندی بە(کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان)ەوەدەکات.

- لە 1982/4/1 پەیوەندی دەکات بە شۆڕشەوە دەبێتە پێشمەرگە

لە کەرتی 2ی ئەحمەدقەمبەری لە (هێزی دەشتی هەولێر)..

- لەهاوینی 1982دەگوازێتەوە بۆ (هەرێمی 2ی کەرکوك)هەموو پلەکان دەبڕێ ..

- ساڵی 1986دەبێت بەفەرماندەی کەرتی2ی شیوەسووری تیپی25ی خاڵخاڵان.

- لەساڵی 1987 شەهیدئازادهەورامی بڕیاری بۆدەردەکات تابکرێ بەجێگری فەرماندەی تیپی 25ی خالاخالان، بەلام جێبەجێ ناکرێ..

- لە شەڕی بەرەیی (قەبوان ـ ماوەت)دا وەك فەرماندەیەکی چالاك رۆڵی دەبێت...

- لە شەڕی بەرگری شاڵاوەکانی ئەنفالی یەك وچوار بەشداری دەکات..

لە 1988/5/3 دوای قۆناغی ئەنفالی چوار بەپارتیزانی درێژەبەخەبات دەدات.

- بەداخەوە لەرۆژی13/7/ 1988 لەنێوان(گردەرەشە)و(دارەتوو) لەگەڵ ئامۆزایەکی بەناوی (جەواد عمرتۆفیق)بە ئیختیفا لەسەرشینایی لەماڵی خاڵۆی دەبێت لەلایەن هێزێکی رژێم و مەفرەزەی تایبەتی (رەحمان کۆپتەر)ەوە بەدیل دەگیرێن و هەواڵەی دەزگاکانی ئەمن وئیستخباراتی هەولێر دەکرێن.

- نزیکەی دوومانگ لە زیندانی (انفرادی)دەمێنێتەوە..

- لە ناو زینداناشەهیدان (مام عومەری قەمچوغە) و(حسن عومەرقولیبەگی)و (مەلاسعدی پەڵکانە) و چەند زیندانییەکی تر دەبینێت..

- دوای دەیان ئازارونەشکەنجە لە1988/9/9بەلێبووردنی گشتی ئازاد دەکرێ.

- ساڵی 1991 پەیوەندی بەشانەچەکدارەکانی(بروسك)ەوە دەکات و لە راپەڕینی 1991 بەشداری دەکات و وەك فەرماندەیەك لەوهێزە دەبێت بەرلە نەورۆز دەچنە ناوشاری کەرکوك و رزگاری دەکەن..

- دوای دامەزرانی حکومەتی هەرێم دەبێت بەفەرماندەی تیپی 22 لە بەتالیۆنی 204ی باباگوڕگوڕ..

- بەشداری لە چەند خولێکی پێگەیاندنی ئەفسەران دەکات:

(خولی یەکەمی فەرماندەیی قەڵاچۆلان لەساڵی 1991وخوولی 2ی ئاسیش1998و خوولی 3ی فەرماندەییەکان 2002 لەقەڵاچۆلان)

- دواپلەی فەرماندەی فەرماندەیی 37ی خاڵخالان بووە

- ئێستا خانەنشینکراوە بە پلەی (عمید).

---

* چاوپێکەوتنێکی نووسەر لە 2019/11/2 سلێمانی



# یادەوەریەکانم لە ڕۆژانی ئەنفال دا *

**ئومێدی مەلاشاخی**

ئێمە لە ناوچەی شێخ بزێنی بووین لە(حاوی توڵکی)کات عەسر بەدواوە بوو. وەکوو ڕۆژانی ئاسایی خەریکی کاری ڕۆژانەی خۆمان بووین، بیٚ ئاگا لەهیچ هەواڵێك..لەپڕ باوکم پەیدا بوو، چەند مانگێك بووباوکمان نەبینی بوو،چونکە پێشمەرگە بوو،باوکم زۆربەی گوندەکانی ئاگادار کردبۆوە زوو فریای خۆتان بکەون.. چونکە ڕژێم نیازی هێرشی هەیە...ئێمە بە بینینی باوکم زۆر خۆشحال بووین،گوتمان ئۆخەی ئەمجارەش بەسەلامەتی هاتەوە ناومان....

بەڵام ئەو هەرزوو پێی ڕاگەیاندین :

یالا...زووکەن خۆتان ئامادە بکەن بۆ ڕەو...پێش ئەوەی دەست بەڕۆیشتن بکەین، هەرزوو دەستمان کرد بە شاردنەوەی کتێبەکانی باوکم...لەو ماوە کورتەدا چەند سەد کتێبێکمان لەژێر زەویدا شاردەوە..بۆئەوەی دەستی ئەنفالچیەکان نەکەون، پاشان دەستمان کرد بە ڕۆیشتن بۆسەر (زیٚ بچوك)بەڵام زێیەکە زۆر زۆر بوو،دەبوو لەو زێیە بپەڕینەوە، بۆئەوەی دەستی ڕژێم نەکەوین،خەڵکی ئەو ناوچەی هەموو شڵەژابوون، لە ترسی ئەنفال.کات گەیشتەمەغریب...مەترسیەکانی ڕژێم دەرکەوت، دەستی کرد بەتۆپبارانکردنی ناوچەکە. ئەوەبوو چەند گوولله تۆپێك نزیکمان کەوتنەوە.. بەڵام شکور خەڵکەکە سەلامەت بوون،ئیتر بە درێژایی ئەو شەوە خەڵکی

لە ڕێگەی کەڵەکەوە ئەپەڕینەوە،ئێمە لە درەنگانی شەو کەڵەکمان بەرکەوت بۆپەڕینەوە من ودایکم وباوکم مابووینەوە،بەڵام براو خوشکەکانم پێشتر پەڕیبوونەوە، لەبەر زۆری ئاوەکە زۆری نەمابوو ئاو بمان بات و بخنکێن، بەڵام شکور بۆ خوا سەلامەت دەرچووین...بەدرێژایی ئەوشەوە هەلیکۆپتەرەکان چەترەتەنووریان بە ئاسمان دا هەڵ ئەدا، بۆ ڕووناک کردنەوەی ئەو ناوچانەی خەڵکی خۆی تێ دا حەشار دابوو،ئەو شەوە ناخۆشترین شەوەکانی ئەنفال بوو، چونکە زۆربەی ئەو خەڵکە لەیەکتری دابڕابوون..

ئەوەبوو ئێمە بەرەو شوێنێکی نادیار هەر بەڕێوەبووین...هەتالەناو ئەو دۆڵ و دەشت ودەرە شوێنێك بۆ حەوانەوە پەیدابکەین..شەو درەنگ گەیشتینە(بانەمۆرد) لەگەڵ دەرکەوتنی گزنگی خۆردا من کە خەبەرم بۆوە سەرم لەسەر سەرینێك بوو. بەڵام سەرینی نەرم نا،بەڵکوو جیاواز لە شەوەکانی تر سەرم لەسەر بەردێك بوو.... ئیتر ئەو ڕۆژە هەر بەبرسێتی خۆمان حەشاردا تا کەشف نەبین...

پاشان لە عەسر بە دواوە دەستمان کرد بەڕۆیشتن بەرەو ئاراستەی هەولێر،هەر بەپێ زیاتر لە دە سەعات بە درێژایی شەو بە ڕێوە بووین،ئەو کات من تەمەنم 11 ساڵان بوو..ئیتر ئەوە بوو بەرەبەیانی زوو گەیشتینە (قوشتەپە) باشووری هەولێر. خۆمان کرد بە ماڵەکاندا...

ئێمە چوینە ماڵێکی بارزانیەوە،ئەو ماڵە زۆر خزمەتیان کردین..نان و ماستیان بۆ هێناین..

زۆر برسی بووین دوای نان خواردن و پوشوویەك ئیتر بەرەو هەولێر بەڕێ کەوتین. پاشان بەرەو بنەسەراوە،چونکە زۆربەی خزم و کەس و کارمان لەوێ بوون...

* سەرچاوە : فەیسبوکی Omed Şhaxî Şhêxbízênî. ١٤ أبریل ٢٠١٥

# شەهید ڕێباز و کتێبی شەڕی پارتیزانی لەکوردستان

کتێبی(شەڕی پارتیزانی لەکوردستان) یەکێك لە نامیلکەکانی فەرماندەی پارتیزانی شەهید ڕێبازە بەرلەوەی ببێتە بشێك لەچاپی دووەمی(قەندیل بەغدای هەژاند) لەساڵی 1989 لەشاخ بڵاوکرایەوە، بۆپێشمەرگە پارتیزانەکان زۆر سوودی هەبوو.. کاك ئەرسەلان بایزیش پێشەکییەکی جوانی بۆنووسیبوو،ئێمەیش هەوڵ دەدەین پوختەیەك لە ناوەڕۆکی ئەو کتێبە وپێشەکییەکەی لەم کتێبەماندا بخەینە بەردیدی خوێنەران:

پوختەی پێشەکییەکەی کاك ئەرسەلان بایز

- شەڕی پارتیزانی شەڕی میللەتێکی چەوساوەیە دژی دەسەڵاتێکی بەتوانا. لەکاتێکدا پەی بەهیچ ڕێگایەکی تر نابات..

پارتیزان خاوەنی ستراتیژێکی ڕوژانەیە، ڕاچاوی پێداویستییەکان دەکات،پابەندە بەخەباتی سیاسی وراگەیاندن و ئابووری..

. پێشمەرگە داینەمۆی شەڕی پارتیزانییە،مەرجەکانی سەرکەوتنیشی بریتین لە ڕێکخستن وهۆشیاری وپەروەردەی سیاسی وپێشمەرگەیی وگوێڕایەڵی وگیانبازی.

. سەرکردایەتی ئاگای لەدەستەکانی خوارەوەهەبێت، ئامۆژگارییان بکات.وا پێکەوەبژێن بەچاوی شۆڕشگێڕانەلێك بڕوانن.بەشێوەیەك متمانەیان بەیکتر هەبێت.

. شەڕی پارتیزانی بۆجەماوەرە هەرجەماوەریش خۆی پشتیوانیەتی،هەربۆیە پێویستە پارتیزانەکان دڵی خەڵك ڕابگرن و ڕێز لە نەریت وبیروباوەڕیان بگرن...

بۆنموونە دەبێ سوود لە شۆرشی گەلان وەربگرین:

. شەڕی پارتیزانی وەك ڕاوە ماسی وایە،چۆن ڕاوچی دەبێ زۆرشارەزابێت،ئاوا دەبێ فەرماندەی پارتیزانەکان هێزەکەی دابەشبکات،شارەزایی لە لەناوچەکەو بەهێزی ولاوازی دژمن هەبێت..

- چۆن ڕاوچی جێ گۆڕکێ دەکات دەبێ ئەویش ڕێگای کشانەوە ڕچاو بکات.

## پوختەیەك لە نامیلکەکەی شەهید ڕێباز

شەهیدڕێباز بۆئەوەی شۆرشگێران ونیشتمانپەروەرانی گەلەکەی شارەزاییان لەشەڕی پارتیزانیدا هەبێت لەم کتێبە گیرفانییەدا بە گونجان لەگەل هەلومەرجی ولاتی خۆمان باسی لەشەڕی پارتیزانی لەکوردستان کردووە:

### 1- شەری پارتیزانی بۆچی...؟

دەربارەی نابەرانبەری هێز و هەلومەرجی پارتیزانی پێی وایە گەلی کورد بەناچاری خەباتی شەڕی پارتیزانی هەلبژاردووە،باسی لەدژواری شەڕی پارتیزانی وقوناغی ناخۆشی دوای ئەنفالەکان وکاولکردنی گوندەکان وراگواستنیان بۆئۆردوگاکان و سەلماندنی ئەوڕاستییەی کەپێشمەرگە سەنگەر چۆلناکات زۆربەجوانی کردووە.

### 2 - ئامانجەکانی شەڕی پارتیزانی:

- بۆهیلاك وماندووکردنی هێزەلەخۆباییەکەی دوژمن،دەستوەشاندنی لەناکاو، سەرلەدژمن شێواندن،ماندوکردن و پەرتەوازەکردنی،وای لێ بکرێ لەهەمووشوێنێك بەگومان بێت،وابزانێ کەپارتیزانی لێیە،زیانی ئابووری بگەیەنێتەدژمن..

. بەپشت بە زانیاری خەلك دەبێ خۆیان لەشەڕی نابەرانبەر بپارێزن، ئزوقەی پێویست دابین بکەن، پەیوەندی لەگەلْ خەلْك کۆلەگەی سەرکەوتنیانە..

## 3 ـ مەرجەکانی پاریزانی:

. باوەڕی بەرێکخراوەسیاسییەکەی هەبێت،کەسەرکردایەتی شۆڕش دەکات..

. تەندروستی باش بێت ، تەمەنی لەنێوان 18ـ35 ساڵدابێت.

. توانای رۆیشتنی باش بێت ، شارەزایی باشی لەناوچەکە هەبێت.

. پشوودرێژبێت،بەرگەی برسێتی تێنویەتی بگرێت.

. ورەی بەرزبێت،هۆشیارو گوێڕایەڵی فەرماندەکانی بێت.

. دوودڵ و نائومێد نەبێت.

. هەرگیز دوژمن نەتوانێت فریوی بدات.

. بەرگەی سەرماو گەرما بگرێت.

. پەیوەندی لەگەڵ جەماوەر باش بێت.

## 4 ـ ئەرکەکانی پارتیزان:

. دەستوەشاندن لەدوژمن.

. بیروباوەڕی رێکخراوەکەی بگەیەنێتە جەماوەر.

. پەردە لەسەرتاوانەکانی دوژمن هەڵماڵێ.

. دۆست ولایەنگر بۆ رێکخراوەکەی پەیدابکات.

## 5 ـ ژیانی پارتیزانی :

. ئەگەرجاران گوندنشینەکان ژیانی پێشمەرگەیان دابین دەکرد،بۆئێستا واپێویستە:

. لەرێی ئۆردوگاکان و ئەوجوتیارانەوە کە ناوەناوە دێنەناوچە وێراەکان..

. دابینکردنی قاپ وکەوچك وتەشت وسێڵ دابەشکردنیان بۆ چەند شوێنی جیاجیا..

. پەیداکردنی برنج وئاوتەماتەوفاسولیا و لۆبیا..وشاردنەوەیان لەچەند جێگایەك..

. لەکاتی چوونی پارتیزان بۆناوچە ئاوەدانەکان خۆراکی شەش ژەم هەڵگرن.

. ئەگەر دابین بکرێ بەکارهێنانی غاز لەسووتەنی تر باشترە..

. گۆشت ئەگەر هەبوو بکرێتە قاورمە باشترە.

. پاراستنی نهێنی شوێنی بنکەکان..

## 6 ـ پێداویستی پارتیزانەکان:

ئەوپێشمەرگانەی بۆپارتیزانی ئامادە دەکرێن دەبێ

پێداویستی 4.3مانگیان بۆ دابین بکرێت کەبریتین لە:

1. دوو دەست پۆشاك    2. پێڵاوی جۆری ئەدیداس

3. قەمسەڵەی باش    4. بارانگیر ئەگەر دەست بکەوێت.؟

## 7 ـ جۆری چەکی پارتیزان:

. بۆهەرپارتیزانێك کلاشینکۆفێکی بێ قۆناغ ، دوو نارنجۆك ، یەك (RPG)

. یەك قەناس یان ناتۆ یەك ، مین جۆری گەورەو بچووك

## 8 ـ رێکخستنی پارتیزانەکان:

بۆ سەردەمی دوای ئەنفال پێویستە پێکهاتەیان بەمشێوەیە بێت:

. رەتڵ یان هەرناوێکی تر کە لەسێ دەستە پێکبێت،

ژمارەی هەرمەفرەزەیەك 10 . 12 پارتیزان بێت.

. فەرماندەی رەتڵەکان پەیوەندی راستەوخۆیان بەسەرکردایەتییەوەهەبێت.

. دکتۆر یان برینپێچێکیان لەگەڵدا هەبێت.

. هەرمەفرەزەیەك فەرماندەو جێگرو رێکخەری هەبێت.

. لانی کەم هەرمەفرەزەیەك 4.3 کەسیان شارەزای اوچەکە بن.

## 9 ـ پەیوەندی مەفرەزەکان:

. بەجیهازی بچووك، یان بەناردنی نامە، یەکتر لەجموجوڵی دوژمن ئاگاداربکەن.

. پاراستنی نهێنی ئەوهاوکارانەی لەشاروشارۆچکەوئۆردوگاکان هاوکاریان دەکەن.

. پێویستە مەفرەزەکان رۆژانە، یاحەوتانە پەیوەندییان هەبێت ویەکتری لەجمووجولی دوژمن ئاگاداربکەنەوە..

. پیویستە فەرماندەی رەتڵ لانی کەم 20رۆژجارێك لەگەڵ دەستەکان کۆببێتەوە، گوێیان لێ بگرێ،گیروگرفتەکانیان چارەبکات،پێداویستییەکانیان بۆدابین بکات..

10 . پەیوەندی لەگەڵ سەرکردایەتی:

. لێپرسراوی رەتڵ دەبێ بەپێی پێویست پەیوەندی بەسەرکردایەتییەوەبکات و رێنمایی ودەنگوباسی خۆیان وشاروشارۆچکەکان بگەیەنێتە سەرکردایەتی..

. پیویستە هەمیشە پاتری شەحنکراوی یەدەکیان پێبێت

. نابێت گفتوگۆی جیهاز کراوەبێت..

11 . پەیوەندی لەگەڵ رێکخستنی شارەکان:

. پەیوەندی پارتیزانەکان ورێکخستنی شار پەیوەندییەکی هاورێیانەو هاوخەباتییە، پێویستی بەنهێنی پارێزی هەیە،بۆئەوەی دوژمن پێیان نەزانێت..

## 12 ـ پەیوەندی لەگەڵ شوانەکان:

. شوان و مەڕدارەکان بەشێکن لە گەلەچەوساوەکەمان،زوڵم وزۆری زۆریان لێکراوە،هەربۆیە رۆڵی باشیان هەیە لە هاوکاری پارتیزانەکان..

## 13 ـ پەیوەندی لەگەڵ خەڵك:

. لە شۆڕشدا هەمیشە خەڵك پشتیوانی شۆڕش بووە،گوتراوە (ئاوبۆماسی چۆنە. جەماوەریش بۆپێشمەرگەوایە)بۆیەدەبێ پەیوەندی خەڵك وپارتیزانەکان باش بێت.

. نابێ لەکەس بدرێ،بێرێزی بەکەس بکرێ،بەزۆر پارە لەکەس بسەندرێ، دەبێ واخۆیان خۆشەویست بکەن کەخەڵك خۆی هاوکارییان بکات.،پێویستە دڵسۆز و وەفاداری خەڵك بن.

. لەکاتی چونەناوخەڵك دەبێ پارتزاەکان باس لەسەروەرییەکان وشەهیدەکان بۆخەڵك بکەن،گوند ورەزوباخ وکانی و کانیاو جوانی زیدی خۆیانیان بیربێننەوە، تابیسەلمێنن کە دڵسۆزە خاك و وڵاتن..

. بۆخەڵکی روونبکەنەوە هەمیشە شۆڕش لەسەختترین رۆژگارەکاندا هەرئەوان پشت پەپەنای بوون..

## 14 - پارتیزانەکان لەوەرزی زستاندا:

. جاران پێشمەرگە لەگوندەکان دەمانەوە،بەڵام ئێستا ئەبێ دوورلەرێگاوبانەکان حەشارگەدرووست بکات،دووربێت لە رێڕەوی خەڵك وئاوەدانی..

. پێویستە رایەخ وبەتانی هەبێت ولەنێوحەشارگەکان دوور لەچاوی ناحەزان و سەرنشینی کۆپتەرەکان بیشارێتەوە. نابێت ئاگری دوکەڵدار بکاتەوە.

. دەبێ بەشەو بەرۆژ ئێشکگریان هەبێت.

. بووئەوەی تەندروست بن دەبێ خۆیان لەبەفروباران بپارێزن.

. شەودرێژیێ زستان لە بەرژەوەندی پارتیزانەکاندایە..

. کورتی رۆژیش لەقازانجی ئەوانە،ئەگەرتووشی شەڕیش بێن دوژمن زووتر دەکشێتەوە..

## 15 - پارتیزانەکان لەوەرزەکانی تردا:

. لەوەرزەکانی بەهار وهاوین وپایزدا پارتیزانەکان وەزعیان باشترە،پێویستیان زۆر بە ئەشکەوت وخانوونییە.دەتوانن لە ناوچەدەشتاییەکان هەر رۆژە لەشوێنێ بژێن.

. لەهاویندا زیاتر پێویستیان بەئاو دەبێت

. هەمیشەسەرکانی کارێزەکان جێی گومانی دوژمن بوون.

## 16 ـ پلانەکانی دوژمن:

لەسەرەتای شۆڕش دوژمن هەوڵی دەدا لەڕێی موختار و مامۆستاو فەڕاش و کۆمەڵەی جوتیارانەوەزانیاری لەسەرپێشمەرکۆبکاتەوە،بەڵام ئیستابەمشێوانە پلان دادەڕێژێ:

. زۆرجارسیخوڕو بەکرێگیراوەکانی ڕژێم ،بەبیانووی گوایە برایەکیان دیار نییە، یان بردنەوەی کەلوپەل و سەردانی گوندەوە دێنە ناوچەشاخاویەکان..

. ناردنی کەسوکاری پێشمەرگە بەزۆربۆ بردنەوەی کوڕوبراو کەسوکاریان، دوای گەڕانەوە لێکۆڵینەوەی وردەکەن..

زۆرجاربەوجۆرە شوێنی پارتیزانەکان ئاشکراکراوە.

. جاری وایە پیاوەکانی ڕژێم دەچنەماڵی پێشمەرگەکان،گوایە کەسێکیان گیراوە داوایان لێدەکەن پچن بۆلای پارتیزانەکان.تالەوڕێیەوە شوێنەکانیان ئاشکرابکەن

. ئاشکرابوون بەهۆی خەڵکی بەناو راوچی یەوە.

. ناردنی خەڵکی خۆیان لەشێوەی شوان.

. ناردنی مەفرەزەی جاش بۆ لوتکەبەرزەکان وچاودێری کردنی جمووجوڵی پارتیزانەکان بەهۆی دووربینەوەو بەدواداچوون بۆ دۆزینەوەی بنکەکانیان.

. شێن پێ هەڵگرتن گەڕان بە هەلیکۆپتەر.

. لێکۆڵینەوەلەوەپێشمەرگانەی تەسلیم دەبوونەوە.

. گوێگرتن لەبێتەلی پارتیزانەکان بە ئامیری پێشکەوتوو بۆ دۆزینەوەیان.

. دانانی سیخوڕ لە ئۆردوگاکان.

. ناردنی کەسێکی خۆیان بۆلای پارتیزاەکان ،بۆئەوەی بەفێڵ بیانخەنە تۆڕەوە..

. گرتنی کەسانی دڵسۆزو پاشان ئازادکردنیان، بەومەرجەی زانیاری لەسەر پارتیزانەکان کۆبکەنەوە.

. لەهاویندا،ڕێگادان بەهەندێ جوتیاری گوندەکان بەناوی شینایی کردن وکشتوکاڵەوە.بەمەبەستی کۆکردنەوەی زانیاری و چاودێری پارتیزانەکان..

. نابێ دۆست ودوژمن تێکەڵاوبکرێن و دەبێ پارتیزانەکان وریابن.

## 17 ـ هێرشەکانی دوژمن:

. دوای کۆکردنەوەی زانیاری دوژمن بەهێزی زۆری سوپاوجاشەوە، بەپاڵپشتی کۆپتەر دەکەوێتە کێومالْ بەمەبەستی دۆزینەوەی پارتیزانەکان...

. زۆرجار چەندفەوج لەجەیش وجاش دەمێننەوە،بەمەبەستی بێزارکردنی پارتیزانەکان.

. چەندین جار زوڵمیان لە شوان وگاوان وخەڵکی جوتیاریان کردووە،گوایە پێشمەرگەیان لەناوچە قەدەغە(محرمە)کان گرتووە..

. لەشەوداڕووبەڕووبوونەوە گونجاوە،لەڕۆژدالەبەرنابەرانبەری هێزکارێکی باش نیە.

## 18 ـ خۆپاراستن لەدوژمن :

دوژمن هەمووشێوازەکان بەکار دێنێ بۆدۆزینەوەی پارتیزانەکان بۆیە پێویستە:

. پێویستەبەرلەخۆرکەوتن بگەنە حەشارگەکانیان.

. نەخافڵێن و پاسەوانی لەخۆیان بکەن.

. لەکاتی بینینی دوژمن لەلایەن حەرەسەوە،نابێ بپەشۆکێن..

. هەندێ جار دوو حەرەس هەبێ باشترە.

فەرماندەی مەفرەزەدەبێ سەردانی حەرەسەکان بکات..

. لەدوای خۆیان دەبێ شوێن پێی خۆیان بسڕنەوە..

. نابێ هیچ پاشماوەوشوێنەوارێك لەجێگای مانەوەیان بەجێ بهێڵن..

. تووشی کەسی نامۆبوون لێکۆڵینەوەی لەگەڵ بکەن..

نابێ هەڕەشەی لێ بکەن و لێی بدەن، پێویستە فەرماندەکایان دڵنیابێت،گەرپیاو خراپ بوو ئەوسا سزای بدەن..

. لەکێوماڵکردندازۆرجاردوژمن لەپارتیزانەکان نزیك دەبێتەوە،دەیکەن بەهەرا ئاوەتان..!تەقەی کوێرانەدەکەن،دەبێ پارتیزانەکان خۆڕاگربن، تادڵنیادەبن لەوەی کەئاشکرابوون، دەبێ خۆئاشکرانەکەن..

. لەکاتی گەڕانی کۆیتەرەکاندا خۆت لە شوێنی هێسترو بارهەڵگرەکان بەدووربگرە..

. دەتوانن بەشەویش ناوە ناوە سوود لەدووربین وەربگرن..

. لەرێگا سەرەکییەکاندا تا لەدوژمن دڵنیانەبوویت مەپەڕەوە..

. هەوڵ بدە بە شەوان ئاگر بەکار مەهێنە،چونکە دەبێتەهۆی ئاشکرابوون..

. مەرج نیە لەکێووهەردەکان خۆحەشاربدەن،جار واهەیە شوێنی بێگومان باشترە.

. پارتیزان نابێ دڵداری بکات ...

. لەچوون بۆناوشارو ئۆردوگاکان دەبێت وریای هاوکارەکانتان بن،نابێ کەس بزانێ، چونکە ئاشکرابوونیان زۆرمەترسیدارە..

. شوێنی خەوتن نابێ وادەستکاری بکرێ دوایی بۆت وەك خۆی لێ نەیەتەوەوببێتەهۆی ئاشکرابوون.

. لەکاتی ئاشکرابوون دوودڵ مەبە،بۆشەڕی بەرگری دەبێت مەردانە سەنگەربگریت. تەنیا چەکە رزگارت دەکات،سەربازو جاشەکان ترسنۆکن،خۆیان بەکوشت نادەن..

. دبێ لەوئازووقانەی بۆتان دێ دڵنیابن،چونکە دوژمن زۆر فێڵبازو نامەردە.

. پارتیزانەکان نابێت مەی بخۆنەوە..

. خۆیان غەش بکەن وبچنەشوێنی بێشك،تالەچاوی دوژمن بەدوربن.

. پێویستە لەسەرچاوەکانی ئاو خۆبەدووربگرن،چونکە جێی گومانن.

. لەهەرشوێنێك بینران،لەوێ دووربکەونەوە.

. خۆپاراستن جگەلەوەی پاراستنی گیانی پارتیزانەکانە،ئەرکێکی نیشتمانیشە.

## 19 ـ شەڕکردن لەگەڵ دوژمن :

شەڕی پارتیزانی جیاوازە،بۆئەوەی زەبری کوشندە لەدوژمن بدەی پێویستە:

. لەنزیك شارەکان یەکدووسەیارەی دوژمن بخرێتەکەمینەوە ودەستی لێ بووەشێندرێ..

. پلان بۆکوشتنی پیاوانی رژێم لە رێگای دەوامیان دابنرێت.

. مۆڵگە بچووك ولاوازەکانی دوژمن بکرێنەئامانج.

. تەقەکردن لە مۆڵگەکانی دوژمن لە نزیك شاروئۆردوگاکان،ئەگەر کاریگەریش نەبێت جەماوەر هۆشیارو دوژمن تووشی شلەژان دەبێت..

. لەناوچەشاخاویەکان بۆسە دابنرێ بۆ ئەوسەربازانەی هاتووچۆ دەکەن..

## 20 ـ چارەسەرکردنی نەخۆش وبریندار:

. بریندار پێویستە چارەسەری سەرەتایی بکرێت.

. گەرباش نەبوو رەوانەی سەرکردایەتی بکرێتەوە.

. لەرێی دۆستەکانەوە نەخۆش چارەبکرێت و پێداویستی پزیشکی دابین بکرێت.

## 21 ـ گۆڕینی پارتیزانەکان:

. هەموومرۆڤێك ماندوودەبێت،ەخۆش دەکەوێت،بێزاردەبێت..

بۆیە پێویستی ساڵی جارێك بگەڕێتەوە بۆ سەرکردایەتی..

. پێویستە ئەورەتلەی دێتە شوێنەکەیان لای کەم 10 رۆژ پێکەوەبن..

بۆئەوەی لەجێ وڕێ وناوچەکەوئەشکەوتەکان وشێوازی ژیان لەوێ شارەزابن.(*)

---

* قەندیل بەغدای هەژاند / شەهید ڕێباز / چاپی سێیەم / هەولێر

## ناوی چەند پارتیزانێکی رەتڵی دەشتی هەولێر

1 ـ رفعت عبدالله پیرداود (رێبان)

2 ـ سلێمان عارەب ئیسماعیل (مەلاسلێمان)

3 ـ هاشم (هاشم جهان)

4 ـ برهان سعید صوّفی

5 ـ ئاسۆ مامەند (ئاسۆ ئەڵمانی)

6 ـ جلال خورشید (جلال ئیلنجاغی)

7 ـ ئاسۆ معلم

8 ـ کاوە انور نادر (مامۆستا کاوە)

9 ـ ئاوات

10 ـ عباس حمدامین (عباس عەوێنە)

11 ـ ابووزید تەها (مامۆستا ابووزید)

12 ـ ادریس صالح نبی (ادریس مصیفی)

13 ـ رحمان عوسمان حمد(رحمان رەش)

14 ـ محمدتاهیر محمد سوسەیی

15 ـ رەنجدەر فەتاح (مامۆستا رەنجدەر)

15 ـ بێستوون خدر

17 ـ ئازۆ عزیز

18 ـ احمدعبدول

19 ـ غازی عبدالله (مەلاغازی)

20 ـ ئارام چاورەش

21 ـ ئاوات شکور

22 ـ شەهید عوسمان علی سوور

23 ـ شەهیداسماعیل خورشید

## لە بیرەوەرییەکانی  پارتیزان مامۆستا کاوە:
## ئەمەکی شەهید ڕێباز بۆ هاوسەنگەرەکانی

ساڵی1988بوو،چێشتە نگاوێکی درەنگی ساڵ بوو،ئیمەمەفرەزەیە ك پێشمەرگەی پارتیزانی دەشتی هەولێر لە هەڵەتەکانی نیوان(حاجی وسوو)و( باخچە)ئیختیفا بووین، لەبەر مەترسی دەرچوونی ڕۆژانەی دووژمن،شەهیدڕیباز خۆی کە مەسئولی ڕەتڵی پارتیزانەکانی دەشتی هەولێربوو،لەبەرزایەکدا چاودیری ناوچەکەی دە کرد.

من و شەهید ملاسلێمان جوینە لای بۆ ئەوەی ئێمە حەرس بین و ئەو بچیت نان بخوات،کاتیك لێی نزیك بووینەوە وسلاومان کرد بینیمان زۆر عاجزە و فرمێسك بە روخساریەوە دیارە،شەهیدملاسلێمان پێیوت:ئەوەچیە کاك ریباز بۆ وا عاجزی؟؟ هیچ وەلاٚمێکی نەبوو،دیسان لێی دوو بارەکردەوە لەولاٚمدا کەگریان لەگەروی بوو.. وتی: چۆن دڵگران نەبم .ماڵی شەهیدێکی هاوڕێم  کە ئامر کەرتێکی قارەمانی تیبی85ی دەشتی هەولێر بوو.لە بنەسلاوە کە وتوون و زۆر هەژارن..منیش هیچم بەدەستەوە نیە.. بۆیان بنێرم. .ئێمەش کاتیٚ گوێمان لەو قسەیەبوو.. خۆمان بی نەگیراو دەستمان بەگریان کرد، گریاین بۆ بێکەسی و بیٚ پشتیوانی کورد..

گریاین بۆ ئەو هەموو مەینەتیەی کەبەسەر میلەتە کەماندا هاتبوو،جونکە ئەویٚ ڕۆژی کوردکارەساتی گەورەی ئەنفال وکیمیابارانی هەڵەبجەی بەسەرهاتبوو، دیهاتەکانی وێران کرابوو. ڕۆژ نەبوو هەواڵی تەختکردنی شارووشارۆچکەکانی یاهەواڵی جەرگبڕی ئیعدام و ڕەمی کردنی دەستە دەستەی لاوەکانی نەبیستین.. تەنها تروسکەی ئومێدیك کە مابوو شۆرش و پیشمەرگەبوو،کەژمارەی دەستەکانی ئەوسای پیشمەرگەش ژمارەی بەنجەکانی  دەست بوو، هەزاران سلاو ودروود بۆ گیانی شە هیدی سەرکردە  شە هید ریبازو تێکرای شە هیدانی کوردستان..



## شەهید ڕێباز
## پێشمەرگەی هەردوو شۆڕش و
## پارتیزان و سەرکردە خاکیەکە *

**لەیادی (24) سالەی شەهید ڕێبازی بەغەدر شەهید کراو...**

( لۆت لاربم شۆرشر چەند گەلۆر نانت دەخوا) ئەمە ووتەی شەهید ڕێبازە ئەو ڕێبازەی لە پێناو ڕێبازی کوردایەتی ومەردایەتی داکۆششی کرد تاگەل ئازاد بێت، تا خاك پشوو بدات، تاجوتیارو گوندنشینەکان بەئاسوودەیی زەوییان بەراو بکەن. ئەم وتەیەی شەهیدڕێباز لەوەسەرچاوەی گرتوە غەدرە ئەوانەی بەشۆڕشەوە ماندوونەبوون و شۆڕش خزمەتیان بکات وبیان کات بەرپرس ودەسەلات دار..... ئەم وتەیەی شەهید ڕێباز (30) ساڵ لەمەبەرە ڕێك بۆ سەردەمی ئێستا وتراوە کە حکومەتی کوردی سەدان جاش و کەسی سەردەمی بەعسی نان دەداو دەست ڕۆیشتووی حکومەتی کوردین،جموجۆلی کاری ڕێکخراوەیی ئەوکاتی ڕێباز ناسرابوو بە(ڕەنجاو) لەتەمەنی لاوی ئەوکاتی دەسەلاتدارانی هەولێری تووشی شۆك کردبوو. لەساڵی 1959دەستگیر دەکرێت، ناوبراوپاش تەواو کردنی ئامادەیی کشتوکاڵ لەسەردەمی شۆڕشی ئەیلول وەك گەنجێکی قارەمان پەیوەندی بە شۆڕش کردو دەورێکی کاریگەری هەبوو لە پێشمەرگایەتی و دەزگا جیاجیاکانی شۆڕش. ئەوماوەی پێشمەرگە بوو لەناو شۆڕش جێ دەستی دیاربوو واتە وەك کادرێکی پێشکەوتووحسابیان بۆدەکرد..لەگەڵ دامەزرانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان ڕێبازی بیروبازوو. ڕێبازی دڵسۆزی هەژاران و چەوساوەکان،ڕێبازی خەمخۆرانی

گوندنشینەکان پەیوەندی کرد و قۆلی مەردایەتی و شۆرشگێری لێ هەڵکردوو ژمارەیەك لاوی خوێن گەرمی ئەوکاتەی هەولێر بوونە سەرمەشق وپێشرەوی رێکخستنەکانی کۆمەڵە واتە سەردەمی زێرین و مەنتقی هێزی رێکخستن بۆ ئەوێ رۆژێ مێژووی خۆی تۆمار کرد،دواتر شەهید رێباز یەکێکە لە پێشمەرگە سەرەتاکانی شۆرشی نوێ گەلەکەمان لەگەڵ شەهیدی سەرکردە(شاخەوان عەباس) بەیەك رۆژو یەك سەعات لە 15. 5. 1977 دەبنە پێشمەرگە..دیارە پێشمەرگایەتی سەرەتاکانی شۆرشی نوێ زۆر سەخت و دژوار بووە، واتە یەکێتی بوون بۆ ئەوێ رۆژێ قورس بووە وەلێ نەك هەردووژمنی سەرەکی چاوی لەسەرت بووە بەڵکو هێزێکی ناوخۆیش بە پشت وپەنای دەوڵەتانی دراوسێ هەمیشە بۆسەو کەمینی بۆ دەنانەوە.. بەڵام شارەزایی و سەبرو خۆراگری جەستەوهزری شەهید رێباز زۆر گەورەترو بەهێزتربوو لە پیلان و بیرکردنەوەی ئەوان،دۆست ودوژمن دەزانن ئەو شەرانەی بەسەرکردایەتی شەهیدرێباز بوایە لە هەرسنورو میحوەرێك دوژمن خۆی لەبەر هێرش وهەڵمەتەکانی رانەدەگرت.. ئازایی شەهید رێباز سنوری نەبوو..

ئەو جیاواز بوو لەسەرکردەو بەرپرسانی تر،هەموو خەڵکی سنورەی هەولێر شایەدی بۆ دەدەن شەهید رێباز چەند پیاوێکی بە پەیوەندی ودۆستایەتی بووە ولەگەڵ ئەمەش بەوەفابووە جگە لەمە دەستێکی باڵای هەبوە لە چارەسەری کێشەکۆمەلاتیەکان،لە رووی رۆشنبیری کادرێکی خوێندەوار هەمیشەو بەردەوام گوێگرێکی رادیۆ و خوێنەری کتابەتازە چاپکراوەکان بووە و لە زۆربەی دانیشتن و کۆرو کۆبونەوەکان ئەو وەزع و پێشهاتەکانی تاوتوێ دەکردو رای خۆشی دەووت ، وەك هەڤاڵانی دەگێرنەوە دەلێن لە زۆر رووداوی مەنتیقەکە پێشبینی ئەو دەهاتەدی..لەرووی سیاسی بەوە کادرێکی کامل وشامل بووە و وتاری سیاسیشی هەبوە، لە ناو جوتیارانیش شەهید رێباز دەوری کاریگەری زۆر ی هەبوەو هەمیشە

هاندەرو پشتیوانی جوتیاران بووە.لە دوای راپەرینش لە سەردەمی بەرەی کوردستانی ئەوانەی خزمەتی پێشمەرگەو شۆرشیان کردبوو بەپێ چەند یاساو رێنماییەك لە سنوری گوندەکان ئەو زەویانەی گەراندەوە کە بەعسیەکان بە میزاجی شەخسی و وەلائیان بۆ بەعس هەبوو دایەوە بە جوتیارانی سنورەکان.. لەگەڵ هەژاران دۆستێکی سەرسەخت و بەرگریکارێکی بەردەوام بووە، هەربۆیە ئێستاش کە لەژیان نەماوە خەڵکانێ زۆر شەهید رێباز بە خاکی وەسف دەکەن. لەرووی ئیداریەوە پیاوێکی راستگۆ، ئەمین،کراوە،دەست پاک، شارەزا، شەفاف ،لەرووی عەسکرییەوە مێژوو شایەدە ئەو ئۆرگانانەی کە (شەهیدرێباز) لەبواری سەربازی سەرپەرشتی و سەرکردایەتی کردوون سەدان داستان و شەری گەورەن لە مێژووی پێشمەرگایەتی تۆماری کردوون،لەپێشمەرگایەتی خاکی وخۆنەویست،نەرم ونیان، بەردەوام بە قسەو نوکتەو بەسەرهاتی خۆش لەگەڵ هەڤالانی کاتی بەسەر بردوە . پیاوێك بوە هەمیشە ئارەزووی لە خوێندنەوەو نوسین کردوە لەسەردەمی شاخ بەردەوام رۆژمێرەکەی وەك هاورێ یەکی لە گیرفان بوە هەموو ئەو داستان و رووداو تێبینیانەی رۆژانەی تۆمار دەکرد هەر بە هۆی ئەم رۆژمێرەوە یَ 2) کتابی خستە ناو کتێبخانەی کوردیەوە بە (5) بەش بە هەردوو کتابەکەوە بەناوەکانی یَقەندیل بەغدای هەژاند) و (نرکەی کوردستان) نوسەرێکی بەتواناو بەسەلیقە بووە .لە قۆناغی بزوتنەوەی کوردایەتی یَپارتیزانی) قۆناغێکی سەختی شەهید رێبازبوە کە سەرکردایەتی رەتڵی هەولێری کردوە بۆ ماوەی چواردە (14) مانگ لە گوندەکانی دەوروبەری هەولێر وەك پارتیزان ماوەتەوە لەگەڵ ژمارەیەك پێشمەرگە، بۆ مێژوو دەلێم شەهید رێباز بە وەفاترین پێشمەرگەو سەرکردە بوە لە دوای راپەرین سەردانی زۆربەی گوندەکانی کردۆتەوە ئەو خەلکانەی بەسەر کردۆتەوە رۆژگارێك بەرامبەر پێشمەرگەو شۆرش هەلوێستیان هەبوەو خزمەتی پێشمەرگەیان کردوە.

ئێستاش گوندنشینەکان کەباس دێتەسەر وەفاداری سەرکردەکان شەهید رێباز بە نمونەی سەرکردەی خاکی و وەفاداری وەسف دەکەن . ئەوەی شەهید رێبازی بە خۆشەویست و گەورەی هێشتەوە سادەیی و خۆنەویستی و دەست پاکی بوو هەمیشە خەمی هاوولاتیانی بەهند وەردەگرت ، لە دوای ڕاپەرین حکومەتی هەرێم تووشی قەیرانی دارایی هات و نەیتوانی موچەی فەرمانبەران بدات بەگشتی شەهید رێباز هەموو بەیانیەك چاودێری نرخی بازاری دەکرد و نرخی شتومەك و خۆراکی وەردەگرت و لە پەراوێك دەینوسی و دەهاتەوە بارەگا ئاخی هەلدەکێشا دەیووت ئەمرۆ لەبەرنەبوونی وبێ پارەی مامۆستایان دەبێ سەلاجە بفرۆشن یان مەکتەبەی مالەوە بفرۆشن یان کالایەك بفرۆشن . خەمی هاونیشتیمانانی لە کۆلْ نابوو بۆیە رێبازی هەژاران و جوتیاران بوو..ناوبراو لە ناو توێژی هەژاران خۆشەویست و خاوەن جەماوەرێکی ئیکجار زۆر بوو هەر بۆیە رێباز لە کوێ بوایە هەژارو جوتیارو گوندندنشینەکان لەوێ بوون ئەویش بێ ئەوان نەدەژیاو هەمیشە دلْی لای ئەوان بوو .بەلام بەداخەوە مێژوو شایەدە چ لە سالانی هەشتاکان چ لە دوای ڕاپەرین ئەوەی باوەری پێ ی نەبوو شەهید رێباز شەری ناوخۆ بوو ، لە زۆر دیدارو ووتارو کۆبونەوەی عسکری و سیاسی و کۆمەلایەتی ئیدانەی شەری براکوژی دەکرد و ئەم شەرەی بە شەری نەگریس ومالوێرانی وەسف دەکرد بەلام بەداخەوە لەشەری ناوخۆ و لە 7. 5. 1994 بەدیلی دەستگیر دەکرێ و شەهید دەکرێ .. هەڤال لیوا (کاوە ئەنوەر نادر) ناسراوە بەمامۆستا کاوە پێشمەرگەی دێرین و پارتیزان وهاوسەنگەرو هاوپارتیزانی شەهید رێبازلە یادی شەهید بوونی ئەم سەرکردەیە لە فەیسبووکی خۆی نوسیبووی : شەهید ێریباز هەربە تەنیا شورشگێرێك وفەرماندەیەکی ئاسایی نەبوو بەلْکو بەوئەزموونە زۆرەی کە هەیبوو لە قوناغەکانی شۆڕش وسەردەمە جیاوازەکان کە لەمەفرەزە سەرەتاییەکانەوە بە

شداری کارا و راستەوخوی هەبوو وەك سەرکردەیەکی کارامەودیاری نێو هێزی پێشمەرگە ئەو بەراستی و بەکردەوە لەدارشتنی نەخشەو پلانی شەرەکان و پەلاماری گرتنی رەبیە و تیکشکانی هێرشەکانی دووژمن هەمیشە رۆلی سەرەکی دەبینی سەرە رای ئەوەی لە بواری سیاسیشدا لەنێو جەماوەروهێزی پێشمەرگەدا رۆڵی کاریگەری هەبوو.کەم روژ هەبوو شەهید ریباز کۆبوونەوە لەگەڵ کەرت و تیپەکانی سنورەکەی نەکات وسەبارەت بەمەسەلە گرینگ و پێویستەکان قسەیان بۆنەکات، کوبۆنەوەکانی ئەو زورجار سنوری تیپەکانی هەولێری تێدەپەراند بەتایبەتی لەکاتی جەولەکان وەشەرەکانی بەرگری لە سەرکردایەتی کۆبوەنەوەکانی ئەو چونکە راستگویانە ولەناخەوە بوو،هێندە کاریگەربوو لەسەر هیزی پێشمەرگە هەر بۆیە زۆرجاران قسەکانی ئەو لەسەرزاری پیشمەرگە بەنموونە دەهینرانەوە (شەهیدریباز)لەکوبوونەوەکانیدا دەیتوانی گەنج ولاوەکانی پیشمەرگە وەهابینیتە جوش وخروش کەبەعەشقەوەپیشمەرگایەتی بکەن ولەشەرپیشدا ئازاو بەهەلمەت بن ئەوبە قسەکانی دەیتوانی روحی بەرزی پێشمەرگە بهێنێتە سەرئەوەی بگری بۆ ولآت ونیشتمانی خۆی، لەهەمان کاتدا دەیتوانی بیانهینیتەوە سەر رقی پیرۆزیان بەرامبەر بە دوژمنان وداگیرکەران ئەو شیکەرەوەیەکی گەورەی سیاسی بوو نەك هەرلەسەرئاستی ناوخۆ و ناوچەیی روداو و پێشهاتەکانی شیدەکردەوە..

بەڵکو لەسەرئاستی مەسەلەگەورەکان ودنیاش تەنانەت لەبواری ئابووری و سەربازیش شەهید ریباز شەوان تا درەنگی شەو گوێی لە دەنگ وباسی رادیۆ جیاوازە کانی دنیا رادە گرت جاری واهەبوو بەرنامەی ئەوتومان لە رادیۆکەی گوێ لێدەبوو،لەکەناڵی رادیوی ولاتە ئەورووپیەکان کە هەرگیز نەمان بیستبوو ئەو ولاتانە کە ناڵی دەنگ وباسی عەرەبیان هەبێ ،ئەوەی جیگای سەرنج بوو شەهید (رێباز

هەمووکاتەجیاوازەکانی ئەوکەنالانەی دەزانی وبەپێی زنجیرەی گرینکیشیان جگە لەوەی گوێی لێدەگرتن لەهەمان کاتدا تێبینیشی ئەنووسیّ ..

ئەوکەشیکردنەوەی بۆ بوارێکی سەربازی یا سیاسی دەکرد زۆر ئەکادیمیانە و سەردەمیانە بە بەڵگەو بە داتاو ئامار قسەی دەکردو دەیسەلماند..

شەهید ریباز لەژیان وخەباتیدا هیچ بوارێکی فەراموش نەدەکرد لەبواری مێژووشدا بەتایبەتی لەبواری مێژووی شورشەکانی کورددا شارەزایەکی زۆری هەبوو، چونکە ئەو خۆی لە بەشیکی زۆری ئەو میژووە دا بەشداری و رۆڵی راستەوخۆی هەبوو بۆیە مێژووی یەك بەیەکی روداو وهەڵوێست وشەرەکانی دەزانی زۆر راستگویانەو بابەتیانە ئەومیژووانەی بەئەمانەتەوە دەگیرایەوە، شەهیدریباز هەرتەنها لەو بوارانەداکەباسم کردشارەزا نەبوو،بەڵکو لەبواری شعرو ئەدەب وهونەری کوردیشدا شارە زاییەکی زۆری هەبوو ئەو لەوروانگەیەوە دەیروانی کەئەدەب و سیاسەت ئەبیّ هاوشانی یەك وبەیەکەوە خزمەت بەکومەلگەو مروڤایەتی بکەن، زۆرکارامە و شارە زایانە کاری لە سەر ئەدەبی کوردیدا دەکرد هەربویە شعرو دیوانی زۆر لە شاعیرە ناسراوەکانی کوردی لەبەر بوو،بەتایبەتی شاکارە بەرزو فە لسەفیەکانیان..

شەهیدریباز عاشق وسەوداسەری نیشتمان بوو هاورێی کانی و رەزو باغ وکەژو کێوی کوردستان بوو ئەو عەشقەشی بەکردەوە بەبەخشینی هەمووژیان وتەمەنی سەلماندبوو، هەربۆیە لە پێشمەرگایەتی هەرجارەی کە لەچیایەك سەردەکەوت و دیمەنی جوانی رەنگینی کوردستانی دەبینی ئەم دیرە شعرەی دەگووت:

(ولاّتی جوان ودڵگیرم هەزار جار لە بەرت مرم). شەهید ریباز لە کاتی ئەنفالەکان کاتیّ کەکەژو کێوەکانی دەبینی لە لایەن هێزی سەربازی دوژمنەوە دەسوتیندرێن، ئەویش لە دڵەوە دە سوتاو دەیگووت وادەزانم ئاگر لەجەستەی من بەردەدەن ...

شەهیدریباز بەرامبەر بە شەهید و هاوسەنگەرەکانی زۆر بە ئەمەك و وەفادار بوو،

هەرگیز لە یادی نەدەکردن تەنانەت لەرۆژە رەشەکەکانی دوای ئەنفالیش کە لێپرسراوی رەتڵی پارتیزانەکان بوو،ژیانی لەوپەڕی مەترسیدا بوو.. شەوان خۆی دەگەیاندە ئوردووگازورەملێکان و ماڵە شەهیدەکانی بە سەردەکردەوە، دڵنەوایی دەکردن و بەپێی توانا هاوکاری دەکردن، شەهید رێباز هێندە خاکی و خونەویست بوو هەرگیز خوی لە پێشمەرگە جیا نەدە کردەوە،ژیانی،خواردنی،جل و بەرگی. وەکو ئەوان بوو، هیچی لە پێشمەرگە چاو نەبوو، هەرجارەی قاتێ جل یا چەکێك یاهاوکاریەکی لە سەرکردایەتی یا لە رێکخستنەکانی شارەوە بۆ بهاتایە یەکسەر دابەشی دەکرد، تەنانەت جاری واهەبوو کە دەچووینە دووکانی ئوردوگایەك پارەی کرینی کێك وساردیەکی پێ نەبوو هەرئەم هەڵوێست و خووە بەرزانەش وای کرد شەهید ریباز خوشەویسترین و روح سوکترین فەرماندەی نێو هیزی بیشمەرگە و خەڵك بێ، لە کوتایی ئەم نوسینە و ئەم یادە پرشکویەدا دەمەوێ ئەو ڕاستیە دووپات بکەمەوە کە شەهید ریباز سەرکردە و شورشگێرێکی میژوویی و کەم وێنە بووە مێژووی پر لە سە روەری ئە م تیکوشەرە ئەوە دەهێنی بکرێ بە سەرمەشق و وەك نمونەیەکی بەرزی فیداکاری چاوی لێبکرێ، ساڵانە یادی بکرێتەوە،لە هەمان کاتدا رێبازی شەهید ریباز کە رێچکەیەکی تایبەت وراست ودروستی هەبوو بکرێ بەدەرس وپەندبۆسەرکردەکانی ئێستا کە ئەگەردەیانەوێ لە یادەوەری مێژووی میلەتەکەیاندا بە زیندوویی ونەمری بمینێنەوە باچاو لەشەدهید ریباز بکەن... درود بۆ گیانی پڕشکۆی شەهیدرێباز سەربەرزی بۆ جگەرگۆشە و کەس وکاری.*

* سەرچاوە : فەیسبووکی رۆژنامەنووس حەیدەرمەنتك



## ژیاننامەی شەهید (ڕێباز)
## ڕەفعەت عەبدوڵا پیرداود

شەهید رفعت عەبدولا پیرداود ناسراوبە( ڕێباز)

- ساڵی 1952 لە شاری هەولێر لە بنەماڵەیەکی نیشتیمان پەروەر لە دایك بووبوو.
- لەساڵی1955پەیوەندی کردبوو بەرێکخستنی(پارتی دیموکراتی کوردستان)ەوە.
- لەساڵی 1959بەهۆی کاروچالاکی رێکخستنەوە لەلایەن رژێمەوەزیندانی کرابوو.
- ساڵی 1970 لە داوای بەیانی 11ی ئازار چالاکانە بەشداری کاریگەری کردبوو لە رێکخستن و خەباتی خوێندکاران و جەماوەری دا
- ساڵی 1972 ئامادەیی کشتوکاڵی هەولێر تەواو دەکات وپەیوەندی بەشۆڕشەوە دەکات و لە دەزگا جیاجیاکانی شۆڕشدا خەباتی دەکات تا نسکۆی ساڵی 1975
- ساڵی 1975 دەبێتە فەرمانبەر لە بەڕێوەبەرایەتی کشتوکاڵ وپەیوەندی دەکات بە (کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان)ەوە .
- لە1977/5/11 لەشۆرشی نوێی گەلەکەماندا لەگەڵ هاوڕێی ئازیز دێرینی خۆی

شەهید شاخەوان بە یەك رۆژ دەچنە شاخ و دەبن بە پێشمەرگەی کوردستان .

- هەتا بڵێی کەسایەتیەکی رۆشنبیر و ئازا و چاونەترس و لە خۆبووردوو بووە...

- بەشداری و سەرکردایەتی دەیان چالاکی و داستانی کردووە .

- لەدوای ئەنفال ماوەی 14مانگ سەرکردایەتی پارتیزانەکانی هەولێری کردووە.

- لەساڵی1990لەسەر داوای مەکتەبی سیاسی (ی،ن،ك) گەڕاوەتەوە سەرکردایەتی بۆبەشداری لەکۆنفرانسێکی ئەورووپا لەسەرکێشەی کورد.

- ساڵی1991بەرلەڕاپەرین جارێ ترگەڕاوەتەوە ناوهێزی پێشمەرگەی کوردستان.

- لەڕاپەرینەمەزنەکدا بەشداری کاریگەری هەبووە لەڕزگارکردنی زۆربەی شارو شارۆچکەکانی سەربەپارێزگای هەولێروسلێمانی هەروەها رۆڵی کاریگەری هەبووە لەڕزگارکردنی کەرکوك بەتایبەتی لەگرتنی ڕەبیەکانی زنجیرەی (کانی دومەلان).

- لەدوای ڕاپەڕین لەبەرەی کوردستانیدا لێپرسراوی سەربازی بووە

بۆ چەسپاندنی یاسا و خزمەتکردنی هاوڵاتیان .

- لەساڵی 1993 بۆتە جێگری قیادەی مەنتیقەی دهۆك

لە وەزارەتی پێشمەرگەی حکومەتی هەرێمی کوردستان .

- نووسەری کتێبی قەندیل بەغدای هەژاند و نرکەی کوردستان و

نامیلکەی شەڕی پارتیزانیە

- لەبەرواری 1994/5/7 دوای کاروانێکی پڕ لەسەروەری بەدیلی شەهیدەکرێت.

- لە 1994/11/14 تەرمی پیرۆزی لە کەرنەڤاڵێکی جەماوەری گەورەدا

لە گۆڕستانی گردەڕەشە بەخاك دەسپێردرێ.

شەهید ڕێباز دوو کوڕ جێدەهێڵێت بە ناوەکانی ( حەمە و ڕێباز ) .

# ڕەشبەڵەکی ڕێباز

من هەر ڕێبازم ئەگەر سەرکردە بم یا پێشمەرگە ژیان هەر لە گەڵ گەل، مردنیش هەر لە گەڵ ئەواندا
ئەگەر ڕۆژێ لە ڕۆژان بزانم ڕێبازەکەم لە بەرژەوەندی گەلدا نییە، ئامادە نیم هەنگاوێ لە گەڵی بڕۆم
وتەی شەهید ڕێباز

ڕابن خەڵکی هەولێر، ڕەنجدەرانی شەمامك و مرکییەو کەندیناوەو بەستی شەرغەو قەراج و بەڕانەتی، ئەمڕۆ ڕۆژی نواندنی وەفایە بۆ خاوەنی ئەم گوتانەی سەرەوە، بۆ کەڵەپیاوی ڕۆژە ڕەشەکان، بۆ پیاوێك کە سەرلەبەری تەمەنی بە ئێوە بەخشی، پێشمەرگەیەك تا ئەو ساتەی شەهیدیش بوو بە مانای پێشمەرگە، پێشمەرگە بوو، ئەو پیاوەی شارو کورسی و شتەکانی تر نەیانتوانی هێندەی تۆزقاڵێك کار لە ڕەوشتی جوامێرانەی ڕۆژانی شاخ و جارانی بکەن.

ئێوەش هەژارانی(بانەمورد) ئەوەتانێ ڕێبازی ئێوە،ئەو ڕێبازەی گفتی پێ دابوون: ئەگەر ئەمجارە بێمەوە شەرتە سەردانتان نەکەم تا ڕێ و بانەکانتان بۆ چاك نەکەم، دە ئێوەش لەجیاتی گریان منداڵەکانتان ڕێبازانە گۆش کەن، زوو کەن دەی پارتیزانەکان کۆڵەپشت و مەتارەو نانەڕەقە و ڕەختە چڵکنەکانتان کۆ کەنەوەو خۆتان ببەستن بە یادی چواردە مانگەی پارتیزانی بێ ئاوەدانی (اختفا)...

وەرن سڵاوی سەرکردە ماندوونەناسە بێنازەکەتان و مەلاسلێمانی جێگری بسەننەوە، هۆ پێشمەرگە دێرینەکان، وەرن پێشوازی لە ڕەمزەکەتان بکەن، ئەوەی لە هەڵبژاردنی کۆمەڵەکەمان ئامۆژگاری دەکردین بەوەی (ئەگەر یەك دەست نەبین سبەینێ پێشمەرگەی دێرین دەبێتە عەیبە و لە پەراوێزیش باسی ناکرێت) ئەگەر لەوێ ئەو ڕۆژە، یەك بە گەرووی هۆڵەکە هاوارتان دەکرد، ڕێباز. . ڕێباز و سەدای پڕ لەحەماسیتان هۆڵەکەی دەلەرزاندەوە، وەرن ئەمڕۆ بە گوڵبارانی جەستەی

پیرۆزی پێی بڵێین: ئێمە هەڵگری شوێن پێتین، ئێمە ڕێبازین و وەکوو تۆش میراتگرو دەمڕاستی ئەم وڵاتە و شەهیدان و هەژارانین، هۆ شەهیدانی مەفرەزە سەرەتاییەکان و هەرێمەکان: محمد عەجەم و عەلی صالح و ئەوانی تر. . . شەهیدانی بن ڕەبایبە و سەرچەقی شەقامەکانی هەولێر،شەهیدانی کەرت و تیپ و مەڵبەند، ئەحمەد قەمبەری و دەشتی موهەندیس و ئەوانیتر، هەڵسن تیپ، تیپ شەهیدانی تیپەکانی قەرەچوغ و دەشتی هەولێرو بەڕانەتی و سەفین، ئەمجارەش مەسافە وەرگرن، دوو دوو بەڕێکەون و سەرێکی هەولێر بدەن و لەم جەولەیەتان ڕێباز دێت و دەبێتە دەلیل و پلان داڕێژی داستانێکی تر، هۆ خەڵکی هەولێر زوو کەن ڕەشبەڵەکێ بگێڕن نە سەری دیار بێ و نە بن بۆ ڕێبازی هەمووان، چونکە ئێمە وا ڕاهاتووین بۆ شەهیدان لە جیاتی فرمێسک و قوڕ پێوان، بەڵێنی درێژەپێدانی ڕێبازەکەیان بۆ نوێ کەینەوە، هۆ (حەمەی) دوو ساڵە، هۆ ڕێبازی سێ مانگە، ئێوەش ئاسوودە بن . کە من، ئەو جگەرگۆشانەی باوکی وەك ئێوە ئاسایان هەبووە ، هۆشەهید ڕێباز دەزانم زۆر لەدڵت گران بوو بێ مەلاسلێمان بگەڕێیەوە دەڤەرە چاوەڕێکەت،ئەوڕۆژە لەگوندی(مام داودە)ی ئاکرێ دەتگووت و دەتگووتەوە بە چ ڕوویەك بچمەوە. چ بە منداڵەکانی مەلاسلێمان بڵێم: ئەوە نییە نەهاتیەوە و.. بە جێت نەهێشت تا نەبووی بە هاوڕێی ئەو لە هاتنەوەی . *

---

* لە(13 / 11 / 1994 ، دوای شەش مانگ لەشەهیدکردنی بە دیلی، شەهیدی فەرماندە وپارتیزانی ماندوونەناس شەهید ڕێباز لە گەڵ شەهیدی فەرماندە مەلا سلێمان ودوو پێشمەرگەی قارەمانی تر تەرمەکانیان هێنایەوە بۆ شاری هەولێر ولە گۆڕستانی گردەڕەشە لە ئاپۆڕایەکی جەماوەری بێ وێنە بە خاکیان سپاردن.

منیش ڕۆژی پێشتر ئەو نوسینەم بۆ ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ نارد لەو ڕۆژەدا بڵاوکرایەوە ولە کاتی گەڕانەوەی تەرمی شەهیدان، ئەو ڕۆژە رادیۆی مەڵبەندی سێی هەولێر دەیان جار ئەم نوسینەی خوێندەوە،وا لە ٢٤ەمین ساڵیادی هێنانەوەی تەرمی پیرۆزیان ....سڵاو لە گیانی پاکی شەهیدان ڕێباز و مەلا سلێمان وهاوڕێکانیان.

عەبدولواحید ئیدریس

## شەهید ڕێباز : چۆن بوم بە مام خدر..؟

لەگەل برادەرانی تیپی(٨٥)ی بەرانەتی هاتمە دەواجنەکانی(بانەمان) لەماڵێك دانیشتبووین دیار بوو پیشمەرگەکان زۆر دەچونە ئەو ماڵە باسی منیان لە بورهان سعید سۆڤی پرسی ئەریَ ڕێباز لە کوێیە؟ پیاوەکانی ڕژێم زۆر مەرەقیانە بیدۆزنەوە ..ئەویش وتبوی وابزانم لە خۆشناوەتیە،، پاش ماوەیەك ووتیان ئەو برایە ناوی چیە ووتی((مام خدر))!!باوەریان کرد. پاش سەعاتیك (شەفە) و دوو پیشمەرگەی تر دین بولای ئیمە لە حەوشەکە توشی کچەکەی مام محمد دەبن کە ١٧ سالانە سلاَوی لی دەکەن دەڵێن ڕێباز و بورهان لێرەن؟

کچەکە دەلی کوا ڕێباز لیرەیە،هەر بورهان و مام خدرن!!شەفە یەکسەر تیدەگا دەزانی ناو گۆراوە، هەرچەندە دەی سورینیَ کچەکە تیدەگا من مام خدر نیم ڕێبازم!!!کچەکە زۆر عاقل بوو لای باوکیشی باسی نەکرد،، کە من ڕێبازم بەلام کە هەموو جار چای بو دەهینام دەیگوت ها مام خدروکە پیدەکەنی، جارێك بە تەنیا لەحەوشەکە راوەستابووم ووتی کاك ڕێباز ماستاو دەخۆی پێکەنی،قۆلم گرت گوتم چیتر باسی ڕێباز نەکەی مام محمد زۆر جار لە دائیرەی ئەمنی مەسیف سوندی دەخوارد کەمن ڕێبازم نەدیوە،، ئەوانیش باوەریان نەدەکرد نامەم دەدا مام محمد بۆ برادەران ئەوانیش دەیانگوت باشە ولامەکەی بۆ کاك ڕێبازی دەنێرین،، مام محمد کە دەهاتەوە دەیگوت هەتا ئیوە ڕێبازەکەی دەشتی هەولێر نەکوژن هیچتان بۆنابیت!!هەر چی هەیە بۆ ئەو دەچیَ ئەویش خۆی لیَ بزر کردینە!! بەم جۆرە لای ئەو کەسانەی کە نەیان ئە ناسیم بە (مام خدر) ناسرام،هەتا زۆر جاریش پیشمەرگەکان لەناو خۆشمانیش هەر بە((مام خدر))بانگیان دەکردم

سەرچاوە : Hama Shaheed Ribaz



# ژیاننامەی شەهید مەلاسلێمان

. سلێمان عارەب ئیسماعیل ناسراو بە (مەلاسلێمان)

ـ لە 1955/7/1 لەگوندی(دەربەندی گۆم)ی سیانان لە بناری چیای زورگەزراو لە خێزانێکی زەحمەتکێش چاو بە دونیا هەڵدێنێ.

ـ شەهید مەلاسلێمان خەڵکی ئەو دێیەیە کە سەرکردە و کادیری پێشمەرگەی وەکو شەهید (ڕێباز و سەردار و دیوانە و عەبدوڵاّ و کانەبی ....) لەباوەش گرتبوو.

ـ شەهید لە خوێندنگای دێیەکەیان دەستی بە خوێندن دەکات

ـ لەساڵی 1963 کە پۆلی یەکەمی سەرەتایی دەبێ شاڵاوی حرس قومی ڕژێمی بەعس ئاگر لە دێ و خوێندنگاکەی بەردەدا و هاوڵاتیان تاڵان دەکەن، بەناچاری روو لەشاری هەولێردەکەن و لەوێ نیشتەجێ دەبن..

ـ قۆناغی سەرەتایی و ناوەندی لە شاری هەولێر تەواو دەکات.

ـ لەتەمەنی 14 ساڵی تێکەڵی خەباتی کوردایەتی دەبێت لەگەڵ یەکێتی قوتابیانی کوردستان چالاکانە دەکەوێتە کار

- لەساڵی 1974 دا لەدوا قۆناغی خوێندنی ئامادەیی کشتوکاڵ دەبێت لە ئاسکی کەڵەك لەگەڵ هەزاران خوێندکاری هاوسەنگەری رووبەڕووی فاشیەکان دەبێتەوەو چەکی مەردایەتی لەشان دەکات.

- دەورێکی تایبەتی دەبێت وەکوئەفسەرێك لە تۆپخانەی شۆڕش دەمێنێتەوە.

- دوای نسـکۆ دەگەڕێتەوەهەولێرودرێژە بەخوێندنەکەی دەدات و ئامادەیی کشتوکاڵ تەواو دەکات.

- لەساڵی 1975 پەیوەندی بە کۆمەڵەی مارکسیەوە دەکات وماڵیشیان دەبێتە یەکێك لە شوێنە نهێنیەکانی ناو شار،

- لەساڵی 1979 دەبێتە ئەندامی لیژنەی ڕێکخستن دوای ئاشکرا بوونی شانەیەکی کۆمەڵە دەکەوێتە ژێر چاودێری ئەمنی هەولێر و دەستگیر دەکرێت، هەموو جۆرە ئازار و ئەشکەنجەیەکی دوژمن ناتوانێ کار لە وورەی پۆڵاینی بکات و نهێنیەکانی پێ بدرکێنێ، تا رۆژی 1979/7/15 بەرلێبووردنی گشـتی دەکەوێت..

- دوای ماوەیەك دەبێتە فەرمانبەر لە بەڕێوەبەرایەتی سەرژمێری هەولێر.

- درێژە بەکاری ڕێکخستن جەدا تا لەساڵی 1982 پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەی کوردستان دەکات، لەدوای دامەزراندنی تیپی 85 ی بەڕانەتی دەبێتە فەرماندەی کەرتی سێ ی هەمان تیپ.

- لەساڵی 1987 دەبێتە جێگری تیپی 85 ی دەشتی هەولێر.

- لەساڵی 1985 دا لەشەڕێکی بەرگریدا لە هێرشە بەناو ئەنفالکراوەکەی بەعس بۆ سەرکردایەتی (ی،ن،ك) شەهید مەلاسلێمان لە هەلاج و دابان زۆر بەسەختی بریندار دەبێ و لەبەر کاریگەری برینەکەی رەوانەی وولاتی ئێران دەکرێت، لە مانگی هەشتی هەمان ساڵدا دەگەڕێتەوە سنووری مەڵبەندی 3ی (ی،ن،ك)، لەهەمووشەڕو پێکدادانەکانی مەڵبەندی 3 و4ی (ی،ن،ك) شوێن دەست وپەنجەی دیار دەبێ.

ـ کە شەهیدرێباز دەکرێتە لێپرسراوی رەتلی پارتیزانی هەولێر شەهیدمەلاسلێمان دەبێتە جێگری بۆ ماوەی 14 مانگ دەمێننەوە، لە 1989/9/1 لەسەر بڕیاری سەرکردایەتی(ی،ن،ك) دەگەڕێتەوە سنوورەکان و لەڕێکەوتی 1990/7/14 دەبێتە فەرماندەی بەتالیۆنی هەشت، لە 1990/11/25 لە کۆنفرانسێکی ناوەخۆیی بۆ کۆنگرەی یەکەمی(ی،ن،ك)یەکەم دەنگی هێناوەو بووەئەندامی کۆنگرە. لە راپەڕیندا بەشداری کاریگەر و بەرچاوی هەبووە لە رزگارکردنی زۆربەی شارو شارۆچکەکانی سەربەپارێزگای هەولێرو سنووری سلێمانی، هەروەها رۆڵی کاریگەریشی هەبووە لەهێرشکردنە سەرمەنزوومەی کەرکوك جارێکی تر بریندار دەبێت. لەدوای راپەڕین شەهید مەلاسلێمان دەبێتە فەرماندەی هێزی 11ی بەرانەتی، پاشان دەبێتە جێگری محوەری هەولێر.دوای دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستان دەبێتە فەرماندەی فەوجی 2ی تەواری شاری هەولێر.شەهیدمەلاسلێمان لەهەڵبژاردنی پێشمەرگەدێرینەکانی هەولێریەکەم دەنگ دەهێنێ.

دوای دامەزراندنی مەڵبەندی 7ی نەینەوا شەهید دەبێتە جێگری مەڵبەند بۆ کاروباری عەسکەری و لێپرسراوی کۆمیتەی باڵای پێشمەرگایەتی لە ئاکرێ.

شەهید مەلاسلێمان دوا کار کەپێی دەسپێردرێ لەدوای هاتنی لیژنەی ئاشتی بۆناوچەی بادینان دەبێتەئەندامی لیژنەی ئاشتی شاری ئاکرێ... لەبەرواری 1994/5/5شەهیدمەلاسلێمانی قارەمان دوای 31 ساڵ لە خەباتی پێشمەرگایەتی وکوردایەتی گیان بە خاکی کوردستان دەسپێرێ و شەهید دەبێت.

شەهید مەلاسلێمان لەدوای خۆی حەوت منداڵ جێدەهێڵێت ، چوار کوڕوسێ کچ بەناوەکانی (ئارەزوو، ساکار، هاوکار، هۆگر، سکاڵا، بەختیار، بەشدار).

---

* سەرچاوە: تۆمارێکی تایبەت بۆ کوردیپێدیا لەلایەن (بەشدار سلێمان)



# شەهید هاشم جیهاز
# پارتیزانی دوای ئەنفال

. ناوی تەواو : هاشم عومەر عوسمان وەسمان (هاشم جیهان)

. ساڵی لەدایك بوون : 1950 گوندی دۆنگزاوا/بناری سەری رەش/ هەولێر

. خێزاندار و ناوی منداڵەکان : هەژار . هانا . هاژە . هاوکار

. لەدوای نسکۆی شۆرشی ئەیلول بەهۆی ئەوەی باوکی شەهید هاشم پێشمەرگە بووە خانەوادەکەیان رەوانەی خواری عێراق دەکرێن لە دیوانە دەگیرسێنەوە

. لەساڵی 1978 بەیوەندی بەرێکخستن دەکات .

. لە 1980دەبێتەسەرباز ودەچێتە خولی فێربوونی جیهاز و دەکرێتە عدد جیهاز.

. ساڵی پەیوەندی بەهێزی پێشمەرگە کۆتایی مانگی 12ی ساڵی 1981 زەلێ

. لەساڵی 1982 گواسترایەوە کۆمیتەی سەرکردایەتی هەولێر

. لەساڵی 1983 گواسترایتەوە تیپی مەلبەند بەعد د جیهاز

. لەساڵی 1984 گواسترایتەوە تیپی 85ی دەشتی هەولێر بە عدد جیهاز

. لەساڵی1985 گواسترایەوە تیپی (85) بەرانەتی بۆماوەیەکی کەم

. لەکۆتایی ساڵی 1985 گواسترایەوە تیپی (87) ی قەرەچوغ هەر بە عدد جیهازی

. لەساڵی 1987 بە فەرماندەی کەرت رەوانەی بادینان کرا لەگەڵ رەتلی رائید جلال

. پلەکانی فەرماندەی مەفرەزەو جێگری کەرت و فەرماندەی کەرتی بریوە.

.. لەساڵی 1988 کە هێزەکانی پێشمەرگە کشانەوە سەرسنورەکان شەهید هاشم و ژمارەیەك فەرماندەو پێشمەرگە لەسنوری هەولێر بە پارتی زانی بۆماوەی (14) مانگ مانەوە . ناوبراو لەماوەی پارتی زانی جێگری رەتلی قەرەچوغ بوو واتە جێگری کاك بێستوون خدر بوو

. ساڵی1990جاری دووەم ژیانی هاوسەری پێکهێناوە ونیشتەجێی مهاباد بووە..

. لەساڵی 1991 بەشداری کاریگەری هەبووە لە ڕاپەرین و رزگارکردنی شاری هەولێرو کەرکوکی قودسی کوردستان .

. لەساڵی 1992 فەرماندەی بەتالیۆن بووە لە هێزی 11ی سەفین

. لە تەشکیلاتی قیادەی مەنتیقەی هەولێر کراوە بەجێگری فوج

. ماوەیەك فەرماندەی تیپی بەرانەتی بووە

. دوا پلەی ئەندامی لەشکری (18) ی بەرانەتی بووە.

. مەدالیای زێرینی پارتیزانی پێشمەرگایەتی هەڤاڵ مام جلال وەرگرتوە .

. رۆژو مانگ وساڵی بێ سەروشوێن بوونی : 31ی ئابی 1995

. شوێنی بێ سەروشوێن کردنی : هەولێر.



## بیرەوەریەك لە گەل هاشم جیهازی پێشمەرگە

رۆژێك لەگەل کۆمەلێك هاوڕێ دانیشتبووین کاك هاشم جیهازیشمان لەگەل بوو لە کاك هاشمم پرسی بۆ یادگاریەکانت نانوسیتەوە کۆمەلە سالێکە بە شاخەوەیت دەزانم گەلێك یادگاری تال و شیرینت لا کۆبوویتەوە ،گوتم ئێوەی کۆنە پێشمەرگە هەموو کاتێك لەسەر لێواری شەهید بوونن یان باشترە بلێم شەهیدی زیندوو. کاك هاشمیش وتی وەلا بلێم چی هاوڕێ نازانم لە کوێ دەست پێبکەمو لە کوێ خالی کۆتایی بۆدانێم  وتم دەستپێك تۆ بیکە و خالی کۆتایی ئێمە بۆت دادەنێین بەزەردەخەنەوە وتیی هاوڕێ زۆر دلنیای کە شەهید دەبم وتم ئێوەی کۆنە پێشمەرگە بەڕاستی شەهیدی زیندون. پاش کەمێك بێدەنگی وتی دەبا یادگاریەکی دوای ئەنفالەکانتان بۆ بگێرمەوە وتی پاش ئەنفالەکان کوردستان سوتماك کرابوو چ لادێیەك بە پێوە نەمابوو جگە لەو چەند دێیەیی سەر شەقامی سەرەکی نێوان شارەکان، بۆ ئەوەی دوژمنیش نەماندۆزێتەوە بە هیچ شێوەیەك نابووایە هیچ ئاسەوارێکمان لە پاش بەجێ مابووایە تەنانەت وەك پشیلە دەبووایە پیسایی خۆمان بشارینەوە نەوەك مەفرەزە خاسەیەك بەلامان ڕەتبێ و ئاسەوارێکی

زیندەگی ببینیٚ شوێنەکەمان ببێتە جێگای گومان و بماندۆزنەوە ، بۆ ئەوەش لە نزیکی گوندی دونگزاوە دۆلی بەستۆڕە لە شێوەی کونە گورگ ئەشکەوتێکمان لە زەوی هەلکەنی بوو دەرگای ئەشکەوتە ژێرزەمینیەکەمان بە بەردێکی پانی گەورە دادەپۆشی هەرچوار دەوری دەمی ئەشکەوتە ژێرزەمینیەکە چەقەلانێك بوو ئاسەواری هات و چوونی مرۆڤی لەسەر دەرنەدەکەوت ، شوێنەکە لە بەر دوو هۆ هەلمانبژارد بوو یەکەم دوژمن هەرگیز بیری لەوە نەدەکردەوە کە ئێمە بێین ئەوەندە نزیك لە بنکەو بارەگاکانی ژیان بەسەرببەین و بارەگای پێشمەرگەی لێدانێین ، دووەم زۆر بەئاسانی هەوالی شارو خواردنمان پێدەگەیشت لە ڕێگای برادەرانی شار . لەو حەشارگەیە بە ڕۆژ بە هیچ شێوەیەك دەرنەدەکەوتین تەنها وەك شەمشەمەکوێرە بەشەودەردەکەوتین بۆ ڕاپەراندنی کارو فەرمانەکانمان،، زستانی سالی 1990 بوو ئەوەی بیرمان لێنەدەکردەوە ڕویدا. کۆمەلە خەلکێکی گوندی گڕاو و سێوەکە و دونگزاوە بۆ بژێوی ژیانیان خەریکی کاری هەلکەندنی بەردن لە کانگاکانی بەردی کاشی یان بەردی مەڕمەڕ ، لە بەیانیەکی زوو لەگەل دەرکەوتنی ڕۆژ گوێمان لە گڕەگری شۆفەل بوو هەتا دەهات لێمان نزیکتر دەبۆوە کات گەیشتبووە لای نیوەڕۆ دەنگەدەنگ و نڕەنری شۆفەر ئەوەندە نزیك بۆوە هەراسانی کردبووین وردە وردە خۆل و بەرد بەسەرسەرمان دەهاتە خوارەوە بەلام هەر خۆمان دەرنەخست نەماندەویست ئاشکرابین بەو ڕۆژی نیوەڕۆیە ، تا کار لەکار ترازا ئەوەنەدە نزیك کەوتەوە لێمان لەگەل لێدانی کێلەی شۆفەر خۆر و بەرد بەسەرمان دا هاتە خوارەوە زۆرنەمابوو ئەشکەوتەکە بەسەرمان دا بڕوخیٚ ، بەناچاری بەردمان لاداو دەرپەرینە دەرەوە شۆفەر کێلەی دووەمی لێدا هاوارمان کرد کوڕە نەکەی ،،کاکی سایەق شۆفەر زۆری نەمابوو دلی بووەستیٚ چاوی زەق بووەوە بە ڕاستی حەپەسابوو ئەوە چی بوو لە زەوی هاتەدەرەوە پاشی ماوەیەك

هاتەوە بارێك کە بتوانی قسە بکات ، یەکتریمان ناسیەوە خەلکی گوندی گڕاو بوو. وتی مالکاولینە ئەوە چی دەکەن لێرە ،،، منیش وتم برا شوێن قاتی بووە تۆ لەو هەموو کانگا بەردە بێی ئێرە بکەیتە کارگە،، وتی جا برا کێ دەزانی یان بیری بۆ ئەوە دەچێ ئێوە لەکونە گورگ ژیان بکەن دوو بستیش لە شەقامی سەرەکی هەولێر مەسیف دورین. وتمان بەردەوام بە لە کارەکەت بەلام بە ئاراستەیەکی تر وە نابێ کەستان لێرە برۆن تاکو ئێوارە ،ئیتر تاکو ئێوارە یەکێکمان بووین بە ئێشکگر کە کەسیان لەشوێنی کارەکە دوور نەکەونەوە لە ترسی ئەوەی کە هەوال بدەن بە حوکومەت ، لەگەل ئەوەی هەموومان دەناسین وە کوڕی چاك و شۆڕش دۆست بوون بەلام زەمانە گۆڕابوو کەس باوەڕی بەکەس نەدەکرد ، شوێنەکە ئەوەندە لە دوژمن نزیك بوو گەر کەسێك هەوالی بە دوژمن دابووایە بە 10-15 خولەك دوژمن دەگەیشتە سەرمان . گەریەکێك ڕاپیکردبووایە بۆ لای دوژمن نەمان دەتوانی تەقەی لێبکەین دەبووایە بە زۆران بازی دەسگیرمان بکردبووایەوە ئەوەش هەرنەدەکرا ئێمەی لەڕو لاواز و بێهێز کەی ئەوەمان پێدەکرێ بەلام بۆ خۆشبەختی هەموویان کوڕی زۆرچاك بوون تا تاریك داهات لامان مانەوە لەگەل بەرێکردنیان ئێمەش کۆلەپشتیەکانمان هەلگرت ،،،، برۆ برۆ بۆ کوێ؟؟ سەرەلگرە؟ بۆ کوێ ؟ هەتا بەم زستانە شوێنێکی تر دروست دەکەینەوە مردنیە بەلام چار چیە دەبێ بچین کونە گورگێکی تر هەلکەنین . دەبێ کاك هاشم چەند یادگاری لەوە تالترو چەندی شیرینی لەگەل خۆی بردبێ ،نەفرەت هەزار نەفرەت لە شەڕی براکوژی.

سەرچاوە: لڤین پرێس PM:02:25:10/09/2015



# هاوکاری پارتیزانەکان

# شـــەهید کامەران عومەر عوسمان

شەهیدنەقیب کامەران لە ساڵی1972لە بنەماڵەیەکی شۆڕشگێڕو نیشتمانپەروەر لە گوندی (دونگزاوا) ی خۆشناوەتی سنووری ناحیەی (مەسیف ) لەدایك بوو بوو

- دەرچووی خووڵی ئەفسەرانی قەڵاچۆلان بوو..
- لەساڵانی 1988 و 1989 یەکیك بوو لەهاوکارە دڵسۆزەکانی پارتیزانەکانی دوای ئەنفال، رۆڵی بەرچاوی هەبووە لەگەیاندنی نامەو خواردن وپێداویستییەکان بۆ سنووری بەستۆڕەو (سێوەکە)و(گراو) و(دۆنگزاوا)ی بناری چیای سەری رەش.
- برای شەهیدی پارتیزانی شەهید(هاشم جیهان) بووە.
- بەداخەوە لەشەڕی دژی تیرۆر دا

لە رۆژی 17 /2016/10 لە گوندی (خرابەسولتان) ی نزیك (موسڵ) شەهید کرا.

# داستانی شەمامك

دەشتی هەولێر و بەڕانەتی وشەمامك ودێدەوان ئەو ناوچە پیرۆزانەن کە ئەنفالی تاوان وجینۆسایدی کوردستان نەیتوانی لە پێشمەرگەکانی شۆڕشی نوێیان دابڕێ و ئەو پارتیزانانەی بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن(شەهید ڕێباز،شەهید مەلا سلێمان .شەهید وشیارەسور ،شەهیدهاشم شەمامکی،برهان سعید سۆفی. ئاسۆئەڵمانی، جلال ئیلْنجاغی، شەهیدئاسۆموعلیم، بێستون ،م کاوە، ئەبووزید. ئەحمەدە، ئازۆ. غەوسە ، ئەحمەد ئیلنجاغی ، شەهیدسۆران ، حەمەد سوسەیی. ئیدریس مەسیفی.م.ئامانج،غازی....)

ئەم پارتیزانانە چواردە مانگ درێژەیان بە پێشمەرگایەتی دا لە دوای ئەنفال، دوای ئەمانە دەستەیەکی تر بە فەرماندەیی شەهید هاشم بۆ درێژەدان بە پارتیزانی و دانەبڕان لە جەماوەر گەیشتنە شەمامك بەلام بە داخەوە تەمەنی پارتیزانیان درێژ نەبوو بە هۆی خیانەت،کەداستانی شەمامکی لێ تۆمار کرا بەخوێنی شەهیدان هاشم شەمامکی وئیسماعیل خورشید مورتکەیی.بەر لە وانیش دوو پارتیزانیتر شەهیدبوون (شەهید عوسمان عەلی سۆر و شەهید عباس سیاوی)کە ئەوانیش دوای ئەوەی لە قەندیل توشی شەڕ دەبن وشەهید هاشم بریندار دەبێ بەلام ئەوان هەر ناگەڕێنەوە ودێنە دەشتی هەولێر ئەوانیش بە هۆی خیانەت شەهید دەبن . سێ لە هاوڕێکانی شەهید هاشم کەلە ناوچەیەکی تر بوون (شەهیدزیادگەزنە. عومەر گردەسۆری،.....مشاری)وقارەمانێکیتر کە هاوسەنگەری شەهید هاشم بوو بەناوی ....ئاقوبانی بە پێ گەڕایەوە سەرکردایەتی لە قاسمەڕەش و زەڵێ.لە سالی1995لە ڕۆژنامەی کوردستانی نوسینێکم لە سەر داستانی شەمامك بلاو کردەوە، ئەمرۆکە25ساڵ بە سەر ئەم داستانە تێدەپەڕێ بۆ ڕێزلێنان لە خوێنی پیرۆزی ئەو شەهیدانە دوبارە لێرە بلاوی دەکەینەوە:



# لە یادی داستانی شەمامك و
# شەهید هاشم شەمامکی

1990 / 9 / 19

داستانی شەمامك لە ڕۆژگارەتاڵەکانی دوای ئەنفال,بەخوێنی دوو قارەمان لە چەند کیلۆمەتری نزیك شاری هەولێر ئەنجام دراوە،بوونی پێشمەرگەلەوسات و وەختەدا نەك لەلای دوژمنان،بەڵکو لەلای دۆستانیش جۆرێك بوو لە مەحاڵ،بۆیە نەبەردی شەمامك لە گۆڕنانی خەونی دوژمنان و وەڵامێکی دروست و بێ پێچ و پەنای پێشمەرگەقارەمانەکانی(ی.ن ك)بوو لەوزەمەن و وەرزە دژوارەدا.

دوای ئەنفالەکان لە ناوچەکانی کەرکووك و سلێمانی وهەولێر جگە لەمەفرەزە پارتیزانەکان هیچ بنکەو بارەگایەکی پێشمەرگەنەمابوو

.دوای پتر لە 14 مانگ لەخەباتی پارتیزانی ، لە چواردەوری شاری هەولێر,مانەوە لەحەشارگەکانی ناو دڵی دوژمندا،ئازایەتی و بیر و باوەڕی پۆڵاینی دەویست، کاك ڕێباز و مەلاسلێمان و برهان سەعیدسۆفی و جەلال ئیلنجاغی و(م کاوە،م ئامانج، ئازادمحەمەد،ئەبوزێد،ڕەحمانەڕەش،بێستون،ئەحمەدئیلنجاغی،شەهیدهاشم جهاز, ئاسۆ موعلیم،حەمەسوسەیی غازی،ئیدریس.....)

بۆپشوو دەگەڕێنەوەبارەگاکانی سەرسنور،هەر لەو ڕۆژگارەدا دوو پارتیزانی و دوو کادیر وپێشمەرگەی قارەمان(هوشیارەسور ونامیق کوڕی) کاتێك دەیانویت بچنەوە ناوهەولێر لەبازگەی هەولێر دەگیرێن، پاشان لە سێدارە دەدرێن..

هەڤاڵان ئاسۆئەلمانی وئارام چاوشین وشەهیدسۆران بەماوەیەك پێشمەفرەزەکانی شەهید ڕێباز وهاوڕێکانی گەڕابوونەوە سەرسنور،دوای گەڕانەوەی ئەوپۆلە پارتیزانە،شەهیدی فەرماندە هاشم شەمامکی لەسەر سنورەوە بە رەو قوولایی خاکی کوردستان لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی پارتیزان دادەبەزن، بەداخەوە دەکەونە کەمینی دوژمنەوە. خۆی برینداردەبێ، بەناچاری دەگەڕێتەوە بارەگاکانی سەرسنور،بەلام سێ پارتیزانەکەی تر،بەرەو دەشتی هەولێر دەڕۆن ودوای ماوەیەك بە هۆی خیانەت، دوو قارەمانی پارتیزان (شەهید عوسمان علی سور،شەهیدعباس سیاوی)شەهیددەکرێن. هەڤاڵ هاشم شەمامکی دوای ساڕێژبوونی برینەکانی، جارێکیتر هاوڕێ لەگەڵ (شەهید ئیسماعیل مورتکەیی، شەهید زیاد، عومەر گردەسۆری،کاوە ئاقوبانی،ناصیح مشاری،کەمالەکوڕ)لەئەیلولی ١٩٩٠ دەگەڕێنەوە دەشتی شەمامك و هەولێر، دواتر دەبن بەدوومەفرەزەوە، مەفرەزەیەکیان دەچن بەرەو ناوچەی بەڕانەتی، شەهیدهاشم و شەهید ئیسماعیل وکاوە ئاقوبانی لە شینایيەکانی نزیك گوندی(خەزنە)دەمێننەوە،بەداخەوە دیسان بە هۆی خیانەتەوە، کەلە جاشێکی خۆفرۆش دەبنە پێشرەوی تانك وتۆپی ڕژێم وهێرش دەکەنەسەر ئەوسێ پارتیزانە قارەمانە،کە دووانیان تاشەهید دەبن بەرەنگاری دوژمن دەبنەوە. چەندجاشێك بەسزادەگەیێنن،(کاوەئاقوبانی)یش خۆی دەربازدەکات و دەگەڕێتەوە بارەگاکانیان لەسەرسنور. *

* سەرچاوە : نوسینێکی د. عبدالواحید ئیدریس شەریف



## لە 1990/9/19 شەهیدان ئیسماعیل مورتکەیی و هاشم شەمامکی شەهید بوون بۆئەوەی کوردستان جێ نەهێلن *

مەفرەزە پارتیزانەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بۆ دروست کردنی رایەلەو ئامادەباشی بۆ راپەرینی سەرتاسەری لە کوردستان و عێراق بەگشتی لەدەورووبەری شارەکانی کوردستان نزیك ببوونەوە یەکێك لەو پێشمەرگانەی لەگەڵ شەهید هاشم شەمامکی فەرماندەی تیپی (88) ی شەمامك شەهید (ئیسماعیل خورشید ئیبراهیم ) مورتکەیی بوو. ناوبراو پێشمەرگەیەکی گەنجی رووخۆش و ئازاو چاونەترس بوو، لەماوەی ژیانی پێشمەرگایەتی خۆنەویستانە بەشداری چەندین چالاکی ونەبەردی کردووە ، بەلآم بەداخەوە لەماوەی پارتیزانی لە 1990.9.19 لەگەڵ شەهید هاشم شەمامکی هاورێ و هاوسەنگەری لە سنوری شینایەکانی گوندی دەلووگوڵ گەیشتنە کاروانی نەمران..

روحت شاد کاکە ئیسماعیلی روح سووکی خۆشەویستی ناوهێزی پێشمەرگە..

---

* سەرچاوە : فەیسبووکی حەیدەرمەنتك

## ژیاننامەی شەهید ئیسماعیل خورشید مورتکەیی

. ناوی تەواو : ئیسماعیل خورشید ئیبراهیم ئیسماعیل (ئیسماعیل مورتکەیی)

. تەمەن : 1973.7.1

. شوێنی لە دایك بوون : گوندی مورتکە . دارەتوو . پارێزگای هەولێر . سنجاوی

. ئاستی خوێندن : ناوەندی

. باری خێزان : سەلت

. لەساڵی1985 پەیوەندی بەرێکخستن ی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان کردوە.

. ساڵی پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەوە : 1987

. شوێنی پێشمەرگایەتی:کەرتی(3)لە تیپی(87)ی قەرەچوغ کەهەڤاڵ(عومەرناسر) فەرماندەی کەرتەکە بووە بۆتە پێشمەرگە،پاشان گواستراتیەوە کەرتی سێ لە تیپی 85ی دەشتی هەولێر دوا شوێنی پێشمەرگایەتی لە تەشکیلاتی ساڵی 1989 لە سەر سنور گواسرایتەوە تیپی (88)ی شەمامك کە شەهید هاشم شەمامکی فەرماندەی تیپەکە بوو . دواتریش بەیەکەوە شەهید بوون.

. یەکەمین شەهیدی بنەماڵەکەیەتی

. لە ژیانی پێشمەرگایەتیشدا یەك جار بریندار بووە لە شێخ وەسانان بە کیمیاوی .

. لە ژیانی پێشمەرگایەتی بەشداری چەندین نەبەردی و چالاکی کردووە لەوانە ( لێدانی رەبیەکانی نێوان هەولێر . پردێ ، محمل قیر، داستانی گرتنی تەق تەق، داستانی گرتنی دێگەلە . داستانی گرتنی سەری رەش ، شەرەکانی سەرکردایەتی ، داستانی سماقوڵی

. رۆژو مانگ وساڵی شەهید بوون : 19. 9. 1990

. شوێنی شەهید بوون : شینایەکانی سنوری دەلووگوڵ



# سۆران ئەوپارتیزانە مەسیحی یە
# ئازاکەی سنووری شەقلاوە و هەولێر

بەمەبەستی دارشتنی نەخشەی ئەنجامدانی چالاکی پارتیزانی لەناو شاری هەولێر، رۆژی 1988/8/28 شەهید سوران لەگەڵ هاورێیەکی خۆی بەرەو کۆمەڵگای پیرزین بەرێدەکەوێت بۆئەوەی پەیوەندی بەمەفرەزەیەکی تری پێشمەرگەوە بکات، دواتر بەهۆی پیلانێکی سیخوری بەرێوەبەرایەتی ئەمنی هەولێرەوە شەهید سۆران لەرۆژی 1988/8/28 لەنزیك دەواجن لەکۆمەڵگای پیرزین شەهید دەکرێت و دوای شەهید بوونیشی هەموو کەسوکاری وخێزانەکەی کە 8 کەس بوون لەلایەن ئەمنی هەولێرەوە دەستگیر دەکرێن و دەست و چاویان دەبەسترێن و دواتر بەماوەیەکی کەم بەرەو گوندی مەچلوبە لەنزیك گوێر دەبرێن و لەرۆژی 1988/10/28 گوللە باران دەکرێن و دواتریش تەرمەکانیان لە 2 شوێنی جیاوازەوە ژێر گڵ دەکرێن و دوای یەك هەفتە لەگوللە باران کردنیشیان شوانێکی ئەو گوندە چەند تەرمێکیان دەدۆزێتەوەو پۆلیسی گوێر لەمە ئاگادار دەکاتەوە، ئەوانیش 4 تەرم دەردەهێنن و رەوانەی نەخۆشخانەی رزگاری دەکەن بەمەبەستی پشکنینی پزیشکی، لەو

کاتەشدا ژمارەیەکی پزیشك و پەرستاری شارۆچکەی عەینکاوە لەو نەخۆشخانەیە کار دەکەن و هەر کەتەرمەکان دەبینن دەست بەگریان دەکەن و کەسوکاریان ئاگادار دەکەنەوە، بەمەش هەر کە جەلادەکانی ئەمنی هەولێر ئەمە دەبینن چواردەوری پەیمانگای پزیشکی دادوەری هەولێر دەدەن و تەرمەکان بەرەو گۆڕستانی کارگەی قیری هەولێر دەبەن و لەوی جاریکی تر ژێر گڵیان دەکەنەوە،بەڵام چەند رۆژێك دوای راپەڕینە مەزنەکەی بەهاری 1991 بەهاوکاری و پشتیوانی کۆسرەت رەسوڵ و شەهید شاخەوان و خزم و کەسوکاریان و بەئامادەبوونی نوێنەری بەرەی کوردستانی، لەرێورەسمێکی شایستەدا هەر 4 تەرمەکەی دایك و باوك و 2 خوشکی شەهید سۆران و لەگەڵ تەرمی شەهید سۆران دەردهەێنرێن و بەرەو گۆڕستانی عەینکاوە دەگوازرێنەوەو لەوی دەنێژرێن، بەڵام تاکو ئێستا 4 تەرمی تری 2 خوشکی شەهید سۆران و خێزان و کۆرپەکەی نەدۆزراونەتەوە کەئەمانەن (نادیاو شەزا پۆلس سلیوا خوشکی شەهید سۆران سێبەر سلیوا برایموك خێزانی شەهید سۆران و ژاڵە عەبدولمەسیحی تەمەن 40 شەو کچی شەهید سۆران) و ئێستاش تەنها 2براوخوشکێکی شەهید سۆران بەناوەکانی(سەلیم ویەڵداو وارینە) لەژیاندا ماون .

شـەهید عەبدولمەسـیح پۆلس سلیوا کە بە (سۆران) ناسرابوو لەساڵی 1954 لەشارۆچکەی عەینکاوە لەخێزانێکی جوتیارو هەژار لەدایکبووەو خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی لەم شارۆچکەیە تەواو کردووەو دواتر لە ساڵی 1977 پەیمانگای پیشەسازی هەولێری تەواو کردووە، بۆ ماوەی 1 ساڵ و 2 مانگ دەبێتە مامۆستا لەناوەندی کاوە لەشاری دهۆك و دواتر وەك مامۆستایەك گەڕاوەتەوە شاری هەولێرو تاکو ساڵی 1981 لەناوەندی ئیسکانی شاری هەولێر وانەی وتووەتەوە .

لەساڵی 1981لەرێگەی عەزیزبەگەوەپەیوەندی بەریزەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لەگوندی خەتی و دۆڵی ئالأنەوە کردووەو بۆ ماوەیەك لەو سنوورە وەك کادیرێکی جەماوەری چوست و چالاك کاری کردووە .

لەساڵی 1983 لەسنوری ناوچەی خۆشناوەتی پەیوەندی بەمەڵبەندی 3 ی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان کردووەو هەر لەم کاتەشەوە بەنهەێنی دەستی بەخەباتی پارتیزانی لەسنوری ناوچەی بەرانەتی و دەشتی هەولێرو ناو شاری هەولێردا کردووەو لەم پێناوەشدا دەیان و سەدان چالاکی گرنگی دژ بەرژێمی بەعسی ئەوسا ئەنجامداوە

لەسالأنی هەشتاکان لەزۆربەی چالأکیەکانی سنوری بەرانەتی و دەشتی هەولێرو ناو شاری هەولێر و دەوروبەری شاری موسڵ بەشداری کردووەو جارێکیش لەساڵی 1987 بەهۆی ئەنجامدانی چالأکیەکیەوە لەسەر شەقامی شەست مەتری شاری هەولێر بریندار بووەو بەر لەشەهید بوونیشی،لەساڵی 1988سەرپەرشت 3 مەفرەزەی پارتیزانی سنووری بەرانەتی ودەشتی هەولێری کردووە .

لەرۆژی 1988/8/28 بەپیلأنی دائیرەی ئەمنی هەولێری رژێمی بەعس شەهید کرا و دواتر 8 کەسی تر لەئەندامانی خێزانەکەی دەستگیر کران و هەر هەموویان لەگوندی مەچلوبەی نزیك گوێڕ گوللە باران کران .

## پرۆفایلی شەهیدانی بنەماڵەی

## (عەبدولمەسیح بوولس سلیوا)

* شەهید پولس سلیوا بوولندرکەدەکاتە باوکی شەهید سۆران لەرۆژی1927/7/1 لەشارۆچکەی عەینکاوەلەخێزانێکی جوتیار لەدایك بووەو بۆ ماوەیەکی زۆر کاری جوتیاری کردووەو دواتر لەفەرمانگەی گەیاندنی هەولێر وەك چاککەرەوەی هێڵی تەلەفۆن کاری کردووە،لەرۆژی 1988/10/28بەدەستی جەلأدەکانی دائیرەی

ئەمنی هەولێر لەگەڵ خێزانەکەی کەپێکهاتبوو لە 4 کچی و هاوسەرەکەی وخێزانی شەهیدسۆران(بووکەکەی) و کۆرپە ساواکەی شەهید سۆران (ژاڵە) کەتەمەنی 40 شەو بوو لەگوندی مەجلوبە لەنزیك گوێڕ گوللە باران کران .

* نێرگس نونا گلیانا لەرۆژی 1928/7/1 لەشارۆچکەی عەینکاوە لەدایك بووەو دەکاتە دایکی شەهید سۆران .

* حەمامە پولس سلیوا لەرۆژی 1950/5/25 لەشارۆچکەی عەینکاوە لەدایك بووە ولەساڵی1988 خوێندکاری پۆلی شەشەمی زانستی بووە لەخوێندنگای هەولێری کچانی ئێوارانو لەهەمان کاتیش لەکۆمپانیای دڵنیایی فەرمانبەر بووە .

* سەبیحە پولس سلیوا لەرۆژی 1953/1/17لە عەینکاوەلەدایك بووەلەساڵی 1988 خوێندکاری پۆلی شەشەمی وێژەیی بووە لەخوێندنگای دواناوەندی کچانی عەینکاوە.

* نادیە پۆلس سلیوا لەرۆژی 1955/5/15 لەشارۆچکەی عەینکاوە لەدایك بووەو خوێندکاری پێنجەمی زانستی بووە لەخوێندنگای دواناوەندی کچانی عەینکاوە .

* شەزا پۆلس سلیوا لەرۆژی 1972/5/20 لەشارۆچکەی عەینکاوە لەدایك بووەو خوێندکاری پۆلی 3ی ناوەندی بووە لەخوێندنگای دواناوەندی کچانی عەینکاوە .

* سێبەر سلیوا برایموك (خێزانی شەهید سۆران) لەرۆژی 1952/7/1 لەشارۆچکەی شەقڵاوە لەدایك بووە دەرچووی (پەیمانگای پزیشکی هەولێر) بووە.

* ژاڵەعەبدولمەسیح پولس(کۆرپە ساواکەی شەهید سۆران) تەمەنی40شەو بووە و لە ساڵی1988بەنهێنی لەشاری هەولێر لەدایك بووە ، چەنکە ئەوکاتە شەهیدسۆران لەترسی جەلادەکانی بەعس بەنهێنی لەخانوویەکدا لەگەڕەکێکی شاری هەولێر ژیانی بەسەر بردووە

سەباح پولس پولەندەر برای شەهید سۆران، سەبارەت بە 24 هەمین ساڵیادی شەهید سۆرانەوە بە PUKmedia ی وت: شەهید سۆرانی برام هەر لەتەمەنی گەنجایەتیەوە باوەڕێكی تەواوی بەخوێندن و رۆشنبیری و درێژەدان بەخەبات و تێكۆشان لەپێناوی پێشكەوتنی نەتەوایەتی و نەمانی جیاوازی چینایەتی و مەنهەجی سۆشیال دیموكرات هەبوو . بۆیە هەر لەم كاتانەوە توانی رووبەڕووی دام و دەزگاو سیخوڕەكانی رژێمی بەعسی فاشیزم ببێتەوەو سەرەتا وەك خەباتی نهێنی و دواتر چەكی شەڕەفی كوردایەتی لەناو ریزەكانی یەكێتیی نیشتمانیی كوردستان كردە شان و تادوا چركەساتەكانی ژیانیشی لەخەبات و تێكۆشانی پێشمەرگایەتی و پارتیزانی بەردەوام بوو، لەرووی كۆمەلایەتیشەوە بەشایەدی زۆربەی هاوڕێ و هاوسەنگەرانی. شەهید تابڵێی ئاوێتەو تێكەلاوی ناو جەماوەرو هێزی پێشمەرگەبووهەمیشە بەكەسێكی خۆشەویست و دادپەروەرناسرابوو.

وتیشی: شەهید سۆران لەگەڵ ئەوەی كە بەئایین موسڵمان و بەنەتەوە كورد نەبوو، بەڵكو بەرەگەز كلدان و بەئایین مەسیحی بوو، بەلاّم بەمانای ووشە كوردێكی دڵسۆزو چاونەترس بوو، هیچ كاتێك سڵی لەبەعسیە فاشیستەكان نەدەكردەوەو لەرووی ئاینینیشەوە هیچ جیاوازی لەنێوان موسوڵمان و مەسیحی نەدەكرد، تەنها ئەوەی بەلاّی ئەوەوە گرنگ بوو رووخاندن و لێدان و گورز وەشاندن بوو لەبەعس، هەمیشەش باوەڕی وابوو كەدەبێت خەڵكی كوردستان بگۆڕێت، وتی: بكۆشێت لەپێناوی هێنانەدی ئامانجەكانی. هەروەها بەر لەتەمەنی پێشمەرگایەتیشیەوە شەهید سۆران وەكو مامۆستایەكی كوردایەتی دەیەویست منداڵی كورد لەسەر رێبازی كوردایەتی پەروەردە بكات بۆ ئەوەی لەزوڵم و چەوسانەوە رزگاریان بێت ..

راشیگەیاند:

لەرووی پێشمەرگایەتیشەوە،شەهیدسۆران بەپاڵپشتی رێكخستنە نهێنیەكان و هەندێ لەجەماوەری باوەڕپێكراوی ناوشاری هەولێرو كۆمەڵگاكانی دەوروبەری كەهاوكاری و خزمەتێكی باشیان دەكرد، پێشمەرگەیەكی پارتیزانی گورز وەشێن و چاو نەترس بوو، هەر بۆیە چالاكی و نەبەردیەكانی وایكرد كە شەهید سۆران بەماوەیەكی كەم لەزۆربەی ناوچەكانی كوردستان بەگشتی و سنوری پارێزگای هەولێر بەتایبەتی وەك گیان فیدایەك بناسرێت و لەسالانی هەشتاكانیشەوە لەزۆربەی چالاكیەكانی سنوری بەرانەتی و دەشتی هەولێرو ناو شاری هەولێر و دەوروبەری شاری موسل بەتایبەتی لەبەرتلە و ئەلقوش و چەندین شوێنی تر بەشداری كردووەو جارێكیش لەسالی 1987 بەهۆی ئەنجامدانی چالاكیەكیەوە لەسەر شەقامی شەست مەتری شاری هەولێر بریندار كراوە .

**مەلا ئاوات هاورێ و هاوسەنگەری شەهید سۆران وتی:**

من لەسالانی 1973 و 1974 لەگەڵ چەند كەسێكی مەسیحی شارۆچكەی عەینكاوە ئاشنایەتیم پەیدا كردوو یەكێك لەوانە شەهید سۆران بوو كەناوی خۆی (عەبدولمەسیح) بوو كەئەو كاتە لەریزەكانی حیزبی شیوعی عیراقی بوو، بەلام دوای جیابوونەوەیان لەگەڵ لیژنەی مەركەزی ئەو حیزبە، شەهید سۆران بەبیروباوەڕە پۆلاینەكەی چیتر نەیتوانی لەگەڵ مەنهەجی خەباتی ئەو حیزبە هەڵ بكات و هەمیشە جەختی لەسەر تیۆری شۆڕشگێڕانە دەكردەوە، بۆیە بەم بیروباوەڕەیەوە شەهید سۆران لەبیروباوەڕی ئێمە كەكۆمەڵەی ماركسی لینین و تێزی ماوتسی تۆنگ بوو زۆر نزیك بوو، من ئەو كاتە پەیوەندیەكی باشم لەگەڵ ئەو برادەرە مەسیحیانە لەناو شاری هەولێر هەبوو . وتیشی: دوای نسكۆی سالی 1975 من شەهید سۆرانم لەشارۆچكەی عەینكاوە بینیەوە، دیار بوو هەمان بیروباوەڕو بیركردنەوەی سیاسی جارانی هەبوو گەنجێكی تابڵێی بەحەماسەت و

چاونەترس بوو لێکدانەوەی سیاسی بەهێزی هەبوو، دواتریش لەساڵی 1980 من لەرێگەی ئامۆزاکەیەوە کەماموستا بوو جارێکی تر شەهید سۆرانم بینیەوەو پەیوەندیم لەگەڵ بەستەوە، دواتر لەساڵی 1981 کەئەو کاتە من لەدۆڵی خانەقا ماموستا بووم دواتر بۆ گوندی رماوێژ لەدۆڵی ئاڵانە گوازرامەوە، ئەوکاتە شەهید سۆران پەیوەندی بەهێزی پێشمەرگە لەدۆڵی ئاڵانەوە کرد ، بەڵام دوای گۆڕانی کۆمەڵەی مارکسی لینین بۆ کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان و جیابوونەوەی ئێمە لەکۆمەڵەی رەنجدەران و چوونمان بۆ ناو ئاڵای شۆڕش، دیار بوو شەهید سۆرانیش هەمان بیروباوەڕی ئێمەی هەبوو ، ئەو کاتە هاتە ناو ئاڵای شۆڕش ، دواتر شەهید سۆران ئاڵای شۆڕشی بەجی هێشت و پەیوەندی بەمەڵبەندی 3 ی رێکخستنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لەناوچەی خۆشناوەتی کردو ئەرکی فەرماندەی مەفرەزەو دواتر سەرپەرشتیاری 3 مەفرەزەی لەسنووری دەشتی بەرانەتی و عەینکاوەو هەولێرو دەشتی هەولێر پێ سپێردراو هەموو ئەو ئەرك و چالاکیانەی کە لەلایەن مەڵبەندی 3 وە پێی دەسپێردران بێ باکانە ئەنجامی دەدان و سەدان بەرپرسی حیزبی بەعس و ئەفسەری دەرەجەداری لەتۆڵەی زوڵم لێکردنی خەڵکی بێتاوانی کوردستان کوشتووەولەناوبردووە.

ئەوەشی خستەڕوو: لەکۆتایی ساڵی 1988 ئەوکاتە کەئێمە وەکو ئاڵای شۆڕش سەرقاڵی بەستنی پلینیۆم بووین لەناوچەی خواکورك ئێمە لەرێگەی برادەرانەوە هەواڵی شەهید بوونی (شەهید سۆان)مان بیست ، کەبەلای ئێمەوە کۆستێکی ئێجگار گەورە بوو کەهەڤاڵێکی مەسیحی تێکۆشەری وەك سۆران لەناو ریزەکانی خەباتی گەلەکەماندا شەهید بکرێت ، چونکە رۆڵەیەکی دەست و چاو کراوەبوو، هەروەها لەرووی کۆمەلایەتیشەوە هەرچەندە شەهید سۆران کەسێکی مەسیحی بوو، بەلام تابلێی کەسایەتیەکی بەتواناو کاریگەری هەبوو زۆر بەئاسانی ئاوێتەی

جەماوەر دەبوو، هەروەها بەهیچ شێوەیەك بیری لەترس و تۆقاندن و بەرژەوەندی تایبەتی خۆی نەدەکردەوەو هەموو ئاواتێکی رزگارکردنی گەلەکەمان بوو لەزوڵم و چەوسانەوە، هەر ئەمەش وایکرد کەرژێمی بەعس هەموو رێگەیەك بگرێتە بەر بۆ شەهید کردنی ئەوەبوو دواتر بتوانێت لەساڵی 1988 لەرێگەی پیلانێکەوە شەهیدی بکات و دواتریش هەموو ئەندامانی خێزانەکەی دەستگیر بکات وگوللە بارانیان بکات .

**جەمیل عیسی وەك کەسایەتیەکی مەسیحی نزیکی شەهید سۆران لەمبارەیەوە وتی:**

لەو سەردەمانەی کەتاریکستانی باڵی بەسەر کوردستاندا کێشابوو، هەولێر ببووە مۆڵگەی بەعسی و سیخوڕو ئەڵقە لەگوێکانیان، بەتایبەتی لەشارۆچکەی عەینکاوە کەرژێمی بەعس بەهەموو شێوەیەك هەوڵی تەعریب وتەبعیس کردنی دەدا، ئەوی رۆژێی ئەنگوستەچاو رۆڵەیەکی ئەم شارۆچکەیەچاوی بە ستەمکاری وزوڵم و زۆرداریەکانی بەعس هەڵ نەدەهات و بیری نەتەوایەتی و نیشتیمان پەروەری وایکرد کەشەهید سۆران پەیوەندی بەرێکخستنەکان و هێزی پێشمەرگەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بکات و هەر زوو کەوتە خۆو،قۆڵ وباسکی هەڵماڵی بۆ بەرەنگاربوونەوەی بەعسیەکان .

وتیشی: شەهید سۆران بەهۆی ئەوەی سەرپەرشتی مەفرەزە پارتیزانەکانی ناو شاری هەولێرو سنوری بەرانەتی و دەشتی هەولێری دەکرد، بۆیە شەهید ببووە هۆکارێك بۆ دەست وەشاندن لەسەرانی بەعسیەکان لەناو شاری هەولێرو شارۆچکەی عەینکاوەدا، لەم کاتانە ترس و دڵەراوکێیەکی زۆری بۆ رژێمی دیکتاتۆری بەعس دروستکردبوو تەنانەت هەندێکیان نەیان دەتوانی لەماڵەکانیشیان بمێننەوە، هەر بۆیە رژێمی بەعس هەڵسا بەگرتن و شەهید کردنی خۆی و کەسوکارەکەی . کەئەم خێزانە شۆڕشگێڕو نیشتیمان پەروەرە لە9 کەس

پێکهاتبوون کەهەرهەموویان گوللە بارانکران.راشیگەیاند: بنەماڵە تێکۆشەرەکەی شەهید سۆران هەمیشە رۆڵێکی قارەمانانەیان لەخەبات و تێکۆشانی کوردایەتی و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا بینیوەو سێبەری خێزانیشی دوای تەواوکردنی خوێندنی وەك پزیشکێك لەنەخۆشخانەی مندالآن کاری کردووەو رۆڵێکی بەرچاویشی هەبووە لەئەنجامدانی کاری رێکخستن و هاوکاری کردنی کەسوکاری هێزی پێشمەرگە .

هەزاران سلاّو بۆ شەهید سۆرانی پارتیزان و8 شەهیدی قارەمانی خێزانەکەی. خۆشم لەدەرەوەی کاری رۆژنامەنوسیم، ئەگەر ئەو مافەم پیێ بدرێت دەتوانم باس لەو تێکۆشەرە بکەم و تارادەیەکی باش شارەزایم لەسەر شەهید سۆران هەبوو ، من ئەو کاتە کەتەمەنم 15 سالآن بوو خوێندکاری قۆناغی ناوەندی بووم زۆر جاری واهەبووە بەئیختیفا هاتۆتە مالّی ئێمەو باسی لەکوردایەتی و تێکۆشان لەپێناوی رزگار کردنی گەلەکەمان لەزولّم و چەوسانەوە دەکردو هەمیشە هانی ئێمەی دەدا کە لەسەر کاری خوێندنمان بەردەوام بین و باوەڕی وابوو کەتەنیا لەرێگەی خوێندن و هۆشیاری نەتەوایەتی و خەباتی پێشمەرگایەتی گەلەکەمان رزگاری دەبێت و هیچ کاتێکیش سلّی لەترسنان و مردن نەدەکردەوە ، وەدایکیشم بەناوی فاتیمە خان ، خزمەتێکی زۆری پێشمەرگەی لەو سنوورەدا کردووە چەندینجار بەم هۆیەوە روبەڕووی ترس و تۆقاندنی بەعسیەکان بووەتەوە کە بەراستی ئەو کاتە خزمەتکردن و هاوکاریکردنی هێزی پێشمەرگە بەتایبەتی لەسنوری بەرانەتی و دەشتی هەولێر کارێکی ئەستەم و گران بوو .

---

سەرچاوە : PUKmedia فەتاح حسەن قەلآتی - هەولێر 2012/8/27



## شەهیدەکانی خانەوادەی شەهید سۆران

1 - نێرگزنونا گلیانا / دایکی شەهید سۆران

2 - پۆلس سلێوا بلندەر / باوکی شەهید سۆران

3 - سێبەر سلێوا برایمۆك / هاوسەری شەهید سۆران

4 - شەهید سۆران

5 - کچە بچکۆلانەکەی شەهید سۆران

6 - سبیحە بۆلس / خوشکی شەهید سۆران

7 - شەزا بۆلس / خوشکی شەهید سۆران

8 - نەدا بۆلس /خوشکی شەهید سۆران

9 - حەمامە بۆلس / خۆشکی شەهید سۆران



## شەهید سۆران و خێزانەکەی

دوای ئەوەی خائینێك كاك سۆران شەهید دەكات ولاشەكەی تەسلیمی ئەمن دەكاتەوە و هاوسەرەكەشی دەگرن و دواتر ئەویش شەهیددەكەن .. رژێم دایك و باوك و خۆشك و براكانی تریشی ئەوانەی لە هەولێر دەبن و بەردەست دەكەون هەر هەموویان كۆمەڵكوژ دەكات ..

ئەویەك دووكەسەی خانەوادەكەیان كەكۆمەلكوژنەكران لەماڵەوە نەبوون، دەنائەوانیشیان دەرباز نەدەكرد وهەموویان هەمان چارەنووسیان دەبوو.

شەهیدسۆران وێڕای دڵسۆزی وئازایەتی وقارەمانی مرۆڤێكی روناكبیرو پووخۆش و قسەخۆش بوو.

- مەگەر خانەوادەی شەهید (د. هادی) لەكەركوك وەك ئەم خانەوادەیە زوڵمی گەورەی لێكرابێت.



# ژیاننامەی
# پارتیزانی دوای ئەنفال
# شەهید فاقە مەخمووری

- فاروق حسێن عەبدوڵا ولی(فاقە مەخمووری)
- ساڵی لە دایك بوون : 1952 لە قەزای مخمور چاوی بۆژیان هەڵهێنابوو.
- ناوی منداڵەکانی ئارۆز، ئاریان . ئاڤان ئارین . ئارەزوو . ئالان . ئاڤێستا
- دەرچووی ئامادەیی کشت وکاڵ بوو.
- ساڵی 1980پەیوەندی کردبوو بە کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان ەوە
- ساڵی 1982بوو بوو بە پێشمەرگە لە هەرێمی دەشتی هەولێر
- ساڵی 1984 بوو بوو بە جێگری کەرت
- ساڵی 1985 بەفەرماندەی کەرتی(2) شەهید ئەحمەد قەمبەری تیپی 87
- لە ساڵی 1988 دەکرێتە جێگری فەرماندەی تیپی 87 ی قەرەچوغ
- لە ساڵی 1989 پلەی فەرماندەی تیپی 87ی قەرەچوغی پێ دەدرێت.
- لە ساڵی 1991 دەکرێتە جێگری بەتالیۆنی (17) ی قەرەچوغ
- لەکۆتایی 1991پلەی فەرماندەی بەتالیۆنی(17)ی قەرەچوغی پێدەدرێت.
- لە ساڵی1992لەگەڵ دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستان دەکرێتە لێپرسراوی فوجی (2) پاراستنی هەرێم بە پلەی مقدم.
- لە 1994 دبێتە بەرێوەبەری ئاسایشی ئاکرێ.
- لە ساڵی 1994 دەکرێتە فەرماندەی لیوای تایبەتی رۆژهەلات.
- چوار جار بریندار دەبێت..

## ئەو چالاکیانەی شەهید فاقە بەشداری تێدا کردبوو:

- داستانەکەی بێتواتە لە پایزی 1983
. گرتنی شارۆچکەی هیران لە ساڵی 1985
- گرتنی زنجیرە رەبیەکانی رێگای کۆیە و هەولێرلە شوباتی 1985
- شەری قەیوان ماوەت ساڵی 1985
- لێدانی بیرە نەوتیەکانی کەرکوك 1985
- گرتنی شارۆچکەی شێخ شەروان
- لە 13 ـ11 . 1985 . شەرە گەورەکەی تەلەلخێم
- لە ساڵی 1985 . گرتنی ناحیەی تەق تەق
- گرتنی قاتعی ئە بوو جحفر منسور رەبیەکانی دەوروبەر لە ساڵی 1987
- گرتنی سەری رەش
- شەری کونە کۆتر قەندیل لە ساڵی 1988 ،،
- گرتنی گوندی مەچلوبە لە تۆڵەی کیمیابارانی هەلبجەی شەهید لە ساڵی 1988
- لە راپەرینی1991گرتنی مخمورو قەراج وکەندیناوە بەسەرپەرشتی شەهید فاقە
- داستانە گەوروکەی کۆریێ شەهید فاقە دەبابەیەکی رژێمی سەدامی سوتاند
- چالاکی گرتنی کەتیبەی تۆبخانەی دیبەگە کە شەهید فاقە سەرپەرشتی کرد.
- گرتنی فوجی (20) سەربە لیوای دیبەگە و مخمور بوو لە چالاکیە. .

چەندین چالاکی ترکە شەهید بەشداری و سەرپەرشتی کردوە. .

ـبە داخەوە ئەم فەرماندە تێکۆشەرە لە شەوی 25 ـ 27 ـ 3ی ساڵی 1995

لە ناحیەی کەسنەزان شەهید بوو گەیشتە کاروانی نەمران.

هەزاران سلاو لە گیانی پاکی



## پارتیزانی دوای ئەنفال

## شەهید جەعفەر حەمەدەرویش

- سالی لەدایك بوون: 1959.7.1 قەزای کۆیە/ دەرچووی پیشەسازی هەولێر
- سالی 1979 پەیوەندی بەرێکخستنەوە کردبوو
- . سالی1981 پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەوە کردبوولە تیپی 93ی کۆیە.
- دوا پلەی فەرماندەی تیپی (93) ی کۆیە بوو، (3)جار بریندار بوو بوو.
- شەهید جعفەر لە سالی 1981 کاتێك کە چەکی شەرفی پێشمەرگایەتی دەکاتە شان لە ڕێزەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستاندا پێشتر ئەندامی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بووە .

شەهید جەعفەر هەر لە یەکەم ڕۆژی بوونی بە پێشمەرگە خاوەنی سیفەتی تایبەت بە خۆی بووە ، پیاوێکی ڕوح سوك و لەسەرەخۆ ، بەلام لە هەڵمەتی پێشمەرگانەدا بۆ سەر دوژمن بەورئاسا بووە ، نەبیستراوە هەر شەرێك کە تیپی (93) ی کۆیە بەشداری تێدا کردبێت یان چالاکی تیپەکە هی خۆی بوبێت ، شەهید جەعفەر بەشداری تێدا نەکربێت . جعفەر حەمە دەروێش پلە بە پلەی لێپرسراویەتی پێشمەرگایەتی بڕیوە. تا سالی 1988 و دوای شالاوەکانی ئەنفال سەرکردایەتی مەفرەزە پارتیزانەکانی دەشتی کۆییەی کردوە تادواجار بە بریاری سەرکردایەتی بەرەوسەرکردایەتی کشاونەتەوە. لە ڕاپەرینە مەزنەکەی بەهاری 1991 بەشداری ڕزگارکردنی شارەکانی ڕانیە و کۆیە و هەولێری کردووە..

- لە ڕۆژی1991/3/20 لە رزگارکردنی شاری کەرکوك شەهیدبووە.

سلاو لە گیانی پاکی شەهید جەعفەروگشت شەهیدانی ڕێگەی ڕزگاری کوردستان.

سەرچاوە : فەیسبووکی حەیدەر مەنتك



# جوامێر

## پارتیزانی دوای ئەنفال

## بیرەوەری خۆی و (عوسمانە سوور) دەگێڕێتەوە

- لە سەردەمی دوای ئەنفال . ئێمە کە مەفرەزەیەکی حەوت کەسی بووین لە (دەشتی هەولێر)لەنێوان(گەڕەشێخان)و(دوڵەبەکر)ەی سەرجادەی هەولێر - کرکوک بەدووری(3کم).لەجۆمێکی بچکۆلانە جێگیر ببووین،بەرۆژ تێدا دەماینەوە، لەسەرلا تەنیشت نانمان دەخوارد،(مار)یکیش ببوو بەهاوڕێمان،کەسمان حەقمان بەسەر کەسمانەوە نەبوو،ماڵەکەی ئەوجیابوو، کونێك بوو لەسەرەوەی ئێمە،کەئێمە دەردەچووین ئەودەهاتە جێی ئێمەو پەپکەی دەکرد،کەئێمەش دەگەڕاینەوە..

ئەو ژێرانەخشکەی دەکردوو دەچووە کونەکەی خۆی...

پایزی١٩٨٨ئێوارە یەکی ساردوئاسمان هەوراوی بوو،ئێمە هەر(٧)مان لە بنکەکەی خۆمان دەرچووین و ڕۆیشتین بەرەو ڕۆژهەڵاتی هەولێر،ئامانجمان بنەسلاوە بوو،بۆ ئەوەی ماڵی هاوڕێکانمان بدوزینەوە،ماڵی(سلمان وکاك شۆڕش) چونکە بنەسلاوە ئەوکومەڵگایەبوو ڕژێمی بەعس تازە دروستی کردبوو،هەموو ئەوگوندانەی کە وێرانی کردبوو راپێچی ئەو ئوردگایەی کردبوون،ئەوهاوڕێیانەی ئێمە نەیاندەزانی ماڵەکانیان لەکوێی ئوردووگاکەن بەهەنگاوە گورج و خێراکانمان بەردەوام بووین لە ڕۆیشتن ، تاکو گەیشتینە راستی دارەتوو کاك عوسمانەسوور (یادی بەخێر)گوتی

ئەوە رووناکی گلۆپی سەیتەرەی هەولێرە،کەئەوسا لەسەر پردەکەی ئیستای کۆلیژی هەندە سە بوو، من گوتم نا کاك عوسمان ئەوە کومەڵگای دارەتووە،کاك عوسمان نەی سەلماندو سووربوو لە سەر رایەکەی خۆی ،کەوتمە گومان لە زاکیرەی خۆم لێرەدا جێگۆرکێ بە هەموو ئاوەدانیەکان هاتەئاراوە، رووناکیەکانی دارەتوو لێمان گۆرا، بوو بە رووناکیەکانی سەیتەرە رووناکیەکانی بنەسلاوەمان لێ بوو بە دارەتوو رووناکیەکانی کەسنەزان مان لێ بووبە بنەسلاوە،بە ئاراستەی کەسنەزان(بنەسلاوە)بەو شەوە ساردەی پایز درێژەمان بە رۆیشتن دا،بەو هیوایەی بگەینە بنەسلاوە و ماڵی هاورێکانمان و خواردنێکی گەرم بخوین وهەواڵی مەفرەزە پارتیزانەکان بەتایبەتی شەهید(رێبان) وەربگرین، چونکە دوومانگ بوو لەیکتری دابڕابووین،هیچ هەواڵێکی یەکترمان نەدەزانی، بە پاریزی زۆرو بەهەڵوەستە کردن و وریایی بەرامبەر هەر جولەیەکی نامۆ شان بەشانی رووناکیەکان بە ردەوام بووین لە رۆیشتن،بنەسلاوەشمان تێپەراندبوو،کەئێمەوامان دانابوودارەتووە بەوشەوە ساردە بە هۆی پالتۆ و کوڵە پشتییەکانمان لەشمان گەرمەوە ببوو، گەیشتینە کەسنەزان، ئێمە لەماڵێك نزیك بووینەوە، لەودەمیدا لاندکرۆزەکی پڕ لە چەکداریەیدابوو، دیاربوو دەوریەبوو خۆمان دا بەرتاریکی ولەئێمە تیپەری،نەفەرەکی ماڵەکە بەفانوس لەناوحەوشەکە دەسواڕوە (کاك توفیق مامە) لێی نزیك بۆوە ،دیاربوو ئافرەت بووخەریکی ئالیکدانی مەرەکانی بوو،لێی پرسی خوشکە ئێرە کێندەرێ یە؟ ئەوبە شلەژاوییەوە جوابی دایەوە گوتی: کاکە ئێرە(کەسنەزان)ە هۆیەکمان ماو هەستمان بەبێ ئومێدیەکی زۆرکرد جا زانیمان کەهەڵەیەکی کوشندەمان کردووە!.

کەسمان لە کەسنەزان نەدەناسی وهیچ شارەزاییەکیشمان لەسەر کەسنەزان نەبوو بەڵام دەمانزانی چەکداری رژێمی زۆر تێدایە،کات زۆردرەنگ بوو لەبەرژەوەندی ئێمەدا نەبوو،زۆریشمان برسی بوو،یەکسەر بڕیارماندا بگەرێینەوە بۆبنەسلاوە.

دەوری بنەسلاوە رەبایەی رژێمی زۆربوو،بە پاریز وەرگرتن وبە نهێنیەکی زۆر چووینە ناو بنەسلاوە وە .

تاریکی شەو بەرەو نەمان دەچوو کەلەشێرەکان دەستیان بە قوولە قوول کرد،پێیان دەگوتین: ئەوە بەیانییە ئەوجا چی دەکەن خێراکەن زوو خوتان دەربازکەن.

نەمان دەزانی چیبکەین،سەرمان لێشێوابوو(ماڵێکی ناسیاو)مان بونە دەدوزرایەوە، کاك سلمان چاوی بەعارەبانەی تراکتۆرێك کەوت،گوتی ئەوەماڵی ئێمەیە، زۆردڵخۆش بووین بەڕاکردن بۆلای چووین،بەداخەوەهەونەبوو،دڵمان ساردبوەوە، هەریەکەو رایەکمان هەبوو،کاك عوسمان گوتی بابچینە ماڵێك و هەموویان بە بارمتە بگرین تاکوئێوارە رێگایان نادەین بچنە دەرەوە و هاتوو چوبکەن،من پێم باش نەبوو ، زۆر قورس لەسەرمان دەوەستا..

گوتم بەیانی کەشف دەبین لەلایەن جیرانەکانیانەوە،دنیا دەهات رووناکتردە بوو کەلەشێرەکان لە قوولە نە دەکەوتن.گووتم تازووە بادەرچین بەرەو هەڵەتەکانی پشت بنەسلاوە،زۆر هیلاك و برسی بووین.بەڵام هیچ دەرەتانێکی ترمان نەبوو، جارێکیتر بەپارێز وەرگرتن وبە نهێنی خۆمان لە هێڵی دووژمن لە(زنجیرە رەبایەکانی دەوری بنەسلاوە)دەربازکرد،بەهۆی هیلاکی زۆرمان رێگاکە لەبەرمان نەدەرۆیشت ، بەڵام هەرنەوەستاین و بەردەوام بووین لە رویشتن و تاریکیش پشتی تێدەکردین و رووناکیش بۆ ئاشکراکردنمان دریغی نەدەکرد،رێگاکە بەناو بەستەکدا دەرۆیشت ورێگای سەیارەبوو،نەشارەزابووین ونەشوێنێکمان شك دەبرد بۆخۆحەشاردان، رویشتین تاگەیشتین بەهەڵەتەکان. لەدوڵێکی بچووك لاماندا،کەیەکەشاخێك لەدوڵەکە هەبوو لەوێ دانیشتین بۆپشوودان.هەر لەسەر رێگاکە پاڵ کەوتن،لەبن گەرەشاخەکە کۆڵەپشتەکەم داناو خۆم کردەوە.دنیا بەتەواوی روون بۆوە،بەڵام هەوربوو وردە وردە دەی پروشاند. ئەوەندەی نەبرد چەن شوانێك لە دەورو بەرمان پەیابوون،کاك

عوسمان و برادەرانی تر کە لە خوارمنەوە بوون ئەوانیش شوانەکانیان بینی،کاك عوسمان گوتی دەچمە لایان و بزانم نان و چایەکیان لا دەست ناکەویت؟گوتمان باخۆمان نیشانیان نەدەین و نەچینە لایان بەلام کاك عوسمان دیاربوو برسیەتی وچای نەخواردنەوە زۆری بۆهینابوو،گوتی نا هیچ نیە ودەچم،یەکێك لەشوانەکان لەپشت منەوە راوەستابوو.. قسەم لە گەلی دەکرد ، لە ناکاو گوتی وەلا ئەوا حکومەت هات،ئاورم دایەوە بینیم لەخوار ئێمەوە چەند سەیارەی لاندکروزەر و قەمەرە و تەکسی وەستان و چەکداریان لێدابەزی..وابزانم وایانزی ئێمەش هەر شوانین ! یەکسەر گوتیان : راوەستن ئێوە کێن..؟

یەکسەر تەقەمان لێکردن،چەکدارەکان ..بلاوەیان کردو خویان خستە پەنا سەیارەکانیان،ئێمە دەبوو زوو خۆمان رزگاربکەین،چونکە ئێمە وامان مەزەندەدەکرد پاش ماوەیەکی.کەم هەرچی کۆپتەرو هێزی حکومەتە دێنە سەرمان،هێشتاش بەیانییە ونزیك سەعات( )ی پێش نیوەڕۆیە،کاك عوسمان هاواری کرد گوتی خێرا پاشەکشە بکەن وئاودیوبن لەو گردەی پشتمان،کاك عوسمانەسور خۆی حمایەی کردین و هەربە پێوە شەری دە کرد تاکو لەگردەکە ئاودیوبوین،بەلام هەزاران گوللە لەبن پێمان لە بەردەکانی دەداو دەتەقینەوە، کە ئاودیوی گردەکە بووین بە دوای یەکەوە بەرە وروژهەلات رامانکرد،چەند رەشمالی مەردار کەوتنە سەرریگامان. سەرەرای ئەوهەموو ماندووبون و ترسە کومەلێك سەگی درِ تێمان ئالان، لێمان نەدەبوونەوە، ئێمە گوێمان پیٚ نەدان و بەردەوام بووین لە ڕاکردن بی ئەوەی بزانین بۆ کویٚ رادەکەین،دەمانویست زۆرترین ماوە ببرین،بۆئەوەی ئەگەرهێزی زیاتریش بەدواماندا هات و شەرِمانکرد.. شەرەکە تاخیربکەین،لانیکەم بیخەینە پاش نیوەرِو. زۆر هیلاك بووین و برستمان لیٚ برا،هەربەرێکەوت گەیشتینە شوێنێك لەدولێك

کەندڕی قول وداپوشراو بە داروبار بوو، پشومان دا..کاك عوسمان گوتی بابڕۆین و بەردەوام بین،گوتمان باشە،بۆ کویّ بڕوین؟

زیاتر بڕۆین دەگەین بەجادەی بێستانە ئەویش هەمووی ڕەبیە یە، با لێرە دامەزرین و خۆمان ئامادەی شەڕی مان ونەمان بکەین،هەروامان کرد،لە کوندرە قوولەکان دامەزراین و بڕیارماندا کەسمان تەقە نەکەین تاکو دێن پێمان لێدەنین،ئنجا تەقە بکەین تادوا فیشەك،داستانێك تۆمار بکەین.ئیتر خۆ-ان لە بۆسە ناو چاوەڕوانی هاتنی دوژمن بوین، کات بووە سەعات یەکی پاش نیوەڕۆ،لەبەرزاییەکانی پێشمان سەری نەفەربەدیارکەوتن.بەهەموو ئەوچەکانەی پێیان بوو  دە ستیان کرد بە تەقە کردن ، تەقەیەکی یەکجار زۆر. تەقەیان بە هەموو دۆڵەکان ودارو بەردەکانەوە دە نا، ئێمە هەرنە جولاین ودانمان بەخۆمانداناو سەرەڕای گزو هوڕی گوللەکان بەسەر سەرمانەوە،بەڵام ئێمە بڕیارمان دابوو تاکو نەگەسەرمان تەقە نەکەین...

نازانم بە ختی ئێمە بوو یان ئەوان، بە دوڵەکەی تەکمان دا ڕەت بوون،کات زۆر لە سەرەخۆی  دەرویشت. دەنگی لێزمەی تەقەوسدای دۆڵەکان دنیای پڕ دەکرد، هەستمانکرد دەنگی تەقە  لە ئێمە دوور دەکەوتەوە( کات)یش پێی هەڵدەگرت، هیوای ژیانش جارێکی تر بۆ ڕوحە ماندو وهیلاکەکان دەگەڕایەوە،دە نگی تەقە نەما، کاتیش بوو بە(٤)ی پاش نیوەڕۆ،ئیتر بە تەواوی لە دوژمن بیّ منەت بووین، خۆر لە ئاوابوون بوو ، حەوت کەسی ماندوو،حەوت کەسی دابڕاو لە ئاوەدانی، دابراو لە هاورێکانیان،جارێکی تر بەرەو بنەسلاوە شۆڕ بووینەوە،ئەگەرچی خۆر لە ئاوابوون بوو بەلام ئومێدی هەلاتنی خۆرێکی تر لە نیو دلەکانمان بوو.

---

* سەرچاوە : فەیسبوکی Jwamer Mhamad

## ناوی هەرحەوت پارتیزانەکە :

1 ـ کاك عوسمان سور

2 ـ کاك توفیق مامە

3 ـ کاك نورالدین احمد رسولْ (شۆرش سێگردکانی)

4 ـ کاك سلمان احمد یارمجە یی

5 ـ کاك تەیب محمد توفیق( برای کاك عوسمان)

5 ـ کاك فتاح ..

7 ـ جوامێرمحمد



پارتیزانی دوای ئەنفال توفیق مامە



نورالدین احمد رسولْ ( شۆرش سێگردکانی )



# پارتیزانی دوای ئەنفال

## زاهیرهمزە سالح حەمەد (هەلکورد)

ـ ساڵی لەدایك بوون : 1959

ـ گوندی ئیلنجاغی گەورە / تەق تەق کۆیە /پارێزگای هەولێر

ـ ساڵی پەیوەندی بەرێکخستن : 1985 کۆمەلەی رەنجدەرانی کوردستان.

ـ ساڵی پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەوە کۆتایی ساڵی 1985

ـ پێشمەرگەیەکی چالاکی تیپی (85) ی دەشتی هەولێر /کەرتی (5)بووە.

ـ لەبەشێك لە قۆناغی پارتی زانی بەشداربووە تا مانگی (1)ی ساڵی 1989

ـ دواتر دابڕاوە بەڵام هاوکاری پارتیزانەکانی کردوە بە بردنی خواردن و پێداویستیەکانیان. ناوبراو بەشداریەکی کارای کردووە لە ڕاپەرینە مەزنەکەی ساڵی 1991 بەڵام بەداخەوە لە 1991.3.31 لە سنوری ناحیەی دیبەگە لەگەڵ ژمارەیەك لە خزمانی ئیلنجاغی شەهید دەبن و دەگەنە کاروانی نەمران.

ـ بەشداری لەم داستان و نەبەردی وچالاکییانە کردووە :(ئیلنجاغ . تەق تەق . دێگەڵە . سەری رەش . سەرگەلو بەرگەلوو. چەندین نەبەردی تر .

ـ حەوتەمین شەهیدی بنەمالەکەیەتی.

. لە سەرەتایی راپەرین پەیوەندی بەشانەی بروسك کردوەو دواتر بەشداری راپەرینی کردووەو

ـ بۆتەوە پێشمەرگە لە بەتالیۆنی 3ی زورگە زراو لای کاك جلال ئیلنجاغی .

ـ ئەم هەڤاڵانەی لەگەڵ شەهید بوون :

(جلیل حەمەد سالح . شێرکۆ ئۆمەر وەسمان ،معروف کریم باداوەیی.



# پارتیزانی دوای ئەنفال

## جەلال خورشید (جەلال ئیلنجاغی)

# بۆئەوەی شان بەشانی پارتیزانەکانی گەرمیان و سورداش و کەرکوك و شارباژێڕ...بەشداری راپەڕین بکەن ...

## پارتیزانەکانی سنووری هەولێروکۆیەو سۆران و خۆشناوەتی و مەخمووریش لەقەندیلەوە بەرەو جەماوەر هاتنەخوارەوە

هەڤاڵ جەلال ئیلنجاغی وەك زۆربەی هەڤاڵەکانی بیرەوەری ویاداشتی سەردەمی پارتیزانی یاداشت کردووە.لەبیرەوەرییەکانی خۆیدا باسی لەوەکردووە.دوای ئەنفال ودامەزراندنی بەرەی کوردستانی وداگیرکردنی (کوێت) لەلایەن (عێراق)ەوە هەلومەرجەکان وایان دەخواست ئامادەسازی بکرێت بۆ راپەڕین،بۆ ئەوەمەبەستە (ی.ن.ك)بڕیاری دا چەندین دەستەی پارتیزانی تر بنێرێتەخوارەوە بۆ سنوورەکانی (سۆران وخۆشناوەتی ودەشتی هەولێر وکویە..)

بۆئەومەبەستە لەبارەگاکانی سەرکردایەتی لە قاسمەڕەش وزەڵێ وناوزەنگ چەندین کۆبوونەوە ئەنجام درا،ئەم هەڤاڵانە ئەرکەکانیان گرتە ئەستۆ:

شەهید تەحسین کاوانی،شەهید مەلاسلێمان،شەهیدجەلال حاجی،هەڤاڵ برهان سەعیدسۆفی، جەلال ئیلنجاغی. مامۆستا باپیر ...

دوای دابینکردنی شارەزا و پێداویستییەکان.. سەدان نامەی مۆر و واژۆکراو بەناوی کاك کۆسرەت و کوێستانی هەڤاڵانی (م.س)ەوە ئامادەکران وبڕیاردرا رێگای سەخت ودژوار بگرنەبەر..

- رۆژی 1991/2/12لە(شێنێ وسونێ)وە،بەرەزگەومارەدوودا،لەبناری (قەندیل)وە بەچاوساغی(عوسمان بچکۆڵ) بەنێوان دەیان بارەگای سەربازی وکێڵگەی میندا..

پاش پترلە(24)کاتژمێر دەگەنە نزیك سەرکەپکانی پشدەرەرەقە,پاش پشوودان و خواردنی نانەرەقی ناوکۆڵەپشتییەکانیان..

بەپێی رێنمایی سەرکردایەتی هەڤالان(مامۆستاباپیر وعوسمان بچکۆل)دەکەونە رێ بۆ(سەرکەپکان)بۆلای (ئاکۆی عباس ئاغا) تا ئەوان هاوکاریان بکەن لەوسنوورەوە دەربازبن بۆناوچەکانی خۆیان..بەلام بەهۆی باران ولافاو و کەمین وسەنگەری رژێم لەسەر پردەکان..ئەوشەوە دەگەرێنەوە لای هاورێکانیان لەبناری چیای(کێوەڕەش).

بۆشەوی دواتردەگەنەسەرکەپکان ونامەوراسپاردەکان رادەستی کاك(ئاکۆ)دەکەن و بەرنامەڕێژی دەکەن و عوسمان بچکۆل ئەرکی تەواو دەبێت و لەوێوە دەگەڕێتەوە بۆ(قاسمەڕەش).

کاك ئاکۆدووچاوساغیان بۆدابین دەکات وبەرێیان دەخات بۆ(حاجیاوا)و(کفرەدۆڵ) لەوێ رەتڵی کۆیە جیادەبنەوە وبەرەو(گردجان)بەرێ دەکەون...

باقی هەڤالان بەوشەوەتاریکە ولەژێر رێژنەی باراندا بەناوقوڕو لیتەی ئەودەشتانەدا دەگەنە گوندی(نێوە)و خۆیان دەکەن بە ژێردەوەری چەند ماڵە مەرداریێکدا.....

ئەوانیش جوامێرانە دەیان حەوێننەوە وخواردنیان بۆدابین دەکەن.

سەرلەبەیانی رۆژی دواتر هەڤالان(تحسین کاوانی وجەلال حاجی)و دەستەکانیان بەرەولای شەقلاوە وسەفین بەرێ دەکەون..

- دەستەپارتیزانەکانی هەولێریش لەجادەی هیزۆپ دەپەڕنەوە بەرەو(نازەنین)و لەوێوە لەچیاسەردەکەون بەرەو(سماقولی).

- دوای پشوودان,کاك (بورهان سعیدسۆفی)و(کاك(شێخەباڵەکی)ودەستەکانیان دەرۆن بەرەو زیارەت و گۆمەسپان وبەستۆڕە..

- هەڤالان (جەلال ئیلنجاغی) و(مەلاسلێمان)یش بەرەوپشتی (دێگەڵە) و بناری (دێدەوان)دەکەونەرێ.دەگەنە گوندی(عەلیاوا).لەوێ میوانی باوڕپێکراو ودۆستی

دێرینەیان کاك(سەیدئەنوەر)دەبن,ئەویش بەپەلە ئاژەڵیکیان بۆ دەکوژێتەوە و خواردنی باشیان بۆ ئامادەدەکات و بۆشەوی دواتر لەجادەی گشتی (هەولێر - کۆیە)دەپەڕنەوە بەرەو سنووری کەسنەزان وهەولێر...

لەنزیك کەسنەزان دەچنەماڵی(حاجی خدری مەنتك)و جیهازەکەیان دەخەنەوەکارو پەیوەندی بە کاك(کۆسرەت) و سەرکردایەتی یەوە دەکەن وپێی رادەگەیەنن کە بەسەلامەتی گەیشتوونەتە سنووری(هەولێر).

- جیهاز وکەلوپەلی زیادەیان لەوێ بەجێ دەهێڵن و هەڤاڵ (مەلاسلیمان)ودەستەکەی بەرەوسنووری پیرزین وشاویس دەکەونەرێ و هەڤاڵ(جەلال ئیلنجاغی)ودەستەیەك بەرەولای رۆژهەڵاتی هەولێردەڕۆن و کاك (ئازادمەخمووری)و(نەریمان ساڵەیی)و (رێکخەرعبدالله)بەرەوناوچەکانی شەمامك ومەخموور..

(جەلال ئیلنجاغی)ودەستەکەی لەگوندی (شاهۆمەر) لادەدەن ودەچنە ماڵی کاك (مارفی محموودرەوشەن) خۆی و کوڕەکانی زۆر هاوکارییان دەکەن..

لەوماوەیەدا تا راپەڕینی جەماوەر لەسنووری هەولێر,ئەم هاوکارانە دڵسۆزانە هەم دالدەی پارتیزانەکانیان دەدا,هەم بازنەی پەیوەندی نێوان پارتیزانەکان و شانەچەکدارەکان وناوشاریش بوون:

(حاجی خدرکەسنەزان)و(حاجی محموودمەنتك)و(مام ئەمیر)و (مامۆستاتاهیر)و (کاك همزە وکاك عباس وکاك قەرەنی شاخەپیسکە)و(کاك کاك فەرحان وکاك کەنعان)و(حسنی خدرقازی)و(کاك محمدهەینی)..

لە1991/3/11 لەگەڵ گەیشتنی هێزی پێشمەرگە لەسنووری کۆیەو شەقڵاوە وە بەسنووری شاری هەولێر

شاری(قەڵاومنارە)یش بەهاوکاری پارتیزانەکان و شانەچەکدارەکانی (بروسك) راپەڕین و پایتەختی ئۆتۆنۆمی کارتۆنی روخاوهەولێریش ئازاد بوو.

# ناوی پارتیزانەکان:

**سنووری رۆژئاوای هەولێر**

1 ـ بورهان سەعیدسۆفی(لێپرسراو)

2 ـ شەهید نەوزاد کۆیی

3 ـ ئەکرەم یوخسری

4 ـ فەتاح حەسەن

5 ـ دلێر

6 ـ محمدسوڵتان تەکەوری

**سنووری شەقڵاوە**

1 ـ شەهید تەحسین کاوانی(لێپرسراو)

2 ـ جەلال سۆرکانی

3 ـ ئەسعەد دۆرەیی

4 ـ کاوە ئاقوبانی

5 ـ بەشدار

6 ـ بەڵێن

**سنووری رۆژهەڵاتی هەولێر و مەخموور**

1 ـ جەلال ئیلنجاغی (لێپرسراو)

2 ـ شەهید تاهیر بەکر

3 ـ مامۆستا کاوە ئەنوەرنادر

4 ـ ئەحمەد عبدالله ئیلنجاغی

5 ـ محمدکریم (محمد بانیمارانی)

6 ـ امیر باپیر حەوێز(مام امیر شاخەپیسکەیی)

7 ـ عبدالواحد محمدعبدالله مەخمووری (ئازۆ)

8 ـ بەهرام عبدالله مامە(ڕێکخەر)

9 ـ نەریمان ساڵەیی

<u>سنووری بەستۆرە و بەحرکە</u>

1 ـ <u>شەهید مەلاسلێمان</u> (لێپرسراو)

2 ـ صالح محمدامین(صالح هەولێری)

3 ـ محموود(خاڵەخولە)

4 ـ کاکەشیخ چۆمانی

5 ـ سەید محمد

6 ـ ئازاد عبدالله تەها

7 ـ سۆفی حاجی

<u>سنووری سۆران</u>

1 ـ شەهید جەلال حاجی (لێپرسراو)

2 ـ شەهید مام شوان

3 ـ کاوە حەبیب

4 ـ حسین حسن حسین (هەڵۆ حەسەن)

5 ـ شەهید سیسۆ عزیز معروف (خاڵەسیسۆ)

6 ـ سەید ڕەسول

7 ـ هەڵمەتە ڕەش

8 ـ شەهید فەرهادماوانی

9 ـ مەلا وەسمان

10 ـ عبدالقادرئاوبەرکەیی

11 ـ شەهیدغەفوور سەرانی

12 ـ ئامانج رسول قادر

13 ـ شەهید شوان سیسۆ

**سنووری کۆیە**

1 ـ باپیر وەیسی (مامۆستا باپیر) لێپرسراو

2 ـ ئاشتی صابیر میرە

3 ـ شەهید کامەران احمد

4 ـ صباح بەکرمەلا

5 ـ مەلاجەمال حاجی علی

6 ـ شەهید فریاد قەسرۆکی

7 ـ محمدحسن عمر(حەمە هەڵدێن)

8 ـ خدر (مامۆستازیرەك)

9 ـ بورهان سەلام شەوگێری

10 ـ شەهید شێرکۆ حەسەن

11 ـ دڵزار علی حەمشین

**تێبینی : هەندێ لەم هەڤاڵانە پێشتریش بە پارتیزانی هاتبوونەخوارەوە...**

* سەرچاوە: بیرەوەریەکان جەلال ئیلنجاغی



# پارتیزانی
# دوای ئەنفال
# شەهید خاڵەسیسۆ

- شەهید سیسۆ عەزیز مەعروف (خاڵەسیسۆ)

لە1965لەخێزانێکی شۆڕشگێڕی گوندی(بنمێردە)ی(رواندز)لەدایك بووبوو.

- ساڵی 1980 پەیوەندی بە(کۆمەڵە)وە دەکات.
- ساڵی 1982 دەبێتە پێشمەرگە لە تیپی 12ی سۆران.
- بەشداری دەیان نەبەرد وچالاکی دەکات..
- دووجاران برینداردەبێ.
- برایەکی بەناوی خالیدعزیزمعروف(خالیدەڕەش) شەهید دەبێت.
- دواپلەی (فەرماندەی کەرت) دەبێ لە تیپی 12ی سۆران .
- بەشداری شەڕەکانی بەرگری لەهێرشی ئەنفال دەکات..
- بەخێزانەوە ئاوارەی کوردستانی رۆژهەڵات دەبێت.
- لەساڵی 1990لەیادی هەڵەبجەوئەنفالدا بەچەندسروودێك بەشداری کرد..
- لە 12 /2/ 1991 لەگەڵ چەند دەستەیەك لەپارتیزانەکانی سۆران وشەقڵاوە و هەولێر وکۆیە دەگەڕێنەوە سنووری خۆیان.
- رۆڵیان دەبێت لە دروستکردنی شانەچەکدارەکان و ئامادەسازی بۆڕاپەڕین.
- لە راپەرینە1991دا بەشداری رزگارکردنی چەندین شار وشارۆچکە دەکات.
- لە1991/3/20 دا لەهەڵمەتی رزگارکردنی کەرکوك دا لە(عرەفە)شەهیددەبێت.



# چاوپێکەوتنی
# گۆڤاری ڕێبەری پێشمەرگە
# لەگەڵ پارتیزانی دوای ئەنفال مامۆستا کاوە نادر دا

**چۆن و چ کاتێك هاتنە خوارەوە؟**

دوای وەستانی شەڕی ئێران عێراق شۆڕی گەلەکەمان لە کوردستانی عێراق کەوتە قۆناغی سەخت و دژوار بە شێوەیەك کە ئیتر هێزی پێشمەرگەی کوردستان نەیدەتوانی ناوچەی ئازادکراوی هەبێت و درێژە بە شەڕی بەرەی بدات بۆ پاراستنی ناوچە ئازادکراوەکانی،بۆیە سەرکردایەتی (ی.ن.ك) بڕیاری دا درێژە بە خەبات بدات بە شێوازی شەڕی ...پارتیزانی بۆئەو مەبەستە مەفارزی پارتیزانی بۆ هەر ناوچەیەك تەشکیل کرا ڕە تلّی پارتیزانەکانی هەولێر بەسەرکردایەتی (شەهید ڕێبان) بوو منیش ئەو کاتە وەکو کادرێکی تیپی 85ی هەولێر بڕیارمدا لەگەڵ مەفرەزە پارتیزانەکان بمێنمەوە ئەم هەڵوێستەشم لەو بڕوایەوە بوو گەلەکەم زۆر پێچوویستی بەوەیە کەوا پێشمەرگە مەیدانەکە چۆڵ نەکات و لە درێژە پێدانی خەبات نائومید نەبێت ئەوە بوو لە 22/ئابی/1988 بە چەند ڕۆژێك بەر لەوەی مەڵبەندی سێی هەولێر بکشێتەوە بۆ سەر سنوور و ڕەتڵی پارتیزانەکان لە خەتی دۆڵی بالیسان بەڕێکوتن بەرەو دەشتی هەولێر،تیپەکەی ئێمە یپی 85 تەقەمەنیەکی زۆری لە فیشەك و ڕومانەو ئاربیجی و گوللە تۆپی پێ سپێردرابوو لەگەڵ خۆمان

بیبەینە خوارەوە کە باری (30) سی ولاّخ ئەبوو، لەبیرمە دەمەو عەسرانێك تیپەکەمان بۆ پەڕینەوە لەسەر جادەی کۆیەـهەولێر لە پشتی شێخەروان لەگەڵ هێزەکەی 21ی کەرکوك یەکمان گرتبووەوە کو مام ڕۆستەم لێپرسراویان بوو ئەمانویست بۆ ئێوارەکەی مشوری پەڕینەوە بخۆین هەرچەند سەیرمان ئەکرد لە بە ر چڕی و قەرەباڵغی هێزەکانی دوژمن نەماندەزانی شەو چۆن بپەڕینەوە ئەوە جگە لەوەی ئەو ناوچەیەی کە بۆی دەچووین هەتا چاو بڕی دەکرد هەر جەیش و چەکداری جاش بوو کە لەم بەدەشتەدا ئەوەی دەتبینی تۆزی سەیارەی دوژمن و دوکەڵی سوتاوی دەغڵ و دانی جوتیاری هەژاری کورد بوو،بەڕاستی دیمەنێکی ناخۆش و پڕ لە نیگەرانی بوو،هەر ئەو کاتە گوێم لە پێشمەرگەیەکی هەولێر بوو دەیگووت ئای دەشتی هەولێر بۆن خوێنت لێدێت،بۆ شەوەکەی درەنگانێك پەڕینەوە بۆ بەرەبەیانییەکەی گەیشتینە گوندی داربەسەر و تەقەمەنییەکانمان لەوێ شاردەوە بۆ بەیانییەکەی دوژمن گەیشتە سەرمان بە ڕادەیەك نزیك کەوتنەوە خەریك بوو تێکەڵبین ئەو ڕۆژە تا ئێوارە دوژمن لە دیار سەر ودەوروپشتمان بووبەرێکەوت ئاشکرانەبووین و لە ناو نەچووین.

چە ند جێگەی حەشارگەتان هەبوو وە کەوتبوونە کوێوە؟

ئێمە وەکو مەفرەزە پارتیزانەکان هیچ حەشارگەیەکی دائییمان نەبوو بەڵکو لە هەر شوێنێك گونجاو بووایە ئەماینەوە چونکە نەمان دەتوانی وەکو جاران بارەگامان هەبێت لەشوێنێکی زانراوو ئاشکرا لەبەر ئەوەی دوژمن بەردەوام لەناوچەکە بوو ڕۆژانە دەی پشکنی تەنانەت زۆرجار شەوانیش دەمانەوە بەڵکو ئەبووایە بەڕۆژ خۆمان حەشار بدەینو خۆمان بپارێزین لەئاشکرابوون ئەویش بەمانەوەمان لەشوێنی نزیك جادەکان هەندێك جار مانەوەمان لەنزیك ڕەبیەکان ولەشوێنێك کەکەمتر گومانی بوونی ئێمەی لێبکرێت . بە بی دە نك و جولە ئە ماینە وە تائێوارە

دادەهات . لەو شوێنانە ئەبوو قسەنەکەین ئاگرنەکەینەوە یان ئاگری بێدوکەڵ بکەینەوە ئینجا ئەبووایە هەرمەفرەزەیەك لەچوار پێشمەرگە تێپەڕنەبێت . ئەمە ژیانمان بوو لەودەشتودەرە بۆبەهارو پایز .

بەلام بەڕاستی لەزستان و هاوینەکەیداله بە رگەر ماڵەقوڵتیك یا لە کوندرێك دا یان بەسەرمای مانگی 1و2 لەشوێنە نسارەکاندا بێ ئاگری و بی پەنایی یەگجار زەحمەت بوو زۆرجار وابوو لەبەیانیەوە هەڵە رزیوین یان لەگەرمای هاویندا بێتاقەت دەبووین .

- بۆماوەی چەند ڕۆژ لە شوینیکدا ئە مانە وە ؟

ماوەی مانەوەمان لەکەم شوێندا لەڕۆژێك و دووڕۆژ تێپەڕی ئە کرد چونکە مەترسی ئەوە هەبوو کەلەدورەوە چاودێری کرابین بۆیە زۆر جێبرکێمان دەکرد تاوەکو دوژمن ئاشکرامان نەکات تەنانەت زۆرجار نەمان دەتوانی بەسەر ڕێگاکاندا بڕۆین. چونکە دوژمن شوێن پێی هەڵدەگرتین بۆیە ئەبووبە تەنیشت ڕێگاو بەناودرکو داڵدا بڕۆین بۆئەمەش پێویستمان زۆربەپێلاو بووبوویە بەردەوام بیلاو لەکولەبشتەکانماندا بوو چۆن خواردنتان بۆدابین دەکرا؟ بۆدابین کردنی خواردن هەمیشە ڕێگای دورمان ئەبڕی چونکە ئاوەدانی نەمابوو جگە لە شارە گەورەکان و چەند شارۆچکە و دێیەکی زۆر نزیکی شارەکان یان نزیکی جادەکان نەبێت،ئێمە ئێواران کاتێك لەو شوێنانەی لێی بووین دائەبەزین لە ئێوارە تا درەنگی شەو تا دەگەیشتینە ئاوەدانی زۆر جار ڕێگەی چەند سەعاتیمان دەبڕی بۆئەو شوێنانە کەچی لەبەر کەمین جاری وا هە بوو بە برسیتی دەگەڕاینەوە بۆ نمونە لە حاجی وسوی ڕۆژهەلأتی هەولێرەوە بەڕێدەکەوتین بۆ دەواجنەکانی هەولێر لەوێ نانمان دەخوارد و لەگەڵ خۆمان نانی ژەمێکمان دەخستە ناو کۆڵە پشتەکانمان چەندین جار لەبەرئەوەی زستانەکەی لە

ئێوارەوە تا بەیانی باران بووە چەن جار جل و کۆڵە پشتەکانمان تەڕ دەبوو نان و پێخۆریشمان بەکەڵکی خواردن نەدە هات .

- به چ بڕوایەکەوە مانەوە و دریژەتان بەو شێوازە سەختەی خەبات دا؟

ڕەنگەگەلێك کەس پێی وابێت ئێمە وەك مەفرەزە پارتیزانەکان لە وانەیە لەژێرزەمینی ڕێکخستنەکانی شاردا یاخود لە ناوچەیەکی سەختی دورە دەستی ڕژێمدا بارەگامان هەبووبی بێئاگا لەوەی کە ئێمە لە سەختترین هەل و مەرجدا ژیاین و ئیعتیمادمان کردە سەر ئیرادەی خۆمان و دڵسۆزی و هاوکاری ئەو دۆستانەشمان کە لە دەوروبەری شارەکان بوون لەم بارەیەوە ئەگەر هەندێك کەس زانیاریشی نەبووایە ناحەقی نییە چونکە نە شەهیدڕێباز ما ئەو مێژووە بنوسێتەوە نە کەسیکیشمان لەو مەفرەزەیە بیرەوەرییەکانمان نوسییەوە تاوەکو گەلەکەمان بزانێت پێشمەرگەکانیان ئەویٚ ڕۆژیٚ چەندە بە خۆڕاگری ژیان چ زروفێکی سەخت و دژواریان تێپەڕاند و جۆن چوونەوە بەگژ موستەحیلدا و چۆن توانیان وەکو تروسکەی ئومێدی گەلەکەمان بمیننەوە و ڕێگا نەدەن دوژمن کوردستان تەعریب بکات وەکولەبەرنامەیدابوو،لێرەدا قسەی دەستەکەمان بەنمونە دێنمەوە بۆ سەلماندنی سەختی ئەوماوەیەی مانەوەمان دوای گەڕانەوە بەبڕیاری سەرکردایەتی لەدۆڵی باڵەبانی بناری قەندیل ڕۆژێك یرادەران ئیسراحەتیان کردبوو خەوتن گوێم لە پێشمەرگەیەکی خۆمان بوو ووتی ئۆخەیش خۆ ئەمرۆ خەوتین و گوێمان لە دەنگی تەقە نەبوو ئەمە بەڵگەبوو بۆئەوەی کەوا بە درێژایی14چواردە مانگ ڕۆژێك نەبوو دوژمن لەلایەك یان چەند لایەکەوە نەگەڕێت بەدوامانداو گوێمان لەدەنگی تەقە نەبێت شەوانی زستان زۆربەی جارەکان لەبەرئەوەی نوانێکمان نەبوو نەمان دەتوانی بارەگایەکمان هەبێت تاوەکو تیایا بحەوێینەوە بۆیە لە ئیچوارەوە تا بەیانی دەڕۆیشتین تا شەوەکە بگوزەرێت وسەرمامان نەبێت.

- لەو هاتوو چۆیانەتاندا توشی شەڕ هاتوون یا خۆتان لەشەڕ لا داوە بۆچی؟

لەبەرئەوەی ئێمە مەفارزی پارتیزانی چەند کەس بووین و ئەرکی سەرەکیشمان مانەوە بوو نەك شەر و پەلامار بۆیە تەنها هەوڵمان دەدا کە زۆرترین ماوە بمێنینەوە تاوەکو دوژمن نەتوانێت ئەو بەرنامە فراوانەی تەعریب جێبەجێبکات،ڕژێم بۆئەوەی چەندین خێڵی عەشایەری عەرەب بەێنێتە ناوچەکە و جێگیریان بکات و وە ئیدیعای ئەوەش بکات کە شۆرشی کورد بۆ یەکجاری کۆتایی هاتووە بۆئەوەش کە زیاتر زاڵ بێت بەسەر ئیدارەی گەلەکەمان و لە درێژە پێدانی شۆرش نا ئومێدیان بکات یا ڕاستتر بڵێین ئەو بەرنامە فراوانەی تەعریب جێبەجێبکات کە بە دەستیەوە بوو بۆئەو مەبەستانە ئەیویست بەهەر ڕێگەیەك بێت هێزی پێشمەرگە لە ناوببات یان هەر لایەنی کەم لە ناوچەکە نەیان هێڵێت بۆیە دوای ئەو هەموو هەولانە کە ئەیبیستەوە ئێمە نەك هەر ماوینەتەوە بەڵکو شەو نییە دانەبەزینە ئۆردوگاکان و دەوروبەری شارەکان و چۆنیشمان دەنگ و سەدای مانەوەی پێشمەرگە چەندین ئەوەندەی بوونی ئێمە دەنگی ئەدایەوە،ئەمە ئەوەندەی تر دوژمنی هەراسان ئە کرد هەر بۆیە کار گەیشتبووە ئەوەی کە ڕژێم چەند بە ربرسیکی ئە منی و سە ربازی محاسەبە بکات و لابان بدات لە بەرامبەر ئەوەی کە نەیانتوانیوە ئە و مە فرە زانە لە ناو ببەن وە لە ماوەی مانەوەماندا لە یادی سەری ساڵی نوێ مەفرەزەیەکمان بە سەرپەرشتی هەڤاڵ فەرماندە جەلال النجاغی کە فەرماندەی تیپ بوو لە ڕەبییەکانی بەستی شرغەمان داو یادی سەری ساڵی 1989 مان بەو چالاکییە کردەوە.

- ڕۆڵی ئەو کەسانەی کە هاوکاریان کردوون چۆن بوو؟

ئێمە زیاتر سودمان لە هاوکاری ئەو دۆستانە وەردە گرت کە لە دەوروبەری شارەکان بوون وەك ئەوانەی لە ئۆردوگاکان بوون یان لە هەندێك دێی نزیك شار وەك شا هۆمەر یوخسردێی سێۆکە و کۆڕیێ بە تایبەتی هەندێ ماڵە مەڕ لەوەڕێن لە

باخچەو دۆڵی هەنارەو لە دەواجنەکانی ڕۆژئاوای مەصیف وکوری کە بەڕاستی ئەوانە هاوکاری زۆریان کردبن شایەنی هەموو تەقدیرێکن ، ئەوە جگە لەوەی هەندێك لە هەڤاڵان ڕێکخستنمان لە شاری هەولێرەوە چەند جارێك هاتن سەردانیان کردین و دەنگوباسی سەرکردایەتیان بۆ هێناین هەروەها لە شارۆچکەی تەق تەق و دەوروبەری دەستەیەك لە هەڤاڵانی ڕێکخستنی ناو شار کوڕە دڵسۆزەکانی ئەو ناوچەیە چەند جارێك سەردانیان کردین و هاوکارییان کردین،من لەگەڵ داوای لێبووردن کە ناتوانم ناوی هەموویان لێرە بێنم کە بەڕاسی ئەویٚ ڕۆژێ نیشانەی جوامێری و ئەوپەڕی دڵسۆزی بوو نابێت لەم بیرەوەریەماندا هەڵوێستی دڵسۆزانەی خەڵکی ناوچەی بەڕانەتی بە ڕێکخستن و جەماوەرییەوە بەو ماڵە مەردارانەی کە لە ناوچەکەدا بوون لە بیر بکە ین کە ئێمەیان وەکو ڕۆڵەی خۆیان لە باوەش گرت و خزمەتی زۆریان کردین هەر ئەو هاوکاری و دڵسۆزیەی ئەوانیش بوو وای لە ئێمە کرد ئەوەندەی تر خۆڕاگر بین سووربین لەسەر درێژەپێدانی خەبات،سەرەڕای هەمو ئەو گوشار و پشکنینە زۆرەی جەیشی کە ڕۆژانە لە ناوچەکەدا ئەنجامی ئەدا بۆیە جێگەی خۆیەتی بەناوی پارتیزانانی ئەومەفرەزەیەو سوپاس و پێزانینی خۆمانیان پێڕابگەیەنین و ستایشی ڕۆڵیان بکەین کە بەڕاستی نمونەی دڵسۆزی بە ئەمەکیان بۆ تێکۆشەران و نەبەردەکانی ئەویٚ ڕۆژێ پێشکەشکردوو توانیان بەشداربن لە نەخشاندنی مێژوویەکی پڕلەسەروەری گەلەکەمان کەبەیەکیٚ لەقۆناغە سەختەکانی مێژووی خەباتمان دائەنرێت.

- باشە ئەکرا ناوی ئەو پێشمەرگە پارتیزانانەمان پێبڵێن کە تا سەر مانەوە؟

ئەو مەفرەزە پارتیزانانەی دەشتی هەولێر کە تا سەرمانەوە ئەمانە بوون:

1 ـ شەهید رفعت عبدالله (ڕێبان) لێپرسراوی ڕەتڵ

2 ـ شەهید سلیمان عارب (مەلا سلێمان) جێگری ڕەتڵ

3 ـ شەهید وشیارعبدالکریم    لێپرسراوی رێکخستن

4 ـ شەهید هاشم عمر (هاشم جیهان)    ف.ت

5 ـ جلال خورشید (جەلال النجاغی)    ف.ت

6 ـ مامۆستا بێستون خدر    لێپرسراوی رپێکخستن

7 ـ بوورهان سعید سۆفی    ف. تیپ

8 ـ کاوه نادر (مامۆستا کاوە)    رابەر سیاسی

9 ـ شەهیدئاسۆنوری سابیر ( ئاسۆ معلم)    ف.ك

10 ـ رحمان عوسمان حمد    ف.ك

11 ـ احمد خدر احمد    ف.ك

12 ـ نامق احمد خدر    ف.ك

13 ـ مامۆستا ابووزێد تەها    کادر

14 ـ رەنجدەر فتاح    کادر

15 ـ عباس حمدامین    ج.ك

16 ـ ئیدریس صالح    ج.ك

17 ـ غازی عدۆ حبیب    ج.ك

18 ـ احمدعبدل النجاغی    ف.م

19 ـ ئازاد محمد    ف.م

20 ـ غەوسە جەلال    عدد جیهاز

21 ـ شەهید محمدتاهیر محمدسوسەیی    ف.م.

**دەکرێ باسی چەندحاڵەتێکی ناخۆشی ئەو رۆژگارانەمان بۆبکەی ؟**

بێ گومان لەماوەی مانەوەماندا حالەتی ناخۆشیمان زۆربینی کەلێرەدا ناتوانم هەمویان باس بکەم ، تەنها ئەو حاڵەتانە نەبێت کە زۆر نیگەرانی دەکردین ، یەکێك

لەو حالەتە ناخۆشنە تەسلیم بوونەوەی ئەو پێشمەرگەو فەرماندانەبوو کە ڕەفیقمان بوونو کەلەگەڵمان بوون کاتێکمان ئەزانی جێیان هێشتوین و لەشەرمی ڕووان نەیان دەگوت تەسلیم دەبینەوە جائەوانە هەندێکی لەتیپەکان و سنورەکانی تربوون و هەندێکی تریشیان لەسەرسونورەوە ئێمەلەڕێگەی خەڵکەوە هەواڵیانمان ئەبیستەوە بەرامبەر هەندێك کادرو فەرماندەیان توشی سەر سوڕمان دەبووین و دەمانکوت چۆن دەبێت ئەوانە تەسلیم ببنەوە بەلرم ئەوەی لەهەمووی زیاتر بێزاری دەکردین هەندێ کەسی ڕیزەکانی خۆمان بوون کەچوبوونەوە و خیانەتیان کردبوو بووبوون بەچاوساغی دوژمن وتەعقیبی ئێمەو ئەوانەشیان دەکرد کەهاوکاری ئێمەیان دەکرد ، یان کاتێك هەواڵی شەهید کردنی تێکۆشەران و ئیعدام کردنی ڕێخستنەکان و ڕەمی کردنی دەستە دەستەی لاوو خەڵکی بێتاوان و ئەنفالکردنی خەڵکان و تەخت کردنی شارو شارۆچکە کانمان دەبیست، بە ڕاستی ئەوهەواڵە ناخۆشانە وای لێدە کردین هەندێك جار بڵێین باپرسیاری دەنگوباسەکان نەکەین بۆئەوەی چیتر هەواڵی ناخۆش نەبیستین ، حاڵەتی تری ناخۆش زستانی سەختی ساڵی 1989 بوو ئێمە لەبر ئەوەی نوانێکمان نەبوو لەچیاکانیش نەبووین تاکو بچینە ئەشکەوتێکەوە بەڵکو لەم دەشتە تەنها چارەبەك ئەوە بوو لەئێوارەوە بڕۆین تابەرە بەیان ، بۆئەوەی هەم جێگۆڕکێ لەشوێنەکانمان بکەین هەمیش نان پەیدا بکەین هەمیش بەم ڕۆشتنە سەرمامان نەبێت شەوانی زستان زۆر جار لەئێوارەوە بەڕێگاوە چەندین جار گیانمان تەڕدەبوو ، ئەوەی زۆر ناخۆش بوو ئەوە بوو ئە و خواردنە ی پەیداشمان دەکرد لەبەر باران بەکەڵکی خواردن نەدەهات ، حاڵەتێکی تر چونکە بەردەوام دوژمن بەدواماندا دەگەڕا وەنەبێ هەرلەیەك لاوەبەڵکو لەچەندین لاوە ناوچەکانی دەپشکنی و زۆر جار شەوانیش دەمایەوە ، پشکنینەکانی دوژمن هێندە زۆر بوون وای لیهاتبوو نەمان دەزانی بچینە کوێ وکوێ بێشکە بۆمانەوەمان

چونکە دوژمن دەهاتە هەموو شوێنێك وای لێشهاتبوو دەمانگووت خۆو بەخت ئێمە یە سەدان جار کەوتینە ناو ئابلۆقەی دوژمن بە دەیان جار بە چەند مەتر نزیك بووینەوە بە ڕاستی ئیختیفاکردنمان هونەری تیا نە مابوو تەنها ئەوەندە هەبوو بەرێکەوت ئاشکرا نابووین و لە ناو ناچووین ، یان کە ئە چوینە لای هەندێك خەڵك لە ئۆردوگاکان و لە دەوروبەری شارەکان کە ئەیانبینین لێمان ئەترسان و تکایان لێدەکردین کە جارێکی تر نەچینەوە بە لایاندا چو نکە ئە ترسان ڕژێم ئەنفالیان بکات.هەندێ جاریش خەڵك پێیان ئەوتین ئێوە کەوڵتان بە قیمەتە دوایی بۆمان دەرکەوت کە ئەوان بۆچی وایان پێدەگوتین چونکە ئەو خەڵکانە بەشێکیان ڕژێم بە تایبەتی بۆئەوەی ئیزندابوون تا لە ڕێگەیانەوە بتوانێت زانیاری لەسەر ئێمە کۆ کاتەوەوە و لە فرسەتێکدا لە ناومان ببەن بۆئەو مەبەستە مەبلەغی زۆری تەماحی خستبووە بەردەمیان لەبەرامبەرگرتنی هەر پێشمەرگەیەك بەڵام خۆشبەختانە هیچکام لەوانە فریوی دوژمنیان نەخواردوو زیانیان بە ئێمە نەگەیاند.

باشە ئێستا باشوور ڕزگاری بووە؟جارجار ئێوە ناچنەوە بۆ بینینی شوێنەکانتان ،کەسەر دانیان دەکەیت هەست بە چی دەکەیت؟

ئێستا هەست بە شانازییەکی گەورە دەکەم کە گەلەکەم ڕزگاری بووەو هەنگاوی باشی ناوە وبەرەو بەدیهێنانی مافەکانی بێگومان بە دیهێنانی ئەم دە ستکەوتانە بەری ڕەنجی خوێنی شەهیدە نەمرەکانمان و تێکۆشەرانی گەلەکەمان بوو بە پارتیزانەکانیشەوە بۆیە ئێمە نەك هەرجارەدەچینەوە ئەوناوچانە و سەردانی ئەو شوێنانە دەکەین بەڵکو زۆر جار بە خەیاڵیش و بە خەونیش دەچینەوە ئەو ڕۆژانە ، چونکە بەڕاستی ئەو ڕۆژانە لە مێژووی کورددا دەگمەنن و کەم وێنەن ئەگەرچی تا ئێستاش وەکو پێویست گرنگی بەو قۆناغە نادری وئە و میزووە وەکو یەکێك لەسەروەرییە گەورەکان نایخوێندرێتەوە

ئەگەر تا هیزی بیشمه رکه ی کوردستان هەموو سەروەرییەکانی لێوەربگرییەوە بە تەنها سەروەری مانەوەی پارتیزانەکانی دوای ئەنفالەکانی بەسە هەتا هەتایە شانازی پێوەبکات چونکە هەر تەنها مەگەر پارتیزانەکان خۆیان کە لە ناو واقیعدا ژیاون بزانن قۆناغەکە چەند سەخت و دژواربوو چ باوەڕو خۆڕاگری دەویست بۆیە هەست بە شانازیەك دەکەم کە شەرەفی خەباتی قۆناغێکی هێندە کارەسات بارو پڕ لەنائومێدی گەلەکەمان پێبڕاوە،کەمیللەتەکەم ئەویٚ ڕۆژیٚ زۆرپێویستی بەوشێوازە خەباتەی ئێمەبوو لەتەنگانەدابوو ئێمەش لەمەیدانەکەدا ماینەوەوجێمان نەهێشت.

لە کۆتاییدا ئەگەر شتێکت هەیە بیڵی ؟

سوپاس بۆ هەموو ئەو دڵسۆزانەی کە ئەرك و شەو نخونیان لەگەڵ کێشاین کە بە هاوکاری کردنمان زۆرجار گیانی خۆیان خستە مەترسییەوە سوپاس بۆ ئەوانەی باوەشیان پڕ لە میەر و وەفا و دڵسۆزیان بۆ ئێمە کردووە و لە کەس و کارەکانمان زیاتر بە هانامانەوە هاتن . من نازانم بە چ زمانێك باسی دڵسۆزی و هەڵوێستی پڕ لە جوامێری ئەو خەڵکە بە ئەمەکە بکەم تەنها هەر ئەوەندە دەڵم کە ئێمە ئیلهاممان لە خۆشەویستی و وەفاداری ئێوە وەرگرت بۆ گەل و نیشتیمان بۆیە توانیمان بچینەوە بەگژ مستحیل داو قۆناغێك لەمێژووی میللەتەکەمان تێپەڕێنین کە دەگمەنە لە دژواری و داوای لێبووردنتان لێدەکەم کە نەم توانی ناوی یەکەبەیەکەتان بێنم هیوادارم بتوانم لە نامیلکەیەکدا ناوی هەمووتان بێنم وەك حەقی خۆتان و بچوکترین پاداشت لە بەرامبەر دڵسۆزیتان.

## مانەوەی مەفرەزە پارتیزانەکانی دوای ئەنفالەکان*

بێگومان لە مێژووی خەبات و تێکۆشانی گەلی کوددا زۆر داستان و نەبەردی پرلە سەروەری هەن کە مایەی شانازین. یەکێك لەو سەروەریانە مانەوەی مەفرەزە پارتیزانەکانی دوای ئەنفالەکانە کە پێموایە نەبەردی و خۆڕاگری لەم شێوەیە نە ك

هە ر لە میژووی گە لی ئیمە دا بگرەلە مێژووی گەلانی دنایشدا نمونەی کەم بێت چونکە ئەو پارتیزانانە ئەویَ ڕۆژیَ لە قۆناغێکی هێندە کارەساتبار و پڕلە نائومێدیدا مانەوە کە مەگەر هەر پارتیزانەکان خۆیان کە لە ناو واقیعەکەدا ژیاون بزانن کە قۆناغەکە چەند سەخت و دژوار بوو . چ باوەڕو خۆڕاگریەکی دەویست ڕژێمی بەعس ئەویَ ڕۆژیَ کارەساتی گەورەی وەك و کیمیابارن و ئەنفالی بەسەر خەڵکی کوردستاندا هێنا بوو دیهات و ئاوەدانی کوردستانی نەهێشتبوو ڕۆژانە لە هەموو ناوچەکانی کوردستان بە فەوج و یەکە سەربازییەکانی خەریکی وێرانکردنی سەرچاوەکانی ژیانی کوردەواری بوو . کارێز و کانیاوەکانی دەتەقاندەوە و ڕەز و باخ ودەغڵ ودان وپوش وپاوانی کێوەکانی دەسوتاند. لە شیوو دۆڵ و شاخەکاندا ماڵی بە جێماوی کوردیانتالآن دەکرد لەو هەل و مەرجەدا و لە کاتێکدا کە ڕژێمی شۆڤینی بەعس بەرنامەی فراوانی بەعەرەب کردنی کوردستانی بەدەستەوە بوو لە کاتێکداکە هێزی پێشمەرگە بەهۆی نا بەرامبەری هێز و بالآدەستی سەربازی ڕژێم کشابۆوە سەر سنوور تەنیا چەند مەفرەزەیەکی پارتیزان لە کوردستان مابوونەوە . ئەوانیش ڕۆژانەوزۆر ەچڕی ڕووبەڕووی مەترسی وهەڕەشەی پشکنینی هێزەکانی ڕژێم دەبوونەوە.وەنەبێت ئەم دەرچون و پشکنینانەی دوژمن هە رلە ناوچەیەك یان هەر لایەکەوە و ناوە ناوە بوویێت . نەخێر بەڵکو لە هەموو لایەکەوە و ڕۆژانەش بوو . هەر بۆیە ئەو مەفرەزە پارتیزانانە لە ماوەی مانەوەیاندا بەسەدان جار کەوتنە ناو ئابلۆقەی دوژمن بەلآم لە بەرئەوەی بە وریایی دەجولآنەوە و پەیڕەوی سەرەتاکانی شەڕی پارتیزانیان دەکرد بۆیە لەم ژیانە پر لە دۆزەخە مانەوە و لە ناو نەچوون ئەو پێششمەرگە پارتیزانانە لە وولآتێکی خاپوورو سوتماك کراودا و کە جگە لە تارمایی ڕبیە و مۆڵگەی دوژمن نەیان دەتوانی ئاوەدانییەك ببینن هەر جارەی کە دەشیان ویست ئاوەدانییەك ببینن دەبووایە ڕێگەی دوری دەیان کیلۆمەتری پڕ لە

مەترسی ببڕن .بە بی ئە وە ی بتوانن تە نانە ت بە سەرریکانیشدا برون لەبەردیارنە بوونی شوین بیکانیان زۆر حاریش کە خەڵکیان دەبینی لەبەرئەوەی ئەو کاتە خەڵك زۆر نائومێد و بێمتمانە و ترساو بوو لێیان دەپاڕانەوە و دەیانووت بیکەن بە خاتری خوا جارێکی تر مەیەنەوە بە لاماندا نەوەك و دوژمن بزانێتەوە و ئەنفالمان بکات ئەوە سەرەڕای ئەوەی ئەویٚ ڕۆژیٚ هەرچی دەشیان بیست هەر هەواڵی جەرگ بڕو پڕ لە نائومێدی بوو جارێك هەواڵی تەخت کردنی شار و شارۆچکەکان و ڕاپێچکردنی خەڵکەکەی بوو بۆ ئۆردوگا زۆرەملێکان جارێکی دیکە هەواڵی ئەنفال کردن و ڕەمی کردنی دەستە دەستەی گەنج و لاوەکان بوو لە شارەکان یان بیستنی هەواڵی تەسلیم بوونەوەی دەیان فەرماندە و پێشمەرگەی قارەمان بوو کە ڕایان دەچڵەکاندن . ئەوە جگە لەوەی ئەو پێشمەرگە پارتیزانانە کەس و کاریان گیرابوون و هیچ هەواڵێکیان نەدەزانین . هەرچەندە زستانیش زۆر سارد بوو نەوایەکیان نەبوو بۆیە لە ئێوارەوە دەڕویشتن تا بەیانی هە م بۆئەوەی لە سەرما نەمرن هەم بۆئەوەی دوژمن نەیان دۆزێتەوەو جێگۆڕکیٚ بکەن . پارتیزانەکان بەم شێوەیە و بەم بەرگرییە بێوێنەیەیان توانیان بچنەوە بە گژ موستەحیل داو قۆناغێك لە مێژووی میللەتەکەیاندا تێپەڕێنن کە دەگمەن بوو لە دژواریدا ئە کەرچی وەکو پێویست گرنگی بەو قۆناغە نادری و مانەوە و بەرگری ئەو پێشمەرگەبارتیزانانەوەکویەکێك لەسەروەرییەگەورەکانی شۆڕشی گەلەکەمان ناخویندریتەوە ئەگەر نا هێزی پێشمەرگەی کوردستان هەموو سەروەرییەکانی لێوەربگریە وە بە تەنیا سەروەری مانەوەی پارتیزانەکانی دوای ئەنفالەکانی بەسە تاهەتایی شانازی پێوە بکات.

* سەرچاوە : فەیسبووك ماموستا کاوە..

# دیمەنێکی حەزین

پایزی 1988بوو، ئەوکاتەی لە رۆژهەلاّتی چیای دێدەوان بووین، ئەسپێك هەبوو هەموو دەمەو ئێوارەیەك لەهەرجێیەکی ئەم ناوچەیەبووینایە، لە ئاسۆگەوە گەردنی هەڵدەکێشاو لێمان رادەما، وەك ئەوەی بمان ناسیتەوە، یاداوا بکات بەخاوەندی بکەین، ولەسەرگەردانی رزگاری بکەین،ئێمە تەنیا سیّ پێشمەرگەی شەکەت و ماندووی دابراولەهەڤالەکانمان بووین،بەبینینی ئەم دیمەنە حەزینە زیاتر خەمبارە بووین، پتر هەستمان بە قەبارەو گەورەیی تاوانەکانی رژێمی بەعس دەکرد کە چ کارەساتێکی بەسەر هێناوین.

**<u>کەوڵی پێشمە رگە</u>**

ماوەیەك بوو لیرە ولەویّ کەسانێك پێیان دەگوتین ئای پێشمە رگە کەوڵتان چەند بەقیمەتە بەتایبەتیش زیاترلەوماڵە رەشماڵنشین و مەرِدارانەمان دەبیست کەتاك وتەرا لەقەراغ جادە سەرەکیەکان بوون ورژێم ئیزنی دابوون تا لەو رێگەیەوە زانیاری لەسەر پێشمەرگە پارتیزانەکان کۆ بکەنەوە و لەفرسەتێکدا لە ناویان ببەن.

ئە وەشمان جۆن زانی شەوێك لەوکاتەی میوانی یەکێك لەومالاّنە بووین کابرای خاوەن مالّ بەشێنەیی پرسیاری ناو ونازناو و موالیدو بە ئەصل خەڵکی کوێی هتد..تەنانەت دەیەویست بزانیّ جۆری چەکەکانیشمان چیە، ئیمەش دوای ئەوەی هەستمان بەمەکرد کەوتینە لێکولینەوە لەگەڵی لەئەنجامدا دانی بەوەدا نا کە بەرێوەبەری ئەمنی هەولێربەو مەرجە ئیزنی داون کەزانیاری لەسەرپێشمەرگە کۆبکەنەوە،لەبارەی هەموو شتێکیان. تەنانەت گوتبوویان ئەبیّ بزانن جۆری پێلاوەکانیشیان چییە،ئەمەیان بۆئەوەبووشوێن پێیەکانمان هەڵگرن ولەورِێگەیەوە

بماندۆزنەوە،هەرواش بوو، دەیان جاربەچاوی خۆمان ئەمانبینی کە دوژمن چۆن لە ریگەی خەڵکی چاوساغ وشارەزاوە تەعقیبی شوێن پێ یە کانمانی دەکرد، بۆیە ئەوکات ئەبووایە بەسەرریگاکاندا نەڕۆین، بە تایبەتی لەهاوینەکەیدا ئەوکاتانە رژێم واتە (988و989)پارەیەکی زۆری تەرخانکردبوولە بەرامبەر گرتنی هەرپێشمەرگە یەکدا بۆیەئەوسا پێشمەرگە وەك ئیستانەبوو،کەوڵی بەقیمە ت بوو..

**شە وێك لە نیوان دوو دنیادا**

ئەوئیوارەیەی من و شەهید ئاسۆ معلیم بە رە ولوتکەی سەری رە ش هەڵکشاین، ویستمان بۆ بەیانیەکەی وەك جێگەیەکی بێ شك لە وقەد پاڵە بمێنینەوە، ئیوارەیەکی کۆتایی بەهاری ساڵی1989بوو،دوژمن ئەورۆژەحەملەیەکی سەربازی بەناوی جەعفەری بنی مەنصور دەست پێکردبوو جێگا نەمابوو لەوناوە بەدوای پێشمەرگەدا نە ی پشکنێ. شەو لەگەڵ گەیشتنمان بەولاپاڵە، لەکاتیکدا کهەێشتا کۆڵەپشتیەکانمان بەکۆڵەوەبوو، گوێ بیستی ئاوازوگۆرانی ئاهەنگی شەوانەی سەری رەش بووین، بە دەنگی بە سۆزی (شەمال صائب) (هەرەلەیلی)و (افتکرنی لحڤەحلوە)ی(ام کلپوم)دەنگو سەدای خۆشی گۆرانییەکان لەو شەوە دا لەبەر تریفەی مانگە شەو بەشیوەیەك بەئاسمانی ئەوناوەدا بەرزئەبوونەوە،بە دول وشیوە کانداپەخش دەبوونەوە.. بەتایبەتیش کەتێکەڵ ئەبوولە گەڵ شنەی باو وچرپەی گەڵاو خورە خوڕی قەڵبە زەی ئاو.. ئەتککوت نەرمە تاڤگە یە کە ئەرژێ بە سەر روحماندا، بە راستی ئەوشەوە بۆئێمە کە هە مووی چەندمە نگاوێك لە ئاهە نگە کە وە دووربووین و بێ بەش بووین لەهەموو خۆشیەکی ژیان و وەدەمێکیش بووگوێمان لەدەنگی ئاوازو گۆرانی نە بوو بوو.. شەوێکی تایبە ت بوو..



# دەستەیەکی تر لە پارتیزانەکانی دەشتی هەولێر

دوابەدوای کشانەوەی هێزەکانی پێشمەرگە بۆ بناری قەندیل،چەند دەستەیەك لەپێشمەرگەکانی کەرکوك ودەشتی هەولێر گەڕانەوە ناوچەکانی خۆیان،یەکێك لەودەستە پارتیزانانە دەستەکەی(رەحمان چاربەردە)بوو کە پێکهاتبوون لە :

1- رحمان عوسمان پیرداود(رەحمان چاربەردە) 2- احمدمحمدابراهیم
3- حسن علی سعید(حەسەن عەوێنە) 4- عصام حسن (حەسیب رەش)
5- نەوزاد رۆستەم (نەوزاد سوفەیە) 6 - رۆستەم احمد بیرە عارەبانی
7- عمر عوسمان(عمرپینەمەڕەبڕ) 8- عمر.صالح عزیز
9- انوراحمد (انورترجانی) 10- رێبین عمر حمد (م.رێبین)
11- محمود حسین تەها (محمود ترجانی) 12 / خالد عبدالله (د . خالد)
13- یوسف حمد امین (کامەران) 14- مامند اکرم عزیز
15- شمس الدین اکرم عزیز 16- قاسم محمد عزیز

لە 31/10/ 1988 لەنزیك گوندی (هەمزەبەگ)دەکەونە بۆسەی جاشەکانەوە دوای شەڕێکی کتوپڕ،هەڤاڵ(رۆستەم اسعدعارەبکەندی) شەهیددەبێت،نەوزادرۆستەم و انوراحمد ترجانی بریندار دەبن،ئیتر بەدووبریندارەوە دەپەڕنەوە بۆبەری شەمامك. دوای بەهۆی کەسوکاری نەوزادسوفەیەوەدەگوازنەوەشینایییەکانی گوندی سوفەیە. تاکۆتایی1989لەوناوچەیەدەمێننەوە،دواتربەلێبووردنی گشتی دەگەڕێنەوە شار.

# ناوی چەند پارتیزانێك
# لە پارتیزانەنی دەشتی کۆیە

**دەستەی یەکەم:** لە 12 1988/8 بۆ 1989

1 ـ دڵشاد مەلاعەلی
2 ـ خدر( م . زیرەك)
3 ـ ابووزێد صالح
4 ـ ئەرڕەلان حەسۆ
5 ـ صباح بکر مەلا
6 ـ اسود حاجی مەلا
7 ـ شەهید خلیل چاورەش
8 ـ کازم احمد سلیمان
9 ـ جواد جوەر(جەوادەرەش)
10ـ لەتیف علی مامە (کاولانی)

**دەستەی دووەم:** لە 30 1988/8 تا 1989

1 ـ شەهید جعفرحمە دەروێش
2 ـ سەید حیکمت نعمت
3 ـ کامەران احمد
4 ـ شێروان حسن تەها
5 ـ حکیم (هاوڕێ کەرکوکی)
6 ـ قاسم حمە گچکەل
7 ـ خالید حاجی مەلا
8 ـ سەفین عومەر
9 ـ ئازادحمیدصالح(ئازادچاوشین)
10ـ برهان سلام (شەوگێڕی)
11 ـ وشیار زاهیر
12ـ د. هیمداد
13 ـ کاوە جمال
14ـ سۆران حەسۆ
15 ـ بادینان حەسۆ
16ـ ئاکۆ دوکانی
17ـ هێرش زاهیر

**دەستەی سێیەم:** لە ساڵی 1990

1ـ ابووزید صالح
2ـ عزیز علی سوور
3ـ دڵزار علی حمەشین
4ـ دڵزار رفیق



## ژیاننامەی
## پارتیزانی دوای ئەنفال
## شاخەوان مەلا محمد ئاوماری

- لەگوندی ئاومار چاوی هەڵهێناوە.
- لەساڵی 1980لەرێی(صابر ئاوماری)یەوە پەیوەندی بە رێکخستنەکانی(کۆمەڵە) و (یەکێتی نیشتمانی کوردستان ) ەوە دەکات.
- لەساڵی 1985 شەشەمی ئامادەیی تەواو کردوە
- لەماوەیەی خوێندکاریدا. لەهەولێر سەرپەرشتی شانەیەکی سەرەکی دەکات. کە (صابرقادر ئاوماری)لەلایەن رژێمەوە دەستگیردەکرێت لەگەڵ صباحی ئامۆزای و کازم عمر کەهەرسێ خوێندکاری ئامادەی زراعەی تەق تەق دەبن،خۆیان دەشارنەوە. لە رێکەوتی 1982/12/18 وازلە خوێندن دەهێنێ. بۆ ساڵی دوایی لە هەولێر ئامادەیی تەواودەکات،هەڤاڵان مەلاخدر لێپرسراوی،کەرتی رێکخستنی هەولێر و ( قادر کادر ) سەرپەرشتی دەکەن.
- لەساڵی 1986لەگەڵ مامۆستا کاوە انور وحمید مەلا عبداللە وەك کادری محلی لەناوچەی خۆیان دەست بەکاردەبن..
- دواتر پەیوەست دەبن بەهەڤاڵ شاخەوان عباس (ل . رێکخراوی مەلبەند)ەوە .
- ماوەیەك لەلایەن هەڤاڵان(سامان دوبزی)و(هوشیارەسور)ل.کەرتی رێکخستنی دەشتی هەولێرەوە سەرپەرشتی دەکرێن .
- وەکو کادر لەو ناوچەیە سەرپەرشتی رێکخستنەکان دەکات..

- لەسەربڕیاری سەرتیپی(86)ی دەشتی هەولێر ڕۆڵی دەبێ لە دروستکردنی هێزی پشتگیری لەلەگوندی (ئاومار).

- ژمارەیەکی زۆر لەهەڤاڵانەی ڕێکخست بوو کە دواتر یا ئەنفال یان شەهیدبوون .

لەوانە شەهیدی قارەمان(شۆرش ئاوماری)و محمد فاتیح (هەژار) کە خەڵکی گوندی سارتك بوو، خوێندکاری شەشی ئامادەی بوو لەلایەن رژێمەوە گیراو لەماوەیەکی کورت گولله باران کرا . .

جگە لە هاوڕێیانی تر لە گوندەکانی وئاومار وبەردەسپی و سەر بەستی شەرغە و هەولێر.. دەیان ئەندامی دلسۆز لە خەتەکانی ئەودابوون..

- لەساڵی 1980 ـ 1982 باوکی دەبێ بە مەلای گوندی مورتکەی گەورە، ئەوسا لەو گوندە دا ئەندامانی پارتی و حزبی شوعی هەبوون کە تەنزیمەکانیان زۆر بەهێز بوو،چونکە لە مورتکەی گەورە ئەندامی سەرکردایەتی حزبی شیوعی و ئەندامی سەرکردایەتی پارتی هەبوون .

بەلام لەماوەیەکی کەمدا توانی ژمارەیەك گەنج ڕێکبخات..لەوانە:

(مامۆستا صلاح،حاكم سەرهەد سلیمان،ناصیح رحمان،شەهیدسەنگەر،بایز جمیل )

ئەوهەڤاڵانەلەماوەیەکی کورتدا توانییان زۆرینەی حەڵکی مورتکەبکەن بە یەکێتی .

یەکێك لە و ڕێکخستنە تێکۆشەرانەکە ناوی خالد رحمان بوو

کاك (خالید رحمان) مورتکەیی پێشتر لە ساڵی 1977ماوەیەك پێشمەرگە دەبێت لەگەڵ شەهید(رحمان سۆنەگۆلی) و لە ساڵی 1988 بەهۆی ئەوەی لە دواجینەکانی گوندی گردمەلا زۆرهاوکاری خەلکی هەلاّتووی ئەنفالەکان دەکات، پاشان لەرێگای کارێکی ڕێکخستن شەهید دەبێ .

- ئیستا هەڤاڵ شاخەوان پلەی ( جێگر) ە لە مەڵبەندی سێی هەولێر.



## ببرەوەرییەکانی شاخەوان ئاوماری

ناوچەی(شێخ بزێنی ) بەردەوام لە ژێر رەحمەتی تۆپباران و هەلیکۆپتەر دابوون، بەتایبەتی(سێگرتکان سێکانی، شەیتان,قەمبەر, سارتك،ئاومار،تورکی، قەرەسالم، کاولەسوار،شەوگیر.پەلکانە،ئۆمرگومبەت،دەرمانا،حەمدون،مەرزیخە،کانی رەش..)

ـ لە 1988/5/4 ژمارەیەکی زۆر خەلك لە زێ پەرینەوە، بۆ 5ی مانگ هێزەکانی رژێم لەسەر کەلی قەرە سالمەوە دەستیان بە تۆپ باران کرد، ئێمە لەحاوی ئاومار هەلاتین بۆ کەندی قەمەر ئەو ئێوارەیە ئێمە کە لەیادم مابێت بریتیی بووین لە :

1 ـ عزیز حمە علی لێپسراوی هێزی پشتگیری

2 ـ رەزا محمد پێشمەرگەی پشتگیری دواتر( ئەنفال کرا)

3 ـ رەزا عەبدولا (مام رەزا) دوتر ( ئەنفال کرا)

4 ـ حەلیمە دایکی کاك رەزا عبداللە

5 ـ ئامینە محمد خێزانی رەزا عبداللە

6 ـ سەلام رەزا (مندال ) کوری رەزا عبداللە

7 ـ سێ کچ و خوشکێکی رەزا عبداللە

8 ـ دوو خوشکی کەرکوکی بەرێکەوت لەگەلٚ ئێمە هاتبوون.

9 ـ رەحمان ملا صالح (قلە) خەلکی شەوگیر دوتر( ئەنفال کرا )

10- مام عبداللە شەوگێڕی (عبداللە قسە خۆش )

11- سورداش عبدالكریم ئاوماری

12- خالد عبداللە رەزا زەردكی

13 - محمد عبداللە رەزا زەردكی

14 - بكری حاجی جبار زەردكی

15 - لقمان جباری ئاوماری

16 - عمر حمە علی ئاوماری ( ئەنفال كرا )

17 - مام عوسمان خەلكی گوندی تولكی

18 - مام فاڕووق مامی شەهید مەلا ئاراس

19 - نەوزادصالح ی برای مام عوسمان(توڵكی)

20 - ماموستا عبداللە گردەسوری

21 - شوكر خەڵكی دەشتی هەولێر

22 - وریا عزیز

بەهۆی تۆپبارانی زۆرەوە بەزەحمەت گەیشتینە ئەشكەوتەكانی (گوندی قەمبەر) ئەوشەوە لەوی ماینەوە،من بەتانیكم هێنابوو،شەوەكەی ساردبوو، بەتانیەكم دا بەودوو كچە كەركوكی یە،ئەو شەوە تا بەیانی لەوی ماینەوە،رژێم هێرشی كردە سەر(ئاومار) و سی ماڵیان لێ سوتاند، یەكێكیان ماڵەكەی من بوو..ئەوكات گوتیان ئەوە نیشانەی ئەوەیە كەگوندەكە لەڕوی سەربازیەوە تەواوكراوە،ئێوارەكەی گەرامەوە،چوومەوە سەرماڵەكەی خۆم هەمووی سوتابوو،سازێكی ئەستەمبوڵیم هەبوو ئەوەشیان برد بوو ،ئەو شەوە ئارد و رون و خوێ و هەندێك كەل و پەلمان لەگەڵ خۆمان برد و بەلەمێك،كە پێشتر لەوێ شاردبوومانەوە چووینە دووڕگەیەك و بەلەمەكەمان دەشاردەوە،بۆبەیانی رژێم بەهێزێكی زۆرەوە هێرشی كردەوە سەر

ناوچەکە..زۆرلیمان نزیك بوونەوە بەتایبەتی جاشەکان، ئەو رۆژە هەموو خانووە کانیان ئاگر تێبەردا و پاشان بە شۆفەل دەیان روخاندیان.

لەبەری( قەرەسالم )ەوە جاشەکان هاتنە(چەم قەلاّ)و شۆربوونەوە بۆ سەر زێ ، بەرۆژ نەدەبوو ئاگر بکەینەوە،ئەوشەوەمان بەرێ کرد رۆژی دوای هەلیکۆپتەرێك بە مایکرۆفۆنێك بەزمانی کوردی قسەی دەکرد،داوای خۆبەدەستەوەدانی دەکرد.. حەفتەیەکمان زۆر بەزەحمەت تێپەراند،کەدڵنیا بووین هێزەکانی رژێم ئەوناوچەیان بەجێهێشت شەولەچەمەکەدەرچووین وبەرەو گوندی(بەردەسپی) وبەستی شەرغە کەوتینەرێ،لەوێ خەڵکمان بینی بە تراکتۆر دەچوون بۆقوشتەپە،ژن و مندالەکانی مام عبداللە و سورداش و وریا لەگەڵ تراکتۆرەکە رۆیشتن...

ئێمەچووینە(بانەمورد) وچیای دێدەوان لەگەڵ صباح حمه علی و علی محمدی ئامۆزام کەدووپێشمەرگە بوون یەکمان گرتەوە،لەوێ دوو بۆچوونمان هەبوو، هەندێ پێیان باش بوو بچینەوە نزیك دارەتوو و بنصلاوە، من و عزیز حمە علی رامان وابوو بچینە سماقولی و لەگەڵ هێزی پێشمەرگەی یەکێتی بمێنینەوە، شەوەکەی من و علی و صباح نانێکی زۆرمان کرد،من هەویرەکەم ئامادە کرد و بەدەست پانم دەکردەوە،صباح دەیبرژاندوعلی ئاگرەکەی خۆش دەکرد،زۆر قسەی خۆشمانکرد زۆر یادگاریمان بۆ یەك گێرایەوە،تەنانەت کە ئەو قسە نهێنیانەی کە پێشتر لەیەکمان دەشاردەوە،ئەوشەوە هەمووومان باسکرد، وەك ئەوەی خوا لەدڵی نابین جارێکی تر یەك نابینینەوە،پاش نیوەرۆیەك بەرێ کەوتین بۆ گەیشتن بە هێزی پێشمەرگە..بۆ شارەزایی علی و صباح لەگەڵمان هاتن تاکو لای (بانە قەلات) ئەوانەی کە لەیادم ماوە لەجادە پەرینەوە:

(شاخەوان،عزیزحمەعلی، عوسمان صالح تولکی، نەوزاد صالح، عمرحمەعلی، شکور،مامۆستا عبداللە،خالیدومحمدی برای،بکری حاجی جبار، لقمان جبار...)

گەیشتینە سماقولی،لەوی کاك(شاخەوان عباس)مان بینی، زۆری پێخۆش بوو ، مەقەڕی داپێمان،ئازووقەی بۆ دابینکردین،ماوەیەك ماینەوە،جەژنمان لەوێ کرد.

پاش جەژن کاك شاخەوان پێی گوتین ئێوە بچوونە کەرتی عوسمان بانی مارانی، من نەبێت ئەوانی دیکە هەموو حەزیان دەکرد بگەرینەوە(ئاومار) هەرچۆنێك بوو گەڕاینەوە(ئاومار) بێگومان ئەو هاتوو چونە ترسناك بوو، چونکە رژێم جادەکانی توند کردبوو، رەبایەکان پر بوون لە جاش ..

- من و عزیز و رسول محمد کە کادری حزبی شوعی بوو لەگەڵ لقمان جبار بەیەکەوە ماینەوە،هێزەکانی رژێم بەبێ ترس هاتووچۆیان دەکرد،چونکە ژمارەمان کەم بوو بەئاسانی دەمان توانی خۆمان حەشار بدەین،شەوێك هێزێك لە پێشمەرگە لەبەری کرکوکەوە پەڕینەوە،لە ئێمە نزیك دەبوونەوە لەوکاتەدا من حرس بووم چەکم لێیان ڕاکێشە هەموویان بێدەنگ بوون، دوبارە دەنگمدانەوە، دەنگی منیان ناسی ،گووتی : منم (سیامەند)ی کوری مام نوری قەرەسالم ..

پاشان چووینە کەندی قەمبەر، کاك عوسمان جمیل وکاك جوامێری کادری کۆمەلایەتی لەوێ بوون، قسەم لەگەڵ کردن،گووتیان بەیانی دەچین بۆلای هێزەکانی خۆمان لەسماقولی وبالیسان.منیش ڕوخسەتم لە(عزیز)ئامۆزام خواست، عزیزگووتی:پێم ناخۆشەجیاببیەوە،بەلام بەئارەزووی خۆت بکە،منیش لەگەڵ کاك جوامێری بەردەسپی وسێ پێشمەرگە، کەئەوان شارەزا نەبوون لە پەڕینەوەی جادەی کۆیە،یەکیان ناوی(چالاك) بوو، کادرێکی تیپی(21) کرکوك بوو،دوانەکەی دیکە پێشمەرگەی دەستەی کاك نوشیروان و ئەوی تریان پێشمەرگەی دەستەی مام جەلال بوو .

کە ڕۆژ بۆوە کەوتینەری.هەوراز و نشیوی گوندەکانمان بری، نیوەرۆ گەیشتینە هەرەتی گوندی داربەسەر،لەوێ ماڵەکان چۆڵ بوون، خواردنمان دەست کەوت و

نیوەرۆیەکی باشمان خوارد،پاشان بەرێ کەوتین گەیشتینە گوندی شیواشۆك لەوێشەوە بەناو دۆلێکدا تێ پەڕین لامان دایە سەرکانیەك، لە کانیەکە ئاومان خواردەوەپێش ئەوەی رۆژئاوا بێت دوو کۆپتەر بەنزمی بەسەر جادەی کۆیە هەولێر دا دەگەڕان. بۆئەوەی دڵنیا بین کەمین هەیە یان نا زوو چووینە ناو گوندی(گۆپتەپە)جوامێر کادرێکی زیرەك وشارەزایەکی باشی بوو، لەسەرخۆ و هێمن بوو،بەسەلامەتی ئێمەی لەجادە پەڕاندەوە...

گەیشتنە دامێنی چیای باوەجی لە شوێنێك دانیشتین پشویەکمان دا من ویستم ئاو بخۆمەوە بەلام مەتارەکەم یەك دڵۆپە ئاوی تێدا نەمابوو،داوام لە چالاك کرد ئاوم پێبدات..چالاك گووتی:

تۆ کەی پێشمەرگەی،کەی پارتیزانی وادەبێت، لەماوەی سێ چوار کاتژمێردا هەموو ئاوەکەت خوواردۆتەوە، گووتی ئەگەر بشخنکێیت ئاوت نادەمێ ..

لەڕاستی داقسەکانی ڕاست بوو،بەلاّم بەهۆی ئەوەی(جوامێر)دەوری فەرماندەی مەفرەزەکەی دەبینی داوای لێ کرد ئاوم بداتێ،چونکە ڕێگای زۆرمان بڕی بوو..

بەیانی گەیشتینە دۆلی سماقولی،من وجوامێر لامان دا لای ژن و پیاوێکی ئەو دۆلە، کە هێشتا خەریکی زەوییەکەیان بوون،کە چووینە لایان پێمان گوتن دەتوانین نیوەرۆ لای ئێوە بین، ئەوانیش بەسینگی فراوەنە گوتیان خواردنی زیادمان پێیەو بەسەرچاو...چووینە سەر رووبارەکە وئاومان گەرم کرد،لەپێشەوە جلەکانمان دوای خۆمان شوشت،بوو بە نیوەرۆ، لەگەڵ ئەو ماڵەجوتیارە دانیشتین، دۆڵمەیان هەبوو، بەپەلکەمێو و برنجی سپی زۆر بەلەزەت و خۆش بوو،پاشان لەگەڵ جوامێر چووینە هێران وسەردانی بارەگای تیپی(سەفین)مان کرد لە دۆلێ،کە کاك سەفینی مەلا قەرە سەرتیپی بوو.

## جیابوونەوە

لەویٚ لە جوامێر جیابوومەوە، بەرەو گوندی ( بەرەکە) بەرێ کەوتم، کە بارەگای ئەو هێزەی لێ بوو شەهید رێباز سەرپەرشتی دەکرد،لەسەر شاخی سوور بوون، کە چوومە بارەگا گوتیان ئێستا پێشمەرگە یەك دێت خواردن دەبات بۆ سەرچیا ناوی(بایز رحمان)ە،کەیەکێك بوو لەو رێکخستنەی خۆمان لە گوندی (مورتکە) لەویٚ بەیەکتر شاد بووینەوە، هەرلەگەڵ ئەو بەرەوشاخی سوور ڕۆیشتم،لەزنجیرە چیای(کلاوقاسم)کەدەیڕوانییە دەشتی هەریر،شوێنێکی زۆرگرنگ بوو لەڕووی سەربازییەوە،چەندێن هێرشی بۆ کرا بوو، رژێم نەیتوانیبوو شاخەکە بگرێت .

دووشەو دوو رۆژ لەویٚ بووم.بەردەوام هاون باران و تۆپ باران بوو، لەویٚ بۆت دەردەکەوت کە بەڵی پێشمەرگەکانی یەکێتی بەرامبەر چ هێزێك شەڕ دەکەن و چەند خۆ ڕاگرو ئازان .چەند پێشمەرگەیەك لەویٚ بوون کە کاتی خۆی لەگەڵ من بوون لەرێکخستن.. لەوانە:( شەهید سەنگەر،ناصح،مامۆستا صلاح،کاك صدیق منتك وبایز )...هەموو خەڵکی مورتکەی گەورە بوون،لەگەڵ سەنگەر چووینە لای شەهید( رێبان) گووتم بەڵکو جهاز بکات بۆ کاك (هوشیارەسوور) چاوەڕێمان کرد لەسەرە سعاتێکدا دوای پەیوەندی کاك هوشیار داوای کردبوو بچم بۆلای ..

لەگەڵ پێشمەرگەی قارەمان کاك(یەدولاّ) بەرێ کەوتین بۆ بالیسان جارێکی دیکە بە کاك هۆشیار شادبووینەوە..ئەوناوانەی لەیادم ماوە کە لای کاك هوشیار بوون (انور گردەسۆری،کاکەمین، ماموستا سلیم،مەلا احمدی کۆیە، رێباز عزیز، سۆران، دارا،هۆگرسەرسپی،دڵشێر وچەند پێشمەرگەی دیکە.)بارەگاکەیان لە شوێنێك بوو نزیك توتمێ و بالیسان بەناوی گوندی(بالوکاوە)شەهید هۆشیار جگە لەوەی

کادرێکی چالاك بوو،ئەندازیاری گشتوکال بوو،دەورەی لە ئێران بینیبوو لەسەر چۆنیەتی بەکار هێنانی رۆکێتی(گراد).

گراد ئەوساروخە بوو پێك هاتبوو لەلولەیەکی نزیکەی(12)پێ لەسەرسێ پایەکی ئاسن، گوللە ساروخەکەشی گوللەی ساروخی راجیمەی چلی بوو ..

بەشێوەی کارەبای دەتەقێندرا،دەنگێکی زۆر گەورەی هەبوو،لەناو هێزەکانی یەکێتی بە(ڕۆکێتی تۆڵە) ناسرابوو،توانای هەبوو(22.5) کیلۆمەتر و نیو بڕوات.

لەو بارەگایە کارمان دەکرد،وەکوکرێکار وابووین چونکەگواستنەوەی ئەو( گوللە ) ساروخانە پێویستیان بەدوو کەس هەبوو،بۆ هەردانەیەکیان،لەگەڵ ئەوەی ئێمە مانگێك چوینە گوندی مەلەکان گواستنەوەی ساروخەکە لەسەر پشتی هێستر زۆر زەحمەت بوو ،بەتایبەتی رێگای چیای (دەرەدار و دەرەشیر) .

لەمانگی(حوزیرانی) 1988بەتەواوی لەگوندی مەلەکان بووین،کەساروخەکەمان ئاراستەی معسکرەکانی( دیانە)و دەوروبەری (رەواندز)دەکرد...

رۆژانە چەند گولەیەکمان ئاراستەی چیای ( کۆرەك) دەکرد .

کاك هوشیار نەخشەی سەربازی هەمووناوچەکەی لەلابوو، بە(قومباس) شوێنی دوژمنی دەست نیشان دەکرد، زۆر جار سەرتیپەکان یان فەرماندەی کەرتەکان لەبەرەکانی شەرەوە دەبوونە(رەسەد) لەگەڵ ئەوەی ئێمە(جیهازێکی) بێتەلی جۆری (PRC)مان پێ بوو،موقیفەکانم وەردەگرت و هەواڵی بەرەکانمان پێ وەردەگرت.

پاشان جارێ دیکە گەڕاینەوە بۆ(بالوکاوە) کەلەوێوە سەربازگەی سەرمەیدانی شەقلاوەمان ساروخ باران کرد. ماوەیەکیش لەژێر چیای(سەرباری خەتێ)نزیك گوندی(خەتێ) لەوێوە مۆلگەکانی دوژمنمان تۆپ باران دەکرد.

## ڕیکەوتنی عێراق ـ ئێران

لە 1988/8/8 ئیمام خومەینی قبولی ڕێکەوتی نێوان عێراق و ئێرانی ڕاگەیاند.
هەرچەندهێشتا زۆربەی هێزەکانی یەکێتی لەسنوری مەلبەندی 3ی هەولێر بوون.
بەڵام لەگەڵ واژۆکردنی اتفاقیەکە هێزەکانی عێراق کەوتنە تۆپبارانی ناوچەکە و ورەی جەیشی عێراق بەرزبووە. هێزەکانیان پەیتا پەیتا لەدەوروبەری مەلبەند جێگیر دەکردوخۆیان ئامادە دەکرد بۆ کۆنترول کردنی هەموو ناوچەکە ..
بڕیاری سەرکردایەتی ئەوەبوو.مەفرەزەی پارتیزانەکان دابەش بکرێت و هێزەکانی دیکەی یەکێتی بەرەوسنوور هەلبکشێنەوە .
ڕۆژێك کاك هۆشیار پێی گووتم قسەم لەگەڵ پێشمەرگەکانی دیکەکردووە زۆربەیان دەیانەوێت ئاودیوبن بۆسنووری ئێران، تۆ لەگەڵ من دەمێنیتەوە..؟،منیش گووتم: هەرچەندمن ئەزموونی پێشمەرگایەتیم کەمە،لەش ولارێکی باشم نیە بۆ پارتیزانی بەلام ئامادەم لەگەڵ تۆبم،پاش چەند ڕۆژێك بەیەکەوە چوینە سەروچاوەی گوندی سکتان،شوێنێکی دیاری کرد کەساروخەکەی لێدابنێین،پاشان منی ڕاسپارد(50) گوللەساروخ لە ئەشکەوتێکی گوندی شێخ وەسانانەوە بگوازمەوە بۆ سەروچاوەی (سکتان) منیش گەڕام بەو گوندانەدا هێشتا تاك تاك ماڵەکان مابوون(25)هێسترم بەکرێگرت،هەرهێسترێك بەبری(25)دینار،گوللەساروخەکانم هەموو گواستەوە...
لەپاش 25 ی ئاب من و( کاك هوشیار)چووینە شوێنی خۆمان وە هێرشی ڕژێمی بەعس دەستی پێکرد، مەفرەزەیەکی پارتیزان کە (شەهید هاشم جیهان) سەر پەرشتی دەکرد هاتنە لای ئێمە،من چوومە سەر شوێنێکی بڵند لە سەر چیاکە جیهازەکەم پێ بوو،لەسەرچیاکە مەفرەزەیەکی دیکەی لێ بوو بۆ چاودێری کردنی گرادەکە فەرماندەی مەفرەزەکەیان هەولێری بوو، ناوی (قادرعەولا) بوو،من بە

جیهازەکە موقیفم لە(کاك نصراللە)ئیلنجاغی وەردەگرت، ئەویش لەگەڵ هیزەکەی (کاك کۆسرەت)بوو،هەواڵەکانی ئێمەی دەگەیاند، ئەگەر هەڵەم نەکردبێت ڕۆژی (28ی ئاب)بوو، هێرشی رژێم دەستی پێکرد (شەهید هوشیارو شەهیدهاشم) سارۆخەکانیان ئاڕاستەی سەربازگەی سەروچاوەو سەربازگەی کۆیە دەکرد، نزیکەی( 45) گوللەیان تەقاند،لەم کاتەدا دووژمن زۆر نزیك کەوتنەوە بۆیە سێ گوللەکەی تریان لەژێر قائیدەی تۆپ هاوێژەکە داناو(شەهید هاشم) بە ئاڕپی جی قاعیدەی سارۆخەکانی تەقاندەوە .

بۆ پاش نیوەڕۆکەی بەلای گوندی(سکتان)دا چوینەگوندی (هیران)شەوەکەی لە چیای(سەفین)،سەرکەوتین،لەسەرچیا پشوومان دا،کلاشینکۆفێك وشەش مەخزن و جیهازێکی کۆڵەپشتوو دەمامکێکی کمیاویم هەڵگرتبوو...

بۆبەیانیەکەی لەگەڵ کاك(ئاسۆ مامەند)یەکمانگرتەوە،لەوێ هێزێکی زۆری (شەهیدرێبان) لەگەڵ هێزەکەی لەوێوە بەرێکەوتن بۆدەوروبەری هەولێر،ئێمەش بەسەرپەرشتی(ئاسۆمامەند)بەرکەوتین بۆئەوەی لە گوندی(حوجران)ەوە بپەرینەوە، بەلأم ئەو ڕۆژە نەمانتوانی،چونکە هێزێکی زۆر لەناوچەکە کۆکرابۆوە،بۆیە بڕیارماندا بگەڕێنەوە چیای(سەفین) پێیان گوتین ئاگاتان لەخۆتان بێت، بەباشی خۆحەشار بدەن، ئەگەر(جوندی)پێی لێتان نا.. نەتانیان بینی ئێوە قسەمەکەن،بۆ بەیانی ڕژێم بە هێزێکی زۆرەوە هێرشی بۆسەردۆڵی(سماقولی)دەست پیکرد، زیاترلە(10)کۆپتەر بەسەر ناوچەکەدا دەسوڕانەوە، ئێمە بەئاسانی هێزەکەمان دەبینی بەبەر دەممان دا تێدەپەڕین،تاکو بەتەواوی هێزەکە لە ئێمە دووركەوتنەوە بۆ ئێوارە کەسێکی شارەزا هات ئێمەی بردە ناو شارۆچکەی (کۆیێ) .

ماڵی(جمیل ئاغا) لەوێ بوون،بەلأم دۆستایەتیان هەبوولەگەڵ پێشمەرگە،هەموو ئەو ماڵانەی کە ئێمە لێی تەوزیع بووین چەکدار بوون لە فەوجەکان ...

ئەو شەوە( کاك هوشیار ) پێی گووتم لەگەڵ کاك (احمدجمیل) بچم بۆ شوێنێك (احمد جمیل) یەکێك بوو لە پێپێشمەرگە ئازاکان و فەرماندەی کەرت بوو، لەگەڵ کاك احمد چەند کلاشنکۆ فێکم بردە ماڵێك بۆی حەشارداین ..

لەوێوە بۆ خۆحەشاردان چووینە پشت(کۆڕێ) و ئاشگەو زیبارۆك و سەرکەند جگە لە گوندی ئاشگە گوندەکانی ترهەموو ئاوەدان بوون و چەکداری حکومەت بوون ، ئەو گوندانە بە زۆری هۆزی(خەیلانی) بوون ، لەناو دارە سێوەکانی گوندی ئاشگە خۆمان حەشـار دا، بۆشەو زیاتر لە(8) کاتژمێر ڕۆیشتین پاشان لە جێگایەکی بێ گومان خۆمان حەشاردا، لە دوای چەند ڕۆژێك چووینە گوندەکانی نزیك(حریر) تا ئەوکاتە ئاوەدان بوون. زۆربەی خەڵکەکەیان لەهۆزی (سورچی) بـوون ..

لە هەموو گوندەکان زۆر بەڕێزو پێشوازی لە پێشمەرگە دەکرا، ئەمەش ڕۆڵی زیرەکی کاك ئاسۆی تێدابوو، لە گوندی (زێبارۆك) چەکیان لێمان ڕاکێشاو نەیان هێشت داخیلی گوندەکە ببین،بەلام(کاك ئاسۆ) قسەی لەگەڵ کردن ڕێگەیان دا کە بچینە گوندەکە، زۆر خزمەتیان کردین، پاشان جارێکی تر گەڕاینەوە ناو کۆڕێ، ئێوارەی 9 ی ئەیلول،ڕژێم لێ بووردنی( نـادیمەن)ی پەشیمان بوونەوەی دابوو ..

شەو چووینە ناو ئەو دارانەی کە دەکەوێتە بەرامبەر گوندی حوجران و جاددەی نێوان کۆڕێ و شەقلاوە، سەرجاددەکە هێزێکی زۆری ڕژێمی لێ بوو .

ئێوارەی دواتر بۆنان خواردن چووینە ناو هەندێك ماڵ کە(خێمە)یان لە نزیك جاددەکە هەڵدابوو،خەریکی بەخێوکردنی مەڕومالات بوون،ئێمەش زۆر بە ئاسانی لە ژێر خێمەکانەوە لەبەر لایتی ئۆتۆمبێلەکان چەکدارەکانی ڕژێممان دەبینی ..

دوایی چووینە دەواجنەکانی(بەستۆڕە)بۆجارێکی تر دووبارە گەڕایەنەوە (گوندی ئاشگە و سەرکەند و زێبارۆك) لە ناو دارەکانی ئاشگە پیاوێك سەردانی کردین و خواردنی لەگەڵ خۆیداهێنابوو،پێدەچوو خەریکی ڕێکخستنی چوونی ئێمە بێت بۆ

نزیك هەولێر،پاش ڕۆیشتنی،شەهید هوشیار پێی ووتم:
دەچینەوە(هەولێر)و سەرپەرشتی ڕێکخستنەکان دەکەین .
منیش ووتم: من ئامادەم لەگەڵ تۆدا بۆهەموو جێگایەك، بەڵام بۆ ناوهەولێر نایەم، ئەگەر بۆ ئێران یان بۆ دەشتی هەولێر بێت باشترە، ئەویش بیاوێکی زۆر بەڕێز و ئازا بوو ووتی: ئەی تۆ چی دەکەی من گوتم دچمەوە ناوچەی خۆمان .
ئەوەبو دوو پێشمەرگەی تریش ئامادەییان نیشادا لەگەڵ من بێن کاك هوشیار پێی ووتن دەبێت زۆر ئاگاتان لە(شاخەوان)بێت، تاکودەگاتە لای(کاك جەلال ئیلنجاغی) یا(کاك ڕێباز)پێشمەرگەکان یەکیان(قادرئازیانە)بوو،ئەوی ترخەڵکی(مخموور) بوو.
کاك هوشیار،دوونامەی، نووسی بۆکاك ڕێباز و کاك جەلال ئیلنجاغی کاك ئاسۆ فەرمانی کرد کە سێ پێشمەرگە بێن، تاکو لە جاددەکە دەپەڕینەوە،ئەوەی سەر پەرشتی دەکرد،کاك(سعیدمصیف)ی بوو، لەڕاست گوندی (سێوەکە) پەڕینەوە، لەوێ پیاوێك کە چەکداری ڕژێم بوو ڕێگاکەی نیشان داین و لە جاددەی( هەنارە) بەلای بەستۆڕە دا بە ڕێی کردین .
بەرزییەکانی سەرڕووباری بەستۆڕەوجاددەی هەنارە هەمووی هێزی ڕژێمی لێ بوو، تانزیك دەربەندی(گۆمەسپان)هاتین،لەوێ لەناودۆڵێك پشووماندا،کاك قادرئازیانە گوتی ئەمڕۆتاکوئێوارە لێرە دەمینێینەوە، لەو ماوەیەداڕژێم لێ بووردنەکەی گۆڕی بۆ لێبووردنی گشتی،بۆ هەمووخەڵك بوو، تەنها بەڕێز(مام جەلال)نەبێ،کاك قادرو پێشمەرگەکەی تردوورکەوتنەوە،چوون خۆیان حەشاردا،منیش لە ناو بنەگەزێکی گەورە خۆم حەشاردا،کاتێك(5) سەرباز کە یەکیان جیهازێکی پێ بوو هاتنە نزیك بنەگەزەکە،من بە ئاسانی هەر پێنجیانم دەبینی، ئەوان بەعەرەبی قسەیان دەکرد، باسی تسریح بوونی خۆیان دەکرد، لەو بەیانییە زووەدا دەنگیان دەڕۆیشت..
ئێستاش نازانم ئەوان چۆن منیان نەبینی، چونکە من چەك و تاخمم پێ بوو.....

لە دوایی ڕۆیشتنیان کاك قادر هاتەلام  بە حەپەساییەوە و پێ ی ووتم:

ئەوە تۆماوی ؟!!! ووتم بەڵی بەبێ ئێوە ناچمە هیچ شوێنێك،دوایی زانیم ئەوانە مۆڵگەکانی خۆیان بەسەر دەکەنەوە و موقیف دەدەنە سەرەوەی خۆیان،ئەو شەوە لەجاددەی دەربەند پەڕینەوە بەرەوبەستی شەرغە،ئێمە زۆرترسمان هەبوو کەمینی مەفرەزەخاسەکان لەپردی(حاجی وسوو)هەبن، بەلام هیچ شتێك نەبوو، تاکو گەیشتینە گوندی نێرەگێن،لەناو دار قەیسی یەکان پشوماندا.. تا کاتەکە بوو بە شەو ئەوان لەویێ بەمنیان گوت ئێمە دەچینە چیای دێدەوان، خۆمان حەشار دەدەین، منیش گوتم من لەگەڵ ئێوە نایەم چونکە کاك هۆشیار بەمنی گوت ئەوانە لەگەڵ تۆن هەتا دەگەیتەوە گوندی(ئاومار) بەلام من گلەیم نەبوو، چونکە نەمان دەزانی چارەنوسمان چۆن دەبێت .. هەربۆیە بریارمدا بەتەنها برۆم .

## مانەوە بەتەنیایی

تەنها مامەوە و ڕێگای بەستی شەرغەم گرتەبەر تاکو گەیشتمە گوندی بەردە سپی، لەوێوە پەریمەوە بۆ هەڵەتەکانی گوندی(ئاومار) بەڵام کە بینیم لەناو حاوی ئاومار گوللەی گردازیان هەلدەدا وجولەی هێزەکانی رژێم لە(خورخور)یش هەبوو ..

لەسەرئەو تەپۆلکە سوّرانەی کە لەنێوان گوندی بەردەسپی و ئاومار بوو پشویەکی باشم دا، بیرم کردوە بگەرێمەوە بەرەودێدەوان لەوێشەوە بەرو ئوردوگای دارەتوو، بەڵام زۆر ماندوبووم،قاچەکانم ئەستور بووبوون،چەند ڕۆژێك بوو تەنها هەندێك نانەرەقم خواردبوو،لە گوندەکانی کانی سلیمانە وگوندی بەردەسپی تەنها دەنگی ئەوسەگانە دەهات کە لەپاش ئەنفال مابوون،گەیشتمە گوندی بانەمورد لەسەر ئاوبارەیەك بەقەمەکەم جێگایەکم هەڵکۆڵی،کلاشنکۆف وتاخمەکەم شاردەوە، تەنیا قەمەکەم لامابوو،زیاتر هەڵکشام بەناوبەستی شەرغەدا،کە لەوشوێنە بەردەکانی شەرغە زۆر زل بوون بەردەوام ساتمەم دەکرد تاکو گەیشتمە نزیك گوندی

بەردبڕ،لەوێ بەتەواوی ڕۆژهەلات،کۆپتەرێکی بچووك کە دوایی گوتیان ئەوە کۆپتەری (قائیدی جەیشە)بەنزمی بەناوهەڵەتەکانی نزیك بەستی شەرغەدا دەسوڕایەوە،خۆم گەیاندە قەمیشەلآنێك تاکۆپتەرەکە دوورکەوتوە، لەژێر هەندێك دارقەیسی هەستم بە جولەی کەسێك کرد، بەراستی من زۆر ماندوو بووم تەنیایش زۆر ناخۆش بوو،بۆیە بۆلای کەسەکەچووم، سلآوم لێ کردو مەتاریەکی گەورەی ئاوی لابوو کە چواردەوری بەفەردەدوورابوو،ئاوەکەی پێشکەش کردم و پرسیاری لێ کردم تۆکێی ؟پاش گفتوگۆ بۆم دەرکەوت پێشمەرگەی تیپی(21) ی کرکوك و 25ی خالخالانن،یەکەم ناوی(رەوەندمەلامحمود)بوو،کەزانیم ئەوان پێشمەرگەن، دلم زۆر خۆش بوو، وامزانی ئیتر لە هەموو تەنگەژەکان رزگارم بووە،منیش پێم گووتن لە 21 ی کرکوك خەلك زۆر دەناسم گووتی کێ دەناسی منیش ئەوکاتی گووتم ( عەول ) دەناسم کاك رەوەند پێ کەنی و گووتی وەلآ ( عەولمان ) لەگەلە .

لەو گفتوگۆیانە بووین کاتێك هێزێك لەو شوێنەی ئێمە نزیك دەبووە بۆیە من و کاك رەوەند بەرەو ناو تەپۆلەکە گردەکان ڕۆیشتین و پێشمەرگە کانی دیکەش لەو سەرەوە هاتن بەلآم من دەبە ئاوەکەم لەگەلٚ خۆم برد،کە دەورێکی باشی هەبوو، لەژێر ئەشکەوتێك خۆمان گرتەوە،هەرلەوێ بە(عەول) شاد بووین(عەول)خەلٚکی گوندی زەردك بوو،خزمایەتی لەگەلٚ منداهەبوو، پێشتر لەگەلٚ برایەکانی بەیەکەوە بووین،کورێکی باش بوو، زۆر یارمەتی دەربوو،پاشان هێزەکە نەگەیشتە لای ئێمە بۆیە هاتینەوە شوێنەکەی خۆمان .

وایێ دەچوو(کاك رەوەند)بەرپرسی مەفرەزەکەبێت کەبەهەموویان یانزە پێشمەرگە دەبوون، سێ لەو پێشمەرگانە هی تیپی خالخالآن بوون،کورێکیان لەگەلٚ بووناوی (صباح) بوو.ئەوان رێگاشارەزا نەبوون،هیچیان چەکیان پێنەبوو جگە لە( رەوەند) دەمانچەیەکی پێ بوو. لەگەلٚ ئەوەشدا سێ کەریان پێ بوو، کە زۆر هاوکار بوون

کاك رەوەند گووتی: پێ دەچێت ئەو هێزە لای چەپی شەرغە بگرێت بۆیە وا باشترە ئێمە بپەرینەوە ئەوبەری بەستی شەرغە، لەوێش ڕەزێکی گەورە هەبوو، فەرمانی کرد یەك یەك بەخێرایی زووبپەرینەوە، خۆمان بگەینینەناو رەزەکە. ئەوەش بۆ ئەوە بوو ئەگەر کۆپتەرهات هەرکەسێك بکوژێ باشترە لە هەموومان .

بەماوەیەکی کورت هەموومان پەڕینەوە، کە لەو راستە بەستی شەرغە زۆر پانە .

تەنها(کەرەکان) لەشوێنی خۆیان مانەوە، لەوێ خەریکی پشوودان بووین کاتێك هێزەکەی رژێم بەرەو لای ئێمە هات بۆیە هەموومان بەشێوەیەکی کتوپڕی لەناو ڕەزەکە دەرچووین بەرەو (هەرەتەکە) ئەو شوێنە تەنها پووش و پەلاشی لێ بوو، من لام وابوو ئەوان ئێمەیان بینیوە،بەلام دەنگیان نەکرد، هێزەکە هاتنە ناو ڕەزەکە، دووئێڤا و ناقیلەیەك بوون.پاش ئەوەی لە یەکترمان پێچایەوە تەنهاکاك (رەوەند) دیار نەبوو،زۆری پێنەچوو هێزەکەئەوشوێنەی بەجێ هێشت،ئێمەش گەڕاینەوە.. تەمەشامانکرد(ڕەوەند)لەسێبەری دارێك خەوی لێ کەوتووە، تاکو پێشمەرگەکان بانگیان نەکرد ئاگای لەهیچ نەبوو،نەشی زانیبوو هێزەکە هاتوونەناوڕەزەکەوە.....

ئەو ناوچەیە پێشتر مقەری حزبی شوعی لێ بوو لەوێ هەندێك ئاردو رۆنمان دەستکەوت،پێشمەرگەکان(ناوساجی)یان دروستکرد،هەندێکمان خواردو ئەوی دیکەشمان لەگەڵ خۆمان برد،من بەهۆی(عەول)وە سواری یەکێك لە کەرەکان بووم، لەپێشەوەش دەڕۆیشتم.تاکو گەیشتینە پردی(حاجی وسو) لەوێ سەرکەوتین و لەناو دۆلێك نزیکی جادە لاماندا و خۆمان و کەرەکانمان حەشاردا .

بۆرۆژی دوایی مەفرەزەیەکی پێشمەرگە کە کاك صباح منتك بەرپرسیان بوو یەکترمان بینی،ئەوهەندێك سەرزەنشتی کردین، کە چۆن دەچینەوە ئوردوگای بنصلاوە،هەر چەند کاك رەوەند و برادەران گوتیان ئێمە خەریکی خۆ شاردنەوە دەبین و تەسلیم نابینەوە

شەوی 1988/9/23 پاش کاتژمێر(12) لەنێوان ڕەبایەکانی دەوروبەری بنصلاوە چووینەناوئوردوگاکەوە.لەوێ لە(عەول)وئەوان دابڕام وسوپاسم کردن، شەو من لەناو ئوردوگای بنصلاوە هیچ شارەزایەکم نەبوو،بۆیە بەناو کۆلانێك دا ڕۆیشتم لە مالێك دەنگی تلفزیونەکەیان دەهات، لەدەرگام دا، کە دەرگا کرایەوە داوای ئەوەم کرد کە شەولەوێ بم،پیاوەکە چەند پەنجەیەکی نەبوو،ناوی (قارەمان) بوو، بەلآم هەتا بلێ بەرێز و پیاوانە وقارەمان بوو ،فەرمووی لێ کردم، ژنەکەی زۆر ژنانە و بەرێز بوو،زۆر بەزەییان بەمن داهاتەوە،ژنەکە ئاوی هێنا قاچ و دەموچاوم شوشت، دوای هەندێك ڕوونی هێنا، قاچم پێ چەور کرد،ژنەکە لێی پرسیم هێلکەو ڕوون دەخۆی یا(ئاشی)ئێوارەت بۆگەرم کەمەوە،من زۆر لە مێژابوو(شیوم) نەخواردبوو، بۆیە داوای ئاشەکەم کرد،پاشان بۆم دەرکەوت کە ئەو مالە گەرمیانی ویەکێتین.. شەوێکی پڕ لە میهرەبانیم لەو مالە بەرێزە بەرێ کرد،پیاوەکە زۆر ڕێنمایی کردم و بەیانی پاش خواردنی کولێرەی گەرم و ماست، بەڕێی کردم، زۆر ممنونی بووم، شایەنی باسکردنە لەوماوەیەدا کە لەو سنوورانە بووین تەنها دوو مەفرەزەی زەحمەتکێشانم بینی یەکیان لەدەشتی(حریر)وئەوی تریان لەنزیك دەواجینەکانی لای (بەستۆرە) بەداخەوە کە دواتر کەتبوونە کەمینەوەو و شەهیدیکیان دابوو .



## موشیری جیهاز :

لەسەرەتای پایزی(۱۹۸۸)دوای کشانەوەی هێزی پێشمەرگە بۆ سنووری ئێران، جگە لەچەند یەکەیەکی پارتیزان کە شەهیدڕێباز لێپرسراوی یەکەی پارتیزانەکانی سنوری تیپەکانی قەرەچوغ ودەشتی هەولیر بەڕانەتی وسەفین وکۆیەش بوو. بارەگایەکی پێشمەرگەکانی تیپی قەرەچوغ و هەولێر لە نۆکان بنیات نرابوو..

مام غەفور سەرپەرشتیەدەکردن. بۆماوەیەك من لە گەڵ ئەو برادەرانە بووم . جهازەکەم لەو بارەگایە دانابوو. زۆری برادەرانی پێشمەرگەی ئەو تیپانەی مابونەوە لەوێ ناسیمن..ئەوکات هەڤاڵ عومەرناسر فەرماندەی کەرت بوو.یەکێك لە شەوەکان مام غەفور ووتی:

- کاکە موشیر ناتانی ڕێبازم لۆ وەربگری..؟

منیش گوتم مام غەفور هەل و مەرجی پارتیزانی ڕێگەیان پێنادا ڕۆژانە جیهاز بکەنەوە و بە ئاسایی پەیوەندی بکەن ،خۆیان چ کاتێك بە باش بزانن دێنە خەت و

هەوالْ و دەنگ و باسەکانی ناوەوە دەگەیەنن. ڕەقابەیەکی زۆر توندی موخابەراتی عێراقیشمان بە سەرەوە بوو. بچوکترین وشەمان بێ تەجفیر کردن بەکار نەدەهێنا. سوتفە دەورو بەری سعات (۱۲) دەنگی جهازەکەی شەهید ڕێبازم بەر گوێ کەوت.. بەدەخەوە نازانم سەید غەوسە بوو یان هەینی بوو.ئاگادارم کردئیشم پێتە, هەڵبەت لەرێگەی ناوژمارەکانمان یەکترمان دەناسیەوە. پێم گوت کاك ڕێبازت لێ نزیکە..؟ گووتی لە تەنیشتمە.. گووتم: مام غەفور دەیەوێ بەیەکەوە قسە بکەن..

بەلاّم ئاگاداربە بە هیچ شێوەیەك ناوی شوێن و جێگاکان نەهێنن ,چونکە خۆت دەزانی دوژمن چۆن انساتی خستۆتە سەرمان. ئەوەی من مەبەستمە ورە بەرزی و ئامانج ڕونی ئەو نەمرەیە. دوای چۆنی و چاکی و خۆناساندنم,هەواڵی برادەران و مامۆستا بەکری پرسی..

دواتر لەگەلْ مام غەفور کەوتنە گفتوگۆیەکی قولْ و سوالفە کردن...

مام غەفور بە ڕموز دەیگوت ئێستا لە فلأنە دۆڵەن چەند کونە بەردێکی هەیە ...

شەهید ڕیبازیش گووتی: بێتوو ناخۆش لەبەر کارەباین و هێواریێ لەبن ڕەشماڵی قوڕامان خواردیە..وەك ئێوە تێگەیشتون وەهانیە.وەزعەکەی زۆربەچێژ باس دەکرد مام غەفور گوتی هەرکە وەرزبوون ئاگادارم بکەوە لۆخۆم دێم بەدلتان دەکەم.. لەکاتیکدا شەهید ڕێبازی نەمر بەو هەموو مەعنەویات و ورەوە تێڕوانینی بۆ داهاتوو هەبوو.. دەیگوت: ئەو شکستە عەسکەریانە زۆر کاتێن یەك زەرە ڕوناکایی نەمابوو ڕژێمی بەعس لەو پەڕی بەهێزیدا بوو, کۆتایی بە شەڕی هەشت ساڵەی عێراق ـ ئێران هاتبوو .پارتیزانەکان لە سەخت ترین بارودۆخدا بوون, متمانە لە نێوان هاوڕێیان زۆر کەم ببۆوە, سێبەری خۆت دوژمنت بوو. زۆر بەداخەوە دوای ئەو هەموو زەحمەتی و گیان بازیە شەهید ڕێباز بەو پەڕی غەدرو نامەردی لە شەڕی ناوخۆ دا بەدیلی شەهیدکرا..



## رەشۆ پونگینە :

لە ٨ / ٨ / ١٩٨٨ چەند پێشمەرگەیەك كە بە پەنجەی دەست دەژمێردراین لە ئەرك و فەرمان دا بووین لە چیای (شەكرۆك) نزیك گوندی شێخ مەحمودیان بەرامبەر گوندی سیساوە تاریكایی شەو بە گولەی گڕدار رووناك دەبوەوە لە هەموو شارو شارۆچكەكانی ئەو سنورە بوو بە تەقە. بە هەموو جۆرە چەكێك گولە بۆ ئاسمان هەڵدەدرا.. ئێمەش چەند پێشمەرگەیەك بووین نەمان دەزانی چی رویداوە . تاكو بەیانی پەنجەمان لە سەر پەلاپیتكەی تفەنگەكانمان بوو...

بەیانی كە روناك بووەوە نزیكە سەعات ٨ چەند پێشمەرگەیەك بۆلامان هاتن. پاش كەمێك پشودانیان یەكێك كە رابەری سیاسی بەناوی(شكوركەركوكی) هەڵسایەوە قسەی بۆ كردین و گوتی :

شەر لە نێوان عێراق و ئێران وەستاوە. ئەو تەقەو گڕدارانەی ئەمشەو پیاوانی رژێم بوون,لە خۆشی وەستانی جەنگەكە بەلاّم بۆ ئێمەی پێشمەرگە كارەسات و ناخۆشیە.. دەبێت بە زوترین كات خۆمان بگەیەنینە سنوری نعێراق ـ ئێران. چونكە رژێمی بەعس ئەو هێزەی كە لە جەنگی ئێران بەكاریدەهێنا لەمرۆ بەدواوە ئەو هێزو چەك و فرۆكانە دژی ئێمە بەكاردەهێنێت, بۆیە هەر ئەو كات بریاری پاشەكشە دراو سەنگەرمان چۆڵكرد.



## محمد گۆران

# پیاوێك لەمەعدەنی ئاڵتوون

ئەگەرمانەوەی پارتیزانەکانی دوای ئەنفال کارێکی سەخت و دژواربووبێت ،ئەوە ئەرکی ئەوسەردەمەی هاوکاری پارتیزانەکانیش کارێکی سووك و ئاسان نەبووە، کاك مستەفا چاوشین یەکێك لە هاوکارەکانی پارتیزانەکان لە تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبووك،بیرەوەری خۆی یاداشت کردووە.لەیەکێك لەو بیرەوەرییانەدا باسی لە پەیوەندی خۆی و پارتیزانەکان و چوونی بۆلای باوکی شەهیدێك بەناوی (محمدگۆران)کردووە.کاك مستەفا لەشوباتی1989 دوای گەڕانەوەی لەدەواجنی مستەفا بۆڕیچی لەگوندی بانەمانی خوارلۆفەکانی پیرمام؛ کەشوێنی شەوانە بەیەك گەیشتنی ئەوان وپێشمەرگە پارتیزانەکانی دوای ئەنفالەکان بووە.شەوێك لەوشەوانە لەگەڵ کاك جلال ئیلنجاغی ومامۆستا کاوەو خواڵێخۆشبوواحمدعبدول وکاك بورهانی سعیدسۆفی وشەهیدهاشم جیهاز موعیدمان دەبێت ؛دوای نانخواردن وگەیاندنی نامە و ڕاسپاردەکان وپێداویستیەکان ووەرگرتنی نامەکان بۆناوشار؛ یەکێك لەونامەچکلێتیانە نامەی کاك بورهان سەعیدسۆفی دەبێت بۆشەهید محمدگۆران ، هەر ئەوشەوە کاك بورهان (شەهید محمدو کاك سەباح خەرابەدراوی وهەندێك خەڵکی تریان پێ دەناسێنێ..تالەکاتی پێویستدا هاوکاری یەکتربن ماڵی کاك مستەفا وئەوبرادەرانە لە کەورگۆسك دەبن، نامەکەی کاك بورهان دەبات بۆکاك(محمدگۆران)بەلام ئەوپیاوە بەئەزموونەنکۆڵی لێدەکات ولەوەڵامدا دەڵێت :

. من بورهان هەر ناناسم .. ئەونامەیە بۆ من نیە... ئەویش بۆ ئەوەی دڵنیا بێت کە بە هەڵە بۆلای کەسێکی تر نەچووە، لێی دەپرسێت: مەگەرتۆ محمدگۆران باوکی شەهید سلام نیت.."کەلەگرتنی شارۆچکەی تەقتەق شەهیدبوو ؟؟

کاك محمدگۆران دەفەرموێت؛بەڵێ ئەوم..بەڵام ئەونامەیە بۆمن نیە..ناهەقی نەبووە، ئەو ڕۆژگارە زۆرسەخت ودژواربوو، بۆیە نەدەبوو وابەئاسانی بڕوابکات ؛

نەك هەرئینکاری دەکات بەڵکو (پلکە حەلیم)ی هاوسەری کاك محمد هەرەشەیان لێ دەکات کە تەسلیمی پۆلیسیان دەکات.. ئیتر کاك مستەفا دوای هەوڵێکی زۆر بۆ دڵنیاکردنەوەیان، نائومێد دەبیت،زۆر نیگەران دەبێت،ئەوکات لە پەیمانگای موسڵ خوێندکاردەبێت ، بۆیە بە ناچاری هەولێر جێ دەهێڵێت و دوومانگ لەموسڵ ناگەڕێتەوە بۆماڵ . دواترکاك محمد پرسیارلە (عومەرحمدامین ئایشۆك) دەکات..

مام عومەریش کاك محمدی دڵنیادەکاتەوەوپێی ئەڵێ کەهیچ نەترسێت وکەفالەتی کاك مستەفایش دەکات. مام عومەرکاك مستەفا لەوتەنگژەیە دەربازدەکات، شایانی باسە جارێکی تریش مام عومەر کاتێك سەلاح شینە دەچێتە کەورگۆسك لەگەڵ مەفرەزەکەی لیستی چەندین کەسی پێ دەبێت بۆگرتن وتەسلیم کردنیان بە ئەمنی هەولێر، یەکێك لەوانەی ناوی سیانی لەلیستەکەدا دەبێت کاك مستەفا دەبێ مام عومەرپێیان دەڵێ ئەوکەسەی ئێوە تاقیبی دەکەن ماڵی لە جەدیدەیە واتە دووجار مام عومەرم فریای کاك مستەفا دەکەوێ، ئیترلەو ڕۆژەوە کە مام عومەر شەهید محمدگۆران دڵنیا دەکاتەوە پەیوەندییان زۆرخۆش دەبێت و بەردەوام سەردانی یەکتر دەکەن کاك محمدیش هەردەم پێی دەڵێت:

مستەفا تۆ برای حکیم واحمدی کوڕمی، ئیتر متمانەو ڕێز وخۆشەویستییان دەگاتە ئاستی مام وبرازا،محمدگۆران پیاوێك لێوان لێو لە خۆشەویستی و ڕێزو حورمەت، قسەخۆش وکوردپەروەرو مەردو لاوك وحەیران بێژو لەهەمووی گرنگتر باوکی شەهیدێکی قارەمان شەهید سەلام بوو. شەهید سلام کوڕی پێشمەرگەیەکی ئازای (ی.ن.ك) بوو..لە 1987لەگرتنی شارۆچکەی تەقتەق شەهید بوو..

بەداخەوە محمدگۆرانی کەسایەتی دیاروخۆشەویستی خەڵك بەدەستێکی ڕەش ونادیار شەهیدکرا.

* سەرچاوە : https://www.facebook.com/mustafa.cawshin/posts/1096061657204942



## کۆچی دوایی
## حاجی حەسەن خدر قازی
## هاوکاری پارتیزانەکانی سنووری هەولێر

زۆرن ئەوانەی بەخانەوادەوەپشت وپەنای شۆڕش وهاوکاری پارتیزانەکان بوون,بەکۆچی دوایی تێکۆشەری کۆچەریان و خانەخوێ بەخشندەکەی شەهید ڕێباز و شەهید مەلاسلێمان و شەهید شاخەوان عباس و برهان سعید سۆفی و جەلال ئیلنجاغی و هاورێکانیان بوون.

لە دەڤەری هەولێریش بۆ پاڵپشتی و هاوکاری ئەوان درێژەدان بەشۆڕش و مانەوەی پارتیزانەکانی دوای ئەنفال هەروا کارێکی ئاسان نەبوو..

ئەمڕۆبەکۆچی دوایی خوالێخۆشبوو(حاجی حەسەن خدر قازی)کەسایەتییەکی نیشتمانپەروەر و دڵسۆزێکی کوردایەتی ماڵئاویی لێکردین..

ڕوحتان شاد هاوکارە کۆچکردووکانی پارتیزانەکانی دوای ئەنفال.

2020/8/15



# ئەردەلان حەسۆ

## پارتیزانی دوای ئەنفال لەدەشتی کۆیە

بەداخەوە مەرگ هەرجارەی تێکۆشەرێکمان لێ دەرفێنێ.. مەرگی کاکە ئەردەلان هەڵوەرانی گوڵێکی تری گوڵدانی پێشمەرگە پارتیزانەکان بوو.. ئەردەلانی حەسۆ وەك ناوبانگ دەکرێ سەرباسی گێڕانەوەی دەیان بەسەرهات و چیرۆك وڕۆمانی قارەمانیەتی پێشمەرگە وخەباتی پارتیزانی دوای ئەنفالەکان بێ.

ئەوپێشمەرگەیەکی جوامێر وخانەدان ودڵ گەورە،کوڕی تەنگانە و لێ قەومان بوو ، کادیری سیاسی و ڕێکخستن وفەرماندەی پێشمەرگایەتی بوو ..

## ژیاننامەی کاکە ئەردەلان

- ئەردەلان حەسۆ نەسرەدین لەدایك بووی 1955 گوندی (کانی بی) دەشتی کۆیە.
- خوێندنی سەرەتایی لەگوندی (بۆگد)و ناوەندی لەکۆیە و ئامادەیی پیشەسازی لەهەولێر تەواو دەکات.
- پەیوەندی بەکەرتی ڕێکخستنی (شەهیدئاودێر).

کادرێکی چالاکی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان دەبێت.

- لەخەباتی شارو شاخ نموونەی کەسی دڵسۆز و فیداکاربووە.
- دوژمنی سەرسەختی بەعسی و داگیرکەرانی کوردستان .

## هەڤاڵەکانی سەردەمی پارتیزانی ئا وا دەربارەی دەدوێن :

- ئەبوزێدصالح : هیچ کەسێکی وا ئازای وەك کاك ئەردەلانم نەبینیووە بەڕاستی پێ ی سەرسام بووم بەتایبەتی لەشەڕی دۆڵی هیران لەکاتژمێری هەشتی بەیانیەوە تا دوازدەی نیوەڕۆ بەرامبەر هەشت دەبابە بەخۆی و دە پێشمەرگە شەڕی کرد، نەی هێلا دەبابەکان بێنە پێشەوە، ڕۆڵی سەرکی هەبووله ئازایەتیدا ...

- مامۆستا زیرەك : هاوری دڵسۆزەکەم ئەردەلان دکتۆرمان بوو لەکاتی پارتیزانی بەناچاری خۆی فێری ناوی داو دەرمانەکان دەکرد و لەبن گەوەرە شاخان دەرمانی دۆزی بۆوە ، ئەوکاتە مار پێوەیدام ، ئەوی زۆر نیگەران کرد ویستی دەرزی دژی ژەهری مارم لێبدا بەلآم دباربوو لەکۆڵەپشتەکەمان کەوتبوو،هەوڵی زۆری دا تەسلیم ببمەوە..من نەمکرد وهەستم دەکرد زیاد لەهەمووان،هاوکارو هاودەردم بوو.

- سەباحی بەکر مەلا: ئەردەلان پیاوەکی مەرد بوو ،زۆر شتم لەدڵە بەلآم نازانم دەریبڕم تەنیا دەڕێم ئەردەلان ئازاترین پێشمەرگە بوو !

- سەفین عومەر: ئەردەلان خاوەن کەسایەتیەکی بەئەمەك،پیاوێکی بەجەرگی مەیدانی شەڕەکان هەروەها پشتیوانی هەڤاڵەکانی بوو !

- مەلا دلشاد: پێشمەرگەی فەرمان و چالاکیە هەرەسەختەکان کاکە ئەردەلانە، ئەوکاتەی چوار دەورمان گیرا یەکەم کەس بوو پێشمان کەوت و ڕێگای بۆ کردینەوە چاوساغی هێزە پارتیزانیەکەمان بوو لەدەشتی کۆیە ،جێگای متمانەوپشت پێ بەستنی هەموومان بوو!

- دکتۆر هیمداد: پیاوێکی سەرڕاست و قەت درۆی نەدەزانی ، هەرگیز مجامەلەی نەدەکرد لەڕاستگۆییدا،ئەگەر کەسێ نەی ناسیبا بەقسەڕەقی دەزانی بەلآم ئەردەلان بەواتای وشە هەست ناسك و برادەری دڵسۆزی هەموو ناسیارانی بوو هەموو پەیوەندیەکانی بەگرینگ و ڕێزەوە دەپاراست !

- كاك ئەردەلان ئارەزووی هونەری هەبوو,شانۆکاری تیپی شانۆی پێشمەرگەبوو، بەشداری شانۆگەری گوندەکانی دەشتی کۆیەی دەکرد لەساڵی1984 لەگوندی کانی بی .لەرۆژانی دوایی تەمەنی لەململانێ ی گەر نەخۆشیەکی کوشندە لەخەستەخانەی شاری لیڤەرکوزن لەئەڵمانیا لەسەرپشت ڕاکشابوو بەزەحمەت هەناسەی دەدا دوای هەواڵپرسی باسی دۆخی ئێستای شاری کەرکوکم کرد .. کە بەعسیە شۆڤینیەکان دەیانەوێ زیان بەکورد بگەیەنن و نیازیان خراپە کەرکوك نەگەرێتەوە سەر هەرێم ،کاکە ئەردەلان هاتە وەڵام بەورەی بەرز و توندی شێرانە گۆتی: ناتوانن ، چۆن دەتوانن کاری وابکەن ؟

وێنەیەکی هۆنراوەیی کاکە ئەردەلان ..

لەگەرمەی ئەنفال و ڕەشبگیری وراتی کۆیە

یەکێ لەپێشمەرگە ئازاکان چاوتیژ و هەڵۆیە

کۆڵەپشتی نانەڕەقەی پارتیزانی لەئەستۆیە

مێژووش دەیناسێ کاکە ئەردەلانی حەسۆیە

لەدوای ئەم ناساندنە دەکرێ بڵێین: بۆ جوانەمەرگی کاکە ئەردەلان لە 2011/3/4 نەك هەریەکێتی نیشتمانی کوردستان وهێزی پێشمەرگەبەڵکوتەواوی گەلی کورد بەهەموو چین و توێژەکانیەوە قەرزاری گیان و مێژووی خەباتی کاکە ئەردەلانی حەسۆیە کە تا هەتایە لەبیرەوەری هاوەڵ وناسیارانی وخوێنەرانیش هەر زیندووە. چوارکچی بەناوەکانی ماتاف، تاماف ، ڕاڤە ، شاڤە لەگەڵ تاقە کورێکی هەشت سالە بەناوی ئاڤار لەدوای خۆی بەجێ هێشت .

* سەرچاوە : دلشاد تاقانە ماڵپەری کۆیە

# پارتیزانەکانی کۆیە وقەڵەمی دڵشاد تاقانە

د ـ عبدالواحید ئیدریس

قاوەخانەی کەلتووری قشڵەی کۆیە.کۆڕێك بۆکتێبی دڵشادتاقانە لە سەرپارتیزانەکانی تیپی93ی کۆیە. 12□11□2015

پارتیزانی قۆناغێکی گرنگ وهەستیاری دوای ئەنفال وسوتماککردنی کوردستانەلە لایەن ڕژێمی بەعسەوە.ژیانی پارتیزانەکان زۆر سەخت ودژوار وئەستەم بوو،بەرەنگاربوونەوەی ئەم ڕۆژگارە تژی لە نەهامەتیە بیر وباوەڕێکی پۆڵاین وپڕ لە عەشقی نیشتیمان وئازادی دەویست،شۆڕشی نوێ هەوراز ونشێوی زۆری دیوە، هەر ڕۆژێکی داستانێك ونەبەردێك وشەهید بەخشین بووە،بەڵام قۆناغی پارتیزانی لە هەموو ڕۆژەکانی تر سەختر وناخۆشتربووە،پارتیزانی دوای ئەنفال مێژوویێکی تایبەت ورووبە ڕووبونەوەی نائومێدی وژیانێکی دور لە ئاوەدانی وبێ نان وپێخۆر وجێ وڕێگا ، ئاسۆی هیواش ناڕوون،لە گەڵ ئەوەش چەندان تێکۆشەر ڕێی خەباتیان بەرنەدا و لە هەموو ناوچەکانی کوردستان مەرگیان بەزاندو پێشمەرگانە خەندەی هیوایان دەبەخشیەوە،باس لەپارتیزانەکان زۆر زیاتر هەڵدەگرێ، ئەوەی لێرەدا مەبەستە نوسەر وپێشمەرگەی دێرین دڵشادتاقانە لە کتێبێکدا قەڵەمەکەی خستۆتەخزمەتی پێشمەرگە پارتیزانەکانی تیپی93 ی کۆیە ولە زاری پارتیزانەکان وبە شێوەزاری ناوچەی کۆیە وڕۆمان ئاسا لە ژیانی ئەو پارتیزانانە دەدوێت نەك وەك مێژوو یان هەڵسەنگاندنی ئەوقۆناغەی شۆڕش، چونکە ئەوکاتە دەبا لە هەموو ڕوویێکەوە باس لەو قۆناغە وتەمەنی پارتیزانی ودابڕان وخۆڕاگری هەتا سەری ئەوانەی پارتیزانیان بە ڕاپەڕین سپارد بکات، دەست وپەنجەی تاقانە خۆش بێت ،هیوادارین قەڵەمە دڵسۆزەکان بێنە دەست تا چەواشەکاران وەك ڕاپەڕین ئەو مێژووەشیان چەواشە نەکردووە.

## تاوانێکی کەم وێنە
## فڕێدانە خوارەوەی (3) پێشمەرگەی پارتیزانی بەزیندوویی لەهەلیکۆپتەرەوە. لە سەربازگەی کۆیە لە بەرزایی ئاسمانەوە

پێشتر لەبیرەوەرییەکانی خۆمدا باسی ئەم کرد،کە دوای دەسپێکی ئەنفالی چوار و ڕزگارکردنی سەدان خێزان خۆم وهەڤاڵەکانم بۆ ماوەیەك چووینە سنووری مەلبەندی 3ی هەولێر لە دۆلی سماقولی و دۆلی بالیسان ..

ئەوەبوو لە بارەگای پێشمەرگەکانی سۆسیالیست کاك (دلزار)و هەڤاڵەکانی باسیان لەوەکرد کە لەسەربازگەی تۆبزاوای کۆیە سێ پێشمەرگەی دیل بەزیندوویی لە هەلیکۆپتەر فڕێدراونەتەخوارەوە...

دوای ڕاپەڕین بەدواداچوونی زۆرم کرد بۆ بەدەستهێنانی بەڵگە لەسەر چۆنیەتی ئەوتاوانە ئەوەبوو دووبەڵگەنامەم دەستکەوت و لە کتێبی (ئەنفالی چوار. لەدادگای باڵای تاوانەکانی عێراق) بلاوم کردەوە بەپێی ئەو دوو بەڵگەنامەیە،دەردەکەوێت کە:هەواڵگری سەربازی سەربازگەی تۆبزاوای کۆیە داوای لێکراوە هەوڵ بدات بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر چۆنیەتی فڕێدانە خوارەوەی 3پێشمەرگەی (ی.ن.ك) بەزیندوویی لە ئاسمانەوە.لەفڕۆکەیەکی هەلیکۆپتەر و چۆنیەتی شەهیدبوونیان..

کە ئەوانیش بریتی بوون لە هەڤاڵان:

1- عەبدوڵا ئەحمەد حەمە ئەمین ناسراوبە (عەبدوڵا خەرابەیی)

2- ڕەحمان ڕەسوڵ سادق خەڵکی گوندی پەڵکانەی دەشتی کۆیە

3- خالید حەمەد ئەحمەد پیرداود / خەڵکی هەولێر

ئەمەی خوارەوە پوختەیەکی ڕوونکردنەوەکەیە:

## بەڵگەی یەکەم:

بەرێز/ یاریدەدەر

بابەت / دەرخستنی راستییەکان

بەرێز بەڕێوەبەری گشتی رایسپاردین کە لێکۆڵینەوە بکەین بۆ ئاشکرا کردنی جۆنیەتی ئەوکارەی بارەگای ( هێزەکانی پارێزگاری نەوت ) لە پرۆسەی ئەنفالی چواردا..کەدەکەوێتە سنووری ئێمە لەکۆیە.لیژنە یەك پێکهات لە نوێنەری هۆبەی (م ا س م باکوور و م ا س م رۆژهەڵات)

لیژنەکە کارەکانی خۆی بە هێمنی تەواوکرد..کە ئەمە پوختەکەیەتی :

1ـلە رێکەوتی 1988/5/13 بارەگای سەرکردایەتی هێزەکانی

پارێزگاری نەوت(ق ق ح ن) بە بریاری فەرماندەی هێزەکان،دوای سەرخستنیان بۆناو هەلیکۆپتەرێکی سەمتی وتوند شەتکدانیان هەڵساون بەفرێدانەخوارەوەی

3 لە تێکدەران لە بەرزایی ئاسمانی بارەگای هۆبەی کۆیە و پاشان مردنیان..

ئەم تێکدەرانە لە کاتی پرۆسەی ئەنفالی چواردا کە دیل کرابوون، ئەو شەڕە لە بەر دووری شوێنەکەی لەخەڵکی کۆیەوە دیار نەبوو، بەڵام لە لایەن زۆربەی پێکهاتەی هێزەکانمانەوە بینرابوو . هەربۆیە ئەو هەواڵە گەییبوو بە خەڵکەکە..

هێشتا زانیاری تەواومان نییە کە هۆکاری ئەم کردەوەیە چی بووە..کە بارەگای فەرماندەی هێزەکانی پارێزگاری نەوت پێی هەڵسابوو.بەڵام لەسەردانێکیدا بۆ بەشکەمان فەرماندە ئاماژەی بەو کارەداونووسراوێکیش پێشکەش بە بەڕیز بەرێوەبەری گشتی کرد(ەنووسراوێکی تایبەت بۆمان بەرزکردوونەتەوە) گوایە بۆیە بەم کارە هەڵساون .پێش گرتنیان تێکدەرەکان تەقەیان لە هەلیکۆپتەرە کان کردووەو ویستوویانە بیانخەنە خوارەوە..

## بەڵگەی دووەم :

نووسراوی ژمارە (10195) لە1988/5/29

بابەت/ زانیاری

گەورەم .. دوای سڵاو و ڕێز

1ـ دەربارەی ئەوکارە(بارق عبداللە)فەرماندەی هێزەکانی پارێزگاری نەوت ئەنجامی داوە ئەم زانیارییانەمان لە بەردەستدایە:

2 . لە ڕێکەوتی 12 ی مایسی 88 سێ تێکدەر لە بەرزایی ئاسمانی بارەگای فەرماندەیی هۆبەی کۆیەوە لە فڕۆکەوە فڕێدرانە خوارەوە..ئەویش بەبەرچاوی زۆرێك لە(جاش) چەکدارەکانی فەوجە سوکوکانەوە.

هاوپێچ دەقی هەردوو بەڵگەنامەکە لە لاپەڕەکانی داهاتوو ببینن:

سەرچاوە: ئەنفالی چوار لەدادگای باڵای تاوانەکانی عێراق / مەلاشاخی

٠٠٤٩٩٩

٥١-٥٢-٤٨٠٣٩٠٦٧٤١٥

بسم الله الرحمن الرحيم

رئاسة الجمهورية
سري
مديرية الاستخبارات العسكرية العامة
مديرية ... - ش٣

إلى / المعاون

م / تقصي حقائق

نسب السيد المدير العام قيامنا بتقصي الحقائق عن ممارسات مقر قيادة قوات حماية النفط في عملية الأنفال/٤ ضمن قاطع مسؤوليتها في منطقة كويسنجق. شكلت لهذا الغرض ممثلين عن شعبتنا ومديرية الشمالية ومديرية الشرقية وأوجزنا اللجنة التي قامت بتقصي الحقائق ميدانياً وبشكل هادئ. وفيما يلي خلاصة ما توصلت إليه.

١. بتاريخ ١٣ آيار ١٩٨٨ قام مقر ق ح ن وبتوجيه من القائد بإركاب (٣) مخربين بطائرة سمتية (بعد أن تم شد وثاقهم) وحلقت الطائرة فوق مقر آمرية قاطع كويسنجق وتم إنزال المخربين من الجو وقذفهم بالحياة... المخربين المذكورين تم إلقاء القبض عليهم بمعارك أثناء تنفيذ عملية أنفال/٤ ولم تشاهد الحادثة من قبل أهالي كويسنجق لبعد منطقة الحادث عن القصبة الا أنها شوهدت من قبل معظم منتسبي آمرية قاطع كويسنجق وتسربت إلى الأهالي... لم تتوفر معلومات عن دوافع هذا الإجراء من قبل مقر ق ح ن الا أن القائد أشار خلال زيارته لشعبتنا وتقديمه تقرير إلى السيد المدير العام (عرضناه بمطالعة خاصة) بأنه اتخذ هذا الإجراء بسبب قيام المخربين المذكورين قبل إلقاء القبض عليهم بفتح النار على الطائرة السمتية وحاولوا إسقاطها

FOR OFFICIAL
USE ONLY

(١ — ٢)

[redacted]

004998

١٥/٦٣.٣٩ ٥١ ...

بسم الله الرحمن الرحيم

رئاسة الجمهورية
السكرتير
مديرية الاستخبارات العسكرية العامة
(مكتب المدير)

سري للغاية وشخصي

العدد : ١٠٠٩٧
التاريخ : ٢٠ / ٥ / ١٩٨٨

سيدي نائب القائد العام للقوات المسلحة - وزير الدفاع المحترم

الموضوع / معلومات

تحية وتقدير سيدي :

١. توفرت لدينا المعلومات التالية والتي وردت من قبل العميد الركن بارق عبد الله - قائد قوات حماية النفط .

أ. بتاريخ ١٢ مايس ٨٨ القي ثلاثة مخربين من الطائرة وعلى ارتفاع عالي وعلى مقر آمرية قاطع كوينجق وامام معظم مقاتلي أفواج الدفاع الوطني .

ب. بتاريخ ١١ مايس ٨٨ ربط رجل وامرأة بحبل ووضعهم في صندوق العجلة .. وقام جنود الحماية بضربهم امام الأهالي .

جـ. قيام قوة بأمرته بتفتيش دور مستشاري أفواج الدفاع الوطني المدرجة اسمائهم ادناه والاستيلاء على مبالغ من المال وحلي ذهبية :

أولاً : المقاتل قاسم فارس - مستشار فوج ٨٥ دفاع وطني .
ثانياً : المقاتل عبد الرزاق اسماعيل - مستشار فوج ٢٠٧ دفاع وطني .
ثالثاً : المقاتل عام بحيي - مستشار فوج ٨٦ دفاع وطني .

٢. مما تقدم .. نقترح الموافقة على تشكيل مجلس تحقيقي بحق الضابط المذكور .. في مديريتنا للأسباب المشار اليها بالمادة (١) أعلاه .

يرجى التفضل بالاطلاع والتنسيب .. مع فائق التقدير والاحترام سيدي .

اللواء الركن
مدير الاستخبارات العسكرية العامة

FOR OFFICIAL
USE

( ١ - ١ )
سري للغاية وشخصي

[redacted]

# چاوەڕوانی

شیعری شاخی

بۆ/ شەهید (عبدالله احمد خەرابەیی)

کەبەزیندوویی لەکۆپتەرفڕێدرایە خوارەوە..

کە لیوانی لێوەکانی

پڕاو پڕی خەندە دەبوو

بۆ پەنجەرەی دڵی هەمووئازیزانی

وەکو سروەی بەرەبەیان بوو.

چۆن دەرگایماڵیان بۆ میوان ئاوالآبوو.

ئاواش دڵی،

گوڤارێکی بەردیدی خۆشەویستان بوو.

فەرموو فەرمووی ، وەک خۆی جوان بوو.

کە دوو هەڵۆی چاوەکانی

بۆ ئاسۆی دووریان دەڕوانی.

دوندی ئاواتی ئاشتی بوو،

چونکە تەنیا لەوسایەوە،

دەگەیی بە کامەرانی.

لە مێژابوو..

لە گەڵ خۆشەویستەکەی دا ،

هیواو ئاواتی هەردووکیان ،

ئاوێزان بوو

ئای ناخۆشە چاوەڕوانی !

هەموو جارێ کە مەلی خەیاڵی دەفڕێ ،

ڕادەچەنی، پێدەکەنی :

( ئۆخەی بۆ ڕۆژی خوازبێنی،

خۆزیا ... بۆ ئەوکاتە خۆشەی ،

لە بەردەرگای ماڵەکەمان،

شایی وگۆڤەند وزەماوەند

بۆ گوند دەبێ بە مزگێنی )

کێ دەیزانی؟

ئەو سایەیەی کەپەلانەی نیازیان بوو

ناحەزان دێن،

دەیکەن بە سووتوی ئاگریان.

کەی ڕەوایە ؟ئەو (نازدار)ەی

بە تان وپۆی بیری ووردی

سەدان تەونی دەهۆندەوە

پێکەنینیان کرد بە گریان.

***

شەو تەواوی ڕاکشابوو،

هێشتا بۆکازیوەی بەیان زۆری مابوو،

هێرش، هێرش.

دەنگە دەنگ لەگوندپەیدا بوو

لە ماڵ دەرچوو ، بەپەلەپەل

لە گەڵ سەدان ئاوارەی تر،

پەراگەندەی کێوەکان بوو.

تاریک وروون،چاو لێک نانێ،

شانی دەنێ بە قەد شانی شاخێکەوە

بە نیازی حەسانەوە

کە ڕۆژ لە" سارا"وە هەڵدێ

پەنا دەبا بۆ ئەشکەوتێ

بە مەبەستی حەوانەوە.

هەر ئەودەمە.

لە هەرچوار لای سنوورەوە.

لە خۆرهەڵات وخۆر ئاوا و

لە باکوور وباشوورەوە.

لە نزیک و لە دوورەوە،

وەک سوپای تاتار ومەغۆل

بەر هەڵدابن لە هەردە وچۆڵ .

شەمشەمەکوێرەی( کۆپتەر) یان،

ڕەو ڕەو ، پۆل پۆل ،

دەبارێنن،سەگبەچەو زۆل

پاش نیوەڕۆ دەدۆزنەوە،

قارەمان وەیوا بە کۆڵ.

چوار کەناری تەیمان دەکەن

هێرش لە سەر هێرش دەبەن

تا ماسولکە و تا مەچەک و . قامکەکانی.

توانای گرتنی گۆی مەمەی چەکیان دەبێ

لە تاو نرکەی تۆقیان دەچی،

هەتا دوا بەردی کەلەک ژەن،

بۆ ئەو چەپەر وپەنابێ .

شاگردەکەی( مامەڕیشە)و

( نەعمانە گۆج) شێلو نابێ

کە مووشەکیش،وەکو ئاواتی دێرینەی

دارو پەردوو بەسەریدا دەروخێنێ

ژار وبارووت بێنی دەگرن،

ئەشکیش چاوی دەنوقینی

لە جیاتی باسکی بلوورین،

پۆستاڵ ڕەشێ، زنجیری تێ دەئاڵێنێ

لە پێش ئەوەی تۆز ودوکەڵ بڕەونەوە..

چەند فڕفڕۆک !

بۆ ئاسمان بەرز دەبنەوە

کاتێ بە ئاگا دێتەوە.

کۆنە برینی دەکولێتەوە.

کە دوو گۆمی خوێن هەڵدێنێ

بە سەدان پێ...

زەوی لە نەوی دەبینێ

دەریای ڕقی شەپۆل دەدات :

دەمبەن بۆ کویٚ ؟

من نامەوەیٚ لەوە زیاتر

لە ( شارەکەی حاجی) دوور بم.

دوا کۆچی من لێرانەوە بخەنە رِیٚ.)

دیارە بەوە. نێو چاوانیان گرژ دەبی !

زیاتر نوقمی تاوان دەبن،

هەڵی دەگرن بە چوار دەستە،

بە زامی بی تیمارەوە ،

لە گەڵ کۆمەڵیٚ جنێودا

بە زیندوویی فرِیٚ ی دەدەنە خوارەوە.

هاوار دەکات : ( ئاوا بە هەڵۆی مردن.

زۆر باشترە. لە سەد ساڵی سەر شۆرِکردن.)

لە پێش ئەوەی چنگ لەم خاکەگیرکاتەوە،

بۆ دوا نیگا

تەماشایی کانی بەر ماڵان دەکاتەوە.

ماڵئاوایی، لە گوندی ( خرابە) دەکاو

خوێنەکەی دەبیٚ بەپەیینی نیشتـمانی،

کۆتایی دیٚ چاوەروانی،

چەندین ساڵەی دەسگیرانی.

ئۆردوگای دیٚلزیٚ 1988

---

* دیوانی شاخی / چاپی یەکەم



# پارتیزانەکان و ڕاپەڕین

لەچوارچێوەی ئامادەکاری یەکێتی بۆ ڕاپەڕین,سەرکردایەتی چەندین دەستەی نوێی پارتیزانی پێکدەهێنێ و دەیاننێرێتەوە بۆسنووری ئەوشاروشارۆچکانەی لەچوارچێوەی بەرنامەی ڕاپەڕیندا دەبن...ڕۆژانی15و16ی شوبات دوای چەند کۆبوونەوەیەك لەگەڵ کورەئازاکانی کۆیەوتەقتەق دووڕەتڵ پارتیزان بۆ ئەودەڤەرە ئامادە دەکەن,هەموو پێداویست و بەرنامەو ئەرکەکانیان بۆدیاری دەکرێ..

- ڕۆژی1991/2/18لەکاتژمێر3ی پاشنیوەڕۆ لە(زەڵێ)وە دەکەونەڕێ,پتر لەماوەی 19کاتژمێر بێ ڕاوەستان بەنێوان دەیان مۆڵگەوسەربازگای ڕژێمدا ڕێگا دەبڕن, هەتادەگەنە (دووگۆمان) لەوێشەوە بۆ کێوەڕەش و بتوێن و کۆسرەت و هەیبەت سوڵتان و دەشتی کۆیە .هەردوو دەستە پارتیزانەکە بەشداری ڕاپەڕینەکە دەکەن وئەرکەکانی خۆیان رادەپەڕێنن..

**ڕەتڵی کۆیە بریتی دەبێ لەم هەڤاڵانە:**

1 ـ مامۆستا باپیر وەیسی

2 ـ مامۆستا زیرەك

3 ـ ئاشتی صابیر میرە

4 ـ بورهان شەوگێری

5 ـ صباح بەکر مەلا

6 ـ حەمەهەڵدێر

7 ـ شەهید کامەران

8 ـ شەهید شێروان

**ڕەتڵی تەقتەق بریتی دەبێ لەم هەڤاڵانە:**

1 ـ مەلاجمال حاجی علی
2 ـ شەهید ابراهیم عوسمان
3 ـ شێخ کریم کاولان
4 ـ انورعمرباغەجنێری
5 ـ هەڵۆڕەش
6 ـ دلزار علی حەمشین
7 ـ شەهید فریاد قەسرۆکی

**لە تەقتەق پەیوەندی دەکەن بەشانە چەکدارەکانی (بروسك) و بەم هاوکارانەوە:**

1 ـ نەوزاد کاکەرەش
2 ـ سەرهەد کانی رەشی
3 ـ نیازی کاکەرەش
4 ـ وەستا سەلام باغەجنێری
5 ـ دلێر تەقتەقی
6 ـ محمدعمر شیوەجانی
7 ـ سەعدی کانی رەشی
8 ـ فخرالدین قەرەناوی
9 ـ محمد سیاسی
10 ـ جوهر سێگردکانی
11 ـ شەهید سوارە ئیلنجاغی
12 ـ رەمەزان گەرمکی

**شایانی باسە ئەم تێکۆشەرانەیش رۆڵی کاریگەریان دەبێ لە راپەرینی تەقتەق:**

**(حاجی حەمەزیاد,رحمان سیدە,هادی خالید,حکیم شهاب,کامەران حەمەزیاد, بەرزان حسن علی, رزگاری حاجی حمە,حاجی عزیزی تاڵەبان ,مەلا بکر ...)**

---

* سەرچاوە :

ـ بیرەوەری شێخ کریم چالاوی

ـ بیرەوەری مستەفا چاوشین



## پارتیزانەکانی رەتلی بتوێن *

1 ـ شەهید عەلی وەیس
2 ـ بەختیار کلاوسوورانی
4 ـ شەهید مستەفا جیهاز
4 ـ صلاح بۆگدی
5 ـ رفیق خەلەکانی
6 ـ رێبین سعید گردجانی
7 ـ صابر حاجی حسن خدرانی
8 ـ بەکر کەڵکە سماقی
9 ـ کاکە مین کەڵکەسماقی
10. عەبدوڵلا چاوشین
11 ـ کەمال رانیەیی
12 ـ علی بۆسکێنی
13 ـ سەید عەزیز

## چەند هاوکارێکی سنووری خەلەکان و کۆیە و بتوێن:

1 ـ مەلاخدری بۆڵی / حاجیاوا
2 ـ شەهید دەروێش کفرەدۆڵی
3 ـ حسن قەرەنی ئاغا خدرانی
4 ـ دڵشاد حسن قەرەنی ئاغا
5 ـ د.فتاح ابراهیم / چوارقورنە
6 ـ ابراهیم کەڵکانی
7 ـ محمود حمەرووت کەڵکەسماقی
8 ـ حارس حمەبۆر بابۆڵی
9 ـ محمد ابوبکر
10 ـ بێستوون / حاجیاوا
11 ـ برایم / حاجیاوا
12 ـ مەلاقادرخەیات /حاجیاوا
13 ـ عەبدولاعەلی شێخاجی
14 ـ مام رەئووف / رانیە
15 ـ اسماعیل راجی / رانیە
16 ـ صلاح راجی / رانیە
17 ـ سەردار(زاوای م. زیرەك)
18ـ م.محمد سەرکەپکان

19 ـ كاك حيدر / رانيه
20 ـ عمر عبدالله / رانيه
21 ـ فاتیح پاپیلانی تەقتەق
22 ـ مستەفا محمدنجم تەقتەق
23 ـ بهرام حمۆل تەقتەق
24 ـ مەلاعوسمان پیرەمەگروون
25 ـ عەولا مستەفا پیرەمەگروون
26 ـ عباس ئامەخان پیرەمەگروون
27 ـ اردلان مەلامحمد پیرەمەگروون
28 ـ عیسی باخەوان چوارقوڕنە
29 ـ مینە سێ تا چوارقوڕنە
30 ـ کاوە عیسی چوارقوڕنە
31 ـ کوێخا برایم کەلاوسوورانی
32 ـ خدر عومەر کەلاوسوورانی
33 ـ خدر خەیاڵ کەلاوسوورانی
34 ـ خدر بچکۆل ژاراوا
35 ـ شەهید عزیز بچکۆل / ژاراوا
36 ـ حاجی احمد/ گەری کەنداڵ
37 ـ عبدولا بەردانگەیی / دۆڵەڕەقە
38 ـ محمدعەولاسوورەگەلەیی
39 ـ شێخ محمد کانی سووری
40ـ شەهید شەمال شێخ محمد
41 ـ شەهید شێخ نەوزەر رانیە
42 ـ کاك واحید خەلەکان
43 ـ محمد جەرگە کانی وەتمانی
44 ـ صدیق مغدید کانی وەتمانی
45 ـ خالە عەبدە کۆیە
46 ـ م. وریا صالح کۆیە
47 ـ کاوە بانەگولانی کۆیە
48 ـ مام رەزا شیوەجانی
49 ـ د. هیدایەت کۆیە
50 ـ زرار عەبدە کۆیە
51 ـ محمد کریم کۆیە
52 ـ مام قوربانی کۆیە
53 ـ عیماد مەلاعلی کۆیە
54 ـ شێرە خەپە کۆیە
55 ـ زرار سوور کۆیە
56 ـ هادی انور کۆیە
57 ـ شیخ محمد کانی سوور
58 ـ شێخ محمد دۆڵی خەلەکان

---

تێبینی: ئەم زانیارییانەم لەکاك ابوزید صالح وەرگرتووە



## پارتیزانی دوای ئەنفال ئەبوزێد صالح

**ناو** : ابوزید صالح مصطفي حمد .

**ڕۆژی لە دایك بوون** / 1 / 7 / 1950 **کۆیە** .

**دەرچووی / پەیمانگای کارگێری یاسا** .

لە 1980/4/10 بووە بە پێشمەرگە .

- سێ ساڵ دوای ئەنفال پارتیزان بووە . 4 جار بریندار بووە .

لە ساڵی 1995 کۆلێژی سەربازیی تەواو کردووە یە کەم خولی فەرماندەی .

ساڵی2005 پەیمانگای کادیرانی تەواووکردووە خولی25 شەهید جەبارفەرمان.

پلە کانی پێشمەرگایەتی لەفەرماندەی مفرەزەوکەرت وتیپ و لەشکر و فەرماندەی فەرماندەیی بڕیوە.

لە پرۆسەی ئازادی عێراق دا یەکێك لە فەرماندەکانی خەتی تەق تەق شوان کرکوك بووە لەگەڵ هێزەکانی امریکا .

لە ساڵی 2004 بووە بەبەڕێوەبەری پۆلیسی دارستان بەشی کۆیە .

- ساڵی 2005 بووە بەلێپرسراوی ناوەندی کۆمەڵایەتی بەپلەی ئەندامی مەکتەب .

لە ساڵی 2005 بە هەڵبژاردن بووە بە کارگێڕی مەڵبەندی ڕێکخستنی کۆیە .

چەندین خولی ڕاهێناز دەربارەی چۆنیەتی هەڵبژاردنەکانم کردووە

لە ڕێکخراوە بیانیەکاز I.R.I.N.D.I سوسیال دیموکرات

لە 2010/5/1 بە هەڵبژاردن بووە بە ئەندامی ئەنجومەنی ناوەندی (ی.ن.ك)

لە کۆنگرەی چواردا بەئەندامی ئەنجومەنی سەرکردایەتی هەڵبژێردرا.



## ژیاننامەی شەهید شێخ نەوزەر

## ـ نەوزەر كريم محمد (شێخ نەوزەر)

. ساڵی١٩٦٤لەگوندی پیّدارەی سوورداش لە خیّزانیّکی هەژار چاوهەڵدیّنیّ .

. ساڵی١٩٨٢لە (کەرتی ریّکخستنی قەڵادزیّ) پەیوەندی دەکات بە(کۆمەڵە)ەوە.

. ساڵی ١٩٨٣لەتیپی ٤٣ی ئاسۆس دەبیّت بە پیّشمەرگە.

. ساڵی ١٩٨٥ خۆی دەگوازیّتەوە بۆ تیپی ٢٣ی سورداش.

. لەشەڕی گولیجە بریندار دەبیّ.

. بەشداری شەڕی قەیوان . ماوەت دەکات لەویّش بەسەختی بریندار دەبیّت.

شۆڕش بۆچارەسەردەنیّریّتە ئیّران.دوای هاتنەوە دەبیّتەجیّگری فەرماندەی کەرت.

. جاریّکی تریەهۆی برینداری دەستیّکی لەکاردەکەویّ.دیسان دەینیّرنەوە بۆ ئیّران.

. ساڵی١٩٨٨ دەکریّتە فەرماندەی کەرت.

تا دوای ئەنفالەکان دریّژە بەخەباتی پیّشمەرگایەتی دەدات.

. لەساڵی١٩٨٩لەسەرداوای(م.س) یەکیّتی گەڕاوەتەوە بۆکوردستان.

بۆ ڕزگارکردنەوەی ئەو پارتیزانانەی کە لە پیرەمەگرون و چەم ڕەزان مابوونەوە.

. لەگەڵ کاك شەماڵ پەیوەست دەبنەوە بە سیدحاجی ومستەفا زۆراب لە ڕانیە.

بەمەبەستی هاوکاری پارتیزانەکان..

. چەندین چالاکی سەرکەوتووانە ئەنجام دەدەن.چەندین دەستە لە پیّشمەرگەو فەرماندە و بریندار دەگەیەننەوە بارەگاکانی سەرکردایەتی یەکیّتی لە ناوزەنگ.

. بەداخەوە بەهۆی خیانەتی خۆفرۆشیّکەوە ئاشکرادەبن ولەرۆژی١٢. ١٢. ١٩٨٩ لەئۆردوگای حاجیاوا دەسگیر دەکریّن و پاش ١١ مانگ لیّدان و ئازارو ئەشکەنجە لەزیندانەکانی ڕژیّم لە ٢١ . ١١ . ١٩٩٠ لەگەڵ هاوڕیّیان سەیدحاجی و مستەفا زۆراب و شەماڵ و گەنجۆ لە قەسابخانەی ابوغریب لەسیّدارە دەدریّن.

. لە٣١ .١١.١٩٩٠تەرمەکەی دەهیّنریّتەوە بۆ پیرەمەگرون لەویّ بەخاك سپیّردریّ.



## شەهیدی پارتیزان

# عومەر محێدین

فەرماندەیەك ژیانی گەنجی و لاوێتی لەشاخ و زیندان بەسەردەبا، پارتیزانێك، دوای ئەنفالەکان شاخەکانی کوردستانی بەجێ ناهێڵێ، خاوەنی مەدالیای شەرەف پارتیزانی، شەهیدی پارتیزان عومەر محێدین،لەساڵی 1958 لەبنەماڵەیەکی کوردپەروەرو هەژاری قەلادزێ چاوهەڵدێنێ، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی و ئامادەیی لەوشارەدا تەواو دەکات لە1982پەیوەندی دەکات بەرێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە، دواتر بەرپرزەکانی کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردستانەوە ئیشوکارەکانی سەرکەوتووانە جێبەجێ دەکات، لەپۆلی شەشەمی ئامادەیی لەلایەن دامودەزگاکانی سەرکوتکەری رژێمی لەناوچووی سەدام حسێن لەئەمنی قەلادزێ زیندانی دەکرێت، لەئیشوکارەکانی رێکخستن و رێکخراوەیی لەگەڵ چەندین هاورێیەکی لەئەمنی قەلادزێ، دوای ئەشکەنجەو ئازارێکی زۆر شەهیدی نەمر تەنیا وشەیەکیش نادرکێنێ، دواتر ئازادیان دەکەن، دوابەدوای ئەمە شەهید عومەر خەباتی شار دەگوازێتەوە بۆ خەباتی شاخ و چەکی پێشمەرگە دەکاتە شان، شەهید عومەر محێدین لەچەندین داستاندا ئازایانە بەشداریدەکات.

وەکو داستانی شەدەڵە کەشەڕی دەستەو یەخەی تێدادەکرا لەگەڵ قوات خاسەو حەرەسی جمهوری تایبەتی رژێمی لەناوچووی سەدام، هەر لەم شەڕەدا مەحمود رازانی لێپرسراوی، واتا سەرتیپی53ی جوتیاران بەسەختی برینداردەبێت شەهید عومەرو هاوڕێکانی نایەڵن سەرتیپەکەیان بەر دەستی دوژمن بکەوێ و ئازایانە رزگاریدەکەن، بەلام سەد مەخابن بەهۆی سەختی و کاریگەریی برینەکەی و سەرماو سۆڵەی ئەوکات بەسەر کۆڵی هاوڕێیەکانیەوە گیانی دەسپێرێت و شەهیددەبێت، هەروەها شەهید عومەر رۆڵێکی جوامێرانەی دەبێ لەداستانەکانی رزگاری و شەدەڵەو چەندین داستان و بەرگریکردن دژی ئەو زوڵم وستەمەی دەرهەق بەگەلی کورد دەکران.

لەدوای ئەنفالەکان پێشمەرگەیەکی پارتیزان و یەکێك بوو لەو 300 سێ سەد پێشمەرگە پارتیزانەی کە شاخەکانی کوردستان بەجێناهێڵێ و خەبات دەکات دژی دیکتاتۆریەت، لەراپەرینە مەزنەکەی بەهاری ساڵی 1991 دەکرێ بەلێپرسراوی بنکەی تۆبزاوای یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان سەر بەشاری هەولێرو دوای کۆڕەوەمەزنەکەی ساڵی1991یش دەکرێ بەفەرماندەی تیپی31ی هەرمێن، لەهەمان ساڵیشدا دەکرێ بەفەرماندەی تیپی ساوێن لەدوای هەڵبژاردنی پەرلەمان ودروستبوونی حکومەتی هەرێمی کوردستان دەبێتە ئەفسەر لەیاریدەدەرێتی ئاسایشی قەلادزێ، دواتر ماوەیەك سەرپەرشتی ئاسایشی قەلادزێ دەکات و دەگوازرێتەوە بۆ کۆمیتەی رێکخستنی قەلادزێ و پلەی کارگێری کۆمیتەی رێکخستنی پێدەدرێت، پاشان لە تەشکیلەی هێزی نیزامی کوردستاندا جارێکیتر چەکی پێشمەرگایەتی دەکاتەوە شان و دەبێتەفەرماندەی تیپی تایبەتی کوبرا لەقەلاچوالان، شەهیدی فەرماندە مەدالیای شەرەف پارتیزانی لەلایەن سکرتێری گشتیی(ی.ن.ك)بەرێزمام جەلال پێدەبەخشرێ،شەهیدی فەرماندە عومەر محێدین

قاڵبووی بۆتەی خەباتی ڕەوای گەلێکی ستەملێکراو بوو،مەسەلەی ڕەوای گەلەکەی و باوەڕبوون بەڕزگاری وسەرفرازیی گەلەکەی وایلێکردبوو هەمیشە لەپێشەوەو لەناوسەنگەرەکانی خەبات و تێکۆشان بیّ بە شاهیدی هەموو هەڤاڵان و برادەرانی، هەمیشە کەئەرکێکی پێدەسپێردرا ئامادە دەبوو بەبیّ هێنانەوەی هیچ بیانوویەك .

شەهید کەسێکی ڕۆشنبیرو قسەخۆش وقسەزان ورۆح سوك بوو، لە هەرشوێنێك قسەی دەکردبۆبرادەرانی یا بۆنەیەك بووایە سەرنجی هەموویانی بۆلای خۆی ڕادەکێشا، نمونە ئەم سەرگوزەشتەیە یە: لە گەرمەی شەڕدا باوکی یەکێك لەو پێشمەرگانەی کەلای شەهید عومەر محێدین دەبێت دەچێت بۆلای شەهید و داوادەکات کورەکەی بنێرێتەوە تاواز لەپێشمەرگایەتی بەێنێت ،بەلام شەهید عومەر بەجۆرێك قسەی بۆدەکات سەرنجی ڕادەکێشێت و وای لێدەکات کە لەهەلو مەرجێکی ئاوادا پێویستە هەموو هاڤالان و ئەندامان ئامادەبن بۆ بەرگریکردن لە(ی.ن.ك)بەو جۆرە باوکی ئەو پێشمەرگەیە نەك کورەکەی ناباتەوە بەڵکوو بەجۆرێك باوەڕی دەگۆڕێت و بەشەهید عومەر دەڵێت: کەواتە تفەنگێکیش بدەن بەمن دەبمە پێشمەرگە ولەگەڵ ئێوەدا دەبم.

بەداخەوە دوای ئەم هەموو شەڕو شەونخونییەو ماندووبوون و کوێرەوەرییە لەشەوی 1995/7/14/13 لەشاخی (چەقڵی سپی) بەسەختی برینداردەبێت، بەهۆی کاریگەریی برینەکەیەوە لە1995/7/14 دەگاتە کاروانی نەمران.

شەهید لەدوای خۆی منداڵێکی چاوگەشی جوان بەجێدەهێڵێت بەناوی (وڵات)



## بۆ هەردوو شەهیدی پارتیزان
## عمر محی الدین و ماموستا مەهدی

ئەی سەر بە رزترین سەربە رزە کانی دنیا، ئەی خۆشەویستان ئەی ئازیزترین ئازیزەکانی دنیا ئەی نەسیمی شارە جوانە کەی قەلادزی ئارامی دڵی قەڵادزێ هەلۆکانی سەربەرزی شارە کەم ئیوە ماندویتی گەلیکتان شکاند کە دەمێك بوو ئازاری چەشت بوو،بوونەخۆری ئازادی وبەفری سەرکەشی قەندیل، ئەی هەردوو کوڕە ئازاوجەربەزەکەی شارەکەم فەرماندە وپارتیزانە کانی کوردستانم، کە بستێك خاکی کوردستانتان نە گۆڕیە وە بە قەسرو قەیسەری کە دوای ئە نفالەکان خاکتان جێ نەهێشت وئە شکەوتەکانتان کردە ماڵە گەورەکەی خۆتان ئەی ئازاوهەڵمەت بەرەکانی شۆرشی نوێ بەرابەرایەتی یەکیەتی نیشتمانی کەئێوە تفەنگتان هەڵگرت جورئەت کەم، کوردستان بێکەس بوو،شارەکەم بێ دایك بوو بەلام ئێوە هاتن ومزگێنیتان بۆشارەکەم هێنا،گزنگی بەیانیتان بەخشی بەقەلادزێ کەم .

---

*سەرچاوە : فەیسبووکی ابراهیم محی الدین ـ قەلادزێ



# پێشمەرگەی دێرین
# شێخ عبداللە شێخ محمد
# بیرەوەری خۆی ئاوا دەگێڕێتەوە

لەکاتی ئەنفالدا ئێمە لەسنووری مەڵبەندی 3 بووین، لەکوتایی عەملیاتی ئەنفالدا. بەرەوسنووری ئێران بەڕێکەوتین،سەرەتا لەئۆردوگای هەنگەوێ نیشتەجێ بووین. هەڤاڵ شێخ نەوزەر هات بۆلام،گوتی مەکتەبی سیاسی،رایسپاردووم کەبچینەوە لە ناوچەکانی خۆمان دەست بەکاروچالاکی بکەینەوە،بۆکاری رێکخستن بەپارتیزانی بڕۆینەوە بۆ ناوچەکانی بیتوین وخۆشناوەتی وکویە ودەشتی هەولێر...

لەگەڵ کاک کۆسرەت وکاک ملازم عمردا،باسی تۆ وکاک شەمال م کردووە، بەڵێنیان پێداوین هاوکاری تەواومان بکەن.لەسنووری بیتوێن کاک سەیدحاجی وکاک مستەفا هاوکارمان دەبن.بیداویستیەکانیان بۆدابین کردوین، گەڕاینەوە بۆناوچەی بیتوێن. دەستبەکاربوین،بۆزیندووکردنەوەی رێکخستنەکان،یەکەم مەفرەزە کەئێمە هێنامانە خوارەوە مەفرەزەکەی(نەریمان سالەیی)بوو،لەبناری قەندیل کەوتبوونە کەمینەوە کاک نەریمان دابڕابوو.پاشان گەیبووە رانیە، بەڵام(عوسمان)و (عزین)و (حمەبڕنەو) گەیشتنە حاجباوا لەماڵی ئێمە مانەوە، بۆماوەی چەند رۆژێك شوینەکەمان زۆر ئاشکراودیاربوو،ویستمان شوێنێکی تریان بۆدابین بکەین،بەڵام کەسێك ئامادە نەبوو بۆشەوێك بیان حەوێنێتەوە....ماڵی ئێمەش ئاشکرابوو،تراکتۆرێکمان هێنا، چەك وتاقمەکانمان کردە ناوگونیەوە،دوو بۆسیێ ماڵمانکرد کەس لێی وەرنەگرتین، ماڵەکانیش جێگەی سیقەیش بوون،پاشان بردمانن بۆماڵی کاك شەماڵ، دیاربوو شەهیدعوسمان داوای کرد دایك وخوشکەکانی ببینێت،شیخ محمد باوکی کاك شەماڵ چوو بەدوایاندا .هێنانی بۆحاجیاوا.نەریمان نەگەیشتەوە لامان لەرانیە

مابۆوە لەماڵی کاك شیخ نەوزەر،سیانەکەی ترگوتیان چیتر لێرەنابین، دەچینەوە بۆ دەشتی هەولێر،لەگەڵ کاك شەماڵ پەیوەندیمان کرد بە(م س)ەوە، شەو جوینە بەرزاییەك دور لەحاجیاوا. گوتیان نابێت برۆن بۆ دە شتی هەولێر...بابگەڕینەوە بۆسەرکردایەتی،بەڵام ئەوان رازی نەبوون بگەڕێنەوە،گوتیان گەر بۆشەوێکیش بێت دەچینەوە دەشتی هەولێر،پاشان شەوێك لەگەڵ شەهید شەماڵ بردمانن بۆ ناوچەی خۆشناوەتی،بۆ گوندی سکتان وکانی کفرۆك.(م.س) گوتیان ئیتر پەیوەندیتان پێیانەوە نەمێنێت،چیتر هاوکاریان مەکەن، پاشان جوو بوون بۆ دەشتی هەولێر، نەریمان یش هاتەوە حاجیاوا لای ماڵی ئێمەبوو، ماوەی مانگێك مایەوە،پاشان رەوانمان کردەوە بۆسەرکردایەتی.جەماعەتیش گەیشتنەوە دەشتی هەولێر، جووبوونە لای دەواجنەکان. عوسمان نامەیەکی ناردبوو بۆکاك اسماعیل ی پوورزای (شەهیدگەنجۆ)ئەویش هاتبوو بۆلایان پێویستیەکانی بۆهێنابوون، پاشان (حەمەبڕنەو)داوا لەعوسمان دەکات کە نامەیەکی بۆ بنوسێت بۆ گەنجۆ، دەچێتە هەولێر پێش ئەوەی بجێتە لای گەنجۆ دەجێتە دایەرەی(امن) نامەکەیان پێدەدات، مەفرەزەیەکی امن دێنێت .عوسمان وعزیز شەهید دەکەن،پاشان یەکسەر دەچن گەنجۆ و دایك و 4 خوشکی عوسمان دە گرن ..دایکی عوسمان بە زور دێنن بۆحاجیاوا بۆ ماڵی کاك شیخ محمد باوکی شەهید شەماڵ لەو رۆژەدا کوبۆنەوەمان هەبوو، بۆکارێکی زۆر گرنگ،کاك شیخ نەوزەرو عوسمان محمد وعوسمان واحید و شیرزادعزیز گیران، لەگەڵ ماڵی شیخ محمد.شەماڵ لای من گوتی: بڕیاری گرتنم بۆ دەرچووە.. لەاستخبارات بەدوامدادەگەڕێن،خزمان هەمووکۆببوونەوەئاگاداری ئەو کەسەیانکرد کەخەبەری لێدابووم،دیارە بەلگەی هەبوو لەسەرچەند (پ.م)تر کەپەیوەندیان بەمنەوەکردوە، لەریگای فەخرەدینی برای (شەهیدمامەریشە)ەوە، کە لەگەرم کەنداڵ بوو لە خوارسەرکەپکان ،لەماڵی حاجی احمد،شەمال رۆیشتەوەماڵ.

خوشکەکەیان نارد دەرگا بکاتەوە،دەرگای حەوشەی کردبۆوە.گوتبووی ڕاکە، ئەویش ڕای کردبوو،تەقەیان لێکردبوو،بەڵام بۆیان نەگیرابوو،زۆرگەڕابوون،نەیان دۆزیبووەوە،منیش ئاگادارکرامەوە، خۆمان شاردەوە،شەهید نەوزەرو عوسمانی محمد وشێخ محمدوخێزانی کەتازە منالی ببوو،کوڕێك و 4 کچیان بردن بۆزیندان بۆهەولێر،لەماڵی شەهیدشەماڵ چەکەکانمان وجیهازو کۆمەڵێك بلاوکراوە وناوی ڕێکخستنەکان وهەندێك نامە..بەردەست کەوت بوون.بەڵام پێشتر کاك سەیدحاجی و کاك مستەفاگیرابوون. دواتر زۆربەی ڕێکخستنەکانمان گیران ...

لەرێکەوتی 11/21/هەڤاڵان سەیدحاجی ومستەفا کرکوکی وشێخ نەوزەروشەمال و گەنجۆلەسێدارەدران.هەندێك لەبرادەران حوکمدران، (محمدعوسمان کانی سوری)و (نوزاد)وچەند کەسێکی تر بوون کە بەداخەوە ناوەکانیانم لە بیرنەماون....

## ناوی ئەو هەڤاڵانەی کە هاوکارمان بون:

1ـ عبدالله مام علی شیخ حاجی، بەتراکتۆرەوە.وەك ڕێکخستن خەتی ملائاری .

2ـ شیخ مارف سەید احمد خەلەکانی بە زۆر تراکتۆری ئەومان بەکار دەهێنا.

هەڤاڵانی ڕێکخستنمان کەکاری زورقورسیان لەسەرشان بوو.

3 ـ جبار شیخ محمدی برایم شیخ

4 ـ عمرو شیخ صمدی قازبەگیان ـ دوو برا بوون.

5 ـ محمد و عزیزی مام عارف سورەقەڵا لەدوکان و پیرەمەگرون.

5 ـ شەهید فایق شیخ صدیق.جبار

7 ـ شیخ ستار.

8 ـ خالید حاجی عبدالرحمان کە لەگیراوە کان بوو.

9 ـ شیخ عمر برای شە هید نەوزەر لەرانیە.

10 ـ عبد اللەی مام رسول لەرانیە پیاوێکی زۆر شۆڕشگێڕو ماندونەناس بوو.



**کریم عبدالله مامیل ئۆمەرگومەتی**

**یەکێکی تر لە هاوکاری پارتیزانەکانی هەولێر**

**کاك عبدالکریم عبداللەحمە( ئۆمەرگومەت)ی ناسراوە بە (کریم عبدالله مامیل) خەڵکی گوندی (ئۆمەرگومەت)ی ناحیەی سێگردکام ، ئەم پیاوە ئەو قارەمانەیە کە مەفرەزە پارتی زانەکانی ی ن ك )دوای ئەنفالی لە ساڵی ١٩٨٨ دەحەواندەوە لەسەر ئەرك و مەسرەفی خانەوادەکەی کەژمارەی پارتیزانەکان یەکەمجار(٣٠)پێشمەرگە و دواتر کەم بوونەوەبۆ(٠-) پیشمەرگە..ماوەی(١٤)مانگ هاوکاری پارتیزانەکان بووە، نامەکانیانی هاوردوەو بردووە تاڕاپەڕینی ١٩٩١واتا ڕایەڵەی نێوان ڕێکخستنەکانی ناو شارو ئەو مەفرەزە پارتی زانانە بووە ..**

## ناوی ئەوپارتیزانانەی هاوکاریان بووە :

١ ـ شەهید رفعت عبدالله پیرداود( ڕێباز)

٢ ـ هەڤاڵ برهان سعید صۆفی

٣ ـ هەڤاڵ جلال ئیلنجاغی

٤ ـ شەهیدملاسلێمان

٥ ـ شەهید هاشم جیهاز

٦ـ شەهیدئاسۆ معلم

٧ ـ شەهید حمەدسوسەیی

٨ ـ هەڤاڵ ڕحمانە ڕەش

٩.مامۆستا بێستون

١٠ـ هەڤاڵ ئازاد ناوێك

١١ـ هەڤاڵ مەلا غازی

١٢ـ هەڤاڵ عباس عەوێنە

١٣ـ هەڤاڵ کاوە انوەر نادر (مامۆستاکاوە)

١٤ـ هەڤاڵ ابوزید صالح

١٥ .ئەحمد عبدول ئیلنجاغی

١٦ .مامۆستا ڕەنجدەر ناسروە بەعمیدئامانج

١٧ـ هەڤاڵ ادریس مستەفا

١٨. هەڤاڵ ڕەوسە

---

* چاوپێکەوتنێکی جومعە شێخ زێنی لە فەیسبووك



# بەشی هەشتەم



## پارتیزانەکانی سۆران و رواندوز و کاروخ و بالەکایەتی و خۆشناوەتی



# ژیاننامەی
# سەرکردەو پارتیزان
# شەهید حەسەن کوێستانی

- حەسەن ئەحمەد عبداالله  ناسراو بە (حەسەن کوێستانی)

- لە ساڵی ١٩٥٠ لە خێزانێکی وڵاتپەروەر لە دایك بووبوو .

- لەشەستەکان تا هەرەسی ١٩٧٥ کادرێکی چالاکی بزووتنەوەی خوێندکاران بووە.

- ڕۆژی ١٤/١١/١٩٧٢ پەیوەندی بە (کۆمەڵەی مارکیسی لینینی کوردستان) کردووە.

- دوای نسکۆی شۆڕشی ١٩٧٥ لە١٩٨١بووە بەفەرماندەی هەرێمی(١٢)ی سۆران.

- لە ١٩٨٣ بووە بە لێپرسراوی سەربازیی مەڵبەندی سیّ ی هەولێری یەکێتی ..

- لە١٩٨٤بووە بە ئەندامی جێگر لە سەرکردایەتی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان

- لە ١٩٨٤دا بووە بەئەندامی دەزگای ڕێکخستنی کومەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان، لە ساڵی ١٩٨٥بووە بە لێپرسراوی مەڵبەندی سێی هەولێر. دوای ئەنفالەکانیش لێپرسراوی پارتیزانەکانی پیّ سپێردراوە و ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە لە ڕێکخستن و ناردنەوەی پێشمەرگە بۆ ڕۆژهەلاتی کوردستان ڕێکحستنەویان ..

- ماوەی ٤٠ ڕۆژ لەگەڵ پارتیزانەکان ماوەتەوە و جەولەی کردووە بە ناوچەکاندا ..

**هاوڕێ پارتیزانەکانی کوێستانی**:

1 ـ شەهید جەلال حاجی (فەرمانده)
2ـ نەجات عەلی
3 ـ رزگار جەعفەر هاودیانی (فەرمانده)
4ـ عبدالرزاق احمد
5ـ ئیدریس گەلاڵی
6ـ شەهید یوسف
7ـ مامۆستا ئەسعد گۆزێ
8ـ عمر دارالسلامی
9ـ عومەر کەوەرتی
10ـ نوری بلەیی
11ـ مەلا کەریم
1ـ د. ئاری احمد( پزیشك)
13ـ هەڵمەت صدیق

ـ لەراپەڕینی 1991 سەرپەرشتی بەشێك لەهێزی پێشمەرگەی کردووە بۆ رزگاری کوردستان،رۆڵی بەرچاو ودیاری هەبووە تا رزگارکردنی کەرکوك، سەرکردایەتی و سەرپەرشتی شەرەکانی کردووە...

ـ لە شەری دەربەندی کۆرێ بەرجاوترین رۆڵی هەبووە.

ـ لە سالی ١٩٩٢ بووەتە لێپرسراوی مەڵبەندی ٤ ی بادینان.

ـ نووسین و وتاری لە زۆربەی رۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکان دا بڵاوکردۆتەوە،

ـ خاوەنی ئیمتیازی گۆڤاری (سەرهەڵدان) بووە.

ـ لە مانگی ١١ی ساڵی ١٩٩٣ چووە بۆ ئەڵمانیا و وەك نوێنەری( یەکێتی) بەشداری لە کۆنفراسی پارتی سەوزی ئەڵمانی کردووە...

ـ دڵسۆزانە بەردەوام بووە لە ئەرك و لێپرسراویەتی وەك کادیروفەرماندە وسەرکردە ونوسەروپەرلەمانتارسەرکەوتنی تێدا بەدەستهێناوە..

ـ سەرکردایەتی و بەشداری سەدان چالاکی و نەبەردو داستانی گەورەی کردووە

ـ ساڵی ١٩٨١ برایەکی بە ناوی (عوسمان) ناسراو بە (حەمەڕەش) شەهید بووە و ساڵی ١٩٨٣ش برایەکی تری بە ناوی (حاجی) شەهید بووە..

ـ لە کاتێکدا ئاگری شەڕی ناوخۆ هەڵگیرسا شەهید کوێستانی زۆر هەوڵیدا ئەو ئاگرەی نێو ماڵی کورد بکوژێنێتەوە ، بەڵام بەداخەوە دواجار خۆی بووە قوربانی گەیاندنی پەیامی ئاشتی و لە بەرواری 1994/5/17 لەگەڵ یوسف ابراهیم گەلاڵەیی ئامۆزای و خولەی برای و هەریەك لە هاوسەنگەرەکانی ( سەید خدر و محمد و خدر حەمەد و مینە ئەحمەد) لە کەمینێك داشەهید دەکرێن و دەچنە کاروانی نەمرانەوە.

## بەرەی هەڵەموند

لە ١٩٨٨/٨/٢٨بەبڕیاری سەرکردایەتی بەرەی هەڵەموند ـ گەروومەنجەڵ چۆڵدەکرێ.

لە ١٩٨٨/٥/٢٣بەرەکانی درەبی،سەری دیزیلە،دەرگەڵە،زینی گەڵیو سەری ئەحمەدە بە هێزەکانی تیپی (٧٨)ی کارۆخ سەنگەرەکانیان ئاوەدان دەکرێنەوە. قۆڵەکانی ئەو جەبهانە دابەشی سەر کەرتەکانی کارۆخ دەکرێن، قۆڵی هەڵەموند ـ زینەتیر و دەرەداسن بە فەرماندەیی رەحمانی حاجی خدردەدرێ، لەناو ئەو قۆڵەشدا قۆپی دەرەداسن دەدرێ بە شەهید عبداللە تەها، قۆڵی ئەحمەدە دەدرێ بەبرادەرانی سۆسیالیست بەر فەرمادەیی شەهید جوتیار وەرتی، قۆڵێ زینی گەڵی دەدرێ بە برادەرانی پارتی،درەبی بۆکەرتی (٧) و قۆڵەکانی دیزیلە و دەرگەڵە بۆ کەرتەکانی (4و5) دادەنرێن.. بە فەرماندەیی شەهید رەحمان سەیدەو شەهید مەلای مەحمودو صلاح دیلمانی،دواتر سەرجەم قۆڵەکان لە هەڵمەمووند لە ١٩٨٨/٥/٢٩ یەکتر دەگرنەوەو ئەو جەبهەیە بۆ سێ مانگو پێنج رۆژ بەردەوام دەبێ، کە تییدا وێرای زیانی زۆری رژێم کۆپتەرێکی سەربازیش لە جۆری سەمتی دەخرێتە خوارەوە...

ـ لە ١٩٨٨/٨/٨ بەهۆی وەستانی جەنگی(عیراق ـ ئێران)ەوە رژێم سەرجەم هێزەکانی بۆ کوردستان دەکێشێتەوە بۆئەوەی روبەڕوی هێزەکانی پێشمەرگە ببێتەوەودوایین شاڵاوەکانی ئەنفالیان جێبەجێ بکەن.

بەم هۆیەوە سەرکردایەتی ی.ن.ك وەك پلانێك بڕیاردەدا هێزەکان بکات بەدوو بەشەوە و ستراتیژی بەرەنگاربوونەوەی ڕژێم لە شەڕی ڕووبەڕوو بگوازێتەوە بۆشەڕی پارتیزانیو جۆشدان وسازدانی جەماوەربۆ بەرپاکردنی ڕاپەڕین، هەر بەو هۆیەشەوەچەندان وەحدەی پارتیزانی لەناوچەکانی کوردستان کەپێشتر ناوچەی ڕزگارکراوبوون ،پێك دەهێنرێ ، لە وانە وەحدەی (75) لە سنووری مەڵبەندی سێ بە فەرماندەیی شەهید حەسەن کوێستانی دەبێ،دواتر وەحدەیەکی تر بەناوی وەحدەی کارۆخی پارتیزانی بەفەرماندەیی شەهیدرەحمان حاجی خدری وەرتی کە ژمارەیان (34)پارتیزان دەبێ پێکدەهێنرێ.

قۆڵی رەتڵی(75) کە شەهید کوێستانی(١٤)پێشمەرگەدەبن،سنوورەکەیان زینەتێر، دۆڵی بالیسان، هەردووبلەی خواروو- سەروو دەبێ.

رەتڵی کارۆخ دوای ئەوەی چاوساغی بۆپەڕینەوەی پاشماوەکانی هێزی پێشمەرگە دەکەن.. بۆ دۆڵی باڵەییانو بناری قەندیل ..

لە ١٩٨٨/٨/٢٩ دەست دەکەن بەچالاکی پارتیزانی وخۆیان و پلان دانێن بۆ ئەوەی هێزەکانیان بکەن بەچەند بەشەوە، هێزێکیان لەگەڵ شەهید رەحمانی حاجی خدر لەناوکارۆخ لەگەڵی بەدران وئێلوونان دەمیننەوە،دەستەیەکی تریش بەسەرپەرشتی (کاکەشێخ) لە بناری کارۆخ - مەیدان دەمیننەوە،هێزی سێیەمیش بەسەرپەرشتی صلاح دیلمانی دەکەونە ناوچەکانی دەوروبەری دەرگەڵە.دەستەیەکی تریش بەسەرپەرشتی جەلال حاجی و دەستەیەکی تریش بەسەرپەرشتی صالح هەولێری.

ئەوهێزانە بۆ ماوەی (٣٨) رۆژ لە لایەن هێزەکانی رژێم کە بە هەزاران سەرباز بوون گەمارۆ دەدرێن، لەو ماوەیەدا پارتیزانەکان نان و ئاویان بەرەو تەواوبوون دەچێ، تەنانەت ئەو نانو ئاوەی کە پێشتریش وەك ئامادەکاری بۆ پارتیزانی دانرابوون، هێزەکانی رژێم بەهۆی کێوماڵی سەربازییانە بەشێوەی رۆژانە هەر هەموویان

دۆزیبووەو ئاگریان تێبەردابوون، تەنانەت دوای ١٩٨٨/٨/٢٨ کە هەزاران سەربازی رژێم بەچیای هەڵەموندا سەردەکەون.. دواتربەپشتیوانی هێلیکۆپتەر و تانك کێومالی سەربازی دەکەن .بەو هۆیەوە هیزەکانی وەحدەی کارۆخی پارتیزانی بۆ ماوەی (٣٨) رۆژ گەمارۆ دەدرێن، بۆ دەربازبوون وپاراستنی گیانی پیشمەرگەش شەوانە تەنیا دوو پیشمەرگە بەناو درك و داڵ دا دەچنە نزیك کانییەك بۆ هێنانی (پێنج لیتیریەك)ئاو بۆ هەموو پیشمەرگەکان.ئەو کانییە ئەوندە ئاوی تێدا کەم دەبێ بەسەری دەبەکە ئاوهەڵدەبێنجن.بەماوەی نزیکەی یەك سەعات ئەوسابۆیان پڕدەبێ. برێك ئارد ورۆنیان لە شوێنێکدا دەبێ،هەر ئەو دوو پێشمەرگەیە ئەو برە ئاردەیش بێنن و لەگەڵ ئاوە هێندراوەکە..دەیکەن بە کوولیچە(ناوساجی)وهەر پێشمەرگەیەك بەیەك لەت بە درێژایی روژ گوزەران دەکات.دوای 48 رۆژ شەهید رەحمان بڕیایدا کە دوو پیشمەرگە بنێری بۆ ئەوەی رێگایەك بۆدەبازبوون لە گەمارۆ بدۆزنەوە، لە ئەنجامدا دوای سێ رۆژ ئەو دوو پێشمەرگەیە دەتوانن رێگایەك بدۆزنەوە لە رێی رێکخستنەکانی ناوخۆ. لە ئەنجامدا هێزەکە بەناوچیای کارۆخدا سەردەکەون و دوای ٣٨ رۆژی گەمارۆ دەرباز دەبن.

وەحدەی کارۆخ یەکەم گروپی پارتیزانی دەبێ کە دەتوانی یەکەم چالاکی پێشمەرگانە ئەنجام بدات کە چەندها سەربازی تێدا دەکوژرێ و پێشمەرگەکانیش بێ زیان دەبن.ئەوچالاکییە لە رێی جیهازی راکاڵی برادەرانی رێبەرایەتی شۆرشگێر کاك جەلیلی گادانی بۆراکاڵی سەرکردایەتی بەرێدەکرێ.لە(دەنگی گەلی کوردستان) دەخوێندرێتەوە،ئەوە هانیان دەدات لە کۆبوونەوەیەکی وەحدەکەدا بریاردەدەن کەچەند چالاکییەکی تر ئەنجام بدەن، بۆ ئەو مەبەستە ژمارەیەك پێشمەرگە بەرەو کوێستانی مەکێ لەوەرتێ بەرێ دەکەون،رەبەیان دەگەنە سەرزین،کە تەماشادەکەن بەسەدان ئاگر لەوکوێستانەکراوەتەوەوهێزێکی زۆری رژێمی لێیە،کاتیش نامینێ.

لە ناو جەرگەی هێزەکانی رژێم رۆژیان لێ دادێ،بەناچاردەبن بەدوودەستە، دەستەیەکیان دەچێتەپشتی رێگاو دەستەیەکی تر دەچنە بەررێگا. دەستەکەی پشتی رێگا لە سەروبەری سەعات ۱۰ی بەیانی رووبەرووی دووجاش دەبنەوە، هەردوو جاشەکە دەسگیر دەکەن بە چەکەوە، دوای گفتوگۆ قەناعەتیان پێ دێنن کە یەکێکیان بچێتەوە رەبیەکەو نان بۆ پێشمەرگەکان بێنێو ئەوی تریان وەك بارمتە بمێنێتەوە، لە ئەنجام جاشەکە دەچێتەوەرەبیەکەو کۆلێك خواردن وسەموونی عەسکەری دەهێنێ، تا ئێوارە لەوێ دەبن،دواتر پێشمەرگەکان بریار دەدەن کە ئەو جاشانە نەکوژن و ئازادیان بکەن. دوای رۆیشتنی پیشمەرگەکانو یەککگرتنەوەیان لەگەڵ دەستەی خۆیان بە رێگادا دەرۆن بەرە مێدێرە لە دۆڵی شاورێ، بەلاَم لە رێگا رووبەروو کەمینێکی گەورە دەبنەوە، کە لێیان نزیك دەبنەوە، کۆمەڵێك جاش دەبن کەلە ترسی پێشمەرگە رەبیەکەیان چۆڵ کردووەو هاتوونەتە دەم ئەو گەڵییە، کەچی نەیاندەزانی کە لەوێ تووشی پیشمەرگە دەبن. بەلاَم پیشمەرگە پارتیزانەکان دوای دابەشبوونیان بە دەوری کەمینەکەی جاشەکاندا بریار دەدەن لێیان نەدەن،چونکە کارێکی گرنگتریان لە بەردەستدا دەبێ...دوای ئەو چالاکییە چەندان چالاکی تریش ئەنجام دەدەن، لەوانەش لێدانی کاروانێکی سەربازی لە دۆڵی خانەقا کە زیاتر لە ۳۰ سەرباز دەکوژرێن. هەروەك لە رەبییەکانی دەورووبەری وەرتێو کوێستانی مەکێ لە بۆسەیەکدا چەند سەربازێك لە رێی هێنانی ئاودا بە سزای گەل دەگەیەنن. سنووری چالاکییەکان فراوان دەکەن لە وەرتێ بۆ دۆڵی شاورێ، دۆڵی خانەقا، باڵەبیان، باڵەکایەتی، رانیەو حاجیاوا...

ئەوهێزە لە ۱۹۸۸/۸/۲۹ تا نەورۆزی ۱۹۸۹ دەمێننەوە.دوای گەیشتنەوەی هێزەکانیش بۆسەر سنووری ئێران هەرلەو هێزە تیپی۷۳ی ئاراسن پێکدەهێنن کە شەهیدرەحمان حاجی خدر دەکرێ بەفەرماندەی تیپەکە.

# ناوی پارتیزانەکانی سنووری وەحدەی کارۆخی

**هاورێ پارتیزانەکانی شەهید رەحمان وەرتی :**

1ـ شەهید رەحمان حاجی خدر (فەرماندەی وەحدەی کارۆخ)

2 ـ شەهید کەریم حاجی برایم دەربەندی

3 ـ شەهید شاسوار حاجی کەریم دەربەندی

4ـ شەهید مام هەژار حمدامین کەوەرتی

5 ـ شەهید کاکە گەلاڵەیی

6 ـ شەهید د. سلێمان بایەزید (کادری پزیشکی)

7 ـ عبدالرحمن ابراهیم مامە (عبدە وەرتی) (فەرماندە)

8 ـ صلاح حاجی برایم دیلمانی( ج ف وەحدەی کارۆخ)

9 ـ ئازاد احمد احمد (ئازاد وەرتی) کادری رێکخستن

10 ـ کاکە شێخ عبداللە سەعید صالح (فەرماندە)

11 ـ شۆرش عبداللە رسول (شۆرش چۆمانی)کادر

12 ـ نەهرۆ رسول احمد (نەهرۆ وەرتی) فەرماندە

13 ـ اسماعیل احمد مام کاك (کوێخا)

14 ـ شالاو عزیز حمد (کادر)

15ـ محمد قادر خدر

16ـ اسماعیل حەسەن اسماعیل

17ـ علی حاجی هەمزە

18ـ حەسەن عومەر

19ـ حسین حسیز احمد (کاکەی شۆڕێ)

20ـ خالید حاجی عوسمان

21ـ محمد احمد شاوری (فەرماندە)

22ـ سەید عبدالله امین

23ـ عبدالله حسین عبدالله بندایزانی

24ـ ئازاد عبدالله(کادری ریکخستن)

25ـ رەمەزان احمد سەرنەوسی

26ـ مستەفا عبدالله تەها(فەرماندە)

27ـ شێخە بێرکۆتی(فەرماندە)

28ـ برایم وسو

29ـ مەلای ملاژنێ

30ـ کێوەرەش (شێخ محمد)

31ـ اسماعیل مەلاسووره

32ـ جەمال کەلێتەیی(فەرماندە)

33ـ قادر سەلاّنەیی

هاوڕێ پارتیزانەکانی دەستەی صالّح هەولێری:

1 ـ صالح محمدامین صالح هەولێری

2 ـ عبداللهچۆمانی

3 ـ زوبیر احمد برای کوێستانی

4 ـ انورعبدالله چۆمانی

5 ـ محموودرسول (مامۆستاخوله)

6 ـ شەهید علی زێندین

7 ـ شەهید سەیدبرایم دۆسکی

8 ـ مەریوان عبدالله



# ژیاننامەی پارتیزانی دوای ئەنفال

## شەهید رەحمان حاجی خدر وەرتی

- لە ساڵی ١٩٥٦ لە گوندی وەرتی لەدایك بووبوو.
- تاکوو پۆلی سێ سەرەتایی خوێندبوو.
- لە ساڵی ١٩٧٦ دەبێتە پێشمەرگەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان.
- بەشداری دەیان چالاکی لە سنووری خۆشناوەتی دەکات.
- لەساڵی ١٩٨٣دەکرێتە فەرماندەی کەرتی ٣ی شەهیدان لە تیپی ٧٨ی کارۆخ.
- بەشداری دەیان داستانی گەورەی دەکات وەك گرتنی دۆڵی خانەقا و رواندوزو چالاکیەکانی هەریروو دۆڵی شاوریێ.
- لەساڵی ١٩٨٥دوای شەرە سەختەکەی زینی وەرتی کە حکومەت ناتوانێ پیشرەوی بکات دەیویست گوندی وەرتێ و دەورەو بەری داگیر بکات دەوریکی کاریگەرو جوامێرانە دەبینێ.

- لەساڵی ١٩٨٦ بەبریاری سەرکردایەتی دەگوازرێتەوە بۆ تیپی سەفین بارەگاکەی لە نازەنین دەبێت دوای چەندین شەڕی رووبەرونەوە لەویٚ جێگری کەرتەکەی بەناوی (ئەحمەد)شەهید دەبێت وچەند پێشمەرگەی تریش شەهیدو بریندار دەبن.

- لەساڵی ١٩٨٧ دەگەریتەوە بۆ وەرتیٚ پاشان بەشداری داستانەکانی هەلاج و دابان و زۆربەی شەرەکانی دۆلی جافایەتی دەکات, لە داستانی رزگاری دا دەوریکی سەرەکی دەبینێت و نامۆزایەکی بەناوی عبدلله بچکۆل شەهید دەبیت. - هەمان ساڵ دەکرێتە جێگری تیپی کارۆخ لەکاتی دەست پێکردنی ئەنفالەکان و هێرشی رژێمی بەعس بۆ سەر ناوچەکانیان دەکریتە سەرپەرشتیاری تیپی کارۆخ لەماوەی سیٚ مانگدا فەرماندەیی شەڕی دەستەو یەخە لە زینی وەرتیٚ و دەرگەلەو درەبی و کەلیتە و شەری سیٚ مانگە لە شاخی هەلەموونڊ دەکات..

دوژمن ناتوانیٚ یەك بست لە خاکی پیرۆز داگیر بکات دوای ئەو شەرە بە بریاری بەرێز کۆسرەت رەسول علی دەکرێتە فەرماندەی تیپی وەحدەی کارۆخ..

- بۆ ماوەی دوومانگ بە پارتیزانی دەمینێتەوە ,چەندین چالاکی ئەنجام دەدەن.

- لەساڵی١٩٨٩ دەکرێتە فەرماندەی تیپی ٧٢ هەلەموونڊ..

- لە راپەرینە مەزنەکەی ساڵی ١٩٩١ دا دەوریکی بەرچاوی دەبێت لە ئازاد کردنی شەقلاوە تاکوو کەرکوکی قودسی کوردستان..

- دوای کشانەوە لەکەرکوك لە کاتی بەرگری کردن لە هێرشی رژیمی بەعس بۆسەر هەولێرلەگەڵ هەردوو پێشمەرگەی ئازاودلێر(عەولاّ تالە)و(ابراهیم حاجی سلێمان) دەگەنە کاروانی شەهیدان.. دوای چل رۆژ تەرمەکانیان دەدۆزرێنەوە ... *

* سەرچاوە : نامەیەکی شەماڵ وەرتی کوری ... 2020/2/24



# ژیاننامەی
# پارتیزانی دوای ئەنفال
# شەهید صلاح دیلمانی

- لەساڵی 1963 لە گوندی (دیلمان) لەدایك دەبێت.
- لەساڵی 1978 پەیوەندی بە شۆڕشەوە دەکات ودەبێتە پێشمەرگەی (ی.ن.ك).
- لەساڵی 1984 بەهۆی ئازایەتییەوە دەکرێتە فەرماندەی کەرت.
- لەساڵی 1988 دەکرێتە فەرماندەی(تیپی کاروخ).
- بەشداری سەدان نەبەردو چالاکی دەکات
- دوای شەڕی بەرگری لە هێرشی ئەنفال ماوەی(40)ڕۆژ فەرماندەیی ڕەتڵێك لە پارتیزانەکانی کاروخ دەکات.
- وەك فەرماندەی بەتالیۆن بەشداری ڕاپەڕینی 1991 دەکات ...
- دوای پێکهاتنی حکومەتی هەرێمی کوردستان,لەوەزارەتی پێشمەرگە دەبێت بە فەرماندەی (لیوای 118ی بالەك.

بەشداری شەڕی تیرۆرستان دەکات,تا لەڕۆژی 2015/5/12 لەدێی(عەتشانە)ی (گوڵاڵە)ی گەرمیان لەگەڵ دووهاوڕێی بەناوەکانی ملازم محمدعبدالله(حەمەلاو)و حسن حمەزیاد(سەربان) بەهۆی تەقینەوەی مینەوە دەگەنە کاروانی شەهیدان.

# پارتیزانی دوای ئەنفال



## شەهید جەلال حاجی

- جەلال حەمەدئەمین ئەحمەد(جەلال حاجی)

- لەساڵی 1964 لەگەڵاڵە چاوی بۆژیان هەڵهێنابوو.

- لە 1980/10/13 پەیوەندی کردبوو بە (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)ەوە.

- فەرماندەو کادرێکی چالاك بوو لەسنووری مەڵبەندی س یَ‌دا

بەشداری دەیان نەبەرد و چالاکی کردبوو،هەربۆیەهەشت جار بریندار بووبوو.

- ساڵی 1986 کەلێپرسراوی بازگەی گومرگی سماقولی بوو بۆ یەکەم جار ئەم هەڤاڵە دڵسۆزەم ناسی دوای گرتنی زنجیرە رەبیەکانی سەر دەربەندی گۆمەسپان لەسەر بڕیاری کاك کۆسرەت ئێمەوکەرتی 3ی تیپی 93ی کۆیە ماوەی پترلە هەفتەیەك لەبارگاکەی ئەو میوان بووین و پشوویەکی باشماندا..

- دوای کۆڕەوەکە بارەگای لەدیانەبوولەقەزای(سۆران)،لەوێش میوانداری کردین، لەپاداشتی دڵسۆزی بە دیاری( B.K.C) یەك و چوار(کلاشینکۆف)م پێشکەشکرد..

- لە کاتی پەلاماری ئەنفال بۆ دەڤەری سۆران و رواندز و گەلاڵەو چۆمان ..

رۆڵێکی قارەمانانە دەگێڕێ لە بەرپەرچدانەوەی ئەنفالچی یەکان.

- لەدوای ئەنفالیش هاورێ لەگەڵ(حەسەن کوێستانی)و(رەحمانی حاجی خدر)و چەند فەرماندەی ئازای دەڤەرەکە رۆڵیان دەبێت لە پێکهێنانی (وەحدەی کاروخ) و چەندە دەستەی تری پارتیزانی و درێژەدان بە خەبات و بەرخۆدان.

- رۆڵی جوامێرانەی هەبوە لە راپەڕینی 1991 تا رزگارکردنی شاری کەرکوك.

- لەساڵی1994 دەبێت بە جێگری فەرماندەی لیوای(33ی سۆران)

- بەداخەوە لە 1995/1/9 لەشەڕی نەگریسی ناوخۆ شەهید دەکرێ.



## ژیاننامەی هەڤاڵ
## (سەعیدی حمەزیاد)

ـ سعید محمد حمدامین سالی ١٩٦٦ لە گوندی فەقێیان لە دایك بووە .

ـ شه هید حمەزیاد باوکی سەرلقی دۆڵی ئاکۆیان بووە .

ـ ساڵی ١٩٦٨دوو مامی هێرش دەکەنە سەرشاخی(کێل کێل)و
پاش نەمانی ته قه مه نی به خه نجەری دەبان هەڵمەت بۆ سەردوژمن دەبن..
بەڵام مخابن شەهیدبان دەکەن ودواترته رمه کانیان به دوای سیارە دا رادە کیشن تا رەواندوز، لەوێ بەخاکیان دەسپێرن.

ـ شەهید حمەزیادیش لە ٨ ـ ٨ ـ١٩٧٤لە شەڕێکی دە ستەویەخەدا شەهیددەبیت.
هەرچەند کە ئەوسا سەعید ی حەمەزیادبەتەمەن مناڵ بووە بەڵام بەفەرمانی (مەلامستەفا)دەکرێ بەسەرلق ولە شوێنەکەی دادەنرێ.

ـ دوای هەرەسی شۆرش به لێبووردنی گشتی گه ڕاونتەوە بۆجنوبی عراق.

ـ لە سالی ١٩٨١ بۆتەوە پیشمەرگەی شۆڕشی نوێ، به پله ی فەرماندەی کەرت لە(کەرتی ٢ی شەهیدحمه زیاد)

ـ لە ١٩٨٣لە شەڕی قندیل به بڕیاری مام جەلال کراوەتە سەرتیپی ١٢ی سوران..
لە تیپی ٨٣ ی هه وری و تیپی ١٩ی کورەك بەشداری وچەندین داستانی کردووە .

ـ بەشداری شەری داستانی رزگاری و قه یوان و ماوەت گرتنی بێتواتە وگرتنی سەری رەش و گرتنی دۆڵی خانەقا و گرتنی ته ق ته ق و شەرەکانی بەرگری لە سەرکردایه تی وئه نفالی٢ و شەره کانی قندیل و شەری کوندی فەقێیان و گرتنی رەبایەکانی نزیك باسرمه وشه کرۆك وگرتنی فەوجی رەواندوز و سپیلك و شه رەکانی سەرجادەی دەشتی حریر وگرتنی شاخی کۆرەك وداستانی کێل کێل و چه ندین داستانی تر لە سنوری مه ڵبه ندی٣و سه رکردایه تی... کردووە.



## چالاکیەکی پارتیزانی لە پشتی فەقیانە

دوای ئەوەی دوژمن هێرش دەکات بۆ چەقەری بێرمێ لەسەر کانیەکەی (سەرەسێو) پێشمەرگەکان(سەعید حەمەزیاد) ئاگادار دەکەنەوە کە بەنیازن چالاکیەك ئەنجام بدەن، مەتارەکانیان پڕ لەئاو دەکەن و کەمێك نان و خۆراك لەگەڵ خۆیان هەڵدەگرن، بەڕێ دەکەون، بەگەیشتنیان بە چەقەری بێرمێ، دادەنیشن و نەخشە و شوێنی چالاکییەکە دیاری دەکەن، کەپشت گوندی (فەقیانە)و ناورەزەکان دەبێت، دیارە پێشتر دوژمن چەند سەنگەرێکی لەویشوێنە دەبێت ، لەگەڵ واجباتێکی تۆکمەدا ،رۆژانە لەناوئەوسەنگەرانە دەمانەوە و شەوانەش چۆڵیان دەکرد، بیرۆکەی کاك سەعیدیش ئەوە بێت پێشمەرگەکان بچینە شوێنی ئەوان، واتە ناوسەنگەرەکانی ئەوان، هەر کەبەیانی زووگەڕانەوە لێیان بدەن، مەفرەزەکە بریتی دەبێت لە هەشت پێشمەرگەی شارەزا و بە دەست و برد، لێزان و شارەزا لە شەڕی پارتیزانی، کە ئەواتیش بریتی دەبن لە هەڤاڵان: ـ

١. سەعید حەمەزیاد ٢. عوزێر فەقیانەیی

٣. ئەنوەر ئاکۆیی ٤. سەردار شەڕکانی

٥. خالید حاجی سەرانەیی ٦. ئەیوب حسێن حاجی مستەفا

٧. مام خالید فەقێیانەیی ٨. ئیبراهیم حاجی رەشید

ئەوشەوە بە تەواوی دەگەڕێن، دەست نیشانی شوێنەکانی دوژمن دەکەن، کاتژمێر دووی شەو دەچنە ناو سەنگەرەکانی دوژمنەوە،لەوێ لێی دادەنیشن، چاوەڕێی ئەو کاتە دەکەن کە ،سەربازەکان بۆ کەمین دێنەوە ئەو شوێنە، دوو ددو دەچنە ناو

سەنگەرەکانەوە، کاك سەعید پێیان دەڵآ: ئێوە بخەون. هەتا کاتژمێر 4ی بەیانی من حەرەس دەبم،دواتر بانگی هاوڕێیەکی دەکات :وەرە تۆوریابە..وامنیش سەرخەوێك ئەشکێم،ئەویش ئەڵێ باشە.. بەڵام خەو زاڵ دەبێ بەسەریدا،خەوی لێدەکەوێت، لە بەردهاویشتنی کاك عوزێر بە ئاگادێنەوە، کاتێك کە سەیر دەکەن دونیا بەتەواوی ڕووناك بۆتەوە، نزیکەی کاتژمێر 6ی بەیانی دەبێت،ئەو بەردانەیان بۆیە بۆ دەهاوێ تا بزانن کەوادوژمن بەرە و لای ئەوان دێت،نەیدەزانی کە ئێمە خەومان لێکەوتۆتەوە.دوژمن نزیك دەکەوێتەوە لەوشوێنەی ئەوانی لێبوون، لەهەراو دەنگەدەنگیان بەتەواوی ئاگادار دەبنەوە،تەواو دەکەونەحالەتی ئامادە باشی، دەست لە سەر پەلەپیتکەو چاو لەسەر سێرە، دەبینن وا پێنج چەکدار لە خوارەوە بەئاراستەی ئەوان دێن.چەکدارێك لە پێش هەموویانەوە، بە دەم گۆرانیەوە مردن بۆ لای ئەوان پەلکێشی دەکات، لە لای کاك عوزێر فەقیانەیی و شەهیدئەنوەر ئاکۆیشەوە بە هەمان شێوە چەند چەکدارێك بۆ لای ئەوانیش دەڕۆن.

بڕیاری کاك سەعید پێشتر ئەوە دەبێ کە کەس تەقە نەکات هەتا ئەو فەرمان نەدات، دوژمن زۆر نزیك دەکەویتەوە، چونکە هەرگیز بیریان نەکردبۆوە کە پێشمەرگە دەچیتەشوێنی ئەوان، چونکە ئەوێ ناو دڵی دوژمن دەبێت، شوێنەکەش وادەبێت پێشمەرگەکان لە بەرزایی و ئەوان لە نزمانی دەبن، کاك سەعید ئاماژە بۆ کاك عوزێر و هەڤاڵەکانی دەکات..:

دەسبەکار بن، لەگەڵ یەك دەستڕێژدا ئاگریان بەسەردا دەبارێنن، سینگی دوژمنان دەکەن بەبێژنگ، لەچەند چرکەساتێکی کەم دا،مەیدانی شەڕخەڵتانی خوێن دەبێت، چەند کەلاکێکی دوژمن و خائینە چاو ساغەکانیان لە شەڕەگەکە دا دەکەون، چونکە ئەوان زۆر بە بێباکی بەرە و شوێنەکانی خۆیان چووبوون، چاوەڕوانی ئەویان نەکردبوو پێشمەرگە لە شوێنەکانی ئەوان بۆیان لە کەمین بن، نەیانزانی بوو هەموو

بن دار ودەوەنێکیان لێ دەبێت بە دۆزەخ،کەلاکێکی زۆر لەومەیدانەجێ دەمێنێ، دەنگی تەقەکان لەگوندی(فەقیانە)وشاخەسەرکەش وجوانەکان دەنگدەداتەوە.. بارەگای سەرەکی سەربازوجاشەکانی ڕژێم لەناو گوندی (فەقیانە) دەبێت، هێزێکی زۆریان لەوێ ئامادە دەبێت، بەرلەوەی پێشمەرگەکان پاشەکشێ بکەن بەرەو چەقەری بێرمێ، دوژمن لەگەڵ دەستپێکردنی شەڕەکە، هێرشێکی توندییان بۆ سەردێنێ، شەڕ زۆر گەرم دەبێت، لە ڕاستیدا دوژمن زۆر بە خێرایی بە هانای هێزەکەیەوە دەچێت، هێرشێکی زۆر گەورە و بەربڵاو دەستپێدەکات، ئیتر کاك سەعید نەخشەی کشانەوەکەیات پێدەڵێ: - هەرجاری دوو کەس شەڕ بکەن ئەوانی تر پاشەکشێ بکەن، ئینجا هەموو بەوشێوەیە پاشەکشێ دەکەن، بەڵام بەهۆی گەورەیی هێرشەکەوە وکۆنترۆڵکردنی چەند بەرزاییەك شەڕکە لە سەریان ترسناك دەبێ، هەربۆیە کاك سەعید خۆی دەگەیەنێتە (چەقەری بێرمێ) کەشوێنێکی گرینگ دەبێ، بۆ ئەوەی پارێزگاری لەهاوڕێکانی بکات،بەوشێوەیە دەتوانن بەرد بۆ بەرد پاشەکشێ بکەن و دەربازبێن.لە راستی دا هەر وەك چۆن دوژمن حسابی بۆ ئەوان نەکردبوو لەناوسەنگەرەکانی خۆیان لێیان دەدەن،بە هەمان شێوە پێشمەرگەکانیش حسابی ئەوەیان نەکردبوو، کە مەفرەزەیەکی پشتیوان لە چەقەری بێرمێ جێگیر بکەن بۆ ئەوەی لە کاتی پێویستیدا پاڵپشتییان بکات.بەلام ئەو پێشمەرگە قارەمانانەی بەشدار نەبووبوون لەو چالاکیەدا، هەر کە زانیبوویان شەڕێکی قورس لەسەرهاوڕێکانیان هەیە،ئازا و مەردانە بە ماویەکی زۆر کەم دەگەنەهانایان، ئەوانیش دەگەنە (چەقەری بێرمێ)...

دوای سەرکەوتن بەسەلامەتی دەگەڕێنەوە بۆ(سەرەسێو)و لەوێ نان دەخۆن و سەرخەوێك دەشکێنن..پاشان دەگوازنەوە بۆ شوێنێکی تر.

---

سەرچاوە : نوسینێکی سەردار شەرکانی



## پارتیزانی دوای ئەنفال
## صالح محمدامین (صالح هەولێری)

دوای شەڕی بەرگری ئەنفال شەڕی قارمانانەی هەڵەموند,لەسەرداوای مەکتەبی عەسکەری(ی.ن.ك) هێزەکان دەکرێن بەدووبەشەوە, بەشێك دەکشێنەوە بۆ بناری قەندیل و بەشەکەی تر بەپارتیزانی دەمێننەوە,هەڤاڵ حەسەن کوێستانی دەستە پارتیزانەکان دابەشدەکات..شەهید رەحمان وشەهید صلاح دیلمانی بە خۆیان دەستەکانیان هەریك بۆ قۆڵێك,هەڤاڵ(صالح هەولێری) ودەستەکەی بۆ قۆڵێکی تر..

### ناوی هەڤاڵانی دەستەکە:

(صالح محمدامین صالح هەولێری,عبداللەچۆمانی,زوبیر احمد برای کوێستانی, انورعبدالله چۆمانی.محموودرسول ـ مامۆستاخوله,شەهید علی زێندین,شەهید سەیدبرایم دۆسکی.مەریوان عبدالله)

لەگەڵ گەیشتنیان بە بنکەی دیاری کراو پێش ئەوەی ئازووقەو پێداویستی دابین بکەن, رژێم لەهەموو قۆلەکانەوە هێرش دەست پێدەکات , زۆر بەوردی دەستدەکات بە کێومالْ و گەڕان بەدوای پارتیزانەکان دا..

بەهۆی شارەزایی باشی (شەهیدعەلی زیندین) ماوەی 10 رۆژ لەئەشکەوتێکدا لە شاخی(کاروخ)دەمێننەوە,دوای نەمانی ئازووقە ناچار دەبن ئەوناوچەیە بەجێ دەهێڵن و دەپەڕنەوە بەری (روستێ).. لەوێ ماڵەڕەوندێك دەدۆزنەوە, زۆر هاوکاری پارتیزانەکان دەکەن.پاش چەندرۆژێك لەوێشەوە دەگوازنەوە بۆشوێنێك لەنزیك بارەگای لیوایەکی سەربازی عێراق لە نزیك کانەبەردەکانی گەڵاڵە لە ئەشکەوتی

(دیکنۆس)ماوەی(15)ڕۆژ خۆیان حەشاردەدەن.لەوێش (مام عبدالله) ی برای (شەهیدحەسەن کوێستانی)وکاك محموودرسول(مامۆستاخولە) بەهۆی شارەزایی باشیانەوە ڕۆڵی باشیان دەبێت لە دابینکردنی خۆراك و شارەزایی ڕێگاوبانەکاندا..

پاش مانگێك بڕیاری گەڕانەوە دەدەن بۆ بناری چیای (قەندیل) ولەوێ لەبارەگای (شەهیدعەبدوالرەزاق) لەگەڵ (کوێستانی)وهاوڕێکانیان یەك دەگرنەوە.

## گەڕانەوەی پارتیزانەکانی هەولێر

دوای ئەوەی ڕەتڵەپارتیزانەکانی هەولێر بڕیاری گەڕانەوە دەدەن بۆ بارەگاکانی سەرکردایەتی,لە بەر ئەوەی گەڕانەوەیان زۆر ئەستەم دەبێت داوای هاوکاری لە سەرکردایەتی دەکەن. بۆ ئەومەبەستە(م.س)ی یەکێتی داوا لە هەڤاڵان(عبدالله هەولێری وشەهید رەحمان سەیدە وشەهیدکاروان) دەکەن کەبچن بەپیرییانەوەو لەو ڕێگایانەوەی بیانهێننەوە کە سوپای عێراق داینەخستوون,بۆ ئەومەبەستە چەند نامەیکیان دەدەنێ بۆ :

1 ـ بارەگای (ح .د .ك .ئ )

2 ـ بارەگای (ح .د .ك .ئ ـ ڕێبەرایەنی شۆڕشگێڕ)

ئەوانیش بەپێی توانا دریغی ناکەن و هاوکارییان دەکەن..

لەوێوە کاك (صالح هەولێری) بە ماشێنی هاوکاری پارتیزانەکان محمد رسول(پیتۆڵ) و(حسن ) برای شەهید (علی داود) دەگەنە ئۆردوگای (شکارتە) لەوێشەوە بەهاوکاری(حاجی احمدی شیرێ)و کاك (سەعدی)برای (مەلامستەفا سەکری)دەگەن ( کۆدەرە)ی سەرکەپکان و لەوێ دەگاتە لای پارتیزانەکانی هەولێر و دەیانگەیەنێتە بارەگاکانی (ح .د. ك .ئ ـ شۆڕشگێڕ) لە(بێردبی)و لەوێ ماوەی سێ ڕۆژ پشوودەدەن و هاوکاری دەکرێن بۆ گەڕانەوە بۆ بارەگاکانی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان.



**کورتەی ژیاننامەی**

**پارتیزانی دوای ئەنفال**

## هەڤاڵ (هەڵۆ حەسەن)

ـ حسین حسن حسین ناسراو بە (هەڵۆ حەسەن).

ـ ساڵی١٩٦٩ لە گوندی ئاکۆیانی سەر بە قەزای رواندز لە دایك بووە.

ـ لەبنەماڵەیەکی هەژار کە نانی ڕۆژانەیان بە هێزی بازوو و ئارەقەی نێوچەوانی خۆیان دەستەبەرکردووە. چەند سەر بزنێکیان هەبووە، ئەرکی ئەو ئەوەبووە بەیانیان بیانگەیەنتە ناو (هوردە ماری) هوردە مار ئەو مێگەلە بزنە بوو کە هی هەموو گوندەکە بوو. هەرماڵەی چەند سەرێکیان بۆ ماست و شیر هەبوو، کە لە نزیك گوند بەخێو دەکران، شوانیکیان هەبوو بە هەموو خەڵکی گوند دەیان ژیاند، ئیوارانیش دەبوو هەر بچێت بیان هێنێتەوە......

ـ ساڵی ١٩٧٤ دەچێتە قوتابخانە تاقیکردنەوەی کۆتایی ساڵ لە گەلی زەنگرانی نزیك گوندی ئاکۆیان دەبێ، لەبەر بۆردومانی تۆپ و تەیارە، قوتابخانەکە جێ دەهێڵن، ئەو رۆژەی تاقیکردنەوە تەواو دەبی بەرێ دەکەون بەرە و ماڵەوە، کەدەگەنە بن قەڵاتێ ئاکۆیان دووفڕۆکە پەیدا دەبن،چەند ناپاڵمێك بەسەر دۆڵاکۆدا دا بارێنن، یەکێك لە ناپاڵمەکان لە نزیك چاکی مامبۆی دەدا، ئەوانیش خۆیان دەخەنە بن بەردەکان.زۆر دەترسن،چونکە ساچمە و پارچە قوڕوبەرد دەگاتە لایان، دوا ناپاڵم ئاو لە زەوی دەردەهێنێ ..

تا ئازاری1975ژیانی کولەمەرگی دەگوزەرێنن..لە کاتی هەرەسی شۆڕشی ئەیلوول دەچنە ئێران. لە ئۆردوگای (سەرئاب گەرم) لە نزیك شاری سەرپیلی زەهاو

نیشتەجیٚ دەبن، لەویٚ ژیان ناخۆش دەبیٚ ،بە قاچاغ دەچنە ناو شار، بۆ بژێوی ژیانی ڕۆژانەیان تەپەدۆرێکی بۆدەکڕن، چلورە و کریٚمستی لەناو ئۆردووگا دەفرۆشێت، ڕۆژێك پاسەوانانی ئۆردوگا، لەکاتی هاتنەوەدا دەیان گرێت، زۆر دڕندانە مامەڵەیان لەگەڵ دەکات،تەپەدۆرەکانیان دەشکێنێ و کریٚمستیەکانیشیان لیٚ دەڕێژێ، دواتر دەیان بەنە ئۆردوگای (سەرئابلە) لە نزیك کرماشان، جارێکی تر لەویٚ چێتەوە بەرخوێندن، لەوێش لەو قوتابخانە فارسیە، بە یەکەم دەردەچێت، لەوێش لەگەڵ (رسول سۆق سمایل) دەست دەکەن بە فرۆشتنی پەلکەسلق، لەسەر خوانچەیەك دایدەنێن و لەناو ئۆردوگا دەیفرۆشن،دواتر دەگەڕێنەوە بۆ عێراق، لێرەش نەفیان دەکەن بۆجنوب،بۆ پاریزگای دیوانیە،ناحیەی شەنافیە، قریەی (بەعس) لەویٚ نیشتەجێیان دەکەن، دەبن بە جیرانی ماڵی پیاوێکی عەرەب بەناوی (عبدالسادە) دیسان دەچێتەوە مەکتەبی (ابن سینا) لە ناحیەی شەنافیە، ڕۆژێك لە قوتابخانەدەگەڕێتەوە ژنەدراوسێکەیان گوێدرێژێکی پیٚ دەبیٚ، لە شار دەگەڕێتەوە، کەدەگاتە ئەوان چونکە دەیناسیٚ، دەڵیٚ:

دەبیٚ سواری کەرەکەبی، ئەویش سواردەبیٚ،بەدەم ریگاوە قسە دەکەن،پیرەژنە جوێنێك بە(مەلا مستەفا)دا، ئەویش زۆری پیٚ ناخۆش دەبیٚ، چونکە ئەوکات تاکە سەرکردەی کورد کە ئەو دەیناسیٚ تەنها مەلا مستەفا دەبێت، بۆیە خۆی لە کەرەکە فریٚ دەداتە خوارەوە و لە پیرەژنەکە زۆر تورە دەبیٚ..

- ساڵی ١٩٧٧ لە شەننافیەوە دەگەڕێنەوە بۆ قەزای ڕواندز لە قوتابخانەی پاشای گەورە لە پۆلی چوارەوە دەست دەکاتەوە بە خوێندن .

- لە ١٩٨٢/١٠/١٤ پەیوەندی بە(کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان)ەوەدەکات.

- سالی ١٩٨٤ لە تیپی ٢١ی سۆران دە بێت بە پێشمەرگە.

# هۆکاری بوون بە پێشمەرگە

ـ لە پۆلی سێی ناوەندی وانەی مێژوویان دەبێ، مامۆستایەکی عەرەب یان دەبێ بەناوی (عبدالغنی) ، ئەندامی ڕێکخراوی حزبی(بەعس) شاری ڕواندز دەبێ ، لەوانە شەرحکردندا، دەڵێ (سەلاحەدینی ئەیوبی) پاڵەوانێکی عەرەبی ئیسلامی بوو کە قودسی ڕزگار کرد، ئەویش بەو قسەیە زۆر تورە دەبێ ، دەست بەرزدەکاتەوە، ئەڵێ:نەخێر مامۆستا سەلاحەدین پاڵەوانێکی کوردی موسڵمان بوو، نەك عەرەب! مامۆستاکە ڕەش پێست دەبێ ، لەگەڵ ئەو قسەیەدا هیندەی تر ڕەش هەڵدگەڕێ، بەتوورەیی ئەڵێ دانیشە ئەویش دادەنیشت، دوو سێ جار بەلای دا دێت و دەچێ، لەپڕ یەك ئەنیشکێکی توند لە پشتی ملی دەدا، لوتی بەر رحلەکە دەکەوێ، یەکسەر خوێن لەدەم و لوتی دێتەخوارەوە،ئەویش هەڵدەستیە سەرپێ وبەعەرەبی پێیئەڵێ: مامۆستا بۆ وات کرد، ئەلێ(هیچی أحسن) لەوڕۆژەوە بڕیاردەدا عومری خۆی بخاتە خزمەتی دژایەتی کردنی ئەو دوژمنە سەر سەختانەی کورد.لە پێشمەرگایەتیش، بەشداری زۆربەی شەڕەکانی سنوری تیپی ١٢ی سۆرانی کردووە، قارەمانەکانی ئەوتیپە فێرگەیەکی گەورە دەبن،بۆ ئەو و لاوانی تازە پێشمەرگە،بەتایبەت ئازایەتی فەرماندەی تیپ، کاك (سعید حەمە زیاد) بۆ گەنجەکان هاندەر و مەدرسەیەك دەبێ ، بۆ ئەوەی فێری ئازایەتی ببێ لەپێناو ڕزگاری گەلەکەیاندا تێبکۆشێن، بە دیاریکراوی بەشداری دەکات لە شەڕەکانی ( بەرگری کردن لە هێرشەکانی دوژمن بۆ سەر دۆڵاکۆ، شەڕەکانی قەیوان ـ ماوەت، کۆرەنگ، حەسەن بەگ، شەڕەکانی سەرکردایەتی لەکاتی ئەنفالەکان دا، زۆربەی چالاکیەکانی ناو شاری ڕواندز شەڕەکانی کونەکۆتر و گۆمێ کرمەسۆران لەکاتی ئەنفالەکانی ١٩٨٨.سێ جار بریندار دەبێ:

1ـ ساڵی ١٩٨٨ لە سێکانیان لە چیای تەبەق، بۆ چارەسەر ڕەوانەی ئێران دەکرێ، چونکە برینداریەکەی زۆر قورس دەبێ ..

2ـ سالی ١٩٩٤ لە شەڕی ناوەخۆ لە قوتابخانەی پاشای گە ورە،

3ـ ساڵی ١٩٩٧ لەسەر زیخینەی گەرەوان، برینەکەی ئاسایی دەبێ..

ـ لەدوای ئەنفال بە پارتیزانی دومینێتەوە..

ناخۆشترین رۆژ لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا لە(1991/3/20) دەبێ ئەو ڕۆژە کەخاڵی سیسۆی لە ئازادکردنی کەرکوك دا شەهید دەبێ...

دەربەرەی هەڵویستی لەبەرانبەر گەل و رێبازی کوردایەتی دا هەڵۆ خۆی ئەڵێ:

(بێگومان هەتا دەمرم لە بەرەی گەلەکەم دەمێنمەوە، لە یەك چرکەی خەبات و پێشمەرگایەتیشم پەشیمان نیم، چونکە من بۆ گەل و نیشتیمانەکەم کردووە، ناشیکەمە منەت بەسەر هیچ کەس و لایەنێك، چونکە پێم وایە ئەرکی خۆم جێ بەجێ کردووە. هەرچەند لە هەرەتی لاویداخوێندنم لە دەست چوو،لە خۆشەویستی خێزان دوور کەوتمەوە. هەروەها نەشم توانی زوو بە دڵخوازەکەم بگەم، دایك و باوك و براکانم زۆر ئازاریان چەشت لەسەر من تامردن قەرزداریانم، برایەکی نازداریشمان لە پێناو ئەو رێبازە لە دەست دا، بە ناوی شەهید ( هەورۆ)....

پێشمەرگایەتیش چەندین هاورێی پێ بەخشیم، هەتا ماوم شانازیان پیووە دەکەم، هەر پێشمەرگایەتیش کردمی بەو هەڵۆ حەسەنەی کە هەستەکەم جیگای ریز و تەقدیری خەڵکم.

خۆم بە قەرزداری شەهیدان و کە سوکاری سەربەرزیان دەزانم کە نەمان توانیووە وەك پێویست خزمەتی منداڵەکانیان بکەین...)

---

سەرچاوە : فەیسبووکی / دۆلآکۆ رواندز- Hallo Hassan.



# پارتیزانەکانی رەتڵی سۆران

## مانەوەی 46 روز بە پارتیزانی

رەتڵی سۆرانی پارتیزانەکان کە شەهید سەعیدی حەمەزیاد سەرپەرشتی کردوون لە٤/١٠/١٩٨٩ لە ئالوەتان و کوێزێ کاک کوسرەت و کاک نە وشیروان بە دوای کاک سەعیدی حەمەزیاد دا دەنێرن بۆقاسمەرەش،لەوێ داوای لێ دەکەن کە بە پارتیزانی رەتڵی سۆران دابەزێ بۆ دەوروبەری سۆران ورەواندوز..

- لە رۆژی 1989/10/5خۆی و دەستەیەک لەمەڤاڵەکانی ئامادە دەبن وبەرەوزێدی لەمێژینەیان بەرێ دەکەون کەبریتی دەبن لە:

1 ـ شە هید سعید حمە زیاد لێبرسراوی رەتڵ

2 ـ ابراهیم مستە فا حمدامین

3ـ ئاسو حمدامین ئاکۆیی

4ـ عبداللە وەسمان ئاکۆیی

5 ـ قادر احمد عبداللە

6 ـ خسرو محمد وەلی

7. فیصل صالح حسین

## چۆنیەتی بەرێکەوتن

لە بردە شاڵ دەپەڕینەوە بەرەو دەرەبی.. لەوێوە بەسەر دەکەون..دوو شەو و ڕۆژی دواتریش هەر لەوێ دەمێننەوە، شەوی دواتر دەچنە گوندی وەرتی و بناری کاروخ، هەر لەوێوە دەچنە زینی سەران ونانی ئێوارەیان لەوێ دەخۆن..

بەڵام لەبەرئەوەی هێزێکی زۆری ڕژێم لەوناوچەیە دەبێت بەناچاری دەگەڕێنەوە سەر شاخی هندرێن ،دوای پشوودان، شەوی دواتر دەچنە گوندی ئاکۆیان ..

لە 1989/10/14 دەگەنە گوندی (کەرەك) ماوەی دوو شەو لەوێ دەمێننەوە، بۆ شەوی دواتر دەچنە ناو قەزای ڕەواندوز،هەرهەمان شەویش دە گەرێنەوە،لە باسکە درێژ پشوویەك دەدەن ودەگەڕێنەوە بۆ دەوروبەری گوندی (فەقێیان)و لەوێشەوە بۆ ئەشکەوتێکی قایم کەکاتی خۆی پێش ئەنفال ماڵی شەهید سەعید لەوێ بووە، کەدەگەنە ئەشکەوتەکە بەهۆی مانەوەی کەل وپەلەکان وەکوخۆی دەزانن کە ڕژێم دەستی بەوشوێنەنەگەیشتووە،ئیتر سودێکی باشی لێ وەردەگرن،دواتر لەوێشەوە دەڕۆن بۆ کێل کێل وناوچەی دەوروبەری، دەبینن هەمووی بەهێزی جیش وجاش تەنراوە،دەیانەوێ رووبکەنە بەنی هەریر) بەڵام لە بەربوونی هێزی زۆری جیش و جاش و بۆ ئەوی ئاشکرا نەبن دەچنە خوارەوە،بەڵام ڕژێم بەهۆی دووربینی چاودێری پێشکەوتوو لە شاخی کۆرك،بوونی پارتیزانەکانی بۆ ئاشکرا دەبێت، هەربۆیە هەوڵدەدات لەشوێنێك کۆنترۆلیان بکات ودەستیان لێ بووەشێنێت،بەڵام ئەوان بەجموجووڵی نائاسایی هێزەکانی ڕژێم وریا دەبنەوەو بەرێ دەکەون بەرو کەلی شەلێ،پێش گەیشتن بە شوێنی مەبەست هێزەکانی ڕژێم دەیان دۆزنەوە، لەکاتێکدا پێشمەرگەکان لەکەلی شەلێ ئاو بۆ خۆشۆرین وشتنی جل وبەرگەکانیان

گەرم دەکەن و مژوولی خۆیان دەبن ،لەپڕێکدا هێزێکی سوپا و چەند دەستەیەك لەجاش وخۆفرۆشان دەوریان دەگرن،شەڕێکی دەستەیاخەبەرپادەبێت، لەوشەڕەدا جگە لەهێزی پاڵپشتی زەمینی،پێنج هەلیکۆپتەریش دەگەنە ئاسمانی شەڕەکەو پارتیزانەکان هێزەکەی دوژمن تێك وپێك دەشکێنن،لە گەڵ ئەوەی فەرماندەی رەتڵ (سەعیدی حەمەزیاد)بەخەستی بریندار‌دەبێت ولەئاسمان وزەوییەوە تۆپ و رۆکێتباران دەکرێن، بەڵام قارەمانانە خۆیان لەبازنەی پەلامارەکە دەرباز دەکەن و دەچنە (کونەهەرس) شەو لەوێ دەمێننەوە ،هەرچەند بەهۆی نەبوونی چارەسەری پێویستەوە تەندرووستی هەڤاڵ سەعید باش نابێت ، بەڵام هەرچۆنێك بێت دەتوانن لەناوچەکە دوور بکەونەوەو دەپەڕنەوە بۆ بناری کاروخ، دواتر دەچنە گوندی نوری بۆ لای برادەرانی (حزبی دیموکراتی ئێران - رێبەرایەتی شۆڕشگێڕ)لەوێ ئەوان میوانداری باش وخزمەتیان دەکەن،برینداڕەکە تیمار دەکەن وبۆ ماوەیك دالدەیان دەدەن، دواتر دەچنە بۆلێ بۆ لای بارەگاکانی (حزبی دیموکراتی ئێران)لەوێش بەرێزەوە بەڕێ دەکرێن بۆ دەوروبەری (باڵەی زەنگلین) و لەوێشەوە دەگەڕێنەوە (بادیناوێ) بۆ رۆژی دواتر پاش 54 رۆژ پارتیزانی لە لایە ن (کاك کوسرەت)ەوە پێشوازی گەرمیان لێ دەکرێت ..

* سەرچاوە: فەیسبووك..پەیجی تایبەتی کاك هەڵمەتی شەهید سەعید حەمەزیاد



## د. وەسمان :
## کاری ڕێکخســتن لە دوای ئەنفال

د. وەسمان لای وایەئەرکی پارتیزانەکان لەکۆتایی سالی(1988)دەست پێدەکات تا ڕاپەڕینە مەزنەکەی ئازاری (1991) لەبەرئەم چەندهۆیانەی خوارەوە :-

- دووژمن لەدوای وەستانی شەڕی(عێراق/ئێران) هەموو قورسایی هێزە دڕندە و سەرکوتکەرەکانی هێنابووە کوردستان،لەدوای ڕەگەکانی شۆڕشگێڕیدا دەگەڕان.. هەر چاوێکیان کردبوو بە هەزار چاو ، متابەعەی ووردی خەڵکیان دەکرد ...

- (ه.پ.ك)لەناوکوردستان نەمابووەتا ببێتەپەناگەیەکی باش بۆڕێکخستنەکان و خەڵکی لێ قەوماو،لەوکاتانەی کە ئاشکرادەبوون ولێیان دەقەوما ..

- لاواز بوونی ڕوحی شۆڕشگێڕی لەناو کۆمەلانی خەڵکی کوردستاندا ...

- یارمەتی دان و حەشاردان و هاتوو چۆ پێکردنی پێشمەرگە پارتیزانەکان لەکاتی گەیشتنیان بۆسنووری ناوچەکانی(هەریرو خۆشناوەتی )تاکوگەڕانەوەیان .

- دروستکردنی مەفرەزەکانی سرك ودەست وەشاندن لەدووژمن بەبێ ئەوەی ئاشکراببین وبۆدووژمن بسەلمێنین کەپێشمەرگەهەرماوە .

- مەترسی لەو پێشمەرگە و فەرماندە و کادیرانەی کە تەسلیم بەڕژێم دەبوونەوە.

- مەترسی لەوهاوڕێیانەی ڕێکخستن کە دەگیران نەك لەژێر ئازارو ئەشکەنجە اعتراف بکەن.

- مانەوەی چەندمەفرەزەیەکی پارتیزانی لەچیاکاندا لەوانە شەهیدی سەرکردە (حسن کوێستانی) سەرپەرشتی ڕەتلێکی دەکرد،کە ژمارەیان (40)کەس دەبوون

لەسنوری وەرتێ و کارۆخ و خۆشناوەتی و هەروتیایەتی، تا مانگی (10/1988)

مانەوە ئینجا لەسەر بڕیاری سەرکردایەتی گەڕانەوە قاسمەڕەش.

- مانەوەی جلال حاجی گەلاڵی ویوسف ابراهیمی ئامۆزای شەهید کوێستانی تاکو مانگی 12ی ساڵی(1988).

- پچڕانی پەیوەندی پارتیزانەکان بەسەرکردایەتیەوە،دروستکردنەوەی پەیوەندی بۆیان وگەڕانەوەیان بۆ سنوری هەریر.

- یەکگرتنەوەیان لەگەل رەتلێکی تری پارتیزانەکان کە کاك (ڕێبین) سەرپەرشتی دەکردن،لە(14)کەس پێك هاتبوون لەسنورەکانی هەریر،دەشتی هەریر،خلیفان، ئۆردوگای هەریر، دۆلی بالیسان،دۆلی ئالانە، سەرکەندی خەیلانیان)

- هەرچەند لەبەر نالەباری بارودۆخەکە هەندێ لەپارتیزانەکان تەسلیم بوونەوە،بەلام زۆر باش بوون کەمترین زیانیان بەمەفرەزەکەو بەرێکخستنەکان نەگەیاند.

- لە ماوەی مانەوەیاندا بەم شێوەیەی خوارەوەهاوکاری کرانن:

1- دابینکردنی خواردن وەك(خواردنی ناو قوتو)و شتی تربەشێوەیەکی بەردەوام .

2 - دابینکردنی داوودەرمان بۆچارەسەرکردنی نەخۆش وبریندارەکانیان .

3 - دابینکردنی کۆمەلێك بەتانی لەرێی بەرپرسەکانی رێکخستنەوە وناردنی.

4. دابینکردنی پێلاوو جل و بەرگ

5.گواستنەوەیان بۆ هەریر و باتاس،گوندەکانی دەوروبەری. .شاردنەوەیان.

6. پاراستنی ژیانیان لەهەموو ڕوویەکەوە بەبێ ئەوەی دووژمن هەستی پێ بکات .

پێشمەرگە پارتیزانەکان ئەو دلسۆزی و پەرۆشیەی رێکخستنە نهێنیەکانیان دەدی ماندووبوون وترس ودلەڕاوکێیان لەبیردەچۆوە و ئاسودەدەبوون.

## گەیاندنی کۆمەك
## بۆ پێشمەرگە پارتیزانەکان

کۆتایی مانگی (10)ی ساڵی(1988) شەهید(ئەیوبی حاجی ڕشیدی بناوی) و هاوڕێیەکی بەتراکتۆر ڕیژەیەکی باش نان و(خواردنی ناوقوتو )وشەکرو وچاو داوو دەرمانمان بۆ پێشمەرگە پارتیزانەکانی ڕەتڵی کاك (ڕێبین محمد سۆفی) دە بەنە گووندی قاسمیەی خەیلانیان،ئەو لەگوندی سەرکەندی خەیلانیان ئیختیفا دەبێ ، کەدەگەنەگووندی قاسمیەوتراکتۆرەکەیان لەنزیك ماڵی(ملاجلال)خەیلانی ڕادەگرن، کە لێپرسراوی شانەی ڕێکخستنن و مەلای ئاوایش دەبێ. کەدەچنە ژوورەوە لەماڵی(مەلاجلال) دەبینن جەماعەتی منەزەمەی بەعسی هەریر لەماڵی ئەوانن و بەسەرداان چوونەتە ئەوێ.ئەوانیش هیچ خۆیان تێك نادن ودانیشتین، دوای بەخێرهاتن پرسیاریان لێ دەکەن : چۆنە هاتوونەتەئێرە..؟

ئەوانیش دانامێنن،ئەڵێن: کاتی خۆی ژن بەژنەیەکمان کردبوو ئێستاش دەمانەوێ لێك جیاببینەوە،بۆیە هاتووینەبۆ لای جەنابی مامۆستا..

ئەوانیش دەپرسن:ئەی بۆ بەمەلایەکی لای خۆتان کارەکەتان جێ بەجێ ناکەن ..؟

کاك(ملا جلال) وەڵامیان دەداتەوە: من لەکاتی خوێندنی مەلایەتیدا لەماڵی ئەمانە بوومە ، وەکو کوڕی خۆیان حیسابم بۆدەکەن و نایانەوێ خەڵك تێیان بگات..

کەمێکی تر دانیشن ویەکێکیان بەبیانووی سەرئاو دەستنوێژ،دەچێتمەدەرەوە .. کاك (مەلاجلال)یش دەچێتە دەر،بەچرپە پێی ئەڵێ: کاکە گیان ئەوعارەبانەی

تراکتۆرە پڕ لەخۆراك و شتومەکە بۆ پێشمەرگە پاتیزانەکانمان هێناوە و ئێوە بەوولاخ بۆیان بەرێ بکەن ، تاکو زووە باعیلاجێك بکەین نەوەك ئەوانە بینەدەر و بیبینن و بزانن حیسابمان دەڕوات...

ماموستایش بەهێمنی ئەڵێ: بیبەنە ماڵی (مام جەوهەر)و بەکاك (صاڵح)شەو ڕەوانەی دەکەین (مام جەوهەر)و (صاڵح)یش هەردووکیان هاوڕێ و دڵسۆزی خۆیان دەبن ، شەهید (ئەیوب)یش بەناوی دەست نوێژ شوشتن دەچێتە بەرەوەو مامۆستایش مەشغوڵیان دەکات و بەپەلە تراکتۆرەکە دەبەنە ماڵی (مام جەوهەر) ، شتەکان دادەنێن و بەخێرایی دەگەڕێنەوە ، بێ ئەوەی ئەوانە هەست بکەن ، دواتر دەگەڕێنەوە بۆ هەریر دوای سێ ڕۆژ خۆیان پێشمەرگە پارتیزانەکان دەبینن . دلنیایی وەردەگرن کە شتەکانیان بەدەست گەیشتبووە..

## بریندداربوونی دووپارتیزان

لەسەرەتای مانگی (10)ی(1988) سلێمان مام حسن نوسراوێك دەگەیەنێ بە هاوکاری پارتیزانەکان لەهەریر دوای خوێندنەوە بۆیان دەردەکەوێکە ئەڵغامێك لەژێر پێی پێشمەرگە پارتیزانەکاندا تەقیوەتەوە لە بەنی هەریر دووکەسیان لێ بریندار بوون، کە(مامۆستا عزیز) دەربەندی و (دکتۆر وەسمان)بوون ، داوای دەرمان و جل و بەرگی تێدا دەبێ ، بەهەڵگری نامە ئەڵێن : تۆدەتوانی بگەڕێیتەوە لایان ئەڵێ نەخێر ببوورن ناتوانم،ئیتر چەند هەوڵ دەدەن کەسیان دەست ناکەوێت، چوونکە ئەوکات تەنها جادەی قیر لەدۆڵی بالیسان نەبێت هەمووی بەمەنتیقەی محەرەمە حیساب دەکرا لەهەمان کاتدا شەهیدان (جلال حاجی یوسف و ابراهیم ) لەلای ئیختیفا دەبن بەپارتیزانی،ئەوان ئەڵێن: مادام ئەوەندە زەرورە ئێمە شارەزاین دەیبەین بۆیان، ئەوان پێداویستیەکان لەکاتێکی زوودا دەگەیەنن بە دەستیان .



# پارتیزانی دوای ئەنفال

## هەڤاڵ ڕێبین محەمەد یوسف

باس لە تێکۆشان وچالاکی پارتیزانەکان لە 1988 بۆ 1991 دەکات:

لە شۆڕشی نوێ دا،یەکێتی نیشتمانی کوردستان بە پێی قۆناغ، شێوازی خەباتی دەگۆڕی. لە دوای شاڵاوی ئەنفالە بەدناوەکانی ڕژێمی بەعسی لە ناوچوو، هێزی پێشمەرگەی کوردستان وازی لە شەڕی بەرەیی هێناو، خەباتی پارتیزانی دەستپێکرد.لە هەموو ناوچەیەك،مەفرەزەی پارتیزانی دروست کرد،تا دوژمن تێبگەیەنێ،ئەگەرچی بەزەبری چەکی کۆمەڵکوژ،دەتوانێ هاوسەنگی سەربازی بەلای خۆیدا لاسەنگ بکات.بەڵام قەدناتوانێ ڕێگە لەخەباتی پارتیزانی بگرێ.

پێش کۆتایی ئەنفالە بەد ناوەکانی ڕژێمی بەعس لە دژی خەڵکی کوردستان، لە مانگەکانی(7و 1988/8) دا،زنجیرەیەك کۆبوونەوەی سیاسی وعەسکەری لە مەڵبەندی (3)ی هەولێر لە گوندی توتمە و بێڕۆ بەڕێوە چوون، چەند هەڤاڵێك لە بەڕێزانی (م. س) وسەرکردایەتی( کۆسرەت ڕەسوڵ عەلی،ملازم عمر عەبدوڵا، فەریدون عەبدولقادر، ماموستا عەبدوڵا، شەهید حەسەن کوێستانی)،هەروەها لێپرساوەکانی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان لە مەڵبەند(شەهید عبدالرزاق،شەهیدشاخەوان عەباس)و لێپرساوی ڕێکخستنی یەکێتی شۆڕشگێڕان و زۆربەی فەرماندەی تیپەکانی پێشمەرگەو، کادرە سیاسیەکانیش بەشداریان تیادا دەکرد،بە مەبەستی هەڵسەنگاندنی هەڵ ومەرجی ئەنفالەکان ودیاری کردنی چارەنوسی هێزەکان. لە ئاکام دا، گەیشتنە ئەو باوەڕەی لە پێناوی پاراستنی (هێزی پێشمەرگەی کوردستان)دا،زۆرینەی هێزی پێشمەرگە بکشێننەوە بۆ سەر سنورەکان و بەشێکی کەم و دیاری کراویش لە پێشمەرگەی هەڵبژاردەو لیهاتوو لە

شێوەی دەستەی پارتیزانی لە ناوچەکانی مەڵبەندی (3) هەولێر درێژە بە خەباتی سیاسی وچالاکی پارتیزانی بدەن.لەسەرەتای مانگی(1988/8)لە کۆبوونەوەیەکی تردا، کە تایبەت بوو بە کاری رێکخراوەیی، لە گوندی بێرۆ لە بارەگای مەڵبەند سازدرا بەسەر پەرشتی بەڕێز ( کۆسرەت رەسوڵ عەلی) لێپرسراوی مەڵبەند و بە ئامادەبوونی بەڕێزان شەهید حەسەن کوێستانی و شەهید عبدالرزاق و شەهید شاخەوان عەباس و تەواوی لێپرسراوەکانی رێکخستنی کۆمەڵەی رەنجدەرانی هەردوو رێکخراوەکەی سنوری هەولێر، لە ئەنجامی لێکدانەوەیەکی بابەتیانەی بارودۆخەکە بڕیاردرا چەند لێپرسراوێکی رێکخستن لەگەڵ دەستە پارتیزانەکان بمێننەوە و سەرپەرشتی کارە رێکخراوەیەکانی هەموو ناوچەکە بکەن. شەهید حەسەن کوێستانی سەرکردەش سەرپەرشتی هەموویان بکات، واتە( فەرماندەی پاتیزانەکان و لێپرسراوی رێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەران )، شەهید رێبازیش جێگری بێت. سەبارەت بەرێکخستن لە کۆی نۆ لێپرسراوی رێکخستن چوار هاوڕێ لەسەر خواستی خۆیان بڕیاری مانەوەیان دا هەر یەکەیان لە ناوچەکانی خۆیاندا لە پاڵ چالاکی پێشمەرگانەدا سەرپەرشتی کاری رێکخراوەیش بکەن بەم شێوەیە: شەهید(وشیارە سوور)بۆ دەشتی هەولێر داندرا(کاک بێستون) بۆ دەشتی بەڕانەتی (مامۆستا رێبووار) بۆ ناوچەی دۆڵی وەرتێ و بۆتێ، (رێبین محمد سۆفی) بۆ ناوچەکانی رواندز، دیانا- سۆران، خەلیفان، هەریر و باتاس داندرا.

هاوشان لەگەل فەرماندەی وەحدەی پارتیزانەکان وەك: شەهید مەلا سولەیمان جەلال ئیلنجاغی و برهان سەعید سۆفی و ئاسۆ ئەڵمانی و شەهید جەلال حاجی و شەهید رەحمان حاجی خدر و شەهید علی وەیس و...هتد، درێژە بە خەباتی پارتیزانی بدەن. لە گەڵ ئەوەشدا، قسە لەوەش کرابوو، بەریدی سەرکردایەتی بەزنجیرە لە مامۆستا رێبووارەوە بۆلای رێبین و ئەویش بۆ کاك بێستون و ئەویش

بوو شەهید وشیارە سوور رەوانی بکات، بەریدی شاریش لە خوارەوە بۆ سەرەوە بە پێچەوانەوە، بە هەمان رێگە بگەڕێتەوە. بە هەرحاڵ، پاش دانانی ئەو بەرنامەیە، لە (1988/8/25)، پێش هێرشی هێزەکانی دوژمن بۆ سەر بارەگای مەڵبەندی (3)ی هەولێر،مەفرەزە پارتیزانەکان بەرەو شوێنەکانی خۆیان بەرێکەوتن.مەفرەزەکەی ئێمەش کەبریتی بووین لەبەشێکی تیپی(19)ی کۆڕەك ژمارەیان(14)پارتیزان بوو، من سەرپەرشتیم ئەکردن. هەموویان لەسەر خواستی خۆیان بڕیاری مانەوەیاندا دابوو،لەدوای نیوەڕۆی هەمان رۆژدا،لە گوندی (توتمە) شەهید حەسەن کوێستانی، پێش ئەوەی ئاگر لەبارەگای مەڵبەند بەربدا، تا وەك خانوی تەواو نەکەوێتە دەست دوژمن، دوا رێنمایی کردین و بەرێی کردین. شەوەکەی لە چیای بەنی هەریر ئاوەدیوبووین، لە راستی گوندی سیساوە بەناو هێزە کۆکراوە گەورەکەی دوژمن دا، کە بۆ هێرشبردنە سەر دۆڵی (ئالانە ـ بالیسان) ئامادەکرابوون، تێپەڕین و لە گوندی ئالی سیدەك لە ماڵی رێکخستنەکانی خۆمان بە پەلە نانمان خواردوو، لە جادەی سەرەکی (سپیلك ـ شەقڵاوە) پەڕینەوە و بەرەو گوندەکانی دەشتی هەریر رۆیشتین. لە لایەکی تر شەهید جلال حاجی کە تازە بەسەر تیپی (19) کۆڕەك داندرابوو، لەگەڵ مەفرەزەکەی خۆی ژمارەیان هەر بە قەد ئێمە دەبوو، لەگەڵ کۆمەڵێ لێپرسراوی تری وەك: صلاح دیلمانی و ڕزگار هاودیانی و د. ئاری و مەفرەزەکانی خۆیان کە ژمارەی هەر هەموویان دەگەیشتە (40) پارتیزان، بوونە هاوڕێی شەهید (حەسەن کوێستانی) سەرکردەی پارتیزانەکان و ئەوانیش لەناوچەکانی دۆڵی بالیسان و مەلەکان و وەرتێ و باڵەکایەتی درێژەیان بە خەباتی پارتیزانی دا. بە هەمان شێوە، مامۆستا رێبووار و مەفرەزەکەی بەرەو ناوچەکانی دۆڵی بۆتێ بەرێکەوتن. هەروەها، جمال هەروتی هەر دوو رۆژ بوو بە جێگری تیپی (19) ی کۆڕەك دانرابوو بە خۆیی و مەفرەزەکەیەوە لە پشت گوندەکەی خۆیان، لە

گوندی هەروتەکۆن، لە دۆڵی هەروتیایەتی خۆیان حەشاردا. دوو ڕۆژ دوای ئەو ڕووداوانە، لە 1988/5/28 دا، دوژمن لە هەموو لایەکەوە پەلاماری گوندی وەرتێ و گوندی گەرەوانی لای رواندز و دۆڵی بله . مەلەکان و دۆڵی بالیسان ـ ئالآنە، و بالیسان . مێرگەسەری دا و بارەگای مەڵبەندی (3) ی گرت، کە (هێزەکانی مەڵبەندی (3) لەوێ نەمابوون و کەیشتبوونە دۆڵی باڵەیان). جەمال هەروتی و مەفرەزەکەی، کە ناوچەکەیان گیرا ئەوانیش لەوێ دەرپەڕین و شەوێك بەڕێکەوت لە دەشتی هەریر ئێمەیان لە نێوان گوندەکانی باویان و خرواتان دا دۆزیەوە و چەند پێشمەرگەیەکی کەمی لە گەڵدا مابۆوە، ماوەی چەند ڕۆژێك لەگەڵ ئێمەدا جەولەیان کردو ئیتر ئەوانیش، جگە لە کاك (صباح توتمەره)، هەموویان تەسلیم بوونەوە.
بە هەرحاڵ، مەفرەزەکانی پارتیزانی لە دەڤەری سۆران بەم شێوەیەی باسمکرد، لە ناوچەکانی خۆیان دەستیان بە چالاکی کرد، بەڵام لە بەر سەختی هەلومەرجەکە، پەیوەندیمان لەگەڵ مەفرەزەکانی تر بەگشتی و لەگەڵ سەرکردایەتی بەتایبەتی، بە تەواوی پچراو، تەنانەت جیهازی کۆڵەپشتیش، کە پێمانبوو بە کەلکمان نەهات، چونکە ئەو جۆرە جیهازانە تەنها لە شوێنی بەرز بە کەلکی پەیوەندی گرتن دەهات، ئەو شوێنانەش هەمووی کەوتە بن دەستی دوژمن، بۆیە جگە لە ڕێکخستنەکانی خۆمان و جەماوەری ناوچەکە لەوانی تر دابڕاین.
دیارە، مەفرەزەکەی ئێمە کە لە خوارەوە ناویان هاتووە سەرەتا لە دەشتی هەریر و ناوچەی شەقلاوە و خەلیفان. درێژەمان بە خەباتی پارتیزانی دا. پێشتریش، وا ڕێنمایی کرابووین لە قۆناغی یەکەم دا هەوڵ بدەین خۆمان نیشانی ڕێکخستنەکان و خەڵك بدەین و خۆمان لە دوژمن بشارینەوە، دەتوانم بڵێم لەم قۆناغەدا ئەو بەرنامەیەی بۆمان دانرابوو زۆر بە وردی جێبەجێمان کرد. هەر هەموو گوندەکانی سنوری عەشیرەتەکانی خەیلانی و سورچی و خۆشناوەتی لە دەشتی هەریر و

خەلیفان و دەورو بەری شەقلاوە و ناو شارۆچکەی هەریر و باتاس بگەڕێین و ڕێکخستنەکانمان بەسەربکەینەوە و لە بڕیاری درێژەپێدانی خەبات بەشێوازی پارتیزانی ئاگاداریان بکەینەوە ئەوانیش،بەهەمووتواناییەکیان هاوکاریان کردین.

شایەنی ئاماژە بۆ کردنە سەرەتای مانگی 1988/9 مەفرەزەیەکی (حشع) بەسەر پەرشتی د. شوان و یەکی (پارتی) بەسەر پەرشتی (وەستا یونس) ماوەیەکی کەم لەناوچەکە دەسوڕانەوە تەنانەت چەند جارێکیش ئێمە لەگەڵ مەفرەزەی (حشع) لەناوچەکانی سەرکەندو ڕەزگە و لەدەوروبەری هەریر بەیەکەوە دەسوڕاینەوە و خۆمان حەشاردەداو بۆ نان خواردنیش لە گوندەکان بەیەکەوە دابەش دەبووین. دواتر کە دوژمن هەستی کرد مەفرەزەی پارتیزان لە ناوچەکەدا بوونیان هەیە زۆر بە چڕو پڕی بە هێزێکی پیادەی زۆر و کۆپتەر، کیۆماڵی (تمشیک) ی ناوچەکەیان دەست پێ کردوو چەندین جار لە ناوچەکە بەڕێکەوت لەبەردەمی هێزەکانیان دەربازمان بوو. دوای ئەوە هەردوو مەفرەزەکەی (پارتی) و(حشع) هێندەی پێویست خۆیان بۆ نەگیرا و ناوچەکەیان بەجێ هێشت. لەسەرەتای مانگی 1988/10 بەدواوە لەو ناوچەیەدا هەر مەفرەزەکەی ئێمەی تێدا دەسوڕایەوە، لە ڕەزگەی دیوین بە خوارەوە بۆ لای هەولێر، مەفرەزەکانی بەڕانەتی و دەشتی هەولێری لێبوو، کە شەهید (ڕێبار) سەرپەرشتی دەکردن. مەفرەزەکەی ئێمە، سەرەڕای شەڕو چالاکیش جارێکیش هەموومان کەوتینە ناو کێڵگەی (مین) و دوو پارتیزان بریندار بوون. ئیدی لەبەر سەختی خەباتەکەو کەم وێنەیی ئەم شێوە پارتیزانی یەدا لە لایەك و زۆری کیۆماڵەکانی دوژمن و شەو ڕۆژ بەدوامانەوە بوون لە لایەکی تر، ئەوانە هەموو کاریگەری خراپیان هەبوو وایان کرد وردە وردە ژمارەیان کەم دەبۆوە ناوە ناوە یەکێك لە دۆڵێك بەدزی یەوە بەجێ ی ئەهێشتین یان بە ئاشکرا چەکیان دائەناو ئەیان وت ئەم شێوە خەباتە قەد ناکرێ، بەڵام بۆ مێژوو دەیڵێم:

یەك کەسیان خیانەتیان لێنەکردین، تا وای لیهات تەنها (8) هەشت پارتیزان ماینەوە. شەهید جلال حاجی و شەهید یوسف گەلاڵی ، دوای بەڕێ کردنەوەی شەهید حەسەن کوێستانی بەرەو سنور بە چەند پێشمەرگەیەکەوە بەرەو لای ئێمە گەڕابوونەوە. لە ڕێگای ڕێکخستنەکانەوە لە 10/7/ 1988 دا، لە پشتی گوندی شارسینەی هەروتیایەتی ئێمەیان دۆزییەوەو هەردوو مەفرەزە یەکترمان گرتەوە. لەوکاتەدا، بەشێك لە پێشمەرگەکان زۆر هیلاك و ماندو ببوون و بڕیارماندا ئەوانیش بگەڕێنەوە بۆ سەر سنور، ئیتر تا کۆتایی(1988) تەنها شەهید جەلال حاجی و شەهید یوسف گەلاڵی و ڕێبین محەمەد سۆفی مابوونەوە، کە لەناوچەکانی خەلیفان و سۆران و گەلاڵە. سەرەنجام، شێوازی خەباتی پارتیزانی لە دەڤەری سۆران زیاتر پەرەی گرت و، بەردەوام بوو. مارتن لۆتەر دەڵێ: کەس ناتوانێ سواری پشتت بێت، گەر دانەنوێی. هێزی پێشمەرگەی یەکێتیش قەد سەری بۆ سوپای داگیرکەران دانەنەواندوە، بۆیە هەر دوای ئێمە، چەندین فەرماندەی مەفرەزەی تر، وەك: عەبدوڵا بۆر، شەهید ڕەحمان سەیدە، عوزێر فەقیانەیی، جارێکی تر شەهید جەلال حاجی، هەموو ئەوانە، لە گەڵ کۆمەڵێك پێشمەرگەی پارتیزان، مەفرەزە لە دوای مەفرەزە، تا ڕاپەڕین درێژەیان بەو شێوازەی خەبات دا.

**لیستی ناوی پارتیزانەکان:ــ**

| | |
|---|---|
| 1 ـ عزیز بابکر حسین( م. عزیز دەربەندی) | 2 ـ صباح توتمەرە |
| 3 ـ شێخ نەبەز دارولسەلامی | 4 ـ شەهید کریم الیاس |
| 5 ـ د. وەسمان ( دکتۆری مەفرەزەکە ) | 6 ـ نوری حسین دیبەگەیی |
| 7 ـ عومەر دارولسەلامی | 8 ـ حەتەم بناوی |
| 9 ـ شەهید جلال حاجی | 10 ـ شەهید یوسف ابراهیم |
| 11 ـ ڕێبین محمد سۆفی | 12 ـ نەجات علی حسن ( کاروخ) |

* سەرچاوە : نامەی تایبەتی کاك ڕێبین محمد صۆفی



# مەڵبەندی کویستانی و خەبات

ئەگەر باس لە خەبات و کۆڵنەدانی خەڵکی کوردستان بەگشتی بکەین ,ناکرێ و ناشێ باس لە دڵسۆزی و ئازایەتی و فیداکاری خەڵکی خۆشناوەتی وباڵەکایەتی و سۆران وسنووری رواندزوچۆمان وگەڵاڵە.باس لەجوامێری هاورێیانی کوێستانی و قادرخەبات نەکەین .

داستانی (دابان ـ هەلاج) و(قەیوان ـ ماوەت) و داستانی رزگاری وکێل کێل و هەڵموند و بەرگری لەشکری ئەنفال و راپەرین و داستانی کۆڕێ و شەڕی تیرۆر و.. بەڵگەی سەلماندنی جوامێرانی ئەو دەڤەرانەیە.

ئەوەتا رەحمانی حاجی خدر لە راپەرین و صلاح دیلمانی لە گەرمەسێر و دوور لە زێدی خۆیان بەوپەڕی سەخاوەتەوە گیانی خۆیان دەکەن قوربانی گەل ونیشتمان.

هەربۆیە بەر لە راپەرین جارێکی ترسەرکردایەتی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) پۆل پۆل پارتیزانی ئامادە دەکرد و هەموو پێداویستی بۆ دابین دەکردن و بۆ سنوورەکانی خۆیان بەرێیان دەکردن..

ئەم نامەی خوارە یەکێك لەوبەڵگەنامانەیە کە هەڤاڵ(حەسەن کوێستانی) دەستەیەك پارتیزان بەفەرماندەیی(مستەفا عبدالله تەها)دەنێرێتەوە بۆباڵەکایەتی ومەڵبەندی خەبات و کوێستانی...


سڵاوێکی گەرم

١٩٨٩/٦/١٨

**نامەیەکی هەڤاڵ کاک حسن کوێستانی**
**بۆ ناردنەوەی پارتیزانەکان**



# کۆچی دوایی پارتیزان مامۆستا عزیز دەربەندی

سالأنە کەسوکارو هاورێ و هەڤالأنی یادی کۆچی دوای تێکۆشەرێکی سەردەمی شاخ وقارەمانێکی پارتیزان و کادیرو فەرماندەیەکی ووشیاری سەربازی دەکەنەوە، ئەوتێکۆشەرەی لەکاتی شالأوەکانی ئەنفالدامەرگ لەگەڵی کەوتە گیانبازی و کۆڵی پێنەدا،هەستایەوە سەرپێ وئەو ڕۆڵە بە ئەمەك وبەوەفاو دلسۆزەبوو بۆ دۆزی ڕەوای گەل ونیشتیمانەکەی بە دارشەق و جەستەی شەکەت و بریندارەوە لەڕێگای زۆر زۆر دورەوە لە سەر سنورەوە ، لە نەخۆشخانەکانی ئێرانەوە ، خۆی پێنەگیراو خۆی گەیاندەوەپارتیزانەکانی دوای ئەنفال لەپشتی کارۆخ..

هەربۆشایەدی ڕاستی ئەم مێژوە کادیرێکی دیاری لایەنێکی تری ساسی ئەو کات کەبینیبووی پێی گوتبوو:(ئەمە چ عیشقێکە تۆ بۆی هاتوویەوە ، بە دار شەق و جەستەی شەکەتەوە گەڕاویتەوە سەنگەری خەبات و کۆڵنادەی ..؟؟ ئەرێ یەکیەتی ئەمانەی لە چ خوێندنگایەك گۆش و پەروەردە کردووە، .؟؟) ئەو ڕۆژە تەنیا پێشمەرگەوشاخ و تەنیایی ومردن ئاوێتەی یەکتربون ڕۆژ ڕۆژی سوتماکی لادێ و ئاوایەکانی نیشتمان بوون.هێزی داگیرکەری بەعس لەپرۆسەی ئەنفالدا سەرمەست وحیران بووبۆ وێرانکردنی نیشتمانی دایکەوە،ئەرێ قەدەرچۆن توانی..

(مامۆستا عزیزدەربەندی)لەم سەفەرە ئەبەدیەدابڕێت..خۆبڕیار وابووئەوحیکایەت و داستانە کانی سەری جوانەگاو کێلکێل و بەنی هەریر..بۆ نەوکانی داهاتوو باس بکات،چالاکیە کانی تیپی 12 سۆران و تیپی نۆزدەی کوڕەك.. بۆ لاپەڕەکانی مێژوو بگێڕێتەوە،ئەو ڕۆژەی سەفەری ئەبەدی کرد بڕیار وابوو بەیانیەکەی سەفەرێك بکات بۆ کۆیە بۆ پرسەی دۆستێکی دێرینی کە کۆچی دوایی کردبوو، بەڵام مخابن مەرگ مۆڵەتی نەدا و خۆی سەفەری تەنیایی کرد.

# پارتیزانەکانی بادینان



## شەهید حەسەن سەلیم نێروەیی
## فەرماندەی پارتیزانەکانی دوای ئەنفال
## لە سنووری بادینان



# ژیاننامەی
# شەهید حەسەن سەلیم نێرەیی

ـ لە سالی 1950 ژ بنەمالەکا هەژارو کورد پەروەر ل دەڤەرا نێروەیا سەرب قەزا ئامێدیێ ژدایك بوویە ..

ـ ل سالا 1977 هاتینە کۆچبەرکرن ژ بۆ مجمع دێرەلوك

ـ ل سالا 1979 جار هاتۆتە گرتن.

ـ ل سالا 1978 پەیوەندی بە ریزێن (پارتی) کریە.

ـ ل سالا 1988 پشتی ئەنفالا بادینان ئاوارەیا تورکیا بویە.

ـ ل سالا 1989 پەیوەندی ب ریزێن (ی.ن.ك) کریە و دگەلەك داستانێن بەرەڤانیکرنێ دا ل دەڤەرا بادینان بەشداری کریە

ـ ل سالا 1990 پارتیزا نا پشتی ئەنفالا بوو..

ـ ل 3 ـ 4 ـ 1991 دگەل هەردوو هەڤالێن خوینێن پێشمەرگە شەهید حسین فەتاح و شەهید حەجی ئەحمەد د داستانەکا کێم وێنەدا و دشەرەکێ بەرگرییێ دا ل دەرازینکا گەلیێ بێسرێ دهۆك دەێنە شەهیدکرن.



## پارتیزانی دوای ئەنفال
## هەڤاڵ عەبدولرەحمان نێروەیی
## بیرەوەری خۆی ئاوا دەگێڕێتەوە :

دوایی ئەنفالەکان وئاوارەبوون ئێمە لە ئێران نیشتەجێ بوین جەندکەسێك هەڵساین بەکۆکردنەوەی جەند پێشمەرگەیەکی بادینی رێکەوتین، ئەوجا پێنج کەس چووین بۆسەرکردایەتی(ی.ن.ك) تالەگەڵیان دابنیشین وبەرنامەیەك ئامەدەبکەین بۆرەتلێکی پارتیزان و رەوانەی بادینانی بکەینەوە، ئەو کەسانەی چوون بۆ سەرکردایەتی ئەمانەی خوارەوە بوون: (محمود کانیسارکی، شەهیدحسن سەلیم، توفیق چەلکی، مەعاوی رەئوف، عبدالواحد تاهر ) لەگوندی زەڵێ لەگەل کاك نەوشیروان دانیشتین، بەرنامەمان دانا کاك نەوشیروان ئامادەیی خۆی دەربڕی هەر پێوستیەکی هەبێت بۆ بادینان دەیکەین، ئەوجا گەراینەوە بۆ ورمێ خۆمان ئامادە کرد،لەشاری شنۆ بارەگای مەڵبەندی بادینان لەوێ بوو،لەگەل کاك حامی حاجی غالی وکاك بیستون سابوراوەیی دانیشتین،رەتلێکی پارتیزانیمان دروست کرد،کە 17 پ م بووین،جەك وتەقەمەنی وجیهازێکی بێتەل وپارە وکەل وپەل ئامادەکران،رەتلی یەك پێکهاتبوون لەم پارتیزانانەی کە ئامادەبوون بچن بۆ بادینان :

| | | |
|---|---|---|
| ١. محمود کانیسارکی | لێپرسراوی رەتڵ | |
| ٢. غەنی کورەمارکی | رابەرسیاسی و جێگری رەتڵ | |
| ٣. عبدالواحد تاهر | فه رماندەی کەرت | |
| ٤. سەبری حسن | فه رماندەی کەرت | |
| ٥. احسان عزیز | عدد جیهاز | |
| ٦. إسماعیل إسلام | دکتور | |
| ٧. احمد محمد علی | پ م | |
| ٨ . ئەمین کانیسارکی | پ م | |
| ٩. نەسرەدین إسلام | پ م | |
| ١٠ . مستەفا عیسا | پ م | |
| ١١ . نصرالله باقی | پ م | |
| ١٢ . مصلح باقی | پ م | |
| ١٣ . حسین تاهر | پ م | |
| ١٤ . محمد إسلام | پ م | |
| ١٥ . احمد سەلمان | پ م | |
| ١٦ . مه جید حسن | پ م | |
| ١٧ . ئەیوب صالح | پ م | |
| ١٨ . نزار کانیکی | پ م | له سنوری تورکیا گەرایەوه بۆ ئێران |
| ١٩ . زوبیر کانیکی | پ م | له سنوری تورکیا گەرایەوه بۆ ئێران |



## بەرێکەوتن بەرەو بادینان

لە ڕۆژی ١٦/٨/١٩٩٠ لە گوندی(ڕاژان)ەوە کە بارەگای پەیوەندییەکانی یەکێتی لێبوو، چووین بۆ سنووری تورکیا،تا لەوێوە بڕۆین بۆ دەڤەری شەمزدینان، تا لەوێوشەوە بچین بۆ ناوخاکی تورکیا،پارتی ئاگاداری دەوڵەتی تورکیان کردبۆوە کەمەفرەزە یەکی یەکێتی دەچن بۆ سنور،تا تورکیا رێگا بگرێت بۆئەوەی ئێمە نەتوانین بچینەوە بۆکوردستانی عێراق، تورکیاش بەهێزێکی لەشکری سنووری خۆی قایم کرد. هەربۆیە ئێمە لە سنوور ماینەوە،تا ڕۆژی٢٧/ ٨ /١٩٩٠ مەفرەزەیەکی (پ ک ک) هاتە لامان ناوی مسئولەکەیان(سوارەحسێن)بوو، کەسێکی زور وریا بوو، لەرێگای (سوارە حسێن)ەوە ئێمە لە سنوور دەرباز بووین،جوین بۆ گوندی( باوێ) لەوێوە چووین بۆ سنووری عێراق ...

ڕۆژی٣٠/٨/١٩٩٠ گە یشتینە گوندی( چەمێ تیا) ئەوگوندە لەخاکی ئێران نەبوو کوردستانی عیراق بوو، لەوێ یەك ڕۆژ ماینەوە، پشوومان دا ...

ڕوژی ١/٩/١٩٩٠ چووین بۆ قولایی کوردستان لە گوندی(جارمەندا ماین) پێش ئەوەی ئێمە بچین بۆ بادینان لەگەڵ سەرکردایەتی رێکەوتبووین کەرووبە رووی هیچ هێزێکی سەربازی نەبینەوە،بۆ ئەوەروێشتبووین کەپەیامی سەرکردایەتی بگەیەنینەهێزە جەکدارەکانی عیراق وئەوموستتشارانەی سنوورەکە،خۆمان لەشەڕی نابەرانبەر بەدووربگرین، تەنها خۆمان ئامادە بکەین بۆ ڕاپەڕین وسەرهەڵدان..



پارتیزاەکانی بادینان ـ لەچەپەوە :

. عبدالرزاق ئیبرهیم ڕێکانی،محمد تاهیر چەلکی،محسن عبدالرحمن دەشازی،

ئیحسان عبدالغنی (پزیشك)،شوکری سلیم(دانیشتوو)،رشدی هیبتی،نازم حسن نێروەیی



پارتیزاەکانی بادینان ـ لەڕاستەوە :

ـ شەهید حەسەن سەلیم ، شوکری سەلیم نێروەیی،

عبدالرزاق ئیبراهیم ڕێکانی، نازم حەسەن نێروەیی، محەمەدساڵح

# بەشی نۆیـــەم

# پارتیزانی لایەنە کوردستانی یەکان



## پارتیزانەکانی پارتی لەبادینان

ئەڤ وێنە ل سالا 1989ێ هاتیە کێشان

ل دەڤەرا بادینان لقێ دەمێ پارتیزانی

## کەمال کەرکوکی و چەند پارتیزانی تری پارتی

هێزێك لەپێشمەرگە پارتیزانەکانی دوای ئەنفالی پارتی دیموکراتی کوردستان بەسەرپەرشتی دکتۆر کەمال کەرکوکی لە ساڵی 1989 تا ڕاپەڕینی ١٩٩١ لە سەخترین ڕۆژگاردا مەیدانیان بۆ ڕژێمی درندەی بەعس چۆڵ نەکرد، ئەمانە هێزێکی پارتیزانی بوون دابەش ببوونە سەر چەندین مەفرەزە و دەستە تاکوئاشکرا نەبن چونکە لەوڕۆژگاردا دژاورترین کاتی پێشمەرگایەتی بوو، ڕژێم دوای شەڕی

لەگەڵ ئێران هەموو هێزەکانی لە چیاکانی کوردستان دامەزراندبوو سەرەڕای ئەوەش لەشکری تورکیایش هاوکاری دەکردن بۆ لێدانی هیزەکانی پێشمەرگە.
پێشمەرگەوهەڤاڵانی بێتەل واتە "عەدەد جیهازەکان" پاتری ئۆتۆمبێل و جیهازی ڕاکاڵ و مولیدەی بچوکی کارەبایان بەشان هەڵدەگرت و لەم شاخ بۆ ئەو شاخ دەیان گواستنەوە تاکو پەیوەندیان لەگەڵ سەرکردایەتی نەپچڕێ ...

**ناوی پارتیزانەکان :**

1ـ محمد تاهیر بارزانی.

2ـ محمد محمد عەلامە.

3ـ سدقی بایەزید ئەرگوشی.

**ناوی ئەوانەی لەوێنەکاندا دیارن:**

١. هادی (قەنناس بە دەستەکە

٢. مام تاریق مەولود (دیاکۆ) بەرپرسی ناوچە .

٣. مەلا عەلی .

٤. فەخرەددین .

٥. دکتۆر کەمال کەرکوکی

٦. مەهدی تاریق مەولود

٧. ڕزگار فاروق مەولود

٨. ڕێبوار فاروق مەولود

٩. کاکە ئاراس عوسمان

* سەرچاوە :فیسبووک Zerak S Hamad ١٨ سبتمبر ٢٠١٧



**لە ڕاستەوە**

١- هادی قەنناس بە دەستەکە

٢- مام تاریق مەولود (دیاکۆ)

٣- مەلا عەلی .

٤- فەخرەددین .

٥- دکتۆر کەمال کەرکوکی .

٦- مەهدی تاریق مەولود

ڕاوەستاوەکان:

٧- ڕزگار فاروق مەولود

٨- ڕێبوار فاروق مەولود .



**لە چەپەوە**

١- ڕزگار فاروق مەولود

٢- کاکە ئاراس عوسمان .

٣- کاکە هادی .

٤- دکتۆر کەمال کەرکوکی .

٥- فەخرەددین

٦- مەهدی تاریق مەولود



**پارتیزان عەلی صدیق نێروەیی**



**شکری فارس ل سالا 1989دەمێ پارتیزانی لدەڤەرا بادینان**



ئەڤ وینە لسالا ١٩٨٩یێ هاتیە گرتن لدەڤەرا دوسکی ژوریا

دەمێ پارتیزانی لوی دەی سالەك لسەر ئەنفالێرا دەرباسببو



ئەڤ وێنە لسالا 1989یێ هەتیە گرتن

ل کوردستانا روژهەلات لگوندێ سلێڤانا دا بەرەڤ کوردستانا باشور

هێزەکا پارتیزان دگەل شەهیدێ فەرماندە/حسێن فتاح نێروەی



## پارتیزانەکانی دوای ئەنفال

**مەفرەزەیەك لە پارتیزانەکانی لێژنەی ناوچەی شەقڵاوەی پارتی دەشتی هەریر لەمانگی ١١ساڵی ١٩٩٠**

- **هەڤاڵ دلشاد ماوەرانی**
- **هەڤاڵ هێرشە ڕەش**
- **هەڤاڵ جمال موتکە**
- **هەڤاڵ شەریف ماوەرانی**
- **هەڤاڵ نوزاد اسعد**
- **هەڤاڵ زریان شێخوەسانی**
- **هەڤاڵ برایم دەراشی**

سەرچاوە : فەیسبوکی Salh Baper



## پارتیزانی دوای ئەنفال دلزار کریم *

دوای کیمیابرانی گۆپتەیە و پەلاماری ئەنفالی چوار بۆسەر ناوچەکانی سنووری کەرکوك ئێمە بەپێشمەرگەوهێزی پشتگیری نزیکەی300کەس دەبووین لەسەرووی گوندی (ئاومالْ) لەزێ پەڕینەوە،دوای دەرچوونمان لەبازنەی ئەخشەی پەلامارەکەبەرەو خۆشناوەتی بەرێکەوتین،ڕۆژی 1988/5/8 گەیشتینە سماقولی، دوای دە ڕۆژمانەوە لەوێ لەگەڵ کاك ڕێبوار بریارماندا بگەرێینەوە بۆدەشتی هەولێرو ناوچەکانی(سالەیی)و(شێخ بزێنی ).. لەرێگا تووشی چەندین دەستەی پێشمەرگەی پەراگەندە بووین.لەکاتی پەڕینەوە لە ڕێگای کۆیەـهەولێر کەوتینە بۆسەی جاشانەوە،بەلام بەسەلامەتی دەرچووین، بەرەبەیان جووینە نزیك (کانی دەربەند)لەوی تووشی (فاتح مامەند قەرەبگ)ی بووین،لەگەڵ خۆمان بردمان بۆ هەڵەتەکانی نزیك گوندی(لەمبەر)لەوێ هەڤاڵێکی خۆمان کاك(ئارام)مان دۆزییەوە، بووین بەسێ کەس،بەرەو (سارتك) بەرێکەوتین، شەوبوو،لە نزیك (شەرغە) تووشی لاشەیەك بووین،سەرەتا وامانزانی مردووە،کەلێی ورد بووینەوە بۆمان دەرکەوت کەزیندووە،ناوی (مام فتاح)بوو،ئاوارەی کەرکوك بوو،بەخێزانەوە لە (پەڵکانە) نیشتەجێ بووبوون،لە کەسوکارەکەی دابرابوو،ماوەیەك لەلای ماینەوە،ئاومان داپێی ،هەندی نانی خوارد،کەمێك وزە هاتەوەبەری،داومان لێکرد ورەبداتەبەرخۆی و لەگەڵماندا بێت،بەلام نەیتوانی،هەندی نانەرەق و دەبەیەك پێنج لیتری ئاومان بۆی بەجێ هێشت،ئێمە کەوتینەرێ بۆچەمەکانی(گێلێن)،دواتر نەمانزانی چی بەسەرهات،بۆرۆژی دواترمن پەرێمەوە بەری(دەرماناو)چونکە برایەکم بەناوی

(جودت)وکاك ڕێبوواریش دووبرای بەناوەکانی(یاسین وصدیق) بێسەروشوێنبوون، هیچ هەواڵێکم بەدەست نەکەوت، لەخوارگوندی(خوڕخوڕ) پەڕیمەوە، لەگەڵ هەردوو هاوڕێکەم یەکمان گرتەوە،نان وئاومان خوارد،بەرێکەوتی بەرەوگوندی (بەردەسپی) شەوبوو،زۆربرسی وماندووبووین،لەپڕچەکیان ڕاکێشا،ئێوەکێن.؟)ئێمەش خۆماندا بەزەویداوچەکمان لێ ڕاکێشانەوە:(ئەی ئێوەکێن..؟)هەردوولا لێك بەگومان بووین.. لەپاش گفتووگۆیەکی زۆر لێك دڵنیابووینەوە، ئەوان مشـووری خۆیان خواردبوو، خواردنیان ئامادەکردبوو،من یەکیانم ناسی ناوی (تەیب) بوو،برای(عوسمان قایەباشی)بوو، لەگەڵ ئەوان نانمان خوارد،گوتیان کاکە دەبێت ئێوەش خەمێك لەخۆتان بخۆن،لەناوگوندی بەردەسپی وشیو ودۆڵەکانی دەورهو نەری هەندێك پاشماوەی خەڵکی ئاوارەی گوندەکەمان کۆ کردەوە..بڕیکی باش لە (شەکر وچا وبرنج وئارد وڕۆن ونیسك و نۆك)مان دابین کرد..لەوناوە گەڕاین تا کەرێکیشمان دۆزییەوە،هەموو شتەکانمان لێ بار کرد وگەڕاینەوە بۆسەر زێ،نزیك گوندەکانی (سارتك)و(خوڕخوڕ)لەو دورگەیەدا حەساینەوە،بەیانی لە دەنگی (هەلیکۆپتەر)ەکان بەخەبەرهاتین،هێزێکی زۆر لە سوپاوجاش هاتنە ئەو ناوچەیە،کردیان بەتەقە.. بەدوای پارتیزانەکاندا دەگەڕان، کەسیان بۆنەدۆزرایەوە..

بۆ ڕۆژی دواتر وابزانم 5/25 1988 بوو،شوێنەکەمان گۆڕی،خواردنەکەمان کردە چوار بەشەوە،لەچوار جێی جیاجیا حەشارماندان،ساج وقاپ وکەوچك کتری وقۆری و کەرەستەی خواردن دروستکردنمان لە کەلاوەکانی (خوڕخوڕ)پەیدا کرد،ناوە ناوە دەپەڕینەوە بۆ بەری(دەرماناو)لەوێ لەگەڵ هاوڕێ (هەڵگورد)یەکمانگرتەوە، مانەوەلەو بارودۆخەدا ئاسان نەبوو،کەس لەکەس دڵنیانەبوو،مەگەر هاوڕێیەکی باوڕپێکراوی خۆت،ئاخر ناهەق نەبوو،هەندی کەسی نەفس نزم خیانەتیان لەهاوڕێکانی خۆیان کردبوو.شەهیدیانکردبوون و تەسلیم ڕژێم بووبوونەوە..

لەبەر ئەوەی زۆربەی ژەمەکان(ناوساجی)مان دەخوارد،هەموو دەموولێومان بووبوو بە زیپکە..گیانمان بەرەزێکی قەیسی بوولە(سارتك) ئێواران خۆمان پێی دەگەیاند.. باکاڵی و بەکولاوی لێمان دەخوارد..خوابەخێری خاوەنی بینووسێت،جگە لە ئێمە بە دەیان دەستە لە پێشمەرگەی (ی.ن.ك) و(هێزیپشتگیری) و(سەربازی هەڵاتوو) لەوناوە مابوونەوە،کەسوکاریان هەوڵیاندەدا بیانبەنەوە بۆشارەکان و ئۆردوگاکان.

پتر لە(18)کەس لەخەڵکی ئەوناوچەیە بریار دەدەن برۆن بەرەو بەری هەولێر و ئۆردوگاکانی(بنەسەراوە)و(قوشتەپە)و(دارەتوو) بەداخەوە لە سێریانی(کانی بزرە) دەکەونە بۆسەی جاشەکانی (عبدالخالق)ەوە ودەسگیریان دەکەن. یازدەکەسیان پسوولەی تەسلیم بوونەوەی رژێمیان پێدەبێت،لە (ئەمنی هەولێر) بەرەڵا دەکرێن.

حەوتەکەی تریان کەهیچیان پێنابێت وەك پێشمەرگە حیسابی دیلیان بۆ دەکەن کەبریتی بوون لە(جودت کریم)برام و(بەگزادیونس سەربیری)و(یاسین محمد)و (صدیق محمد) و (محمدحمدمین) و (دووکوری حسن هەمین چیاجەرمك)ی جودتی براکەی من کە پێشمەرگەبوو. چەك وئەلبوومێك وێنەی پێشمەرگایەتی پێ گیرابوو، لەگەڵ(5)هاورێی بێ سەروشوێن کران..ئیتر ئێمە بەوهەواڵە زۆر نیگەران بووین، هەرلەودوڕگانەدا ماینەوە،پاش چەندرۆژێك ئیترسوپاوجاش لەناوچەکە کشانەوە، پاشنیوەروان بەئازادی دەگەڕاین، رۆژێك لە شارەوە جەندکەسێك لەکەسوکاری پێشمەرگەو فیرار هاتنەلامان لە گوندی دەرماناوی گەورە، داوایان لێکردین هاوکاریانبین بۆ دۆزینەوەی کورەکانیان لەچەند حەشارگەیەك لە نزیك گوندی سەربیر،بریتی بوون لە(محمدرشاش)پێشمەرگەی شیوعی(زامن حاجی نوری) پێشمەرگەی یەکێتی (دووکوڕی عمربەگ سەربیر)و(دووکوری ئەحمەدخەجێ)و (کوڕێکی حاجی اسماعیل قصاب قەرەسالمی) ئەوان پتر لە 25 رۆژ لەو ژێر زەمینەدا خۆیان حەشاردابوو،لە هەموو هەواڵێك دابڕابوون، تەنانت ئەسپێ لێی

دابوون،سەرلەئێوارە چوار- پێنج کەس بەڕێ کەوتن بەرەو (سەربێر) لەوێ هەموویانیان دۆزیبیبۆوە.. بەرەبەیان هەموو گەڕانەوە لای ئێمە لە چەمەکانی دەرماناو،چەندرۆژێك لەگەڵ ئێمە بوون،خۆیان شۆری،خاوێن بوونەوە، بووژانەوە، ئیترئەودەستەیە(محمدرشاش)یش لەگەڵماندا هات،لەوانجوودابووینەوە، بۆخۆمان کەڵەکێك مان دروستکرد بۆ پەڕینەوە لە زێ، بۆ هەر جێگایەکیش بچووینایە گوێدرێژەکەمان لەگەڵ خۆمان دەبرد، ئەویش لەگەڵ ئێمە بەو بارو دۆخە راهاتبوو، بەشێوەیەك راهاتبوو لەکاتی پەرینەوە لەزێیەکە سەری دەنایە سەر کەڵەکەکەو بە مەلەوان لەگەڵ ئێمە دەپەڕییەوە. تاکۆتایی تەمموز لە سنووری خۆمان ماینەوە، ئیتربەڕێکوەتین بەرەو بناری قەندیل.تاسەر سنووری ئێران ئەو گوێدرێژەمان هەر لەگەڵدابوو..

لە 1988/7/25لە گەڵ دەستەیەکی تر لە هەڤاڵەکانمان، لە پارتیزانە شارەزاکانی (حزبی سۆسیالیستی کوردستان) کەبریتی بوون لەبەڕێزان(شێخ سەردارجەباری) و (کاك سەدرە)وچەندهەڤاڵێکیان بەکمانگرتەوە وبارەگامان دامەزراندەوە..

سەرەتای مانگی ئاب لەگەڵ دەستەکەی هەڤاڵ (صدرە) بەرێکەوتی بەرەو دەوروبەری هەولێر ماوەی 3 رۆژ لە دۆلە دەمانچە بووین دواتربەرێکەوتین بەرەو ئۆردووگاکانی(بنەسەراوە)و(دارەتوو)هەرچەند لەرێگا کەوتینە کەمینی دوژمەوە، بەلام بەسەلامەتی دەربازبووین. سەردانی زۆرێك لە کەسوکارەکانمان کرد،لەگێران وبێسەروشوێن بوونی جودتی برام وهەر5هاورێکەی دڵنیابووینەوە، هەرهەمان شەو گەڕاینەوە بناری دێدەوان وگەیشتینەوە لای هەڤالەکانی ئەوێمان،پاش چەند رۆژی تر کەوتینەوەرێ بەرەو خۆشناوەتی ولە رۆژی 1988 /8/31 لە(قەندیل) ئاودیو بووین بەرو(کاولان)* لەسەر سنووری ئێران .

* ئیستا کادرێکی چالاکی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)ە



## فاروق هەورامی
## پارتیزانی دوای ئەنفالی
## حزبی سۆسیالیستی کوردستان

سۆسیالیستەکانی شارەزوور و خەورامان ناوە ناوە گوێیان لەچالاکی هاوڕێ شیوعی هەڤاڵە یەکێتی یەکانیان دەبوو، چەندمانگێك بوو شەڕی عێراق - ئێران وەستابوو، شەش پێشمەرکەی سنوری هەورامانی (حزبی سۆسیالیستی کوردستان) یش بڕیار دەدەن بەشێوەی پارتیزانی بگەڕێنەوە دەڤەرەکەو چالاکی پارتیزانی ئەنجام بدەن

فاروق هەورامی دەگێڕێتەوە:

ئێمە شەش پێشمەرگەی هەرێمی 2ی هەورامانی سۆسیالیست بووین ، بڕیارماندا بگەڕێینەوە سنووری هەورامان و چالاکی ئەنجام بدەین، سەرەتاچووینە هانەی لای دەرەی مەڕ، چاوێکمان بەناوچەکەدا گێڕا، هەرشاخێکی هەورامانی سەرکەشت تەماشا دەکرد، رەبیەومۆڵکەی سەربازی عێراقی بەسەرەوەبوو، بڕیارماندا کە لەسەر رێگای هاتووچۆیان کەمین بنێینەوە، ئەوەبوو چالاکی یەکمان ئەنجامدا..

ئەفسەرێك و2سەرباز کوژران ونائیب زابتێکیش بەناوی(قەحتان محمود ابراهیم) دیل بوو، ئێمەش بەسەلامەتی گەڕاینەوە حەشارگەکەمان.

---

سەرچاوە : فەیسبووك



# پارتیزانەکانی
# حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان

# درووستکردنی مەفرەزەی پارتیزانی

پاش ئەنفالەکان کە سەرجەم حزبەکان بەرەو سنووری ئێران یان ئەو دیو سنوور کشانەوە بە هۆی ئەو باروودۆخەوە جۆرێك لە پەرتەوازی لە ڕیزەکانیان دروست دەبێت، بەڵام ئەوەندەی پێناچێت بە گوێرەی توانا هەوڵی خۆڕێکخستنەوە دەدەن و خۆیان بۆ قۆناغێکی تر ئامادە دەکەن، لەوێ بنکەو بارەگاکانیان دادەنێن و بە جۆرێك خۆیان ڕێکخستەوەو هەندێك لە حزبەکان مەفرەزەی تایبەتیان پێکهێناو بەرەو ناوچەکانی باشوری کوردستانیان ناردن، بە (مەفرەزەی پارتی زانی پاش ئەنفال)ەکان ناسران. دەبوایە ئەم مەفرەزانە بە شێوەیەکی نهێنی و زۆر بە ئاگایانە هەڵسوکەوت بکەن. چوونکە ڕژێمی بەعس بە بەردەوامی چاودێری ناوچەکانی دەکردو هەر جولەیەکی هەست پێکردبا مەفرەزەی تایبەتی و هێزی بۆ دەناردن، بۆیە (مەفرەزەی پارتی زانی) یەکانی پێشمەرگە بۆ ئەوەی بتوانن کارەکانیان بە سەرکەوتووی ئەنجام بدەن و خۆشیان بێ زیان بن زۆر بە هوشیاری لە ناوچەکانی خۆیان جولەیان دەکرد، کە ئەمەش بۆ ئەوان زۆر گران و سەخت بووە کە بتوانن لەو ناوچە چۆڵ و وێرانانە بەردەوامی بە کارەکانیان بدەن، بۆیە هەندێ جار ڕوبەڕووی مەترسی دەبوونەوە. هەڵبەتە بۆ ئەم کارە پێشمەرگەی چوست و چالاك و بە ئەزموون هەڵدەبژێردرا.

حزبی زەحمەتکێشانی کوردستانیش یەکێك لەو حزبانە بووە کە بەو بارودۆخەدا ڕەت بووە، لە دوای ئەنفالەکان بارەگاکانی لە ئۆردوگای زێوەی ڕۆژهەلاتی کوردستان دادەنێت. دوای خۆڕێکخستنەوەی لە دوای پەرتبوونی لە پرۆسەی ئەنفالەکان، چوونکە ئەم حزبە لە پرۆسەی ئەنفالەکاندا دووچاری گرفتێکی گەورە بووە، بە شێکی لە هێزەکانی لە دەشتی هەولێرو کۆیەو ناوچەی هەریر بووە،

مەفرەزەیەکی لە ناوچەی بادینان ( بەری گارا) بوون و لە هێزەکانیان دابڕا بوون، چەند کادیرێکی بە ئیشوکاری رێکخستن لە ناو شاری هەولێر بوونە، دوو کادیری لە زیندانەکانی تورکیا بووە، هێزە زۆرەکەی کە سەرکردایەتی حزب و کادیرانی دامودەزگاکانی بوونە کەوتووبوونە نێو گەمارۆی ئەنفالی بادینان و بە زەحمەتییێکی زۆر توانیبوویان بگەنە نێو سنووری تورکیاو پاشان بۆ ئێران، بۆیە بە پێویست دەزانن بۆ پەیوەندیکردن بە رێکخستن و ئەندامەکانی چەند جارێك ( مەفرەزەی پارتی زانی) بنێرێتە ناو چەکانی ( هەولێرو خۆشناوەتی و رواندزو هەریرو خەلیفان و شەقڵاوەو کۆیەو بەرانەتی) لەو پێناوەشدا کادیرو پێشمەرگەو رێکخستنەکانی کەوتوونەتە بەر هەڵمەتی گرتن و زیندانیکردن لە لایەن رژێمەوە.

1- شەوی 10 / 1990/7/11 مەفرەزەیەکی پێشمەرگە ( مەفرەزەی پارتی زانی) کە(3) کادیر دەبن ( ئازیز عەبدوڵا، فەرهاد مەنتك، موحسین بانی مارانی) لە گوندی (بادیناوا) ی رۆژهەڵاتی کوردستان بەرەو قەندیل بە رێدەکەون بە مەبەستی گەڕانەوە بۆ ئەو ناوچانەی بۆیان دیاری کرابوو کە بتوانن ئەرکەکانیان تیادا ڕابپەڕێنن، بە (شێخ ئایش و گۆمی کرمە سۆراو گۆڕتێسو) ڕەت دەبن، تا ئێرە بە بێ مەترسی رێدەکەن بەڵام لە ڕۆیشتنی رۆژانی داهاتوویان مەترسی دێتە رێگایان چوونکە دەبێت بە نزیك مۆڵگاکانی سوپای بەعسدا بچن، بە شەو بە (ئاشقۆڵکەو کۆمتان) دەڕۆن تا دەگەنە چیای(ماخۆبزنان و 1990/7/15 دەگەنە(دۆڵە رەقە)و شەو بە گوندی (گوڵان) دا رەت دەبن و 7/17 دەگەنە (دۆڵی مەلەکان) و لە هەندێ شوێن بە رۆژ ڕێگادەکەن، 18/ 19/7 1990 لە شەقامی شەقڵاوە نزیك گوندی ( قادیانە) دەپەڕنەوەو هەر لەوێ مەفرەزەکە لە یەکتر جیا دەبنەوە، چوونکە هەر لایەنێك کاری تایبەتی خۆی هەبووەو دەبوا یە بە دوا یدا بچێت، سێ کادیری زەحمەتکێشان ماوەیەك لە دەورو بەری گوندەکانی ( میر رۆستەم و خەتیبیان و

مەرزان و ئازەران و ئافریان) لە دەشتی هەریر دەمێنەوەو پاشان (ئاریز عەبدولا) جودا دەبێتەوەو بۆ کاری تر دەچێتە شوێنێکی تر، (فەرهاد مەنتك و موحسین بانی مارانی) شەوەی 25/ 26 1990/7 بە ئوتومبێلی دۆستێکیان تا حوجران دەچن، لەوێوە بە مەبەستی چوونە کۆیە بە دۆڵی تەوسکەدا ڕێدەکەن و شەوی 27لەسەر 28 دەگەنە کۆیەو دەچنە ماڵی (مام عەبدولا رەشید باوکی شەهید قەندیل)، لەوێ دەمێنەوەو پەیوەندی بە ڕێکخستنەکانی کۆیەو هەولێر دەکەن و ڕاسپاردەکانی حزبیان پێدەگەینن، شەوی 7/30 کۆیە جێدەهێڵن و بە باواجی دا سەردەکەون و بە بناری سەفیندا دەڕۆن و شەوەی 1لەسەر8/2 دەگەنە گوندی (قەراسنجی سەروو ـ قیرژە) شەوی پاشتر لە شەقامی (حوجران) دەپەڕنەوەو دەچنە گوندی (زێباروك) ، شەوانی پاشتر دەچنە گوندەکانی دەشتی هەریرو باتاس، لە گوندی (ئافریان) لە گەڵ (ئاریز عەبدولا) یەکتر دەگرنەوەو پلانی گەڕانەوە بۆ (سەرکردایەتی) ڕۆژهەلاتی کوردستان دادەنێن، (ئاریز عەبدولا) لە گەڵ ئەوان نا چێت و بە ڕێگا یەکی تر دەگەڕێتەوە، ئەوانیش لە ڕێگای ڕێکخستنەکانیان بە شەو بە ئوتومبێل دەچنە خەلیفان و پاشان لە خوار گوندی (سرێشمە)[51] دەچنە نێو گەلی (عەلی بەگ) لە ڕێگادا بە هۆی خواردنی گۆشتی برژاو کە لە خەلیفان بۆ یان ئامادەکرابوو تەندروستیان تێکدەچێت و (گەدەیان) ژان دەکات و ناتوانن لە ڕۆیشتن بەردەوام بن، لە سەر ڕووبار لە پەنا بەك خۆیان حەشار دەدەن تا ئێوارە ئەوسا بە چیای (برادۆست) سەردەکەون و تا ڕۆژ دەبێتەوە بەردەوام دەبن لە ڕۆیشتن پاشان لە گەلییێك دەمێننەوە تا ئێوارە، شەو لە شەقامی (مێرگە سۆر) دەپەڕنەوەو بەیانی دەگەنە چیایی (پیران) و تا ئێوارە لەوێ دەمێنەوە، پاشان بە دەشتی (بەرازگر) دا دەڕۆن و ڕۆژێك لە سەر ڕووباری ئەوێ دەمێنەوەو شەو دەپەڕنەوە، ئەوان بە ڕۆژ ناتوانن بڕۆن تەنیا بە شەو نەبێت، بە ڕۆژ خۆیان حەشار دەدەن و بە شەو ڕێیان

کردووە، هەڵبەتە ئەوان لەم ڕێگایە شارەزا بوونەو چەندین جار پێیدا هاتوو چۆیان کردووە، کە شەو دادێت لە ڕووبار دەرباز دەبن و بەرەو سنووری باکوری کوردستان دەچن، بەرە بەیان دەگەنە گوندی ( بێگژنێ)[55] ی سەر سنووری باکوری کوردستان، خەڵکی گوند هاوکاریان دەکەن و تا ئێوارە لە دەرەوەی گوند خۆیان پەنا دەدەن نەوەك قەرەقۆڵی تورکیا پێیان بزانێ، ئێوارە دوو لە پیاوەکانی گوند هاوکاریان دەکەن تا لە مەترسی قەرەقۆل دەرباز دەبن و پێیان ئەڵێن نابێت لەم ناو چەیە بمێنەوەو بەردەوام بن لە ڕۆیشتن تا دوور دەکەونەوە، دوو شەو و ڕۆژێك بە کوێستانەکانی سێگۆشەی سنوور ڕێدەکەن و ێرای برسی بوون و شکەتی ساردو سەرمای کوێستانەکانیش زیاتر هیلاکیان دەکات،دەگەنە نزیك سنووری ئێران و لە بنکەی گومرگی پێشمەرگەکانی (پارتی) پشووییێك دەدەن و بەرەو ئەو دیوی سنوور بەڕێدەکەون، لە ڕەبایەکانی ئێران تەقەیان لێدەکرێت و گورج و گۆلانە خۆیان دەرباز دەکەن و دەگەنە ڕۆژهەلاتی کوردستان، ڕۆژی دواتر دەگەنە ئۆردوگای زێوە.

1- لە پایزی 1990 مەفرەزەیەکی تری پارتیزانی ئامادە دەبێت بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکی حزبی و پەیوەندی کردن بە ڕێکخستنەکان بە تایبەتیش ڕێکخستنەکانی هەولێر، چوونکە هەولێر چەقی جموجۆڵی حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان بووە، بۆیە دەبوایە هەمیشە لەگەڵ ئەم ناوەندەیان لە پەیوەندی دابان. مەفرەزەکە بریتی دەبێت لە سێ کادیر( موحسین بانی مارانی، ڕزگار چاو شین، تەنیا) لە بارەگاکانیان لە زێوەی مەرگەوەڕی ڕۆژهەلاتی کوردستان بەرەو سێ گۆشەی سنوور بەڕێدەکەون، لە گوندی (بێگژن)ێی سەر سنوور بە دیوی باکوری کوردستان ڕێدەکەن، دەبوایە نزیکەی ڕۆژە ڕێییێك بە ناو باکوری کوردستاندا بە نهێنی و بە شەو بڕۆن و ئینجا بێنەوە ناو باشوری کوردستان، لە سەر ڕووباری (کەتەینە) دەمێنەوە تا شەو دادێت، ڕێگایەکە بێ کێشە دەبڕن و دەچنە دیوی

باشوری كوردستان ناوچەی ( دەشتی بەرازگر) هەڵبەتە بە شەو بە ڕێگادا دەڕۆن، پاشان لە ئاستی گوندی ( خەردن) لە شەقامی مێرگە سۆر دەپەڕنەوەو دەچنە شاخی برادۆست، لە ڕۆژی بەڕێكەوتنیان تا دەگەنە برادۆست دوو شەو و دوو ڕۆژیان پێدەچێت، پاش بڕینی برادۆست شەو دەچنە سەر ڕووباری ذێو دۆڵی خوار گوندی (سرێشمە)، موحسین بانی مارانی كە شارەزای ڕێگاو بانەكانی دەڤەرەكە بووەو چەندین جار بەو ڕێگایە هاتوو چۆی كردووە، بەڕۆژ بە بێ چەك دەچێتە گوندی سرێشمەو پەیوەندی بە ڕێكخستنەكان دەكات، دوو شەو لە سرێشمە دەمێنەوە، لە خەلیفان و سرێشمەو دەوروبەری ڕێكخستنێكی چالاكی ئەم حزبەی لێبووە، دەیانەوێت بۆ ڕاپەڕاندنی ئەركەكانیان بچنە ناو شاری هەولێر، دوای دانانی بەرنامەو ڕێكخستنی ڕێگاو شوێن لە ڕێگای ڕێخستنەكان بە ئوتومبێل بەڕێدەكەون بۆ هەولێر، بێئاگا بووینە لەوەی كە پیاوانی ڕژێم لە خەلیفان پێیان زانیوەو زانیارای تەواویان لە سەر مەفرەزەكە هەبووە كە نیازیان چیەو جولەوهەڵسوكەوتیان خراونە تەژێر كۆنترۆڵ، چەكەكانیان لە خەلیفان بەجێهێشتووە بێ چەك بووینە بەیانامەو نووسراویان پێبوە، تەنیا شوفێری ئۆتۆمبیلەكەیان لە گەڵ بووە، بە شەو بە ڕێكەوتوون، تا نزیك دەبنەوە لە شەقڵاوە بە لای ئەوان باروودۆخەكە ئاسایی دەبێت و هیچ ڕوونادات لە دەربەندی شەقڵاوە مەفرەزەیەكی تایبەتی نزیكەی 70 كەس بووینە سەر بە ئەمنی هەولێر بۆیان دانیشتوون و دەكەونە ناویان و دەستگیر دەكرێن، یەكسەر دەیانگوازنەوە بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی هەولێر، دوای لێكۆڵینەوەو ئازاردان و جۆرەها ئەشكەنجەدان، ددان بە هیچ دانانێن و هیچ زانیاریێك نادەن، ڕژێم هەوڵی داوە كە زانیاری ئەوەیان دەسكەوێت كە ئەم مەفرەزەیە بە نیازی چ بووینە بۆی هاتوون و پەیوەندی بە كێوەوەبكەن و ڕێكخستنەكانی هەولێری ئەم حزبەیان بۆ

ئاشکرابێت، دوای سێ مانگ لە گیرانی ئەم مەفرەزەیە، هەر لە ڕێگای ئەو کەسەی کە هەواڵی لە سەر ئەم مەفرەزەیە دابوو بە ڕژێم، زانیاری تەواو لە سەر کادیرێکی پێشمەرگە کە لە شار بووە، لەگەڵ چوار کادیری چالاکی ڕێکخستنە نهێنیەکانی شاری هەولێر دراوە بە پیاوانی ئەمن و هەر پێنج کادیرەکە دەستگیر دەکرێن بە ناوەکانی ( گۆران جەلال، غازی حەسەن، محەمەد سلێمان، عەلی عەبدوڵا، حوسێن کۆیی) پیاوانی ئەمەن دەیانخەنە ژێر جۆرەها ئەشکەنجەدان تا زانیاری بدرکێن، بەڵام ئەوەندە خۆڕاگر بووینە ئامادە نەبووینە بە هیچ جۆرێك زانیاری و نهێنی بدرکێنن، دەزگای ئەمنی ڕژێمی بەعس کە یەکێك بووە لە دەزگا هەرە دڕندەکانی سەددام و بە ناوبانگ بووە لە هۆڤیەتی و دڵرەقی، کە هیچ سنوورێکی نەبووە لە کوشتن و بڕین و ئازار دان، جا ئەم دەزگایە ئەمە کردەوەو ئاکارو ڕەوشتی بێت و پێشمەرگەی بە چەکەوەو کادیری حزبێکی بەرهەڵستکاری بکەوێتە دەست چ جۆرە ئەشکەنجەیەکیان ئەدات، لەوێ هەردووك لای گیراو مەفرەزە کەو کادیرە کانی ڕێکخستن بە یەکتر دەزانن کە چیان بەسەر هاتووە، هەموو جۆرە ئەشکەنجەیەکی دەروونی و جەستەیی لە بەرامبەریان بەکار دەهێنرێت، بەڵام نەڕوخاون و بە کۆڵنەدان و خۆڕاگری بە گژپیاوانی ئەمن دا چووینەتەوە، ئەوان دەیانزانی کە چارەنووسیان کە پەتی سێدارەیە، ڕۆژانە لەو پەڕی خۆڕاگریەوە لە چاوەڕوانی ئەم ڕۆژەدا بووینە، ڕاپەڕینی بەهاری 1991 بۆ ئەوان مژدە یەکی دووانە بوویە، لە ڕاپەڕینی خەڵکی هەولێر لە ڕۆژی 11ئازاری 1991 کە هەولێر بانگی ئازادی تیا بەرز بۆوە، لە لایەن جەماوەری ڕاپەڕیوو کە هێرش دەبەنە سەر دام و دەزگاکانی ڕژێمی بەعس،زیندانیەکان ئازاد دەکرێن، ئەوانیش پاش شەشە مانگ مانەوە لە ژێرئەشکەنجە ئازاددەبن وتێکەڵی جەماوەر دەبن ودەست لە ملانێی ئازادی دەبن.*

- حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان لەدوای ئەنفالەکان بەشی پێشمەرگایەتی) خۆی ڕێکخستەوە بە شێوەیەك کە لەگەڵ بارودۆخەکە بگونجێت، بە شێوازێکی پارتیزانی بەشێکی لە هێزەکانی ناردۆتە خوارەوە بۆ ناوچەکانی دەشتی هولێرو هەریرو خەیلانیەتی و شەقڵاوەو کۆیە ، هەمیشە هێزی پێشمەرگەی ئەم حزبە لەو ناوچانەو ناوچەکانی تری کوردستان بەتایبەتیش ناوچەکانی سنووری(شەقڵاوەو خەلیفان و هەریرو بەڕانەتی و مرکیەو شەمامك وکەندیناوەو دەشتی هەولێرو کۆیە) بوونی هەبووە، تەنانەت لە ڕۆژگارەکانی ئەنفال و سەردەمی مەفرەزەی پارتی زانی دوای ئەنفالەکان ئەم ناوچانە جێ پێگەی چالاکیەکانی بووە.

بەشێك لە پێشمەرگەکانی هەرێمی سێ و چەند کادیرێکی ناوچەی دەشتی هەولێر سەرەتای تەموزی 1988 بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکی پێشمەرگایەتی و ڕێکخستن بە جەولە دەچنە ناوچەی خەیلانیەتی و هەریرو شەقڵاوە، ماوەیەك لەو ناوچە دەمێنەوەو پاشتر دەچنە سنووری کۆیە، پاش ئەنجامدانی ئەرکەکانیان بە تایبەتی پەیوەندیکردن بە ڕێخستنەکانی کۆیەو هەولێر، دەگەڕێنەوە سنووری شەقڵاوە، شەوی(1988/8/1) لە گوندی(ئارمەوان)ی نزیك کۆڕێ دەبن لە کاتی دەرچوونیان دەکەونە نێو کەمینی جاشەکانی خۆفرۆش(سەلاح شینە)، پێشمەرگەیەکیان بە ناوی(ڕۆستەم سیاوی)شەهید دەبێت، ئەم هێزە لە ناوچەکە دەمێنێتەوەو درێژە بە کارو چالاکیەکانی دەدات.

- ( شاخەوان عەبدوڵا ) یەکێك بووە لە پێشمەرگەکانی(هەرێمی یەك) لە بڕگەیەکی یاداشتەکانی خۆیدا لە بارەی بارودۆخی ناوچەکە، وا باس لەو جەولەیە دەکات:

(لە 1988/8/12 لە گەڵ هاوڕێیانی کادیرانی ناوچەی دەشت لە سەر بڕیاری حزب بەرێکەوتین بۆ خوارەوە بۆ جەولە، ئەو چوونە خوارەوەیە وەك ئەوە وابوو کە ڕووبار بە پێچەوانەی ئاراستەی خۆی بڕوات، چونکە هەر خەڵکی ئەو گوندانەی کە

پێیدا دەڕۆیشتین پێیان سەیر بوو کە مەترسی هێرشی دووژمن بۆ ناوچەکە زۆر نزیك ببۆوە، ئەم پێشمەرگانەش دەچنە خوارەوە)

( بەشێك لەیاداشتەکانی شاخەوان عەبدوڵا)،

(1988/8/20)دەگەنە ئەو دیوی چیای(کۆریس)بە دیوی ئاکرێ،لە گەلییێکدا خۆیان حەشاردەدەن وفەرهاد مەنتك( جێگری فەرماندەی هەرێمی سێ) دەچێتە ئەو گوندەی کە یەکێك بە(کەلەك)لە زێ بیانپەڕێنێتەوە، شەو دەچنە دەشتی هەریرو خەیلانەتی، بارودۆخیش نائاسایی بووە و رژێم لە جم و جۆڵ دابووە..

لە(1988/8/26) لەگەڵ پێشمەرگەکانی(هەرێمی یەك) کە پێش ئەوان لە (ناوچەی دەشتی هەولێر) لە جەولە بوونە یەکتر دەگرنەوەو بۆ چەند رۆژێك پێکەوە لەو ناوچەیە دەگەڕێن بەڵام ژیانیان زۆر سەخت دەبێت بە هۆی دەستپێکردنی پرۆسەی ئەنفالی بادینان و چۆڵی ناوچەکەو دەست نەکەوتنی خواردن، زۆر جار بۆ ژەمێك خواردن بە ناچاری رێگای دوورو پڕ مەترسیان گرتۆتە بەر، شەو دەچنە گوندی (سەرکەند)، لەم گوندە زانیاری وهەواڵی دەستپێکردنی شاڵاوی ئەنفالی بادینان وەردەگرن، کە هێرشێکی بەر بڵاو بۆ سەرجەم ناوچەکانی بادینان دەستی پێکردووەو هێزی پێشمەرگەش بڕیاری پاشەکشێی داوە بۆ سنووری ئێران و تورکیا بێ ئەوەی بەرگرییێکی ئەوتۆ بکات، تا (1988/9/7) ئەم هێزە بە هەر شێوەیەك بووبێ پێکەوە بووینە بەڵام دواتر نەیانتوانیووە چیتر پێکەوە بن، چوونکە لەو هەلومەرجە سەختەدا هێزی زۆر ناکرا چیتر پێکەوە بێت، هەواڵی ئەوەشیان زانیووە کە رژێم لەم چەند رۆژەدا هێرش بۆ ناوچەکە دێنێ و کێوماڵی دەکات، بەرپرسانی هێزەکە کۆبوونەوەیەك دەکەن کە بەرنامەی لە مەودوایان چی بێت، بڕیار دەدەن ببن بە سێ بەش (مەفرەزە) و بە شێوەی پارتی زانی لەو ناوچانەی بۆی دەچن کارەکانی خۆیان ئەنجام بدەن.

**مەفرەزەیەك بۆ دەشتی هەولێر کە بریتی بووینە لە :**

1 ـ مام جەوهەر		2 ـ فازل حەسەن.

3 ـ کرمانج عەوێنەیی.		4 ـ ڕزگار چاوشین.

5 ـ شاخەوان عەبدوڵا		6 ـ سەنگەر دهێماتی.

7 ـ ڕێبین سوور.

**مەفرەزەیەك بۆ کۆیەودەوروبەری کە بریتی بووینە لە :**

1 ـ ئاوارە کۆیی.		2 ـ موحسین بانی مارانی.

3 ـ حامد مەولود(دێدەوان).		4 ـ هەڵۆ کەرکوکی.

5 ـ بێکەس قادر.		6 ـ مەلا هەندرێن.

**مەفرەزەیەك لە ناوچەی خەیلانیەتی دەمێنێتەوە کە ئەمانە بوونە:**

1 ـ فەرهاد مەنتك.		2. سەعد خالید.

2 ـ تەنیا.		4. دەشتی.

5 ـ هۆشەنگ دهێماتی.		6 . ڕەنجدەر کەرکوکی.

7 ـ کاوە دهێماتی.		8 . پەروەر.

9 ـ وریا گردعازەبانی		10 . ئاسۆ کەرکوکی

11 ـ نەهرۆ هەینی.		12 . دکتۆر چالاك.

ئەومەفرەزەی لە ناوچەی خەیلانیەتی مابۆوە چەند ڕۆژێك لە ناوچەکە دەمێنەوە، کاتێ سوپاو جاش هێرش بۆ ناوچەکە دێنێ ئەوان لە دەوروبوری گوندی ( گراو ) دەبن و خۆیان لەم هێرشە دەپارێزن و هەوڵی ئەوە دەدەن ناوچەکە جێبهێڵن تا سوپاو جاش پاشەکشێ دەکات، بۆ ئەم مەبەستە ڕوو لە دەشتی (شەمامك) دەکن و پاشان بە ڕێگای دەوروبەری (مەلا ئۆمەر)دەچنە ناوچەی کۆیەو پاش چەند ڕۆژێك دەگەڕێنەوە ناوچەی خەیلانیەتی.

# ئەنفالی بادینان و
# گەمارۆدانی پیشمەرگەکانی زەحمەتکێشان

مەفرەزەی هەولێر، چەند ڕۆژێك لە دەورو بەری گوندی (جەدیدە) دەمێنەوەو لەوێ دەزانن کە هاوڕێیەکانیان بەرەو سنووری تورکیا ڕۆیشتوونەو مەفرەزەیەکی (11) کەسیشیان لە ناوچەی بەری گاراو زێبارەتی کەوتۆتە نێو گەمارۆی ئەنفالەکان و بە ناچاری لە لێبوردنی گشتی خۆیان ڕادەست کردووەو هێنراونەتە ئۆردوگای (جەژنیکان)، پاشان بە ڕێگای بەڕانەتی دەگەنە شەمامك وگوندەکانی بە شێوەی پارتی زانی بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك دەمێنەوە، پاشان بە هەمان ڕێگای بەڕانەتی لە کۆتایی مانگی(ئەیلولی 1988) دەگەڕێنەوە بۆ ناوچەی خەیلانیەتی و لە گەڵ هەردووك مەفرەزەی کۆیەو خەیلانیەتی یەکتر دەگرنەوە، پێش ئەوان مەفرەزەی کۆیە گەڕاوەتەوە ناوچەکە. لە (1988/9/29) دوو پێشمەرگەیان بە ناوەکانی حامد مەولود(دێدەوان)و (د.چالاك) لە هەڤاڵەکانیان دادەبڕێن و دەکەونە کەمینی جاشان و دەستگیر دەکرێن وشوێنبزر دەکرێن و لە دوای ڕپەڕین دەزانرێ کە شەهید کراون، (دڵشاد کۆیی و نەبەز ئیسماعیل) دوو پێشمەرگەی ئەو مەفرەزە(11)کەسیە بوون کە لە بەری گاراو ناوچەی زێباریەتی لە کاتی گەمارۆدانیان لە ئەنفالەکانی بادینان خۆیان ڕادەست کردبوو لە ڕێگای ڕێکخستنەکانی هەولێریان دەگەنەوە ئەو هێزەی کە لەناوچەی خەیلانیەتی بوون، بۆبەرنامەی کاری داهاتوو کۆبوونەوەیەك لە گوندی (زێبارۆك)ئەنجام دەدەن..! چوونکە بارودۆخی ناوچەکە گەیشتبووە ئاستێك کە مانەوە لەوێ زۆر ئەستەم بوو، بە تایبەتیش بۆ هێزێکی زۆر، بڕیار دەدەن بگەڕێنەوە بۆ ڕۆژهەلاتی کوردستان،بەڵام چۆن وبە چ ڕێگایەك،بۆیە گەڕانەوە دەکەنە هەڵبژاردەو (گەریەکێك خواستی گەڕانەوەی نییە دەتوانێت سوود لە

لێبووردنی گشتی وەربگرێت و خۆی رادەست بکات)چەند کەسێکیان خۆیان رادەست دەکەن و ئەوانی تریش کە (13) کەس مابوونەوە ئامادەکاری دەکەن بۆ گەڕانەوە بۆ بارگاکانی سەرسنوور.

سێزدە کەسەکان ئەمانە بوون:

1. ئاوارە کۆیی.
2. سەعد خالید.
3. فەرهاد مەنتك.
4. موحسین بانی مارانی.
5. بێکەس قادر.
6. مەلا هەندرێن
7. فازل حەسەن
8. دڵشاد کۆیی.
9. نەبەز ئیسماعیل.
10. ڕزگار چاوشین
11. شاخەوان عەبدولا.
12. تەنیا.
13. ئەمرۆ هەینی

(1988/10/27)لە رێگای رێکخستنەکانی (خەلیفان) بە شەو بە دەشتی هەریرو پاشان بە نزیك سەربازگای سپیلك و کەلەکین بەرەبەیان دەگەنە گوندی (کانی وەتمان)ی پشت خەلیفان، لە ماڵی (مام سالح) دەمێنەوەو پشوو دەدەن تا ئێوارە، ئێوارە لەم گووندە دەردەچن و رۆژێك لە دەوروبەری سرێشمە دەمێنەوەو ئێوارە دەچنە چیایی برادۆست و شەوی پاشتر لە نزیك گوندی(سارداو)لە شەقام دەپەڕنەوەو دەچنە گوندی(خەردن) لەو ناوچەیە چەند رۆژێك دەمێنەوە تا رێگایەك دەدۆزنەوە بۆ گەیشتن بە سنوور، هەڵبەتە خەڵکی ئەو ناوچەیە هاوکاری کردون بە

تایبەتی بۆ ڕێگا نیشاندان و ڕێنوێنی کردنیان، (مام غەزالی و خۆشەویی) دوو کەسایەتی ناوچەکە بووینە هاوکاری ئەم هێزەی حزبی زەحمەتکێشانی کوردستانیان کردووە بۆ گەیشتن بە سنوور، لە وێوە کەسێکی دانیشتووی گوندەکانی سەر سنووری باکوری کوردستانیان دەبێتە هاوڕێگایان کە ئەمە بۆ مەفرەزەکە باش بووە بۆ زیاتر شارەزابوونی ڕێگا.(1988/11/3) دەگەنە گوندی(بێگژنێ)ی سەر سنوور، بە ڕۆژ خۆیان لە نزیك گوندەکانی باکوری کوردستان حەشار داوەو بە شەو بە نێو خاکی باکوری کوردستان و نزیك بنکەو پێگەکانی سوپای تورکیادا ڕۆیشتوون تا گەیشتوونەتە سێگۆشەی سنوور (ئێران ئێراق تورکیا) لەوێ تووشی سەختییێکی دژوار دەبن سەرەتایی مانگی تەشرینی دووەم دەبێت و بەفر دەبارێت، بە هەر شێوەیەك بێت دەگەنە سەر سنووری ڕۆژهەلاتی کوردستان ناوچەی(مەرگەوەڕ)، بەر لەوەی بەرەو سێگۆشەی سنوور بە ڕێبکەون چەند کەسێك کە خەڵکی گوندەکانی سەر سنووری ڕۆژهەلاتی کوردستان پەیوەندیان پێوە دەکەن و کە ئەوانیش ویستوویانە بگەڕێنەوە ڕۆژهەلاتی کوردستان، بە پێشمەرگەکانی زەحمەتکێشان ئەڵێن ئێمەش لە گەڵ ئێوە دێین بۆ ڕۆژهەلات بەلام گەر کەوتینە نێو کەمینی هێزەکانی تورکیا نابێت تەقە بکەن و یەکسەر خۆتان رادەست بکەن، ئەوانیش ئەڵێن هەرگیز شتی وانابێت و ئێمە خۆمان رادەست ناکەین و بەرگری دەکەین جا ئاکامەکەی هەر چییێك بێت، مەترسییێکی تری ئەوان ئەوە بووە پێشمەرگەیەکیان لە گەڵ بووە بە ناوی (نەبەز ئیسماعیل) کە خەڵکی باکوری کوردستان بووە، گەر لەگەڵ هێزەکانی تورکیا تووشی هەر ڕووبە ڕوونێك بان و زانرابا کە ئەو کەسەیان لەگەڵە ئەوە بۆ ئەوان گەرەترین کێشە دەبوو، گەر ئەو پێشمەرگەیان کەوتبایە دەست تورکیا ئەوە ڕووبە ڕووی مەرگ دەبۆوە، چوونکە پێشووتر شتی لەم جۆرە ڕووی دابوو لە کاتی

ئەنفالی بادینان و چوونی هێزی پێشمەرگە بۆ نێو سنووری تورکیا، سوپای تورکیا لە رێگای سیخورەکانی چاودێری ئەوەی کردووەو بە دوای ئەو کەسانە گەڕاوە کە پێشووتر لە ریزەکانی(پارتی کرێکارانی کوردستان pkk ) بووینە، کاتێ ئەو هێزەی (حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان) لە کاتی ئەنفالەکانی بادینان چووبوە نێو باکوری کوردستان ئەم بە دواچوونەی سوپای تورکیایان دیتبوو کە بە دوای ئەو کەسە تێکۆشەرانە گەڕاوەو دەستگیریان کردوون، هەر لەسەر ئەمەش لێپێچینەوەیان لە کەسی یەکەمی ئەم حزبە( قادر عەزیز) کردبوو و بۆ ماوەیەکیش دەستبەسریان کردبووچوونکە زانیبوویان کەسانی وەها لەم حزبەدا هەبوونە، بۆیە ئەم هێزەش مەترسی ئەوەیان هەبووە،بەلأم ئەم رووداوەی پێشووتریان نەزانیووە تا نەگیشتوونەتەوە لای هاورێیەکانیان لە رۆژهەلأتی کوردستان.

کەسێك دەنێرنە بنکەی سنووری ئێران تا رێگایان پێبدەن بچنە نێو رۆژهەلأتی کوردستان بگەنەوە بنکەکانیان لە ئۆردوگای زێوە،بەلأم رێگا نادەن و دەلێن ئێوە چەکدارن رێگاتان پێنادەین،بە هەرشێوەیەك بێت بە رێگای یاساغدا بەرەبەیانی (1988/11/7) لە دەوروبەری گوندی( بێراسپێ)ی سەر سنوور دەچنە رۆژهەلأتی کوردستان و پاشان بۆ ئۆردوگای زێوە، کە بارەگاو بنکەکانیان لەوێ بووە.

* سەرچاوە : نامەیەکی بەرێز هیواسەید سەلیم 2020/1/6



ئەلبوومی پارتیزانەکانی

حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان

## پیرۆزبایی ئەنفالچی یەکان

لە دوای پرۆسەکانی ئەنفال ئەوئەنفالچی یەکوردانەی چاوساغی سوپای تالآنیان کردبوو بۆسەرمیللەت ونیشتمانی خۆیان،هیندە کەسایەتییان ڕووخابوو،بڕویان بەهەڵسانەوەی شۆڕش وگەل نەمابوو،هەر بۆیەهەمیشە نۆبە بڕەیان دەکرد لەچاوپێکەتنی دەزگاکانی ڕاگەیاندن و ناردنی پیرۆزبایی بۆسەرانی تاوان...

لە دوای ئەنفالی سێی گەرمیان لە چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەی(هاوکاری) دا لەگەڵ (تحسین شاویس سعید) موستەشاری فەوجی(172)بەمشێوەیە نووسراوە:

(فەوجەکەمان لەلایەن سەرکردایەتی یەوە 15نیشانەی ئازایەتی پێ بەخشراوە.. شانبەشانی هێزە چەکدارەکان.. بەشداری کردووە لەنێوفەیلەقی یەك وهەروەها بەشداری کردووە لەپرۆسەکانی ئەنفالی یەکەم ودووهەم وسێیەمدا،هەروەها داگیرکردنی بەرزاییەکانی(1050)لەکەرتی هەنجیرەو(1710) لەسەگرمەوقەرەداغ.

لەم دیدارەدا بەشانازییەوە باس لەکۆمەڵێك داستانی دیکە بۆڕاونانی ویرانکاران لەناوچەی قەرەداغ وسەنگاوتەوێڵەوحاجی ئۆمەران وگردەمەند(ئەوشەرەی کە شەهید سعیدتۆماری تیداشەهید بوو- نووسەر) لە سالآنی1982-1983دەکات.

هەروەها(پاککردنەوەی کەرتەکانی جەباری وقەرەحەسەن لە ئەنفالی سێیدا..)

هەرلەهەمان ڕۆژنامەدا لەچاوپێکەوتنێکدا بەشانازی یەوەدەڵێ:

(ئێمەزۆرخۆشحاڵ ودڵ شادین لەگێڕانەوەی خاکی داگیرکراومان بۆ کۆشی دایکی نیشتمان بەم بۆنەیەوە ئەوپەڕی پیرۆزبایی بەرزدەکەمەوە بۆ سەرۆکی فەرماندە صدام حسین وسەربازە دلێرەکانی دووەم قادصیەی صدام).

* ڕۆژنامەی(هاوکاری) ژمارە (998) 15 /1988/8

# ئەنجام

لە پاش پەلاماری ئەنفالی یەک بۆسەربارەگانی(ی.ن.ک)وخەڵکی (دۆڵی جافایەتی)و ئەنفالی دوو بۆ(قەرەداغ)وئەنفالی سی بۆ(گەرمیان)وئەنفالی چواربۆ(شوان وشێخ بزێنی وقەڵاسێوکە ودەشتی کۆیە...)و (ئەنفالی پێنج وشەش وحەوت)بۆسەر مەڵبەندی سیٚلە (خۆشناوەتی) وئەنفالی هەشت بووسەر(باد ینان)..بە هەزاران کەس لە خەڵکی بێتاوان ئەنفالکران وبێسەرو شوێن کران.

لە نێوان 1988/2/18 تا5/ی ئازاری1988کە ڕاپەڕینی1991ی لیٚکەوتەوە پارتیزانەکانی کوردستان لەزۆر شوێنی وڵات مابوونەوە، بەڵام لەهەموویان دژوارتر مانەوەی سنووری ئەنفالی سیٚوچواربوو،بەراستی بۆمێژوو سەلماندیان کە رۆڵەی ئازای ئەم خاکە سووتماککراوە بوون..

ئەو سەروەرییەیان بۆ نەتەوەکەیان تۆمارکرد کە هەمیشە شانازی پێوە بکەن و بڵێن ئێمە بووین کە شۆڕشی نوێمان لەهەرەس و ئاشبەتاڵ پاراست و..بووین بەئەو پشکۆ وژیلەمۆ نەکوژاوەیەی کەچەخماخەی راپەرینی لێکەوتەوە.. ناشیٚ وناکریٚ رۆڵی جوامێرانەی ئەوان وهاوکارەکانیان لەیاد بکرێت. بەراستی بەڵێنی خۆیان بردە سەر کەهەمیشە لەپێشەکی نامەکانیاندادەیان نووسی(نەسروتن تاسەرکەوتن) و(کوردستان یانەمان).ئەم مێژوە لێرەو لەویٚ بابەت و کتێبیان لەبارەوە نووسراوە، بەڵام هەموو ئەوانەی کە بوون بەخشتی دیواری سەروەرییەکان لەسنووری تاك وناوچە وحزب تێپەر نە دەبوون ، دوای پتر لە 12 ساڵ تێکۆشان توانیم بەشێك لەوئەرکە پیرۆزە بگرمە ئەستۆ و کتێبی (پارتیزانەکانی دوای ئەنفال) بنووسمەوە...

هەرچەند حەزم دەکرد هەمووی پێکەوە چاپ وبڵاوبکەمەوەبەڵام بەداخەوە نەشیا بۆم،

بۆیە بەناچاری بەشێکی کتێبەکەم کەتەرخانکردبوو بۆپارتیزانەئازاکانی حزبی شیوعی عێراق.. جیاکردەوە و بەناونیشانی(جوامێری)چاپ وبڵاوم کردەوە.. ئەم بەرهەمەی بەردەستانیش بیٚ کەم و کورتی نییە، دڵنیام هەندیٚ تێبینی و کۆمێنتی لەسەر دەبێت..بەڵام بەوپەڕی توانامەوە هەوڵم داوە جیاوازی بیروباوەڕ و ململانێی حزبی و گروپ وناوەچەگەری ببەزێنم..

هیوادارم لە چاپێکی تردا کاری باشتر پێشکەش بکەین.

مەلاشاخی

2020

# ئەلبوومی پارتیزانەکانی
# رەتڵی سورداش و کەرکوك



کاك عەلی بچکۆل و شەهید غەریب هەڵەدنی





**«پارتیزانەکانی ڕەتڵی سورداش» شوباتی** 1989

**لای چەپەوە:** شەهید غەریب هەڵەدنی - شەهید بەکر سێوێی

**- شوان موغاغی - رزگار جاسەنەیی - هێدی - کاروان**

* سەرچاوە: شوان موغاغی / سکرتێری کۆمەڵەی پێشمەرگە کەمئەندامەکانی سەنگەر





شەهید عومەر کاکەڕەش

عمر رسول قادر ( قەرانگۆیی )



کەوت جیهاز مانگی 10 ی 1990 پیرەمەگرون

هەڤاڵ بێستوون سابووراوەیی



(ئاکۆسوور)و(مام ڕەئوف)



شەهید سیامەند مام نوری



پارتیزان جەبار ستیف و ئاسۆکەرکوکی

ئەیلولی 1988 سێگردکان



كوێخا سیروان و حەیدەر دوو پارتیزانی دوای ئەنفال



شەهید یاسین عمرصدیق



تۆفیق عوسـمان دووشیوانی



**شەهید غەریب هەڵەدنی و هاوڕێ پارتیزانەکانی**



**پارتیزانەکان ١٩٩٠ مەفرەزەی کۆسرەت،کێومڕەش**

**ڕاوەستاوەکان لەڕاستەوە:**

**ـ خاڵند پ.م شارەزا ـ دڵزار رەفیق ـ شەمەید پشکۆ ـ عەزیزە سور**

**ئەوانەی دانیشتون:**

**ـ تالب فاروق ـ هیوارەش ـ محەمەد پ.م شارەزا ـ ناوی نازانم پ.م شارەزا ـ سامان**




پارتیزانەکانی ڕەتڵی سورداش
مەلا بەهادین ، دکتۆر تەها
شەهید جومعە، ناسراو بە وەستا کاروخ ئاسۆ سورداشی



شەهید ئیباو عەزیزەسوور پۆڵا هەیبەیی



وەستاوەکان:کاکەمەند ـ تالیب فاروق ـ شەهیدئاکۆ ـ شەهیدعمرمەغریب ـ عەریف نامیق

دانیشتووەکان: عمرجهاز ـ ئاشتی ـ شەهیدهیوا ـ .... ـ مام رەئووف





**پارتیزان جەبارستیف و عەول و حسن زەردکی**

**چیای کۆسرەت 1988/9/11**



**شەهید یونس احمد**



**عوسمانە سوور**



شەهید ابراهیم فازل(ئیباو)



شەهید نیزام کۆچەکی



شەهید ابراهیم فازڵ (ئیباو) شەهید پشکۆ



عومەر جیهاز و سەفەرقولیبەگی



شەهید ئاوات



محی ادین معروف



قەمچوغە 1991 پێش راپەڕین

فخرالدین و ئاواتەڕەش



# ئەلبوومی پارتیزانەکانی
# رەتڵی هەولێر و کۆیە و خۆشناوەتی



شەهید مەلا عەزیزی بەردەسپی



شەهید سۆران



١٩٨٩- بناری پیرمام دوای ئەنفالەکان/ لەچەپەوە: شەهید ڕێباز، جەلال ئیلینجاغی، هاشم جیهاز



ابوزید و هاورێیەکی



برهان سعید سۆفی



بەکر گردەسۆری



هەمینە مام رەسول نامەبەر



شەهید هاشم جیهاز ـ جلال ئیلنجاغی ١٩٨٩/٨/٢٦



پارتیزانی دوای ئەنفال جەعفەر وسوو جومعە(خارە جەعفەر)



پارتیزان



پارتیزان  ئەریمان ساڵەیی



ئەردەلانی حەسۆ و هەڤاڵەکانی پارتیزانەکانی دەشتی کۆیە



# ئەلبوومی پارتیزانەکانی
# سۆران و باڵەکایەتی و کاروخ



# چەند نامەیەك
# لەئەرشیفی پارتیزانەکانەوە

**نووسەرلە چەند دێڕێکدا:**

* ابوبکرمحمدحاجی1953/ بیرە سپان/ پردێ / کەرکوك
* بەشداری (شۆڕشی ئەیلول)م کردوە.
* لە (1975) ەوە کادر ی (ی.ن.ك) بوومە.
* لەساڵی 1981 بووم بەپێشمەرگەی شۆڕشی نوێ.
* ئەندامی یەکەمین پەرلەمانی کوردستان بووم.
* ئەند امی هەرچوار کۆنگرەی (ی.ن.ك) بووم .
* ئەندامی ئەنجومەنی ناوەندی (ی.ن.ك) بووم.
* ئەندامی (یەکێتی نووسەرانی کورد) م .
* دەستەی دامەزرێنەرو لێپرسراوی بەشی ئەدەبی (کۆڕی رۆشنبیری لاوانی کورد) بووم لە(ئەغەدە).
* ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (کرمانج) بووم .
* لە دامەزرێنەرانی ( بنکەی ڕووناکبیری شەهید) و بەڕێوەبەری نوسینی گۆڤاری (شەهید)بووم.
* یەکەم سەرنوسەری گۆڤاری (کەرکوك) بووم .
* سکرتێری رۆشنبیری (کۆمەڵەی روناکبیری کەرکوك) بووم .
* ئەندامی ( سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان ) م
*خەڵاتی رێزوپێزانینی یەکیتی بە واژۆی (مام جەلال)م وەرگرتووە کەبەچەك وقەڵەم بەشداری شۆڕشی گەلی کوردستانم کردووە.
*چوارساڵ نوێنەری (هەڤاڵ مام جەلال) بووم لە کەرکوك .
* بەرپرسی لقی کەرکوکی(یەکێتیی پەرلەمانتارانی کوردستان) بووم.

## بەرهەمە بڵاوکراوەکانی نووسەر

| | | |
|---|---|---|
| 1. دا ستانی ئاوارە یی (شعر) | | 1989 |
| 2. هۆرەی چیا (شیعر) | | 1991 |
| 3. سوتەن (دەربارەی ماف مرۆڤ) | | 1992 |
| 4. ئەنفال و شۆڕەبی (شیعر | | 1998 |
| 5. شیوەنێك بۆرەندی خان (شیعر) | | 1999 |
| 6. ئەنفالی خاڵخاڵان | | 2000 |
| 7. ڕاپەڕین ورزگارکردنی کەرکوك | چاپی یەکەم | 2000 |
| 8 . فیدرالی لەنێوان لکاندن وجیابوونەوەدا | | 2001 |
| 9 . انفال خالخالان | چاپی عەرەبی | 2006 |
| Anfal.of.Khalkhalan .10 | چاپی ئینگلیزی | 2006 |
| 11. ئەنفالی ڕەش | | 2007 |
| 12 . دڵسۆزی کەرکوك | | 2007 |
| 13 . دیوانی شاخی | | 2009 |
| 14. ئەنفالی چوار لەدادگای باڵای تاوانەکان.. | | 2010 |
| 15. ڕاپەڕین و رزگاری کەرکوك | چاپی دووەم | 2012 |
| 16 . پارتیزانەکانی دوای ئەنفال | چاپی یەکەم | 2012 |
| 17 . کەشکۆڵی شاخی | چاپی یەکەم | 2012 |
| 18. مانگ و خۆر و حەوتەوانە | چاپی یەکەم | 2017 |
| 19 . جوامێری | چاپی یەکەم | 2019 |
| 20 . گریانی شەو | شیعر | 2020 |

## سەرچاوەکان


. کوردستانی نوێ / ژ /2725 /2002/4/10

. بڵاوکراوە مۆردانە 2005/5/5/ ژ تایبەت /کۆڕی ماتە مینی

. ئەنفالی رەش گۆڕەبەکۆمەڵەکان/ مەلاشاخی

. رەشەبای ژەهروئەنفال/عەبدوڵاکەریم مەحمود/چاپی یەکەم

. چەند دەست نووسێکی / عوسمانی حاجی مەحمود

. بیرەوەرییەکانی سەنگاوی/ مەحمود سەنگاوی

. رۆژنامەی (هاوکاری) ژمارە (998) 15 /1988/8

. بیرەوەری پارتیزانی/ ابووزیدصالح / پارتیزانی سنووری کۆیە

. گۆڤاری رێبەری پشمەرگە

. فەیسبووکی کاك مەحموود سەنگاوی

. فەیسبووکی کاك حەیدەر مەنتك

. قەندیل بەغدای هەژاند/شەهید رێباز/ئاوێر / هەولێر 2017

ـ حەمەرەش گەرمیانییەکی گڕگرتوو. ئەمیرە محەمەد . 2018

ـ پارتیزای مەرگ وژیانەوە / عوسمان سێدەری 2013

ـ پارتیزانەکانی کەرکوك / ئاراس ئیلنجاغی 2012

ـ ئەنفالی خاڵخالان / چاپی دووەم

## سوپاس و پێزانین

**لەگەڵ سوپاس و پێزانینم بۆ کاک (سالاری ئیدارەی گشتی و کاک وەستا رسولْ ) هاوکارم بوون بۆ لەچاپدانی**

**سوپاسی وپێزانینی خۆم بەم بەرێزانە ڕادەگەیەنم کەلەبەرگی دووەم کەم وزۆربە بەڵگەنامە و پێدانی زانیاری پشتیوانییان کردووم:**

1. کاک عەلی بچکۆل
2. کاک چەتۆ صالح سعید
3. مامۆستا جەلال تەلانی
4. کاک بێستوون سابووراوەیی
5. کاک حسن عبدالرحمن(حسن شورتە)
5. کاک علی محمد نارۆجەیی(علی حەیران)
7. کاک جەبار ستیف
8. کاک ابووزید صالح
9. کاک ئازاد وەرتی
10. کاک صالح هەولیری
11. چەند هاوکارێکی پارتیزانەکان
12. کاک هیوا سەید سەلیم
13. کاک فخرالدین سمایل بەگی

**لەبەر زۆرییان ناتوانم ناوی هەموویان بهێنم داکارم بمبوورن.**

**نووسەر**

## The partisans after Anfal

In 1988 ، after the Iraqi government used chemical weapons and in 8 stages،razed 450 villages and deported 182،000 Kurdish women، children and youth to the southern plains of Iraq and murdered them en masse ، Kurdistan's peshmerga and especially the courageous fighters of the PUK abandoned conventional in favour of partisan warfare tactics. This book (the post Anfal partisans، authored by Abubakir Mohamed Haji aka Mala Shakhi) speaks of that phase in the struggle of an occupied .divided and ravaged country called Kurdistan .

Mala shakhi

# The partisans after Anfal

حرب العصابات بعد الانفال

ملاشاخی





**In 1988, after the Iraqi government used chemical weapons and in 8 stages, razed 450 villages and deported 182,000 Kurdish women, children and youth to the southern plains of Iraq and murdered them en masse, Kurdistan's peshmerga and especially the courageous fighters of the PUK abandoned conventional in favour of partisan warfare tactics. This book (the post-Anfal partisans, authored by Abubakir Mohamed Haji aka Mala Shakhi) speaks of that phase in the struggle of an occupied, divided and ravaged country called Kurdistan.**

**2nd adition**

2020